بڵاوکراوەکانی دەزگای دیموکراسی

# بیرەوەرییەکانی بەهادین نووری



بەشی یەکەم

چاپی کوردی یەکەم - ئابی ٢٠٠١

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای دیموکراسیی

# بیرەوەریەکانی
# بــەهادین نــوری

**پێشکەشە :**

- بەهەموو مرۆڤێك کـە وەکـوو سـەربازێکی نەناسراو لـە پێناوی ئایدیـا و پرنسیپەکانیدا خەبات دەکات و، کێشەی گەل و نیشتمانەکەیی خستووەتە ژوور کێشەی تایبەتی خۆیەوە.
- بەهـەر کەسێك کـە لەسـەر ئـەم ئەستێرەیەدا بـۆ رزگـارکردنی مرۆڤـایـەتی لەمۆتەکـەی زۆرداری و چەوساندنەوە و رووتاندنەوە تێدەکۆشێ.
- بەبنیاتنەرانی جیهانێکی تازە، کە هاوسانیی راستەقینە و دادی تەواوەتیی تێدا سەردەستە بن.

# پێرست

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

# وشەیەك بۆ خوێنەری چاپی کوردی

لەگەڵ پێشکەش کردنی ئەم بیرەوەریانەمدا بەزمانی کوردی حەز دەکەم بەخوێنەری بەڕێزی رابگەیەنم کە، ئەگەر چی من خۆم کوردم و دەشتوانم بەکوردی بنووسم، بەزمانی عەرەبی نووسیمەو بلاوم کردەوە، دۆستێکی بەڕێز وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە بۆ کوردی گرتە ئەستۆی خۆی.

بەداخەوە نەمتوانی هەموو ئەو بەشەی کە لەچاپی عەرەبیدا هەیە و هەتا ساڵی ١٩٨٤ دەگرێتەوە بەیەك جەڵدی کوردی چاپ بکەم چونکە لەبارودۆخی ئەمڕۆی ولاتدا چاپ کردنی کتێبێکی ٦٥٠ لاپەڕەیی شتێکی ئاسان نیە. بەهیوام پاش چاپ کردنی ئەم بەشە بەماوەیەکی کورت بەشەکەی تریشی چاپ بکرێ. دیارە ئارەزوومەندیشم کە بیرەوەری ساڵانی پاش ١٩٨٤یش بنووسم، ئەگەر چی ئەمە بۆ من کارێکی ئاسان نیە.

ئەم بیرەوەریانەم تەرخان نەکراوە بۆ باسی بارودۆخی کوردستان و کێشەی کورد چونکە من لەسەر ئاستی عیراق خەباتم کردووە، بەسەرجەمی کورد و عەرەب و کەمایەتیەکانیەوە، نەك لەسەر ئاستی کوردستان بەتەنها. بەلام هێندەی پێوەندی بەسیاسەتی حیزبی شیوعی عیراقەوە هەبێ خاڵە گرنگەکانم سەبارەت بەمەسەلەی کورد خستۆتە بەر باس، چ لەرووی ئیجابییەوە بێ چ سەلبی. ئاشکرایە کە لەماوەی چارەکە سەدەیەکدا ح ش ع گەورەترین و کاریگەرترین حیزبی سیاسی عیراق بوو. جا ئەو کەسەی کە بیەوێ بەشێوەیەکی بابەتیانە لەمێژووی ٥٠ ـ ٦٠ ساڵی رابوردووی بزافی رزگاریخوای کوردی عیراق بگات دەبێ بەباشی لەهێڵ و هەڵوێستی ح ش ع بگات بەرانبەر وەزعی کورد و کوردستانی ئەو سەردەمە.

خۆشحاڵ دەبم بەوەرگرتنی هەر راوبۆچوون و تێبینیەك لەسەر ناوەڕۆك و رووداوەکانی ئەم کتێبە، بەتایبەتی لەلایەن ئەو خوێنەرانەوە کە هاوچەرخی ئەو رووداوانە بوون کە باسیان لێ کراوە.

بەهیوام بەبلاوکردنەوەی ئەم بیرەوەریانە توانیبێتم شتێکی نوێ بخەمە نێو کتێبخانەی کوردی کە بەداخەوە هێشتا هەژارە.

کوردستانی عیراق — دانەر

٢٠٠١/٦/٤ — بەهادین نوری

هێندێك كەس لێم دەپرسن ئاخۆ پەشیمان نیم لەوەی کـە هـەرەتی لاوی‌و سـالآنی تەمەنم لەنێو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا بەسەر برد، کە ئەمڕۆکە بـەلای زۆر کەسـەوە لەوە دەچێ تووشی نشوستی‌یەك بوو بێ هەسـتانەوەی بـۆ نـەبێ؟ لـەوەلآمدا دەلێـم: من کارێکی وام نەکردووە لی‌ێ پەشیمان بم‌و، کاری سیاسیم بۆ پـەیدا کردنـی پلـەو پایەو دەولەمەندی نـەبووە. هـەرچی بـووم شـانازی پێـوە دەکـەم، لـەپێناوی ئایدیـاو ئامانجی بەرزدا تێکۆشاوم‌و خزمەتی گەل‌و نیشتمانم کـردووە. ئەوپـەڕی تـین‌و توانـی خۆمـم لـەرێی ئـەو شـتانەدا بـەخت کـرد کـە نـەوە دوای نـەوەی چینـی زەحمـەتکێش خەونیان پێوە بینـی‌و، لەمـەودواش ـ تـا بەدەسـتیان دەهێنـن ـ هـەر خـەونیان پێـوە دەبینن: بنیاتنانی ژیانێکی ئازادو کامەران کە دادپەروەریی راستەقینەی تێـدا بـالآ دەسـت بـی‌و، زۆرداری‌و رووتاندنـەوەو چەوسـاندنەوەی بەهـەموو جۆرەکانیـەوە تێـدا شوێنە ون بێ، واتە بنیاتنانی سۆشیالیزم.

هێندێکیـش لێـم دەپرسـن: داخـۆ جـارێکی دی دێمـەوە سـەر چـالاکی سیاسـی لەچوارچێوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا؟ دەلێم: من بەشی خۆم لەخەباتدا بەشـداریم کردو بەشەرەفەوە ئەرکەکانم راپەڕاند، بەبێ ئەوەی لەدژواری‌و قوربانی بترسم. مـنیش قەرزاری بزووتنەوەی کۆمۆنیستیم کـە بـەگیانی بوغزاندنـی زۆرداری‌و رووتاندنـەوەو داکۆکی لەمـافی زۆرلێکراوان‌و خۆشەویسـتی هـەموو مرۆڤـە باشـەکانی سـەر رووی زەوی پەروەردەی کردم. من ئینتەرناسیونالیست بووم‌و هـەروایش دەمێنمـەوە. گـەل‌و نیشتمانم‌و گەلان‌و نیشتمانانی دیکەیشم خۆش دەوێن‌و، هەموو شـێوە هـەلآواردنێك

لەنێوان مرۆڤەکاندا ـ بەهۆی جیاوازیی ئایین یا نەتەوە یا رەنگ.. هتد ـ رەت دەکەمەوە.

بەلاّم من هەست بەنیزیك بوونەوە لەو رۆژە دەکەم کە بەساڵدا چوون هەڵمدەپێچێ دەست لەئەنجامدانی چالاکیی حیزبی ـ سیاسی هەڵبگرم. لەو باوەڕەیشدام لەسایەی ئەم بارودۆخە نوێ باوەدا کاتی ئەوە هاتووە نەوەی لاوی هۆشیار ئالاّی پیرۆزی خەبات بگرێتە دەست و، ئەزموونی ئێمەو جۆش و خرۆش و ئەزموونی تایبەتی خۆی هەردوو تێکەڵ بەیەکدی بکات و، درێژە بەو کارە بدات کە نەوەکانی پێشوو دەستیان پێکرد. هەرچی منیش هەست دەکەم دەبێ پاشماوەی ووزەی خەباتگێڕانەم لەچوارچێوەی رێبازێکی دیموکراتیدا بۆ داکۆکی لەئازادی و مافی مرۆڤ لەکۆمەڵگایەکی دیموکراتی و شارستانیدا تەرخان بکەم کە ململانێی شێتانەی خوێناویی پڕ لەمەترسی و دڵە راوکەو وێرانکاریی تێدا دوایی پێ دێت.

خەون بەوەوە دەبینم ئەم کۆمەڵگایە ببینم ئاسەواری زمانی چەك و تیرۆرو بەندیخانەو راوەدوونانی تێدا نەماوە، ململانێی ئاشتی یانەو شارستانی یانەی خراوەتە جێ، کە سنووقی دەنگدانی تێدا دەبێ بەحەکەم و ئالاّی ئازادی و دیموکراسیی بەسەردا دەشەکێتەوەو، رەوشتی بەنرخ و پەسەند کراوی تێدا زاڵ دەبێ و، وشەی یاسایشی تێدا دەخرێتە سەرووی هەموو وشەیەك.

دانەر

کوردستانی عیراق ـ سلێمانی

تشرینی دووەمی ١٩٩١

# وتەیەك بۆ خوێنەران

ئەم بیرەوەریانەم تۆمار کرد تەنیا لەبەر ئەوە نا کە قەناعەتم بەنووسینیان هەیە، بەڵکو لەبەر داواکاریی و ئامۆژگاریی گەلێك لەهاورێکانم لەماوەی دە مانگی ۱۹۹۱ دا تەواوم کرد. بەپلەیەکی سەرەکی پشتم بەبیرو زەینی خۆم بەستووە، چونکە هەل و مەرجی سەختی پێشووی ژیانم دەرفەتی ئەوەی نەدەدام بیرەوەریی رۆژانەم تۆمار بکەم و بیان پارێزم. کە ئەم بیرەوەریانەیشم نووسی هەڵی ئەوەم بۆ نەڕەخسا بەبەڵگەنامە حیزبی‌یەکاندا بچمەوە، کە دەیانتوانی لەبیرکەوتنەوەی زۆر رووداوو وورد کردنەوەو لەسەر نووسینیان ـ بەشێوەیەکی درێژتر ـ یاریدەم بدەن. سوپاسی ئەو کەسە دەکەم هەر کامێك لەو بەڵگەنامانەم بۆ بنێرێ، کە لەوانەیە لەدەرکردنی چاپێکی دیکەی ئەم بیرەوەریانەدا بەکەڵك بن. لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بیرەوەریی تا ۱۹۸٤ یان گرتۆتەوە کە ساڵی جوێ بوونەوەمە لەحشع. ئومێد دەکەم لەپاشەرۆژدا دەرەتانی ئەوەم هەبێ لەسەر ساڵانی دواییش بنووسم.

خوێندەوار دەبینێ ئەم کتێبە بەرادەیەکی بنچینەیی باسی کاروباری حیزبی شیوعی و سیاسەت و خەڵکانی پێوەند دار دەکات. بەڵام من هەر بەباس کردنی ئەم رووداوانە دانەکەوتووم، بگرە لام لەرووداوە سەرنج راکێشەکانی دیکەش کردووەتەوە، چونکە من لەقەفەزێکی حیزبی ـ سیاسیدا نەژیاوم، بەڵکو لەم کۆمەڵگەیەداو لەنێو خەڵکدا بووم و، بایەخ و ئارەزووی خۆمم لەگەڵ قسەی نەستەق و ئەدەب و مۆسیقاو رابواردنی خاوێن و مەلەکردن و دارستان و شاخەوانی و دارتاشی و کشتوکاڵ و دا هەبووە. من دڵخۆش و خەمگین بووم، پێکەنیووم و گریاویشم، وەك چۆن ئەمە رێبازی ژیانە لای هەموو مرۆڤێکی ئاسایی.

هێندەی پێوەندیی بەگێڕانەوەی رووداوەکانەوە هەیە، دەتوانم جەخت بکەم کە من دەست و دڵ پاك بووم و بەئەنقەست نەکەوتوومە گۆڕانکاری و شێواندن، ئەگەر چی

نكوڵی لەوە ناكەم كە ڕەنگە شتم لەبیر چووبێ، لەكاتێكدا پشتم بەیادەوەری "الذاكرة" بەستووە كە لەوانەیە مرۆڤ بەهەڵەدا ببات. هەرچی پێوەندیی بەقسەكردن لەسەر ڕووداوەكانیشەوە هەیە، ئەوە جۆرەها هەڵوێستو ڕەفتاری كەسانو ڕێكخراوەكانم ڕیسوا كردوونو پشتگیریم لیٚ كردوونو ڕەخنەم لیٚ گرتوونو بەباشم زانیون.

من لەوەدا ـ وەكو ڕایەكی شەخسی ـ بەبیٚ ڕق هەڵگرتن لەهیچ كەسیٚ لەوانەی كە لەئیش كردندا هاوڕێیەتیم كردوونو لەسەر گەلێگ مەسەلە لەگەڵیاندا ناكۆك بووم، باری بەرپرسی دەخەمە سەر شانم. وەك مافی بەرپەرچدانەوەو ڕادەربڕین بەخۆم دەدەم، ئاوایش بەو كەسانەی دەدەم كە بیروڕایانم بەدڵ نیيە.

كاتێك ئەم بیرەوەریانە دەنووسم تەمەنی حیزبی ـ سیاسیم نزیكەی نیو سەدە دەبێتو، هەموویم بۆ ئەو ئایدیاو ئامانجە هەرە بەرزانە تەرخان كرد كە باوەڕم پیٚیان هەبووو دڵسووتەیان بوومو خەباتم بۆ كردن  بەڵیٚ، چەندەها ساڵ بەندیخانەو ئەشكەنجەكانیو ژیانی قورسی خۆشاردنەوەو ڕاوە دوونانی بەردەوامو دژواریی غەریبایەتیی دوور لەخۆشەویستانو وڵاتم لەپێناویاندا دەربرد. هەروەها ساڵەها لەچیاكانداو لەبەر بۆمبا بارانو هەڕەشەدا ژیاومو خۆمم ڕاگرتووە. سەرباری ئەوەی ئەوەم پیٚ نەبڕا سەركەوتنی ئەو مەسەلەیە ببینم كە گوڵی لاویمو هەموو ساڵانی ژیانمم بۆ تەرخان كرد، بەهیچ شێوەیەك پەشیمان نیم لەوەی كە كردم، بەڵكە ئەو شتەی تێدا دەبینم كە هەم مایەی شانازی بەخۆوە كردنی منەو هەم زوو بیٚ یا درەنگ بەرهەمی دەبیٚ.

من بۆ كێشەی گەلو خەڵك ژیام، نەك بۆ خۆم. تەواوی وزەی خۆمم خستە خزمەتی ئەوانەی كە سیستمێكی كۆمەڵایەتیی ستەمكاری لەسەر زۆرداریو ڕووتاندنەوەو چەوساندنەوە بنیات نراو زوڵمو زۆری لیٚ دەكردن. تا بژیم سوور دەبم لەسەر ئەو ئایدیاو پرنسیپە هەرە بەرزانە، پرنسیپی شێلگیرانە خەبات كردن

لەپێناوی رزگارکردنی کرێکاران‌و سەرجەم زەحمەتکێشانی کاری بیرو بازوو لەزۆرداری‌و رووتاندنەوەی چینایەتی‌و چەوساندنەوەی نەتەوەیی‌و سیاسی‌و، هەروایش دەمێنمەوە.

ئەوە بەڵگەی ناوێ کە من بەدرێژایی ساڵانی ژیانی تێکۆشانم جۆرەها چەوتی‌و هەڵەی فیکری‌و سیاسی‌و رێکخراوەییم کردوون. بەڵام خراپەم دەرهەق بەو ئایدیاو پرنسیپانە نەکرد کە باوەڕم پێیان هەبووو خەباتم بۆ کردن، قسەکانم پێچەوانەی کردەوەم نەبوون، هەرگیز هەوڵم نەداوە دەسەڵاتی شەخسیم یا پایەی حیزبی ـ سیاسیم بۆ ئیمتیازی شەخسی یا مەبستی تایبەت بەکاربهێنم، دوای پێشەوایەتی‌و خۆدەرخستنیش نەکەوتووم، بەڵکوو وەك سەربازێکی نەناسراو پێ داگریم لەسەر ئیش کردووەو، سوور بووم لەسەر پاکی‌و راست‌و رەوانیی سیاسی‌و، بەرژەوەندی گشتیم خستووەتە سەرووی بەرژەوەندی تایبەت. ئەمڕۆکە مایەی شەرەفە بۆ من کە پاش نێزیکەی نیو سەدە لەکاری حیزبی ـ سیاسی، لەم دنیایەدا جگە لەجل‌و بەرگی خۆم‌و شان‌و شکۆی شەخسیم‌و شەرەفی سیاسیی پارێزراوم، هیچ شتێکی دیکە شك نابەم.

لەرۆژێکدا جڵەوی رێبەرایەتیم لەحشع دا گرتە دەست کە لاوێکی شۆڕشگێڕی دڵگەرم‌و کەم ئەزموون‌و ئاستی رۆشنبیری نزم بووم، لەرۆژێکدا کە حیزب خۆیشی دووچاری تێشکانێکی سەخت بوو(١٩٤٨ ـ ١٩٤٩). ئەو ساڵانە کە سکرتێر بووم توانیم بەسەرکەوتوویی رێبەرایەتیی چالاکیی کۆمۆنیستەکان بکەم بۆ زاڵبوون بەسەر دژواریەکان‌و سەر لەنوێ بنیات نانەوەو هاتنەوە کۆڕی سیاسیی حیزب وەکوو حیزبێکی بەهێز. باکم لەوە نەبوو، کاتێك لەبەندیخانە بووم، لەپایەی رێبەرایەتی لادرام‌و، کە لەساڵانی ژیانی حیزبایەتیمدا لەسەر دەستی سەلام عادل‌و عەزیز الحاج‌و عەزیز محەمەدی هاوڕێیانم یەخەگیری سزای حیزبیی ناڕەواو کردەوەی توندوتیژ بووم.

من شەرەفی بەشداری کردنی چالاکانەم هەبوو لەرێبەرایەتی جموجۆڵەکانی حیزبدا، بەتایبەت لەو رۆژانی تەنگانەو ناڕەحەتیانەدا کە بەسەر بزووتنەوەی کۆمۆنیستیو دیموکراسیی عیراقدا هاتبوون.

لەگەرمەی خەباتدا گەلێك کتێبم خوێندنەوەو گوێم بۆزۆر موحازەرە راگرتو دەمەتەقێم لەسەر کێشە تیۆریو سیاسیەکان کردو لەسەر ئەدەبو سیاسەتم نووسیو رۆشنبیریی گشتیم پەرەپێداو، بەوە فێربوومو ئاستی فیکریم سەرخست. بەڵام خودی ژیان هەمیشە ئەو قوتابخانە بنچینەییە بوو کە لێوەی فێربووم. پاییزی ١٩٦٤ کە لەهەندەرانەوە هاتمەوە بۆ نیشتمان، بەخاڵێکی جوێکەرەوەی نێوان دوو قۆناخی ژیانی فیکری - سیاسیم دادەنێم، چونکە بێ کەمو زیاد لەم کاتەوە لەرووی فیکریو سیاسییەوە گەیشتمە تەمەنی کامڵ بوونو، خۆم گیرۆدەی گێچەڵی پشتگیری ئەو سیاسەتو هەڵوێستە چەوتانە نەکرد کە سەرەنجامەکەیان پەشیمانی بوو.

* * *

چارم ناچارە لەکاتێکدا منێکی چارەنووس بەچارەنووسی بزووتنەوەی کۆمۆنیستییەوە گرێ دراو - لەم وڵاتەو دەرەوەیدا - بیرەوەریەکانم دەنووسمەوە، دەبێ بەچەند قسەیەك لا لەو رووداوە تێژپەڕانەیش بکەمەوە کە بوونە هۆی رووخانی رژێمی حوکمی کۆمۆنیستەکان لەوڵاتانی ئەوروپاییو یەکێتی سۆڤێتو، بەوە سەرجەم بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهان کەوتە گێژاوی نسکۆیەکی قووڵو راستەقینەوە.

ئەمڕۆکە تێشکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی راستییەکە مشتومڕ هەڵناگرێ. جیهانی ئەمڕۆ لەهیی دوێنێ ناچێو، هاوسەنگیی هێزەکانی سەر شانۆی نێو دەوڵەتانی ئەمڕۆ - لەبنەڕەتدا - لەهیی دوێنێ جیاوازە. بەڵگە نەویستە کە رووداوێکی وا گەورە هەم ببێتە جێی مشتومڕێکی فراوان لەسەر ئاستی جیهانو، هەم باری سەرنجەکان لەسەر هۆو ئەنجامو رێگەکانی چارەسەری ناکۆك بن. پێم وایە

بارودۆخی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی - لەچەند لایەنێکی دیاری کراوەوە - لەبارودۆخی هەردوو دە ساڵی سەرەتای ئەم سەدەیەی بزووتنەوەکە دەچێ. بەڵام پڕوپاگەندەی بۆرجوازی هەوڵ دەدات وای بخاتە بەرچاو کە سەرمایەداری بۆ ئەوە هاتووەتە ئاراوە تاکوو تا سەر بمێنێتەوە، چونکە باشترین دەسکەوتی مرۆڤایەتی‌یە.

ئەمە تەنیا هاشەو هووشەیە. وەك چۆن ناکرێت شکانی قاچی پیاوێك - بەهۆی هەڵخلیسکانیەوە لەسەر پلیکانەوە - ببێ بەنیشانەی ئەوەی کە فلانەپیاوی ماڵەکەی دراوسێ چاکترین راکەری وڵاتە، ئاوایش ناگونجێت نسکۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بەبەڵگە دابنرێت بۆ ئەوە کە سیستمی سەرمایەداری لەهیی سۆشیالیستی باشترە. ئەم نسکۆیە ئێستاو لەمەودوایش خەوش‌و دژایەتیی رژێمی کۆمەڵایەتی - ئابووریی لەسەر پێوەندیی هێنانە بەرهەمی سەرمایەداری دامەزراوو لەبناغەدا لەسەر زۆرداری‌و رووتاندنەوەی چینایەتی بنیات نراو هەڵناوەشێنێتەوە کە هەق بەتاکە کەسێك دەدات خاوەنی ملیارها بێ‌و، لەهەمان کاتدا ملیۆنەها کەس ناچار دەکات تێکڕا لەهەل‌و مەرجی هەژاری‌و بێکاری‌و بێ بەشیدا بژین.

نسکۆی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئەو تاوانە چەپەڵانەی سەرمایەداریی ئیمپریالیستی(ی ئەوروپایی) ناسڕێتەوە کە چەندەها سەدە بەسەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر گەلانی وڵاتە جیاجیاکانداو بەتەشەنە پێ کردنی زۆرداریی کۆلۆنیالی تێیانداو بەتاڵان کردنی سامان‌و کۆسپ نانە بەردەم پێشکەوتنیان‌و رێی بەجێ هێنانی سەرداریی نیشتمانی لێ گرتنیان درێژەی کێشا.

نسکۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئەو راستی‌یە پووچەڵ ناکاتەوە کە ئەو سەرمایەداری‌یە گەلانی لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا بۆ نێو دۆزەخی دوو جەنگی جیهانی کوڵە پێچ کرد. سەرباری دەیان شەڕی ناوچەیی کە نەهامەتی‌و وێرانکاری‌یەکی لەژمارە نەهاتوویان بەسەر گەلاندا هێنا، بەکوشتن‌و شێواندنی سەدان هەزار بێ تاوانیشەوە لەرێگەی بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵ کوژ (ی ئەتۆمی‌و

کیمیایی)ی لەنێو دەوڵەتاندا قەدەغە کراو. ئەو راستی‌یەیش هەڵناوەشێنێتەوە کە سەرمایەداری سەرچاوەی بێکاری‌و هەژاریی ملیۆنەها خەڵکە لەناوچە جیاجیاکانی جیهاندا، لەکاتێکدا دەوڵەمەندەکان بڕێکی لەئەندازە بەدەر کەرەستەی خواردەمەنی لەنێو دەبەن تا نرخیان دانەبەزێت‌و ئاستی قازانجیان نەیێتە خوار.

نکوولی لەو واقعە ناکرێت کە سەردەمی سەرمایەداری هاوشانی پێشکەوتنێکی مەزن بوو لەزانست‌و تەکنیك وپەرەستاندنی ژیانی مرۆڤایەتی‌و بەدەست هێنانی بەرەوپێش چوونێکی گەورە لەبەرقەرارکردنی ئازادی‌یە دیموکراسیەکان‌و سەقامگیر کردنی مافەکانی مرۆڤدا ؛ بەڵام ئەم دەسکەوتانە وەکوو بەخشش لەرژێمی بۆرجوازی‌یەوە نەدران، بەڵکو بەدرێژایی چەندین سەدەی یەك لەدوای یەکی خەبات‌و قوربانی گەلان‌و وەك ئەنجامی پەرەستاندنی ژیان خۆیشی بەدەست هێندران. ئەگەر رژێمە بۆرجوازیەکان بەزۆری زۆردارەکی دان بەم دەسکەوتانەدا بنێن بۆ گەلەکانیان، ئەوا هێشتا هەوڵ دەدەن کەمیان بکەنەوەو فێڵیان تێدا بکەن‌و کۆسپ بخەنە ڕێی جێبەجێ کردنیان، لەکاتێکدا مەگەر بەدەگمەن دەنا پەنا دەباتە بەر ئاگرو ئاسن، تا نەهێڵێ گەلانی ولاتانی ژێر دەستەو پاشکەوتوو بەکاریان بهێنن.

ئەو بنچینە ماددی‌و گیانی‌یەی کە رژێمی بۆرجوازی لەسەر دادەمەزرێت بواری تەشەنەکردنی دادو هاوسانیی راستەقینەی نێو کۆمەڵگا نادات‌و، ناتوانێ ئاواتەکانی چینی زەحمەتکێش لەژیانی ئازادو خۆش گوزەران‌و پڕ کەرامەتدا بەدی بهێنێ. لەبەر ئەمەیە ناکۆکی‌یەکان دەمێننەوەو ململانێی چینایەتی درێژەی دەبێ، تا لەسەرەنجامدا سەرمایەداریی تێدا هەرەس دێنێ. دیارە ئەلتەرناتیڤی سروشتی‌و حەتمیی ئەو سۆشیالیزم دەبێ کە لەسەر دادوەری‌و هاوسانی بنیات دەنرێ‌و چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوەی تێدا ناهێڵرێ. ئەو ئەنجامەی کە مارکس‌و ئەنگلز لەسەر حەتمیەتی رووخانی سەرمایەداری‌و سەرکەوتنی سۆشیالیزم بەدەستیان هێنا، زانستێکە پشت بەلێکۆڵینەوەی رووداوەکانی مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی

دەبەستیێو لەسەر تێگەیشتنی قووڵی یاسا بابەتیەکانی جووڵانەوەی پەرەستاندنی کۆمەڵایەتی دامەزراوە. سیستمی سەرمایەداری هەر دەڕووخێ، وەك چۆن سیستمی فیودالێو پێشتریش سیستمی کۆیلایەتی رووخان. سۆشیالیزمیش پاشەرۆژی حەتمیی مرۆڤایەتییە، جا رێگەی پێگەیشتنی هەر کامێك بێ، چونکە ئەو سیستمەیە کە بەدەنگ ئاواتە رەواکانی ژیانی جەماوەرەوە دەچێ.

* * *

دیاردەی هەرەس هێنانی رژێمە سۆشیالیستەکانو نسکۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی جیهانی ترسناکترین رووداوە لەجیهانی نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا. لێدوان لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە دەستی پێکردووەو زۆریش درێژە دەکێشێ، بەر لەوەی بتوانرێت چەند وەڵامێکی لێ کۆڵدراوە بخرێتە بەرچاو کە هەر لەسنووری لێکدانەوەی رووداوەکەدا گیر نەبن، بەڵکوو رەنگی ئاقارەکانی بنیاتنانەوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیو دەستە بەرکردنی بووژانەوەی ئایندەی بڕێژن. من تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی مەنتیقیو تەواوم لەسەر ئەم رووداوە نەخوێندووەتەوە، نە هیی رێبەرانی حیزبە کۆمۆنیستە هەرەسهێناوەکانو نە هیی کەسانی دیکە. ئەو گوتارە رۆژنامەنووسییانەیش کە هێندێك نووسەرو ئایدۆلۆجیستی بۆرجوازی پێشکەشی دەکەن، لەدووپاتکردنەوەی ستایشی تەقلیدیی سیستمی بۆرجوازی دەچنو، بەژو باهو هەڵدانی نموونەی وەك گەربەچۆڤو یەڵتسن ـ کە رێبەریی پرۆسەکەیان روو بەهەرەس هێنان کرد ـ تەواوی دەکەن. نوێنەرانی چەپی توندڕەویش کە رووداوەکان لەقسەیەکدا کورت دەکەنەوە: " نە هیچ شۆڕشێکی سۆشیالیستی لەئارادا بووو نە هیچ رژێمێکی سۆشیالیستی"، لەرووی ئەنجامەوە لەگەڵ ئەواندا یەکدەگرنەوە.

لەراستیدا چەند شۆڕشێکی سۆشیالیستیو چەند رژێمێکی سۆشیالیستیش سەرباری گیروگرفتو نەخۆشیەکانیان هەبوون. شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ شۆڕشێکی سۆشیالیستیی راستەقینە بوو، کرێکارانو رەنجدەران بەرێبەریی حیزبی

بۆلشەوی لەدژی زۆرداریو چەوساندنەوەی چینایەتی بەرپایان کرد. لینینو بۆلشەویەکانو ئەو ملیۆنەها کرێکارو جووتیارو سەربازەی رووسیایش دووی وەهەم نەکەوتنو، کاتێك چوونە نێو سوپای مەزنی شۆڕشەوەو قوربانیی گەورە گەورەیان لەپێناودا بەخشی شێت نەبوون. وەختێك شۆڕشگێڕان لەرووسیاو چینو بولگاریاو یوگوسلاڤیاو لەپراگی ١٩٤٨ و شوێنانی دیکە بەیداخی سووریان هەڵگرتو لەخەباتی دژی قەیسەرو سەرمایەداو بۆ سۆشیالیزم دلێرییان نواند، دەبەنگ نەبوونو دەیانزانی چییان دەوێ. پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەریش ئەو ملیۆنەها کۆمۆنیستو ناکۆمۆنیستە لەوەهمدا نەدەژیان کاتێك دانیان بەوەدا نا کە سیستمێکی تازە لەدایك بوو، جیهان بوو بەدوو ئوردوگاو هاوسەنگی‌یەکی تازەی هێزەکان لەسەر شانۆی نێو دەوڵەتیدا پەیدا بوو، سۆشیالیزمی تازە کوورەیش بەشێوەی جۆراوجۆر بوونی خۆیی دەربڕیو خزمەتێکی شایانی کارگەرانی وڵاتەکانیانو جیهانی کردو گەورەترین هەڕەشەی بۆ ئیمپریالیزمو سەرمایەداری بەگشتی پێکهێنا. ئەوانە چەند راستی‌یەکی مێژوویین هەر جێگیر دەبن، با هێندێك کەس تا ئەمڕۆ نکوولی‌یان لێبکەن، بەتایبەت ئەوانەی کە وێنەیەکی خەیاڵیی سۆشیالیزمیان لەزەیندا کێشاوە، لەگوتەی جوانی نێو کتێبی یۆتۆپیی دوور لەواقیعی ژیانی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی‌یەوە رایانگواستووە.

ئەو راستی‌یەی کە دروست نی‌یە بیکەین بەژێر لێوەوە ئەوەیە سۆشیالیزمی تازە کوورە سەرەتا لەوڵا تێکی پاشکەوتوودا سەری هەڵدا. بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە جۆرەها خەوشو نەخۆشیی تایبەت بەپاشکەوتن لەگەڵ خۆدا هەڵبگرێ. واتە کە لەدایك بوو دووچاری نەخۆشیەکانی پاشکەوتن بوو بوو. ئەو نەخۆشیانەیش لەکاتی خۆیدا چارەسەر نەکران، بەڵکوو وازیان لێ هێندرا پەل بهاوێژنو ئاڵۆز بن، تا وای لێ هات قەوارەکەیان تێکشکاندو کێشایانەوە بۆ هەرەس هێنانی. رژێمە سۆشیالیستە ماوەکانی کۆریاو چینو کووباو هیندی چینی هەمان نەخۆشی

بەرۆکی گرتوونو، ئەگەر چارەسەری نەکەن هەمان چارەنووسیان دێتە ڕێ. جاران زۆر کەرەت دەنووسراو دەگوترا: گەڕانـەوە لەسۆشـیالیزمەوە بـۆ سـەرمایەداری کـارێکی مەحاڵە. بەڵام ئەمڕۆکە ژیان خۆیشی پەردەی لەرووی شـتێکی جیـاواز هەڵداوەتـەوە. گەڕانەوە کارێکی گونجاوە، بەتایبەت کاتێك ڕژێمە سۆشیالیستیەکە بەتەواوی بنیـات نەنرا بێ.

بێ گومان هەرەسهێنانی رژێمی حوکم لەیەکێتیی سۆڤیەتو ئەورووپای خۆرەلاتدا، نە بەڕێکەوتو نە ئەنجامی چالاکییەکی پیلانگێڕانەی هێندێك حوکم بەدەسـتی ئـەم دەوڵەتانە یان دەوڵەتانی خۆراوا بووە. بەڵکوو دەرەنجامی چەندین نەخۆشیی کوشـندە بوو کە ئەم رژێمانە ـ یا راستتر بڵێین ئەم حیزبە کۆمۆنیستە حوکمدارانـە ـ تووشـیان بوو کە لەگەڵ دابڕانو بوون بەدەزگایەکی بیرۆکراتی داسەپاوو پشت بەسـتوو بـەریو شوێنی سەرکوت کردنو پۆلیسی نهێنی. ئەم رژێمانە لەرەوتی پەرەستاندنیاندا بەدوو قونـاخی جیـاوازدا رەت بـوون: لەیەکـەمیاندا گـەلێك دەسـکەوتی راسـتەقینەیان بەکارگەران بەخشیو، لەقۆناخی دووەمیشیاندا جگە لەدروشمی بریقـەدارو بەرنامـەی کاغـەزینی بۆشـی مایـەی لـەجێی خـۆدا چەقین یا روو لـەنزمی کردنـی ئاسـتی گوزەرانی دانیشتوان، هیچی دیکەیان نەخستە بەردەست.

بەرای من گرنگترینی ئەو نەخۆشیانە لەم خاڵانەدا کورت دەکرێنەوە:

١- ترسـناکترین نەخۆشـی نـەبوونی دیموکراسـیو خنکـاندنی سـادەترین شـێوەی بەرهەڵستکردنو رەخنەو سەپاندنی پۆلیسی نـهێنی بەسـەر جـەماوەردا بـوون. وەهـا پێویست بوو دیموکراسی لەسایەی سۆشیالیزمدا بەرە بەرەو بـەردەوام بـۆ ئاسـتێکی بالاتر لەهیی کۆمەڵگـە بۆرجوازیـەکان پـەرە بسـتێنێ. وا داندرابـوو دەسـەڵات پلـە بەپلە لەدەسەلاتی چینی کرێکارانەوە بۆ دەسەلاتی هەموو گەل گەشـە بکـات. بـەڵام پێچەوانـەی ئـەوە رووی دا، چونکـە دەسـەڵاتی چینـی کرێکـاران بـوو بەدەسـەڵاتی حیـزبو، لەدەسـەلاتی حیزبـەوە بـوو بەدەسـەڵاتی (تۆتالیتـاری)ی کەسـانێکی

هەڵبژاردەو، لەدەسەڵاتی کەسانێکی هەڵبژاردەیشەوە بۆ دەسەڵاتی تاکە سەرکردە. لەبریی ئەوەی سیستمی تاکە حیزبی، هیچ نەبێ لەچوارچێوەی بەربەرەکانێی نێوان لایەنگرانی ڕژێمە کۆمەڵایەتیە تازەکەدا، بۆ سیستمی فرە حیزبی پەرە بستێنێ، کەچی دەوری ئەم تاکە حیزبەیش وەکوو حیزبێکی حوکمدار کەم کرایەوە یا بەکردەوە هەڵوەشێندرایەوەو، بەندیخانە بووە ماڵی هەموو کۆمۆنیستێك کە زاتی ئاشکرا کردنی ناکۆکیی فیکریی خۆیی کرد لەگەڵ سەرکردایەتیی بیرۆکراتی حیزب‌و دەوڵەتدا.

٢ ـ دیاردەی دەق پەرستی (النصية)و وشکە باوەڕی بەرادەیەك پەلیان هاویشت کە باوەڕی کۆمۆنیستییان لەگەڵدا بوو بەشێوە باوەڕێکی ئایینی ـ ئاسمانی. ئیدی هێندێك سەرکردە خرانە ڕیزی پێغەمبەران‌و پێشەوایانەوە، بەرهەمە نووسراوەکانیشیان خرانە خانەی کتێبە ئاسمانیە پیرۆزەکان، تا گوزارەو قسەیان لێ بخوازن بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ئاڵۆزترین پرسیارانەی کە هەل‌ومەرجە تازەکە خستنیە بەردەم حیزبە کۆمۆنیستە حوکمدارو حوکم لەدەستدا نەبوەکان، یان بۆ پێشکەشکردنی چارەسەری حازر بەدەست بۆ پڕ گرێ‌و گۆلترینی ئەو گیروگرفتە فیکری‌و سیاسیی‌و ئابووری‌و ڕێکخراوەییانەی کە ژیان ئەمڕۆکە لەهەل‌و مەرجێکی تەواو جیاواز لەکاتی تێدا نووسرانی ئەو گوزارەو قسانە هێنانیە گۆڕێ.

نا پەسەند ترین‌و ترسناکترین لایەنی نالەباری دیاردەی وشکە باوەڕی‌و هەرە زیان بەخشترینیان بۆ دۆزی سۆشیالیزم گواستنەوەی دەقاو دەقی ئەزموونی سۆڤێتی بوو بۆ ولاتانی ئەورووپای خۆرە لات، بەبێ لەبەرچاو گرتنی خسڵەتە مێژوویی‌و نەتەوەیی‌و کۆمەڵایەتیەکانی ئەو ولاتانە. ئەم دیاردەیە لەگەڵ میزاجی سەرکردە بیرۆکراتەکان‌و بەرژەوەندی شەخسیياندا هاوجووت بوو، چونکە بەهانەی ئەوەی دەدانێ ببنە " نوێنەری پێشەوایان " و بەدڵی خۆیان بجوولێنەوە.

٣- پێدەچێ شێوەی موڵکداریی هەڵبژێردراو لەم رژێمانەدا تا ماوەیەکی دیاریکراو گونجاو بوو بێ، چونکە ئاستی گوزەرانی کارگەران بەرزبووەوەو ئەندازەیەکی باشیان لەخزمەتگوزاریو دەستە بەریی کۆمەلآیەتی بۆ دابین کرا. بەلآم هێندەی نەخایاند بەهۆی درێژەدان بەهەمان تەرز لەموڵکداریو بەڕێوەبردنی ئابووریی نیشتمانییەوە ئەم ریۆ رەسمە ئاوە ژوو بووەوە. ئەمەیش کێشایەوە بۆ نەمانی هاندەری ماددیو هۆکاری بەریەرەکانی کە بۆ پەرەپێدانی چۆنایەتیو چەندایەتیی هێنانە بەرهەمو رۆیشتن شان بەشانی نوێترین پێشکەوتنی زانستی - تەکنیکی پێویستە. ئەوەی کە قەوما نەك هەر لەجێی خۆدا چەقینی هێنانە بەرهەمی پیشەسازی کشتوکاڵی بوو، بەڵکو هاتنە خوارەوەیشی بوو بۆ نزمترین ئاستو کارێکی کرد کرێکارانی وڵاتانی سۆشیالیستی بەخیلی بەهاوچینەکانیان ببەن لەوڵاتانی سەرمایەداردا لەبەر ئەوەی ئاستێکی چاکتری گوزەرانیان هەبوو. دەبوو پێچەوانەی ئەمە رووی بدابایە.

ئەوەیش قوڕەکەی خستتر کردەوە کە باری گرانی پاشکەوتنی ئابووریو نزم بوونەوەی ئاستی گوزەران ئەو کادێرانەی حیزبی کۆمۆنیستی حوکمدارو دەوڵەتی بیرۆکراتیان نەگرتەوە کە پایەی حیزبیو حکوومەتییان بەکار دەهێنا بۆ ئیمتیازی ناڕەواو بەردەوام بەخۆش گوزەرانیو لەنازو نیعمەتدا دەژیان. ئەم کارە نەك هەر ئەوانەی لەجەماوەر دابڕی، بگرە بووە جێی ناڕەزاییو بێزارییانو خودی رژێمی سۆشیالیستیشی دووره پەرێز کردو لەبەرچاوی خەڵکی خست. کارگەران سۆشیالیزمیان بۆ ئەوە ویست کە ژیانێکی خۆشترو چاکتریان لەهیی ژێر سایەی سەرمایەداری بۆ مسۆگەر بکاتو دیموکراسییەکی زیاتریشیان بۆ بهێنێتە دی نەك بەپێچەوانەوە.

٤- رووداوە مێژووییەکان حیزبی کۆمۆنیستی بۆلشەوییان لەنێو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیو کرێکاریی جیهاندا خستە جێو رێیەکی جیاو تایبەتو تەنانەت

# پێڕســـت

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

# وشەیەك بۆ خوێنەری چاپی كوردی

لەگەڵ پێشكەش كردنی ئەم بیرەوەریانەمدا بەزمانی كوردی حەز دەكەم بەخوێنەری بەڕێزی رابگەیەنم كە، ئەگەر چی مـن خـۆم كـوردم و دەشـتوانم بـەكوردی بنووسـم، بـەزمانی عـەرەبی نووسیمەو بڵاووم كردەوە، دۆستێكی بەڕێز وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە بۆ كوردی گرتە ئەستۆی خۆی.

بەداخەوە نەمتوانی هەموو ئەو بەشـەی كـە لـەچاپی عـەرەبیدا هەیـە و هـەتا سـاڵی ١٩٨٤ دەگرێتەوە بەیەك جەڵدی كوردی چاپ بكەم چونكە لـەبارودۆخی ئـەمڕۆی وڵاتـدا چـاپ كردنـی كتێبێكی ٦٥٠ لاپەڕەیی شتێكی ئاسان نیە. بەهیوام پاش چاپ كردنی ئەم بەشـە بەماوەیـەكی كورت بەشەكەی تریشی چاپ بكرێ. دیارە ئارەزوومەندیشم كە بیرەوەری ساڵانی پاش ١٩٨٤یش بنووسم، ئەگەر چی ئەمە بۆ من كارێكی ئاسان نیە.

ئەم بیرەوەریانەم تەرخان نەكراوە بۆ باسی بارودۆخی كوردستان و كێشەی كورد چونكـە مـن لەسەر ئاستی عیراق خەباتم كردووە، بەسـەرجەمی كـورد و عـەرەب و كەمایەتیەكانیـەوە، نـەك لەسەر ئاستی كوردستان بەتەنها. بەڵام هێندەی پێوەندی بەسیاسەتی حیزبی شـیوعی عیراقـەوە هەبێ خاڵە گرنگەكانم سەبارەت بەمەسەلەی كورد خستۆتە بەر باس، چ لەرووی ئیجابییەوە بێ چ سەلبی. ئاشكرایە كە لەماوەی چارەكە سـەدەیەكدا ح ش ع گـەورەترین و كاریگـەرترین حـیزبی سیاسی عیراق بوو. جا ئەو كەسەی كە بیەوێ بەشێوەیەكی بابەتیانە لەمێژووی ٥٠ ـ ٦٠ سـاڵی رابوردووی بزافی رزگاریخوای كوردی عیراق بگات دەبـێ بەباشـی لـەهێڵ و هەڵوێسـتی ح ش ع بگات بەرانبەر وەزعی كورد و كوردستانی ئەو سەردەمە.

خۆشحاڵ دەبم بەوەرگرتنی هەر راوبۆچوون و تێبینیەك لەسـەر نـاوەڕۆك و رووداوەكـانی ئـەم كتێبە، بەتایبەتی لەلایەن ئەو خوێنەرانەوە كە هاوچەرخی ئـەو رووداوانـە بـوون كـە باسـیان لێ كراوە.

بەهیوام بەبڵاوكردنەوەی ئەم بیرەوەریانە توانیبێتم شتێكی نوێ بخەمە نێو كتێبخانەی كوردی كە بەداخەوە هێشتا هەژارە.

كوردستانی عیراق — دانەر

٢٠٠١/٦/٤ — بەهادین نوری

هێندێك كەس لێم دەپرسن ئاخۆ پەشیمان نیم لەوەی كـە هـەرەتی لاویو سـالآنی تەمەنم لەنێو بزووتنەوەی كۆمۆنیستیدا بەسەر برد، كە ئەمڕۆكە بـەلای زۆر كەسـەوە لەوە دەچێ تووشی نشوستییەك بوو بێ هەسـتانەوەی بـۆ نـەبێ؟ لـەوەلآمدا دەڵێـم: من كارێكی وام نەكردووە لێی پەشیمان بمو، كاری سیاسیم بۆ پـەیدا كردنـی پلـەو پایەو دەوڵەمەندی نـەبووە. هـەرچی بـووم شـانازی پێـوە دەكـەم، لـەپێناوی ئایدیـاو ئامانجی بەرزدا تێكۆشاومو خزمەتی گەلو نیشتمانم كـردووە. ئەوپـەڕی تـینو توانـی خۆمـم لـەرێی ئـەو شـتانەدا بـەخت كـرد كـە نـەوە دوای نـەوەی چینـی زەحمـەتكێش خەونیان پێوە بینـیو، لەمـەودواش ـ تـا بەدەسـتیان دەهێنـن ـ هـەر خـەونیان پێـوە دەبینن: بنیاتنانی ژیانێكی ئازادو كامەران كە دادپەروەریی راستەقینەی تێـدا بـالآ دەسـت بـێو، زۆرداریو رووتاندنـەوەو چەوساندنەوەی بەهـەموو جۆرەكانیـەوە تێـدا شوێنە ون بێ، واتە بنیاتنانی سۆشیالیزم.

هێندێكیـش لێـم دەپرسـن: داخـۆ جـارێكی دی دێمـەوە سەر چـالاكی سیاسـی لەچوارچێوەی بزووتنەوەی كۆمۆنیستیدا؟ دەڵێم: من بەشی خۆم لەخەباتدا بەشـداریم كردو بەشەرەفەوە ئەركەكانم راپەڕاند، بەبێ ئەوەی لەدژواریو قوربانی بترسم. منیش قەرزاری بزووتنەوەی كۆمۆنیستیم كـە بـەگیانی بوغزاندنـی زۆرداریو رووتاندنـەوەو داكۆكی لەمافی زۆرلێكراوانو خۆشەویسـتی هـەموو مرۆڤـە باشـەكانی سـەر رووی زەوی پەروەردەی كردم. من ئینتەرناسیونالیست بوومو هـەروایش دەمێنمـەوە. گـەلو نیشتمانمو گەلانو نیشتمانانی دیكەیشم خۆش دەوێنو، هەموو شـێوە هـەلآواردنێك

## پێڕست

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

# وشەیەك بۆ خوێنەری چاپی كوردی

لەگەڵ پێشكەش كردنی ئەم بیرەوەریانەمدا بەزمانی كوردی حەز دەكەم بەخوێنەری بەڕێزی رابگەیەنم كە، ئەگەر چی من خۆم كوردم و دەشتوانم بەكوردی بنووسم، بەزمانی عەرەبی نووسیم‌و بلاّووم كردەوە، دۆستێكی بەڕێز وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە بۆ كوردی گرتە ئەستۆی خۆی.

بەداخەوە نەمتوانی هەموو ئەو بەشەی كە لەچاپی عەرەبیدا هەیە و هەتا ساڵی ۱۹۸٤ دەگرێتەوە بەیەك جەڵدی كوردی چاپ بكەم چونكە لەبارودۆخی ئەمڕۆی ولاّتدا چاپ كردنی كتێبێكی ٦٥٠ لاپەڕەیی شتێكی ئاسان نیە. بەهیوام پاش چاپ كردنی ئەم بەشە بەماوەیەكی كورت بەشەكەی تریشی چاپ بكرێ. دیارە ئارەزوومەندیشم كە بیرەوەری ساڵانی پاش ۱۹۸٤یش بنووسم، ئەگەر چی ئەمە بۆ من كارێكی ئاسان نیە.

ئەم بیرەوەریانەم تەرخان نەكراوە بۆ باسی بارودۆخی كوردستان و كێشەی كورد چونكە من لەسەر ئاستی عیراق خەباتم كردووە، بەسەرجەمی كورد و عەرەب و كەمایەتیەكانیەوە، نەك لەسەر ئاستی كوردستان بەتەنها. بەلاّم هێندەی پێوەندی بەسیاسەتی حیزبی شیوعی عیراقەوە هەبێ خاڵە گرنگەكانم سەبارەت بەمەسەلەی كورد خستۆتە بەر باس، چ لەرووی ئیجابییەوە بێ چ سەلبی. ئاشكرایە كە لەماوەی چارەكە سەدەیەكدا ح ش ع گەورەترین و كاریگەرترین حیزبی سیاسی عیراق بوو. جا ئەو كەسەی كە بیەوێ بەشێوەیەكی بابەتیانە لەمێژووی ٥٠ ـ ٦٠ ساڵی رابوردووی بزافی رزگاریخوای كوردی عیراق بگات دەبێ بەباشی لەهێڵ و هەڵوێستی ح ش ع بگات بەرانبەر وەزعی كورد و كوردستانی ئەو سەردەمە.

خۆشحاڵ دەبم بەوەرگرتنی هەر راوبۆچوون و تێبینیەك لەسەر ناوەڕۆك و رووداوەكانی ئەم كتێبە، بەتایبەتی لەلایەن ئەو خوێنەرانەوە كە هاوچەرخی ئەو رووداوانە بوون كە باسیان لێ كراوە.

بەهیوام بەبلاّوكردنەوەی ئەم بیرەوەریانە توانیبێتم شتێكی نوێ بخەمە نێو كتێبخانەی كوردی كە بەداخەوە هێشتا هەژارە.

كوردستانی عیراق — دانەر

۲۰۰۱/٦/٤ — بەهادین نوری

هێندێك كەس لێم دەپرسن ئاخۆ پەشیمان نیم لەوەی كە هەرەتی لاوی‌و ساڵانی تەمەنم لەنێو بزووتنەوەی كۆمۆنیستیدا بەسەر برد، كە ئەمڕۆكە بەلای زۆر كەسەوە لەوە دەچێ تووشی نشوستی‌یەك بوو بێ هەستانەوەی بۆ نەبێ؟ لەوەلامدا دەڵێم: من كارێكی وام نەكردووە لێی پەشیمان بم‌و، كاری سیاسیم بۆ پەیدا كردنی پلەو پایەو دەوڵەمەندی نەبووە. هەرچی بووم شانازی پێوە دەكەم، لەپێناوی ئایدیاو ئامانجی بەرزدا تێكۆشاوم‌و خزمەتی گەل‌و نیشتمانم كردووە. ئەوپەڕی تین‌و توانی خۆمم لەڕێی ئەو شتانەدا بەخت كرد كە نەوە دوای نەوەی چینی زەحمەتكێش خەونیان پێوە بینیی‌و، لەمەودواش - تا بەدەستیان دەهێنن - هەر خەونیان پێوە دەبینن: بنیاتنانی ژیانێكی ئازادو كامەران كە دادپەروەریی راستەقینەی تێدا باڵادەست بێ‌و، زۆرداری‌و رووتاندنەوەو چەوساندنەوەی بەهەموو جۆرەكانیەوە تێدا شوێنە ون بێ، واتە بنیاتنانی سۆشیالیزم.

هێندێكیش لێم دەپرسن: داخۆ جارێكی دی دێمەوە سەر چالاكی سیاسی لەچوارچێوەی بزووتنەوەی كۆمۆنیستیدا؟ دەڵێم: من بەشی خۆم لەخەباتدا بەشداریم كردو بەشەرەفەوە ئەركەكانم راپەڕاند، بەبێ ئەوەی لەدژواری‌و قوربانی بترسم. منیش قەرزاری بزووتنەوەی كۆمۆنیستیم كە بەگیانی بوغزاندنی زۆرداری‌و رووتاندنەوەو داكۆكی لەمافی زۆرلێكراوان‌و خۆشەویستی هەموو مرۆڤە باشەكانی سەر رووی زەوی پەروەردەی كردم. من ئینتەرناسیونالیست بووم‌و هەروایش دەمێنمەوە. گەل‌و نیشتمانم‌و گەلان‌و نیشتمانانی دیكەیشم خۆش دەوێن‌و، هەموو شێوە هەڵاواردنێك

لەنێوان مرۆڤەکاندا ـ بەهۆی جیاوازیی ئایین یا نەتەوە یا رەنگ.. هتد ـ رەت دەکەمەوە.

بەلاّم من هەست بەنیزیک بوونەوە لەو رۆژە دەکەم کە بەسالّدا چوون هەلّمدەپێچێ دەست لەئەنجامدانی چالاکیی حیزبی ـ سیاسی هەلّبگرم. لەو باوەڕەیشدام لەسایەی ئەم بارودۆخە نوێ باوەدا کاتی ئەوە هاتووە نەوەی لاوی هۆشیار ئالاّی پیرۆزی خەبات بگرێتە دەستو، ئەزموونی ئێمەو جۆشو خرۆشو ئەزموونی تایبەتی خۆی هەردوو تێکەلّ بەیەکدی بکاتو، درێژە بەو کارە بدات کە نەوەکانی پێشوو دەستیان پێکرد. هەرچی منیش هەست دەکەم دەبێ پاشماوەی ووزەی خەباتگێڕانەم لەچوارچێوەی رێبازێکی دیموکراتیدا بۆ داکۆکی لەئازادیو مافی مرۆڤ لەکۆمەلّگایەکی دیموکراتیو شارستانیدا تەرخان بکەم کە ململانێی شێتانەی خوێناویی پڕ لەمەترسیو دلّە راوکەو وێرانکاریی تێدا دوایی پێ دێت.

خەون بەوەوە دەبینم ئەم کۆمەلّگایە ببینم ئاسەواری زمانی چەکو تیرۆرو بەندیخانەو راوەدوونانی تێدا نەماوە، ململانێی ئاشتییانەو شارستانییانەی خراوەتە جێ، کە سنووقی دەنگدانی تێدا دەبێ بەحەکەمو ئالاّی ئازادیو دیموکراسیی بەسەردا دەشەکێتەوەو، رەوشتی بەنرخو پەسەند کراوی تێدا زالّ دەبێو، وشەی یاسایشی تێدا دەخرێتە سەرووی هەموو وشەیەک.

دانەر

کوردستانی عیراق ـ سلێمانی

تشرینی دووەمی ١٩٩١

# وتەیەك بۆ خوێنەران

ئەم بیرەوەریانەم تۆمار کرد تەنیا لەبەر ئەوە نا کە قەناعەتم بەنووسینیان هەیە، بەڵکو لەبەر داواکاریی‌و ئامۆژگاریی گەلێك لەهاورێکانم لەماوەی دە مانگی ١٩٩١ دا تەواوم کرد. بەپلەیەکی سەرەکی پشتم بەبیرو زەینی خۆم بەستووە، چونکە هەل‌و مەرجی سەختی پێشووی ژیانم دەرفەتی ئەوەی نەدەدام بیرەوەریی رۆژانەم تۆمار بکەم‌و بیان پارێزم. کە ئەم بیرەوەریانەیشم نووسی هەڵی ئەوەم بۆ نەرەخسا بەبەڵگەنامە حیزبی‌یەکاندا بچمەوە، کە دەیانتوانی لەبیرکەوتنەوەی زۆر رووداوو وورد کردنەوەو لەسەر نووسینیان - بەشێوەیەکی درێژتر - یاریدەم بدەن. سوپاسی ئەو کەسە دەکەم هەر کامێك لەو بەڵگەنامانەم بۆ بنێرێ، کە لەوانەیە لەدەرکردنی چاپێکی دیکەی ئەم بیرەوەریانەدا بەکەڵك بن. لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بیرەوەریی تا ١٩٨٤ یان گرتۆتەوە کە ساڵی جویٚ بوونەوەمە لەحشع. ئومێد دەکەم لەپاشەرۆژدا دەرەتانی ئەوەم هەبیٚ لەسەر ساڵانی دواییش بنووسم.

خوێندەوار دەبینیٚ ئەم کتێبە بەرادەیەکی بنچینەیی باسی کاروباری حیزبی شیوعی‌و سیاسەت‌و خەڵکانی پێوەند دار دەکات. بەڵاّم من هەر بەباس کردنی ئەم رووداوانە دانەکەوتووم، بگرە لام لەرووداوە سەرنج راکێشەکانی دیکەش کردووەتەوە، چونکە من لەقەفەزێکی حیزبی - سیاسیدا نەژیاوم، بەڵکو لەم کۆمەڵگەیەداو لەنێو خەڵکدا بووم‌و، بایەخ‌و ئارەزووی خۆمم لەگەڵ قسەی نەستەق‌و ئەدەب‌و مۆسیقاو رابواردنی خاوێن‌و مەلەکردن‌و دارستان‌و شاخەوانی‌و دارتاشی‌و کشتوکاڵ‌و دا هەبووە. من دڵخۆش‌و خەمگین بووم، پێکەنیووم‌و گریاویشم، وەك چۆن ئەمە رێبازی ژیانە لای هەموو مرۆڤێکی ئاسایی.

هێندەی پێوەندیی بەگێڕانەوەی رووداوەکانەوە هەیە، دەتوانم جەخت بکەم کە من دەست‌و دڵ پاك بووم‌و بەئەنقەست نەکەوتوومە گۆڕانکاری‌و شێواندن، ئەگەر چی

نکوڵی لەوە ناکەم کە ڕەنگە شتم لەبیر چووبێ، لەکاتێکدا پشتم بەیادەوەری "الذاکرة" بەستووە کە لەوانەیە مرۆڤ بەهەڵەدا ببات. هەرچی پێوەندیی بەقسەکردن لەسەر ڕووداوەکانیشەوە هەیە، ئەوە جۆرەها هەڵوێستو ڕەفتاری کەسانو ڕێکخراوەکانم ڕیسوا کردوونو پشتگیریم لێ کردوونو ڕەخنەم لێ گرتوونو بەباشم زانیون.

من لەوەدا ـ وەکو ڕایەکی شەخسی ـ بەبێ ڕق هەڵگرتن لەهیچ کەسێ لەوانەی کە لەئیش کردندا هاوڕێیەتیم کردوونو لەسەر گەلێک مەسەلە لەگەڵیاندا ناکۆك بووم، باری بەرپرسی دەخەمە سەر شانم. وەك مافی بەرپەرچدانەوەو ڕادەربڕین بەخۆم دەدەم، ئاوایش بەو کەسانەی دەدەم کە بیروڕایانم بەدڵ نی‌یە.

کاتێك ئەم بیرەوەریانە دەنووسم تەمەنی حیزبی ـ سیاسیم نزیکەی نیو سەدە دەبێتو، هەموویم بۆ ئەو ئایدیاو ئامانجە هەرە بەرزانە تەرخان کرد کە باوەڕم پێیان هەبووو دڵسووتەیان بوومو خەباتم بۆ کردن بەڵێ، چەندەها ساڵ بەندیخانەو ئەشکەنجەکانیو ژیانی قورسی خۆشاردنەوەو ڕاوە دوونانی بەردەوامو دژواریی غەریبایەتیی دوور لەخۆشەویستانو وڵاتم لەپێناویاندا دەربرد. هەروەها ساڵەها لەچیاکانداو لەبەر بۆمبا بارانو هەڕەشەدا ژیاومو خۆمم ڕاگرتووە. سەرباری ئەوەی ئەوەم پێ نەبڕا سەرکەوتنی ئەو مەسەلەیە ببینم کە گوڵی لاویمو هەموو ساڵانی ژیانمم بۆ تەرخان کرد، بەهیچ شێوەیەك پەشیمان نیم لەوەی کە کردم، بەڵکە ئەو شتەی تێدا دەبینم کە هەم مایەی شانازی بەخۆوە کردنی منەو هەم زوو بێ یا درەنگ بەرهەمی دەبێ.

من بۆ کێشەی گەلو خەڵك ژیام، نەك بۆ خۆم. تەواوی وزەی خۆمم خستە خزمەتی ئەوانەی کە سیستمێکی کۆمەڵایەتیی ستەمکاری لەسەر زۆرداریو ڕووتاندنەوەو چەوساندنەوە بنیات نراو زوڵمو زۆری لێ دەکردن. تا بژیم سوور دەبم لەسەر ئەو ئایدیاو پرنسیپە هەرە بەرزانە، پرنسیپی شێلگیرانە خەبات کردن

لەپێناوی رزگارکردنی کرێکاران‌و سەرجەم زەحمەتکێشانی کاری بیرو بازوو لەزۆرداری‌و رووتاندنەوەی چینایەتی‌و چەوساندنەوەی نەتەوەیی‌و سیاسی‌و، هەروایش دەمێنمەوە.

ئەوە بەڵگەی ناوێ کە من بەدرێژایی ساڵانی ژیانی تێکۆشانم جۆرەها چەوتی‌و هەڵەی فیکری‌و سیاسی‌و رێکخراوەییم کردوون. بەڵام خراپەم دەرهەق بەو ئایدیاو پرنسیپانە نەکرد کە باوەڕم پێیان هەبووو خەباتم بۆ کردن، قسەکانم پێچەوانەی کردەوەم نەبوون، هەرگیز هەوڵم نەداوە دەسەڵاتی شەخسیم یا پایەی حیزبی - سیاسیم بۆ ئیمتیازی شەخسی یا مەبستی تایبەت بەکاربهێنم، دوای پێشەوایەتی‌و خۆدەرخستنیش نەکەوتووم، بەڵکوو وەك سەربازێکی نەناسراو پێ داگریم لەسەر ئیش کردووەو، سوور بووم لەسەر پاکی‌و راست‌و رەوانیی سیاسی‌و، بەرژەوەندی گشتیم خستووەتە سەرووی بەرژەوەندی تایبەت. ئەمڕۆکە مایەی شەرەفە بۆ من کە پاش نێزیکەی نیو سەدە لەکاری حیزبی - سیاسی، لەم دنیایەدا جگە لەجل‌و بەرگی خۆم‌و شان‌و شکۆی شەخسیم‌و شەرەفی سیاسیی پارێزراوم، هیچ شتێکی دیکە شك نابەم.

لەرۆژێکدا جڵەوی رێبەرایەتیم لەحشع دا گرتە دەست کە لاوێکی شۆڕشگێڕی دڵگەرم‌و کەم ئەزموون‌و ئاستی رۆشنبیری نزم بووم، لەرۆژێکدا کە حیزب خۆیشی دووچاری تێشکانێکی سەخت بوو(١٩٤٨ - ١٩٤٩). ئەو ساڵانە کە سکرتێر بووم توانیم بەسەرکەوتوویی رێبەرایەتیی چالاکیی کۆمۆنیستەکان بکەم بۆ زاڵبوون بەسەر دژواریەکان‌و سەر لەنوێ بنیات نانەوەو هاتنەوە کۆڕی سیاسیی حیزب وەکوو حیزبێکی بەهێز. باکم لەوە نەبوو، کاتێك لەبەندیخانە بووم، لەپایەی رێبەرایەتی لادرام‌و، کە لەساڵانی ژیانی حیزبایەتیمدا لەسەر دەستی سەلام عادل‌و عەزیز الحاج‌و عەزیز محەمەدی هاوڕێیانم یەخەگیری سزای حیزبیی ناڕەواو کردەوەی توندوتیژ بووم.

من شەرەفی بەشداری کردنی چالاکانەم هەبوو لەرێبەرایەتی جموجوڵەکانی حیزبدا، بەتایبەت لەو ڕۆژانی تەنگانەو نارەحەتیانەدا کە بەسەر بزووتنەوەی کۆمۆنیستی‌و دیموکراسیی عیراقدا هاتبوون.

لەگەرمەی خەباتدا گەلێك کتێبم خوێندنەوەو گوێم بۆزۆر موحازەرە ڕاگرت‌و دەمەتەقێم لەسەر کێشە تیۆری‌و سیاسیەکان کردو لەسەر ئەدەب‌و سیاسەتم نووسی‌و ڕۆشنبیریی گشتیم پەرەپێداو، بەوە فێربووم‌و ئاستی فیکریم سەرخست. بەڵام خودی ژیان هەمیشە ئەو قوتابخانە بنچینەییە بوو کە لێوەی فێربووم. پایزی ١٩٦٤ کە لەهەندەرانەوە هاتمەوە بۆ نیشتمان، بەخاڵێکی جوێکەرەوەی نێوان دوو قۆناخی ژیانی فیکری ـ سیاسیم دادەنێم، چونکە بێ کەم‌و زیاد لەم کاتەوە لەرووی فیکری‌و سیاسی‌یەوە گەیشتمە تەمەنی کامڵ بوون‌و، خۆم گیرۆدەی گێچەڵی پشتگیری ئەو سیاسەت‌و هەڵوێستە چەوتانە نەکرد کە سەرەنجامەکەیان پەشیمانی بوو.

* * *

چارم ناچارە لەکاتێکدا منێکی چارەنووس بەچارەنووسی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی‌یەوە گرێ دراو ـ لەم وڵاتەو دەرەوەیدا ـ بیرەوەریەکانم دەنووسمەوە، دەبێ بەچەند قسەیەك لا لەو رووداوە تێژپەڕانەیش بکەمەوە کە بوونە هۆی رووخانی رژێمی حوکمی کۆمۆنیستەکان لەولاتانی ئەوروپایی‌و یەکێتی سۆڤێت‌و، بەوە سەرجەم بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهان کەوتە گێژاوی نسکۆیەکی قووڵ‌و راستەقینەوە.

ئەمڕۆکە تێشکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی راستی‌یەکە مشتومر هەڵناگرێ. جیهانی ئەمڕۆ لەهیی دوێنێ ناچێ‌و، هاوسەنگیی هێزەکانی سەر شانۆی نێو دەوڵەتانی ئەمڕۆ ـ لەبنەڕەتدا ـ لەهیی دوێنێ جیاوازە. بەڵگە نەویستە کە رووداوێکی وا گەورە هەم ببێتە جێی مشتومرێکی فراوان لەسەر ئاستی جیهان‌و، هەم باری سەرنجەکان لەسەر هۆو ئەنجام‌و رێگەکانی چارەسەری ناکۆك بن. پێم وایە

بارودۆخی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ـ لەچەند لایەنێکی دیاری کراوەوە ـ لەبارودۆخی هەردوو دە ساڵی سەرەتای ئەم سەدەیەی بزووتنەوەکە دەچێ. بەلاّم پڕوپاگەندەی بۆرجوازی هەوڵ دەدات وای بخاتە بەرچاو کە سەرمایەداری بۆ ئەوە هاتووەتە ئاراوە تاکوو تا سەر بمێنێتەوە، چونکە باشترین دەسکەوتی مرۆڤایەتی یە.

ئەمە تەنیا هاشەو هووشەیە. وەك چۆن ناکرێت شکانی قاچی پیاوێك ـ بەهۆی هەڵخلیسکانیەوە لەسەر پلیکانەوە ـ ببێ بەنیشانەی ئەوەی کە فلانەپیاوی ماڵەکەی دراوسێ چاکترین راکەری وڵاتە، ئاوایش ناگونجێت نسکۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بەبەڵگە دابنرێت بۆ ئەوە کە سیستمی سەرمایەداری لەهیی سۆشیالیستی باشترە. ئەم نسکۆیە ئێستاو لەمەودوایش خۆش‌و دژایەتیی رژێمی کۆمەلاّیەتی ـ ئابووریی لەسەر پێوەندیی هێنانە بەرهەمی سەرمایەداری دامەزراوو لەبناغەدا لەسەر زۆرداری‌و رووتاندنەوەی چینایەتی بنیات نراو هەڵناوەشێنێتەوە کە هەق بەتاکە کەسێك دەدات خاوەنی ملیارها بێ‌و، لەهەمان کاتدا ملیۆنەها کەس ناچار دەکات تێکڕا لەهەڵ‌و مەرجی هەژاری‌و بێکاری‌و بێ بەشیدا بژین.

نسکۆی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئەو تاوانە چەپەلاّنەی سەرمایەداریی ئیمپریالیستی(ی ئەورووپایی) ناسڕێتەوە کە چەندەها سەدە بەسەپاندنی دەسەلاّتی خۆی بەسەر گەلانی وڵاتە جیاجیاکانداو بەتەشەنە پێ کردنی زۆرداریی کۆلۆنیالی تێیانداو بەتالاّن کردنی سامان‌و کۆسپ نانە بەردەم پێشکەوتنیان‌و رێی بەجێ هێنانی سەرداریی نیشتمانی لێ گرتنیان درێژەی کێشا.

نسکۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئەو راستی‌یە پووچەڵ ناکاتەوە کە ئەو سەرمایەداری‌یە گەلانی لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا بۆ نێو دۆزەخی دوو جەنگی جیهانی کولّە پێچ کرد. سەرباری دەیان شەڕی ناوچەیی کە نەهامەتی‌و وێرانکاری‌یەکی لەژمارە نەهاتوویان بەسەر گەلاندا هێنا، بەکوشتن‌و شێواندنی سەدان هەزار بێ تاوانیشەوە لەرێگەی بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵ کوژ (ی ئەتۆمی‌و

کیمیایی)ی لەنێو دەوڵەتاندا قەدەغە کراو. ئەو راستی‌یەیش هەڵناوەشێنێتەوە کە سەرمایەداری سەرچاوەی بێکاری‌و هەژاریی ملیۆنەها خەڵکە لەناوچە جیاجیاکانی جیهاندا، لەکاتێکدا دەوڵەمەندەکان بڕێکی لەئەندازە بەدەر کەرەستەی خواردەمەنی لەنێو دەبەن تا نرخیان دانەبەزێت‌و ئاستی قازانجیان نەیێتە خوار.

نکوولی لەو واقعە ناکرێت کە سەردەمی سەرمایەداری هاوشانی پێشکەوتنێکی مەزن بوو لەزانست‌و تەکنیك وپەرەستاندنی ژیانی مرۆڤایەتی‌و بەدەست هێنانی بەرەوپێش چوونێکی گەورە لەبەرقەرارکردنی ئازادی‌یە دیموکراسیەکان‌و سەقامگیر کردنی مافەکانی مرۆڤدا ؛ بەلاّم ئەم دەسکەوتانە وەکوو بەخشش لەرژیمی بۆرجوازی‌یەوە نەدران، بەڵکو بەدرێژایی چەندین سەدەی یەك لەدوای یەکی خەبات‌و قوربانی گەلان‌و وەك ئەنجامی پەرەستاندنی ژیان خۆیشی بەدەست هێندران. ئەگەر رژێمە بۆرجوازیەکان بەزۆری زۆردارەکی دان بەم دەسکەوتانەدا بنێن بۆ گەلەکانیان، ئەوا هێشتا هەوڵ دەدەن کەمیان بکەنەوەو فێڵیان تێدا بکەن‌و کۆسپ بخەنە رێی جێ‌بەجێ کردنیان، لەکاتێکدا مەگەر بەدەگمەن دەنا پەنا دەباتە بەر ئاگرو ئاسن، تا نەهێڵێ گەلانی ولاّتانی ژێر دەستەو پاشکەوتوو بەکاریان بهێنن.

ئەو بنچینە ماددی‌و گیانی‌یەی کە رژێمی بۆرجوازی لەسەر دادەمەزرێت بواری تەشەنەکردنی دادو هاوسانیی راستەقینەی نێو کۆمەڵگا نادات‌و، ناتوانێ ئاواتەکانی چینی زەحمەتکێش لەژیانی ئازادو خۆش گوزەران‌و پڕ کەرامەتدا بەدی بهێنێ. لەبەر ئەمەیە ناکۆکی‌یەکان دەمێننەوەو ململانێی چینایەتی درێژەی دەبێ، تا لەسەرەنجامدا سەرمایەداریی تێدا هەرەس دێنێ. دیارە ئەلتەرناتیڤی سروشتی‌و حەتمیی ئەو سۆشیالیزم دەبێ کە لەسەر دادوەری‌و هاوسانی بنیات دەنرێ‌و چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوەی تێدا ناهێڵرێ. ئەو ئەنجامەی کە مارکس‌و ئەنگلز لەسەر حەتمیەتی رووخانی سەرمایەداری‌و سەرکەوتنی سۆشیالیزم بەدەستیان هێنا، زانستێکە پشت بەلێکۆڵینەوەی رووداوەکانی مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی

دەبەستێو لەسەر تێگەیشتنی قووڵی یاسا بابەتیەکانی جووڵانەوەی پەرەستاندنی کۆمەڵایەتی دامەزراوە. سیستمی سەرمایەداری هەر دەڕووخێ، وەك چۆن سیستمی فیوداڵیو پێشتریش سیستمی کۆیلایەتی رووخان. سۆشیالیزمیش پاشەڕۆژی حەتمیی مرۆڤایەتییە، جا رێگەی پێگەیشتنی هەر کامێك بێ، چونکە ئەو سیستمەیە کە بەدەنگ ئاواتە رەواکانی ژیانی جەماوەرەوە دەچێ.

* * *

دیاردەی هەرەس هێنانی رژێمە سۆشیالیستەکانو نسکۆی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی جیهانی ترسناکترین رووداوە لەجیهانی نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا. لێدوان لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە دەستی پێکردووەو زۆریش درێژە دەکێشێ، بەر لەوەی بتوانرێت چەند وەڵامێکی لێ کۆڵدراوە بخرێتە بەرچاو کە هەر لەسنووری لێکدانەوەی رووداوەکەدا گیر نەبن، بەڵکوو رەنگی ئاقارەکانی بنیاتنانەوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیو دەستە بەرکردنی بووژانەوەی ئایندەی بڕێژن. من تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی مەنتیقیو تەواوم لەسەر ئەم رووداوە نەخوێندووەتەوە، نە هیی رێبەرانی حیزبە کۆمۆنیستە هەرەسهێناوەکانو نە هیی کەسانی دیکە. ئەو گوتارە رۆژنامەنووسییانەیش کە هێندێك نووسەرو ئایدۆلۆجیستی بۆرجوازی پێشکەشی دەکەن، لەدووپاتکردنەوەی ستایشی تەقلیدیی سیستمی بۆرجوازی دەچنو، بەژو باهو هەڵدانی نموونەی وەك گەربەچۆڤو یەڵتسن ـ کە رێبەریی پرۆسەکەیان روو بەهەرەس هێنان کرد ـ تەواوی دەکەن. نوێنەرانی چەپی توندڕەویش کە رووداوەکان لەقسەیەکدا کورت دەکەنەوە: " نە هیچ شۆڕشێکی سۆشیالیستی لەئارادا بووو نە هیچ رژێمێکی سۆشیالیستی"، لەرووی ئەنجامەوە لەگەڵ ئەواندا یەکدەگرنەوە.

لەراستیدا چەند شۆڕشێکی سۆشیالیستیو چەند رژێمێکی سۆشیالیستیش سەرباری گیروگرفتو نەخۆشیەکانیان هەبوون. شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ شۆڕشێکی سۆشیالیستیی راستەقینە بوو، کرێکارانو رەنجدەران بەرێبەریی حیزبی

بۆلشەوی لەدژی زۆرداری‌و چەوساندنەوەی چینایەتی بەرپایان کرد. لینین‌و بۆلشەویەکان‌و ئەو ملیۆنەها کرێکارو جووتیارو سەربازەی رووسیایش دووی وەهەم نەکەوتن‌و، کاتێك چوونە نێو سوپای مەزنی شۆڕشەوەو قوربانیی گەورە گەورەیان لەپێناودا بەخشی شێت نەبوون. وەختێك شۆڕشگێڕان لەرووسیاو چین‌و بولگاریاو یوگوسلاڤیاو لەپراگی ١٩٤٨ و شوێنانی دیکە بەیداخی سووریان هەڵگرت‌و لەخەباتی دژی قەیسەرو سەرمایەداو بۆ سۆشیالیزم دلێرییان نواند، دەبەنگ نەبوون‌و دەیانزانی چییان دەوێ. پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەریش ئەو ملیۆنەها کۆمۆنیست‌و ناکۆمۆنیستە لەوەهمدا نەدەژیان کاتێك دانیان بەوەدا نا کە سیستمێکی تازە لەدایك بوور جیهان بوو بەدوو ئوردوگاو هاوسەنگی‌یەکی تازەی هێزەکان لەسەر شانۆی نێو دەوڵەتیدا پەیدا بوور، سۆشیالیزمی تازە کوورەیش بەشێوەی جۆراوجۆر بوونی خۆیی دەربڕی‌و خزمەتێکی شایانی کارگەرانی ولاتەکانیان‌و جیهانی کردو گەورەترین هەڕەشەی بۆ ئیمپریالیزم‌و سەرمایەداری بەگشتی پێکهێنا. ئەوانە چەند راستی‌یەکی مێژوویین هەر جێگیر دەبن، با هێندێك کەس تا ئەمڕۆ نکوولی‌یان لێ‌بکەن، بەتایبەت ئەوانەی کە وێنەیەکی خەیاڵیی سۆشیالیزمیان لەزەویندا کێشاوە، لەگوتەی جوانی نێو کتێبی یۆتۆپیی دوور لەواقیعی ژیانی ئالۆزی کۆمەلایەتی‌یەوە رایانگواستووە.

ئەو راستی‌یەی کە دروست نی‌یە بیکەین بەژێر لێوەوە ئەوەیە سۆشیالیزمی تازە کوورە سەرەتا لەولاَ تێکی پاشکەوتوودا سەری هەڵدا. بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە جۆرەها خەوش‌و نەخۆشیی تایبەت بەپاشکەوتن لەگەڵ خۆدا هەڵبگری. واتە کە لەدایك بوو دووچاری نەخۆشیەکانی پاشکەوتن بوو بوو. ئەو نەخۆشیانەیش لەکاتی خۆیدا چارەسەر نەکران، بەڵکوو وازیان لێ هێندرا پەل بهاوێژن‌و ئالۆز بېن، تا وای لێ هات قەوارەکەیان تێکشکاندو کێشایانەوە بۆ هەرەس هێنانی. رژێمە سۆشیالیستە ماوەکانی کۆریاو چین‌و کووباو هیندی چینی هەمان نەخۆشی

بەرۆکی گرتوونو، ئەگەر چارەسەری نەکەن هەمان چارەنووسیان دێتە ڕێ. جاران زۆر کەڕەت دەنووسراو دەگوترا: گەڕانـەوە لەسۆشـیالیزمەوە بـۆ سـەرمایەداری کـارێکی مـەحاڵە. بەلاّم ئەمڕۆکە ژیان خۆیشی پەردەی لەرووی شـتێکی جیـاواز هەڵداوەتـەوە. گەڕانەوە کارێکی گونجاوە، بەتایبەت کاتێك رژێمە سۆشیالیستیەکە بەتەواوی بنیـات نەنرا بێ.

بێ گومان هەرەسهێنانی رژێمی حوکم لەیەکێتیی سۆڤیەتو ئەورووپای خۆرەلاّتدا، نە بەڕێکەوتو نە ئەنجامی چالاکی‌یەکی پیلانگێڕانەی هێندێك حوکم بەدەسـتی ئـەم دەوڵەتانە یان دەوڵەتانی خۆراوا بووە. بەڵکوو دەرەنجامی چەندین نەخۆشیی کوشـندە بوو کە ئەم رژێمانە ـ یا راستتر بڵێین ئەم حیزبە کۆمۆنیستە حوکمدارانـە ـ تووشـیان بوو کە لەگەل دابڕانو بوون بەدەزگایەکی بیرۆکراتی داسەپاوو پشت بەسـتوو بـەرێو شوێنی سەرکوت کردنو پۆلیسی نهێنی. ئەم رژێمانە لەرەوتی پەرەستاندنیاندا بەدوو قونـاخی جیـاوازدا رەت بـوون: لەیەکـەمیاندا گـەلێك دەسـکەوتی راسـتەقینەیان بەکارگەران بەخشیو، لەقۆناخی دووەمیشیاندا جگە لەدروشمی بریقـەدارو بەرنامـەی کاغـەزینی بۆشـی مایـەی لـەجێی خـۆدا چەقین یـا روو لـەنزمی کردنـی ئاسـتی گوزەرانی دانیشتوان، هیچی دیکەیان نەخستە بەردەست.

بەرای من گرنگترینی ئەو نەخۆشیانە لەم خالاّنەدا کورت دەکرێنەوە:

١- ترسـناکترین نەخـۆشـی نـەبوونی دیموکراسـیو خنکـاندنی سـادەترین شـێوەی بەرهەڵستکردنو رەخنەو سەپاندنی پۆلیسی نـهێنی بەسـەر جـەماوەردا بـوون. وەهـا پێویست بوو دیموکراسی لەسایەی سۆشیالیزمدا بەرە بەرەو بـەردەوام بـۆ ئاسـتێکی بالاّتر لەهیی کۆمەلگـە بۆرجوازیـەکان پـەرە بسـتێنێ. وا داندرابـوو دەسـەلاّت پلـە بەپلە لەدەسەلاّتی چینی کرێکارانەوە بۆ دەسەلاّتی هەموو گەل گەشـە بکـات. بـەلاّم پێچەوانـەی ئـەوە رووی دا، چونکـە دەسـەلاّتی چینـی کرێکـاران بـوو بەدەسـەلاّتی حیـزبو، لەدەسـەلاّتی حیزبـەوە بـوو بەدەسـەلاّتی (تۆتالیتـاری)ی کەسـانێکی

هەڵبژاردەو، لەدەسەڵاتی کەسانێکی هەڵبژاردەیشەوە بۆ دەسەڵاتی تاکە سەرکردە. لەبریی ئەوەی سیستمی تاکە حیزبی، هیچ نەبێ لەچوارچێوەی بەربەرەکانێی نێوان لایەنگرانی ڕژێمە کۆمەڵایەتیە تازەکەدا، بۆ سیستمی فرە حیزبی پەرە بستێنێ، کەچی دەوری ئەم تاکە حیزبەیش وەکوو حیزبێکی حوکمدار کەم کرایەوە یا بەکردەوە هەڵوەشێندرایەوەو، بەندیخانە بووە ماڵی هەموو کۆمۆنیستێك کە زاتی ئاشکرا کردنی ناکۆکیی فیکریی خۆیی کرد لەگەڵ سەرکردایەتیی بیرۆکراتی حیزب‌و دەوڵەتدا.

٢ ـ دیاردەی دەق پەرستی (النصية)و وشکە باوەڕی بەڕادەیەك پەلیان هاویشت کە باوەڕی کۆمۆنیستییان لەگەڵدا بوو بەشێوە باوەڕێکی ئایینی ـ ئاسمانی. ئیدی هێندێك سەرکردە خرانە ڕیزی پێغەمبەران‌و پێشەوایانەوە، بەرهەمە نووسراوەکانیشیان خرانە خانەی کتێبە ئاسمانیە پیرۆزەکان، تا گوزارەو قسەیان لێ بخوازن بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ئاڵۆزترین پرسیارانەی کە هەل‌ومەرجە تازەکە خستنیە بەردەم حیزبە کۆمۆنیستە حوکمدارو حوکم لەدەستدا نەبوەکان، یان بۆ پێشکەشکردنی چارەسەری حازر بەدەست بۆ پڕ گرێ‌و گۆڵترینی ئەو گیروگرفتە فیکری‌و سیاسیی‌و ئابووری‌و ڕێکخراوەییانەی کە ژیان ئەمڕۆکە لەهەل‌و مەرجێکی تەواو جیاواز لەکاتی تێدا نووسرانی ئەو گوزارەو قسانە هێنانیە گۆڕێ.

نا پەسەند ترین‌و ترسناکترین لایەنی نالەباری دیاردەی وشکە باوەڕی‌و هەرە زیان بەخشترینیان بۆ دۆزی سۆشیالیزم گواستنەوەی دەقاو دەقی ئەزموونی سۆڤێتی بوو بۆ ولاتانی ئەورووپای خۆرە لات، بەبێ لەبەرچاو گرتنی خسڵەتە مێژوویی‌و نەتەوەیی‌و کۆمەڵایەتیەکانی ئەو ولاتانە. ئەم دیاردەیە لەگەڵ میزاجی سەرکردە بیرۆکراتەکان‌و بەرژەوەندی شەخسییاندا هاوجووت بوو، چونکە بەهانەی ئەوەی دەدانێ ببنە " نوێنەری پێشەوایان " و بەدڵی خۆیان بجوولێنەوە.

٣- پێدەچێ شێوەی موڵکداریی هەڵبژێردراو لەم رژێمانەدا تا ماوەیەکی دیاریکراو گونجاو بوو بێ، چونکە ئاستی گوزەرانی کارگەران بەرزبووەوەو ئەندازەیەکی باشیان لەخزمەتگوزاریو دەستە بەریی کۆمەڵایەتی بۆ دابین کرا. بەڵام هێندەی نەخایاند بەهۆی درێژەدان بەهەمان تەرز لەموڵکداریو بەڕێوەبردنی ئابووریی نیشتمانییەوە ئەم رێو رەسمە ئاوە ژوو بووەوە. ئەمەیش کێشایەوە بۆ نەمانی هاندەری ماددیو هۆکاری بەریەرەکانی کە بۆ پەرەپێدانی چۆنایەتیو چەندایەتیی هێنانە بەرهەمو رۆیشتن شان بەشانی نوێترین پێشکەوتنی زانستی - تەکنیکی پێویستە. ئەوەی کە قەوما نەک هەر لەجێی خۆدا چەقینی هێنانە بەرهەمی پیشەسازی کشتوکاڵی بوو، بەڵکو هاتنە خوارەوەیشی بوو بۆ نزمترین ئاستو کارێکی کرد کرێکارانی وڵاتانی سۆشیالیستی بەخیلی بەهاوچینەکانیان ببەن لەوڵاتانی سەرمایەداردا لەبەر ئەوەی ئاستێکی چاکتری گوزەرانیان هەبوو. دەبوو پێچەوانەی ئەمە رووی بدابایە.

ئەوەیش قوڕەکەی خەستتر کردەوە کە باری گرانی پاشکەوتنی ئابووریو نزم بوونەوەی ئاستی گوزەران ئەو کادێرانەی حیزبی کۆمۆنیستی حوکمدارو دەوڵەتی بیرۆکراتیان نەگرتەوە کە پایەی حیزبیو حکوومەتییان بەکار دەهێنا بۆ ئیمتیازی ناڕەواو بەردەوام بەخۆش گوزەرانیو لەنازو نیعمەتدا دەژیان. ئەم کارە نەک هەر ئەوانەی لەجەماوەر دابڕی، بگرە بووە جێی ناڕەزاییو بێزارییانو خودی رژێمی سۆشیالیستیشی دوورە پەرێز کردو لەبەرچاوی خەڵکی خست. کارگەران سۆشیالیزمیان بۆ ئەوە ویست کە ژیانێکی خۆشترو چاکتریان لەهیی ژێر سایەی سەرمایەداری بۆ مسۆگەر بکاتو دیموکراسییەکی زیاتریشیان بۆ بهێنێتە دی نەک بەپێچەوانەوە.

٤- رووداوە مێژووییەکان حیزبی کۆمۆنیستی بۆلشەوییان لەنێو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیو کرێکاریی جیهاندا خستە جێو رێیەکی جیاو تایبەتو تەنانەت

ناوەندی پێشرەوایەتیشەوە، چونکە لەبواری تازەکردنەوەی فیکریو سیاسیو ڕێکخراوەییو لەڕێبەریکردنی یەکەم شۆڕشی سۆشیالیستی سەرکەوتوودا خاوەنی دەست پێشخەریی مێژوویی بوو. ئەم حیزبە بەهۆی سەرکەوتنە گەورەکانیەوە لەڕێبەری کردنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو بنیاتنانی ڕژێمی کۆمەڵایەتیی تازەی سۆڤیتیو لەپشتگیری کردنی بزووتنەوەکانی ڕزگاریی نیشتمانیی دژ بەئیمپریالیزمدا هتد لەسەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا دەورێکی یەکجار باشی لەبووژاندنەوەو بەهێزکردنی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی جیهانیو پتەو کردنی هاوکاریی ئینتەرناسیونالیی نێوانیانو لەگەیاندنی کۆمۆنیستەکان بەحوکم لەچەند وڵاتدا بینی.

بەڵام خولیای خۆداسەپاندن کە لەبنەڕەتدا لەڕێبازی ستالینیدا خۆیی بینییەوەو لەساڵانی پاش ستالیندا پتر نەشونمای کرد، بەهێواشی پێوەندیی نێوان سەرکردایەتیی کۆمۆنیستیی سۆڤیتو حیزبە کۆمۆنیستەکانی دیکەی لەناوەڕۆکە باشەکەی خاڵی کردەوەو کردی بەکارکردێکی خراپو هۆی زیان گەیاندن بەبزووتنەوەی کۆمۆنیستی، دوای ئەوەی کارێکی وای کرد لەسەر بنچینەی وا بەستە بوونی ئەم حیزبانە بەسەرکردایەتیی حیزبی سۆڤیتییەوە دابمەزرێت. ئەمەیش مافی بەحیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیت دەدا وەك سەرکردەی هەموان ڕەفتار بکاتو خۆ لەکاروباری ئەو حیزبانە هەڵبقورتێنێ کە دەبوو دەست بەرداری سەربەخۆییان بنو مل بۆ خواستی سەرکردایەتییەك کەچ بکەن کە ناتوانێ لەبارودۆخی وڵاتەکانیان حاڵی ببێ. جا ئەگەر ئەو حیزبە کۆمۆنیستانەیش قایل نەبووبان لەسەر ئەم بنچینە چەوتە پێوەندی دابمەزرێنن ( کە ناوی پێوەندیی ئینتەرناسیۆنالیی بەسەردا بڕا)، دەبوو لووتیان ببێ بەلووتی سەرکردایەتیی سۆڤیتییەوەو، بەلادان لەمارکسیزم ــ لینینزمو لەئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری تاوانبار دەکران.

دابەشبوونی حیزبی کۆمۆنیستی حوکمدارو دەوڵەت لەیۆگۆسلاڤیا لە(١٩٤٧ ـ ١٩٤٨)ەوەو، ئەمجا دابەشبوونی گەورەو ترسناکی نێوان هەردوو حیزبی حوکمدارو هەردوو دەوڵەتی سۆڤیەتو چین لە(١٩٦٠)ەوە، ئەم پارچە پارچە بوونو لەبەریەکهەڵوەشانەی نێو دەوڵەتانی سۆشیالیستی (تەواو بنیات نەنراو) بەجیا لەم دیاردەیە وەرناگیرێ. بەرپرسیی سەرکردایەتیە کۆمۆنیستیەکان لەبەلگرادو پەکینو تیرانـاو بۆخارێستو پێتەختەکانی دیکەدا هەرچی چۆنێك بێ، ئەوا بەرپرسیی سەرەکی دەکەوێتە ئەستۆی سەرکردایەتیی سۆڤیەتی کە لەسەر بنەمای رێزگرتنی هاوبەش لەسەربەخۆیی‌و دان نان بەهاوسانیی نێوان هەموو حیزبەکان مامەڵەی لەگەڵ حیزبەکانی دیدا نەدەکرد. دیارە ئەم پارچە پارچە بوونە زیانێکی قورسی بەسەرجەم بزووتنەوەی کۆمۆنیستی‌و کرێکاری‌و رژێمە سۆشیالیستەکان گەیاندو دەورێکی گەورەی لەخولقاندنی ئەو قەیرانە توندو تیژەدا بینی کە بووە هۆی رووخانی رژێمی حوکم لەیەکێتیی سۆڤیەتو خۆرەلاتی ئەوروپا.

٥- دەسەلاتی سۆڤیەتی هەر لەزووەوە (کاتێك رژێمە سۆشیالیستیەکە بەیەکەمین قۆناخی گواستنەوەدا رەت دەبوو لەسەرمایەداری‌یەوە بۆ سۆشیالیزم) چارەسەرێکی پەسەندو راستی بۆ گیروگرفتی نەتەوایەتی لەولاتی سۆڤیەتی بەرفراوانو فرە نەتەوەدا دانا. دامەزراندنی یەکێتیی کۆمارە سۆشیالیستیە سۆڤیەتیەکان لە١٩٢٢دا هەنگاوێکی دیاری گونجاندنی یاساییی ئەم چارەسەرە هاوجووتەی کە ئاواتو بەرژەوەندەکانی ئەو گەلە سۆڤیەتیانە بوو کە نەك هەر هەستیان بەرزگاربوون لەئازاردانی نەتەوایەتی کرد بەلکوو دەرەتانێکی کراوەیان بۆ بنیات نانی نیشتمانی تازەیانو بەدەست هێنانی پێشکەوتنێکی بێ ئەندازە لەپیشەسازی‌و کشتوکاڵو خزمەتگوزاری.. هتد لەبەردەمی خۆدا بینی. بەرێکەوت نەبوو ئەو گەلانە نیزیکەی حەفتا ساڵ لەچوارچێوەی کۆمەڵێك پێوەندیی برایانەی نەرمو نیانی نێو یەك دەوڵەتدا ژیانو، بەچەندین ریزی یەکگرتوو بۆ بەرگریکردن لەنیشتمانی هاوبەشیان چوونە مەیدانی دووەم جەنگی جیهانی‌یەوە. لەم هەموو ساڵانەدا هیچ جۆرە پشێوی‌و

باخی بوونێکـی نەتـەوەیی پێکـەوە ژیـانی برایانـەیانی لەکـەدار نـەکرد. لـەکاتێکدا ولاتانی گیرۆدەی دەسەلاتی دەولەتانی ئیمپریالیست جۆش‌و خرۆشـی خۆپیشـاندان‌و مـانگرتن‌و راپـەڕینی ئاشـتی‌یانەو چـەکداری‌یان دژی کۆلۆنیالیسـتی بێگانـەو لەپێناوی رزگاریی نیشتمانی‌و نەتەوەییدا بەخۆوە بینی.

بەلام ئـەو هەلـەو لادانانـەی کـە لایەنـە جیاجیاکـانی رێبـازی حیزبی حوکمدارو دەولـەتی سـۆڤیتی‌یان گرتـەوە، هـەر دەبـوو مـەیدانی پێوەندیـە نەتەوایەتیـەکانیش بگرنەوە. ئەو چارەسەرانەی کە لەسالانی بیستدا بـۆ مەسـەلەی نەتەوایـەتی گونجاوو پەسـەند بـوون، لـەدەیان سـالی داهـاتوودا بەتایبـەت لەسـالانی حـەفتاو هەشـتادا، پەرەیان پێ نەدراو پێویستی‌یان بەچاو پێدا گێڕانەوە هـەبوو بـۆ ئـەوەی پـەرەیان پـێ بدری‌و بگەیەندرینە ئاستی داواکاریـەکانی بارودۆخـە تازەکـە. بـەلام سـەرکردایەتیی سـۆڤیتی بیری لـەهیچ شـتیکی لـەم چەشـنـە نـەکردەوە. سـەرەڕای ئـەوە سـالانی پیرۆسترێکا کە گەربەچۆڤ رێبـەریی دەکـرد، سـالانی بـێ ئـەندازە دارمـانی ئاسـتی گوزەرانـی گـەلانی یـەکیتیی سـۆڤیت‌و یـەکجار پـەل هاویشـتنی خراپـەکاری‌و تالانکردنی بـێ پـەردەو تـاوان بـوون. ئـەم کـارە هـاو ولاتیـانی ولاتـە جیاجیاکـانی سۆڤیتی خستە سەر کەلکەلەی پرسیارکردن لەوەی کـە داخـۆ مانـەوەی چوارچێـوەی دەولـەتیکی بۆگـەنی لـەم چەشـنـە سـوودی تێدایـە، یـان چاکتر وایـە جـوێ ببنـەوەو دەولەتی نیشتمانیی سەربەخۆی خۆیان پێك بهێنن؟

٦ـ هەرەسهێنانەکە لەخۆوە نەبوو، دەرەنجامی مەنتیقی زنجیرەیەکی درێژی هەلـەو لادان بوو کە لەسەردەمی ستالینەوە دەستیان پێ‌کرد، لەچەند دەورانێکـی دواتـرداو بەتایبەت لەسەردەمی بریجنێفدا تەنینەوە. ئەم هەلەو لادانانە بەنـەبوونی دیموکراسـی بنەماکانی پـەیدابوونی توێژێکـی کۆمـەلایـەتیی تـازەو مشـەخۆریان لـەنێو حیزبی حوکمـدارو دەزگـای دەولـەتدا فەراهـەم کـرد کـە دەکرێـت نـاوی بنێـین (شـێوازی سۆشیالیستی)ی بۆرجوازیی بیروکراتی مشەخۆری تازە کوورە لەهێندێك ولاتـی روو لەگەشەکردوودا.

ئەم توێژە هیچ سەرمایەیەکی شەخسیی نەبوو تا بۆ دەست خستنی قازانج بیخاتە کار، بەڵکوو پایەی حیزبیی‌و حکوومەتیی خۆیی بۆ بەدەست هێنانی پارەو ئیمتیازی نارەوا لەڕێگەی دزی‌و بەرتیلخۆری‌و ماشینەوەی سامانی کەرتی گشتی‌یەوە بەکارهێنا. کسانێکی ملیۆنێری راستەقینەش لەنێو ئەم توێژەدا دەرکەوتن، بەکەف‌و کوڵۆ شێلگیرانە هەوڵی بەشێوەیەکی نارەوا هێنانەوەی رژێمی سەرمایەداری‌یان دا بۆ ئەم وڵاتانە، بیانوویشیان ئەوەبوو کە سۆشیالیزم سەری نەگرتووەو، سەرنەگرتنەکەیشی دەستکردی دەستە گلاوەکانیان بوو.

لێرەدا دەبێ قسەیەك لەسەر پیرۆستریکاو ریفۆرم (الاصلاح)بکەین: خرۆشییێف یەکەمین بەرپرسی سۆڤێتی بوو کە لەساڵانی پەنجاوە پەیی بەهەڵەو خراپییەکان بردو هەوڵی چاك کردنی بارودۆخەکەی دا. بەڵام سەرنەکەوت، چونکە دروشمی ریفۆرمی نەکرد بەبزووتنەوەیەکی جەماوەری، بەڵکە تێکۆشا ئەم ریفۆرمانە لەنێو هۆڵەکانی سەرکردایەتیی بیرۆکراتدا جێبەجێ بکات. بۆیە هێزەکانی شەڕو خراپەکاری بەرێبەریی بریجنێف لەپایەی سەرکردایەتی دووریان خستەوە، تاکوو رێبازی ستالینی بەجۆرێکی لەجاران خراپتر درێژەی ببێ.

(گەربەچۆڤ)یش ئاگاداری هەڵەو خراپەکاریە گەورەکان بوو، بۆیە پیرۆستریکا ـ بنیاتنانەوە ـ ی راگەیاند. هێزەکانی شەڕو خراپەکاری بەهەمان شێوەی دوورخستنەوەی خرۆشییێف، دەیانویست ئەمیش لەسەرکردایەتیی حیزب‌و دەوڵەت دوور بخەنەوە. بەڵام نەیانتوانی، چونکە ئەمجارە جووڵانەوەی ریفۆرم بووە جووڵانەوەیەکی جەماوەریی بەربڵاو. ئەوەبوو ململانێ‌یەکی توند لەنێوان لایەنگران‌و دوژمنانی ریفۆرمدا بەردەوام بوو. گەربەچۆڤ توانیی یەکێك لەئامانجەکانی ریفۆرم بەدی بهێنێ. واتە دوایی پێ‌هێنانی شێوە حوکمی بیرۆکراتی تۆتالیتاری‌و چەسپاندنی بەهاو رێ‌و رەسمی دیموکراسی لەکۆمەڵگەدا. بەڵام هەرچەندێك نیاز پاك بووبێ، پێی نەکرا ئەو رژێمە سۆشیالیستی‌یە چاك بکات کە نەخۆشیی هەمیشەیی‌و گیروگرفتی دژوار لەپێ‌یان خستبوو، بەڵکوو گروەکەی دۆڕاندو خۆبەدەستەوە دانی

ڕاگەیاند. شایەنی گوتنە ئەو توێژە کۆمەڵایەتیەی کە لەریفۆرمی سۆشیالیزمدا بەرەنگاری گەربەچۆف بووەوەو لەپارچەکردنی یەکێتیی سۆڤێتو ئاشکراکردنی کۆتاییی سۆشیالیزمدا بەسەریدا سەرکەوت، هەمان توێژی بیرۆکراتی مشەخۆر بوو کە پێشتر لەسەرکردایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی حوکمدارو دەوڵەتی سۆڤێتیدا جێی خۆی خۆش کرد بووو هەر ئەوانە بوون کە دوێنێ بەناوی کۆمۆنیزمو سۆشیالیزمەوە حوکمیان دەکردو ئەمڕۆیش بەناوی تازەی جیاوازەوە حوکم دەکەن. بۆ نموونە، (بۆریس یەڵتسن) یێک کە ئەمڕۆ کاری بەوە گەیشتووە چالاکیی کۆمۆنیستی لەناوچەکانی کۆماری رووسیای فیدراڵدا قەدەغە بکات وبەئاو و تاوە وە کەوتووەتە وەرگرتنی ئامۆژگاریەکانی خۆراوا بۆ بەرەو پێدانی بازاڕی ئازاد، تا دوێنێ بوو ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتی حوکمدارو ناز کێشراوێکی ئەو توێژە بیرۆکراتە خۆشگوزەرانو خاوەن ئیمتیازی ناڕەوایە بوو.

من وای دەبینم هۆی سەرەکیی سەرنەکەوتنی گەربەچۆف لەوەدا بوو کە نەیتوانی دارمانی بەردەوامو خێرایی باری ئابووریو بەتایبەت گوزەرانی جەماوەر رابگرێ، کە لەساڵانی پیرۆسترۆیکاو لەسایەی سەرکردایەتیی خودی "گەربەچۆف" دا چەندەها جار لەهیی سەردەمی پێش پیرۆسترۆیکا خراپتربوو. گەربەچۆف خۆیشی یەکەم بەرپرسی ئەم دارمانە بوو. ئەو هەرگیز سەرسەختانە رووبەرووی ئەو چالاکیی تێکدانە نەبوەوە کە توێژی بیرۆکراتی مشەخۆر بەهۆی مافیای زۆرو زەبەندی دەورانی پیرۆسترۆیکاوە دەیکرد. هۆی ئەم نەرمی نواندنەیش بەرانبەر بەو مافیایانە - بەرای من - ئەوەیە کە ئەو لەنێو ئەو توێژە بیرۆکراتە مشەخۆرەدا پەروەردە بووو وەکوو یەکێك لەو توێژەیش جڵەوی پێشەوایەتیی گرتە دەست (ئەندامەتیی مەکتەبی سیاسی حیزبو، ئەمجا یەکەم پلەو پایە لەحیزبو دەوڵەتدا). ئەو لەو توێژە هەڵگەڕایەوەو هەوڵی ریفۆرمی دا، بەڵام بەتەواوی پێوەندیی بەرابردووەوە نەپچڕیو، لەجێبەجێکردنی یاسا بەسەر ئەوانەدا جەربەزەییەکی پێویستی پێشان نەدا.

* * *

بەڵێ، بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانی نشوستی هێناو چەندین رژێمی سۆشیالیستی رووخان. رژێمی بۆرجوازیی جیهانیش بەوە سەرکەوتنێکی گەورەی لەململانێیدا دژی بزووتنەوەی کرێکاریو سۆشیالیزم دەستگیر بوو. بەلاّم ئەوەی کە قەوما دوا قسەی مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نییە. نسکۆکە کاتییەو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیش دەرس لەم ئەزموونە قورسە وەردەگرێو، رێگەو هۆکاری گونجاو بۆ تێ پەڕاندنی مەینەتیو سەر لەنوێ خۆ بنیات نانەوەو تازەکردنەوەی چالاکیەکانی لەرووی فیکریو سیاسیو رێکخراوەییەوە دەدۆزێتەوە.

سەرمایەداری لەدرێژاییی چوار سەدەدا بەم ئاستەی پەرەستاندنی ئەمڕۆکەی گەیشتو لەم ماوەیەدا یەخەگیری سەدان قەیرانو راچڵەکینی توند بوو و، هێشتاکەیش بەدەست هەزار گیروگرفتی فیکریو سیاسیو ئابوورییەوە دەناڵێنێو، ناتوانێ نە وەلاّمێکی پەسەندی ئەو دەیان پرسیارانە بداتەوە کە بەرەو رووی دەبنەوەو نەچارەسەری دەیان گیروگرفتی ئالۆزو پرگرێو گۆڵی بەردەمی بکات. ئیدی چ سەیرو سەمەرەیەك لەوەدا هەیە کە سیستمی سۆشیالیستیش تووشی نشوستی ببێ، لەکاتێکدا ئەم سیستمێکی ساوا بووو تەمەنی لەحەفتا ساڵی تێ نەپەڕاند بوو؟

سۆشیالیزم ئەم گێمەی دۆڕاندو هەموو یاریەکەی نەدۆڕاند. سەرمایەداریش پێشتر چەند گێمێکی دۆڕاندو، پشتیوانێکی وای نییە زامنی تا سەر خۆراگرتنی بکات. سەرمایەداری لەوە کەوتووە دژایەتیی نێو قەوارەی ئابووریی خۆی چارەسەر بکات. سەرەنجام چاری نییە بەهۆی ئەو دژایەتیانەوەو لەرێی سنووقەکانی دەنگدانیشەوە لەو وڵاتانەدا کە بەهاو رێ و رەسمی دیموکراسییان تێدا سەقامگیر بووە، دەڕووخێ.

پاشەرۆژی مرۆڤایەتی سۆشیالیزمەو بەتەنیا سۆشیالیزم.

دانەر

کانوونی یەکەمی ١٩٩١

عیراق

**ـ ١ ـ**

# چەردەیەك لەبارەی یادگاریی منداڵییەوە

لە(تەکیّ) لەدایك بــووم‌و گــەورە بــووم. لــەمنداڵیمدا، دێیەکــەمم وەهــا دەبینــی: جیهانێکی جوانەو، هەموو لایەکانی سەریان بەیەکــەوە نــاوە. ئــەوێ، هــاوڕێ‌و چیــاو گردو دۆڵ‌و گۆمی سروشتیی مەلــەو یــاریی تێــدا زۆرو مشــە بــوون. هیــچ ڕۆژێکــم بەبیردا نایێ کە هەستم تێدا بەوەڕەسی کردبێ لەژیانی لادێ. لــەکاتێکدا کــە بــاوکم دەیبردم بۆ ســلێمانی، ئــەو شــارەم بەجیــهانێکی تەنگبــەری مایــەی بــێزاری دەهاتــە بەرچاو، کە ژیانی تێدا وشك بوو، ـ بەلای منەوە ـ لەبەندیخانەیەکی گــەورە دەچــوو. بەرانبەر بەو ژمــارە زۆرەی هاوڕێیــانم لــەدێدا، تاکــە هــاوڕێی بنچینــەییی منداڵیــم لەشاردا، کەم‌و زۆر، محەممەدی پوورزام بوو، کە ئەوەندەی لەسەریم کردووەتەوەو شــەرم بۆ کردووە لەگەڵ منداڵانی دیکەدا ئەوەندە شەرم بۆ خۆم نەکردووە.

باوکم پلەوپایەیەکی تایبەتی لــەنێو خــەڵکی دێیەکــەدا هــەبوو، هــەموان وەکــوو یەکە پیاوێکی کــەس لــەعۆدە نــەهاتوو دانیــان پێــدا نــابوو، چونکــە ڕووناکبــیرێکی زەمانی خۆی‌و دێنشــین‌و شارســتانیش بــوو. دایکــم لــەدێدا دادەنیشــت‌و؛ دووەم ژنــە بچووکەکــەی باوکیشــم لــەخانووی باپــیرمدا کــە لــەزانا ئاینیــە گــەورەکانی شــاری سلێمانی بوو، جێ نشین بوو بوو. باوکم گەلێکی کاتی خۆیی بــەهاتو چووی نێــوان شــارو دێ بەســەر دەبــرد. خێزانەکــەمان لــەڕووی گوزەرانــەوەو بەبــەراورد لەگــەڵ دێنشینانی ئەوســادا خۆش گــوزەران بــوو، چونکــە بــەرو بوومــی کشــتوکاڵمان پێداویستیمانی دابین دەکرد. باوکم هێندەی تووتن دەفرۆشت، بەشی کڕینــی شــەکرو چاو جل‌وبەرگ وشتی لەم بابەتەمان بکات کە چار نەبوو هــەر دەبــوو بیــانکڕێ. ئــەو خوێندنی زانستی ئاینیی تەواو کرد بووو، وەك زانایەك لەقەڵەم درا بــوو. بــەلام وەك ملکخێوێکی بچووك رووی لەکشتوکاڵ کردبوو. حەزی بەوە دەکرد ببێ بەدەرەبەگێك

یا ملکخیۆیکی گەورە. بەلاّم تەبیعەتە بیوەی و لاشەرەکەی لەلایەکەوەو، سروشتی هێنانە بەرهەمی پارچە زەویی کشتوکالّیی بچووکی گیرۆدەی کەمیی ئاوو زەویی بۆ کشتوکالّ گونجاو لەمدێدا لەلایەکی دیکەوە، هەردوو کۆسپ بوون لەبەردەم ئارەزووەکەیدا. بۆیە خۆشگوزەرانیی ئێمە زیاتر پێبەندی ئەوە بوو کە لەمدێدا بمێنینەوەو خەریکی رەنێو هێنانی زەوی و زاری خۆمان ببین.

باوکم، بەپێچەوانەی داب و نەریتی باوی دێهاتەوە، حەزی نەدەکرد رێ و شوێنی لێدان بەرانبەر بەمنداڵەکانی بەکاربێنێ. ئەو، لەمنداڵیمداو بگرە لەدرێژاییی ژیانمدا، تەنیا دوو جار بەسووکی لێی داوم، یەکیان بەهۆی خۆ دزینەوەمەوە بوو لەئەرکەکانی خوێندنم و، ئەوی دیکەیش لەبەر ئەوەی کە لەئێوارەیەکی درەنگوەختدا سەر دارتوویەکی بەرز کەوتم. هیچ رۆژێک دایکمم نەدیوە لەمن یا لەشەش منداڵەکەی تری بدات. ئەو، لەرووی دڵنەرمی و بایەخدانیەوە بەئێمە، دایکێکی خۆرەلاّتیی نموونەیی بوو. چەندەها جار دانیشتووە نان و ئاوی خواردووە، پاش ئەوەی هەرچی یەکی لێ ناوە لەبرنج یا گۆشت یا هەر خواردنێک کە بەباش بزاندرایە، خستوویەتیە بەردەمان. بەوە پاساوی دەدایەوە کە دەیگوت:

- زارۆڵەکان پتر پێویستی یان بەخواردنی باشە، چونکە لەقۆناخی نەشونما کردندان. لەکاتێکدا بۆ هیی وەک من یەک ئەنجامی هەیە، جا برنج بخۆین یان نان. گرنگ ئەوەیە سکمان تێر بکەین.

لەتەمەنی دە یا یازدە ساڵیدا بووم کە دایکم پێی گوتم: "باوکت لەشارەو دەبێ تۆ کە کورە گەورەی ماڵی سبەی بەیانی زوو لەنێو پیاوانی گوندو لەمزگەوتدا دابنیشی تا خواردنی جێژنیان لەگەڵدا بخۆی. لەوێ وەک پیاو دادەنیشی و، ئێمەش سینی یەک خواردنت بۆ دەهێنین". نەریتی کورد وا بوو: بەشەو چێشتی جێژن ساز بکەن و، بەیانی زوو بیخۆن. پیاوان دوای نوێژی جێژن لەمزگەوت دەمانەوەو، هەموو یەکێکیان چێی لەماڵەوە بۆ ئامادە بکرابایە بۆی دەنێردرا، تا لەسەر خوانەکە لەنێو

خۆیاندا بەشیان بکەن. سەعەی مجەوری مزگەوت تەشتێکی مسی گەورەی لەبەر دەرگای مزگەوتدا دادەنا، تا دێنشینەکان لەکاتی ڕۆیشتنیاندا چی لەقاپەکانیاندا مابایەوە، برنج بوایە یا ساوەر یا شلە یا غەیری ئەوانە، تیٚیان بقلّپاندایە. جێژن نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ دواییی پیٚ دەهات. مەگەر بۆ کوڕو کاڵو کچۆلانی سەلّتی دیٚ کە هەر تاقمێکیان بەجیا بەخواردنو چاوە دەردەچوونو لەجێیەکی دوور لەچاوی باوانیان پێك دەگەیشتن، تا پێکەوە چەند سەعاتێك بەگۆرانیو هەلّپەڕکیٚو ڕەشبەلّەكو تاکە ئامێری مۆسیقایان کە شمشالّ بوو، بەسەر ببەن.

ئەگەر زێدە لادێیی بوونەکەم شوێنەواری بەرچاوی خۆیی بەسەرجەم ژیانی لەمەودوامەوە لەسلێمانیو بەغداو دەرەوەی عیراق هەبوو بیٚ، ئەوا حوجرەکەی "کاکە حەمە" ی جووتیاری نیوە مەلای زیرەك دەورێکی لەوەدا هەیە. ئەم جووتیارە لاوە پیاوێکی لەسەرخۆو پەروەرشتیارو مامۆستایەکی لایەقی زەمانی خۆی بوو. لەهەلّسو کەوتیدا لەگەلّ قوتابیەکانیدا، بەپێچەوانەی زۆربەی هەرە زۆری مامۆستایانی حوجرەکانی ئەو سەروبەندەوە، پەنای نەدەبردە بەر دار. باوکم زیاتر دەیتوانی پیٚم بخوێنیٚ، بەلاّم هەلو مەرجی هاتنو چوونو سەر قالّیی بەکەمی ڕیٚیان دەدا ببێتە مامۆستام. بیرمە ئەو ڕۆژە قایمقام لەدیدەنیی دێیەکانی قەراخدا بوو، میوانی باوکم بوو لەمالّی خۆمان. بەهاندانی باوکم بوومە سەرکردەی وەفدێکی مندالانی دیٚو، عەریزەیەکمان بۆ میوانەکە پیٚ بووو داوامان تێداکردبوو قوتابخانەیەکمان بۆ بکاتەوە. داواکەمان کاری لەهەستو سۆزی قایمقام کردو، گفتیدا ئەوپەڕی هەولّی خۆی بۆ بەدی هێنانی داواکەمان بخاتە کار. بەلاّم قوتابخانەکە، چەند سالّێك بەر لەدێیەکەی ئێمە، بۆ "سێوسێنان"ی دراوسیٚ دێمان کرایەوە.

"قانع"ی زەحمەتکێشو برسیو شاعیری جووتیاران یەکێك بوو لەمامۆستایانی قوتابخانەی سێوسێنان هەر لەیەکەم دامەزراندنیەوە. چەند جارێك سەری لەباوکم داوە

لەدێیەکەمان، بەدەم چا خواردنەوەوە شیعریان بۆ یەکتری دەخوێندەوە. بەمامۆستایی مانەوەی ئەم شاعیرە درێژەی نەکێشا، چونکە لەکاتی ناوبژیکردنیدا لەنێوان چەند دێنشینێکی بەشەڕ هاتوودا تێلاّی یەکێکیانی بەرکەوت و قاچی شکا. دوا بەدوای ئەوە، بۆ نەخۆشخانەی سلێمانی گوێزرایەوە. پێش ئەوەی روو لەچاکی بکات، پێیان راگەیاند لەوەزیفە دەرکراوە.

دێ هەلپەڕکێی تاکە کسیی تێدا نەبوو. بەلاّم ئاهەنگی گۆرانی گوتن و رەشبەلّەك بەبۆنەی ژن گواستنەوە یا خەتەنە کردن یان لەدایکبوونی منداڵێکی تازەوە، بەردەوام دووپات دەکرانەوە. ئاهەنگی خەتەنەکردنی خۆم و چەند منداڵێکی دێیەکەم لەنوکەوە لەبیرە. هەلپەڕکێکە گۆرانی و شمشاڵ ژەنی لەگەلّدا بوو. داوەتێکی نان خواردنی بەدوودا هات، هەموو پیاوانی دێ ئامادەی بوون و، لەپانتاییەکی گەورەداکە سەربانی چەند ماڵێکی پێك دەهێنا دانیشتبوون. هەموان گۆشت و برنج و شلەیان بەدەست دەخوارد، کەس بیری لەبەکارهێنانی کەوچك و چەتاڵ نەدەکردەوە. دووشتی جێی پێکەنینی هەموان لەئاهەنگەکەدا روویان دا: یەکەمیان، من بەدەنگی بەرز ئەو قسەیەم گوتەوە کە باوکم تووتی ئاسا فێری کردبووم: "میوانەکان، تا تێر دەبن بەسایەی کێرمەوە بخۆن". دووەمیان تڕەکەی (حەمە کوردە)ی منداڵ بوو کە لەکاتی خەتەنەکردندا لێی بەربووەوە. کابرای خەتەنەکەری دێنشین کە لەدێی سێوسێنانەوە هێندرا بوو، چەقۆ تیژەکەیی بەدەستەوە گرتبووو ئامادەی جێبەجێ کردنی کارەکەی بوو. هیچ منداڵێکی موسلّمان دەرباز نابێ. قسەی لەگەڵ منداڵەکەدا کرد.

ـ حەمە، بڕوانە ئەم چۆلەکە جوانە بەبنمیچی ژوورەکەوە وا بەسەر سەرمانەوە! هەر کە منداڵە چاویی روو بە ـ گوایە ـ چۆلەکەکە بەرزکردەوە، کابرا دەست و برد بەجووڵەیەکی خۆ بەخۆی سامناك نەشتەرکاریەکەی کرد و، حەمەیش تڕێکی زلی کەند کە تا چەندین ساڵ جێی سەمەرەو پێکەنین بوو لەدێدا.

لەگەڵ چەند منداڵێکی دیکەیشدا بەشداری ئاهەنگێك بووم کە حەوت شەو لەماڵی کاکە حەمەی مامۆستاماندا بەبۆنەی لەدایکبوونی (مەحموود)ی یەکەم کوڕیەوە بەردەوام بوو. ئاهەنگەکە شەو پاش شێوکردن دەستی پێدەکردو، تا بەرەبەیان بەگۆرانیو یاریو چاو مێوژو خورما خواردنەوە درێژەی دەکێشا. پیرە دایکەکەی کاکە حەمەیش هەر جینگە جینگی بووورپای منداڵەکە بن، تا "شەوە" زەفەری پێ نەبات، کە چاو لەدووی منداڵی تازە زاواو بۆ هەلێکی لەبار دەگەڕێت تا ئارەزوە چەپەڵەکانی بەخنکاندنی منداڵەکە تێر بکات بەر لەوەی بگاتە حەوتەمین ڕۆژی تەمەنی.

(مینە دۆم)ی چکۆلە گۆرانیبێژێك بوو، لەئاهەنگی شەوانەی مامۆستاماندا، بەلای ئێمەی منداڵانی دێوە باشترین گۆرانیبێژ بووو، گۆرانیەکانیمان بە وشەو ئاوازەوە لەبەر کردبوو. ئەو خەڵکی دێیەکە نەبوو، بەڵکوو لەگەڵ خێزانەکەیدا لەجێیەکی نەزانراوەوە هاتبوون، تا سەردەمێك لەدێیەکەدا کە کەلوپەلی خۆماڵیی ئەوان - کلاش - ی تێدا بەرمێن بوو، جێ نشین بن. ئەو خێزانە لاوێکی (ئەحەشەشە) ناویان لەگەڵدا بوو، فێری گۆرانیی هەڵپەڕکێی دێهات بوو بوو. ئەو هاوڕێیەکی خێزانەکەو دڵداری (بەهێ)ی کچی بوو. ئامادە بوو لێکدا لێکدا گۆرانی بڵێت. بەتایبەت بۆ ئەو کچۆلانەی کە جارێك بەئاشکرا لەوشەی گۆرانیداو، جاری وایش هەبوو بەچەند جوولانەوەیەکی هونەریو بێ پەردەی چاوو برۆی دڵداریی لەتەکدا دەکردن. (بەهێ)یش بەش بەخۆی لەسەر پێ بوو گۆرانی بۆ کوڕو کاڵان بڵێتو، عەشقبازیان لەگەڵدا بکاتو، هەوڵی کەمەنکێشکردنیانی دەدا. ڕەفتاری لەم چەشنە لەدێدا ئاسایی نەبوو، مەگەر بۆ خەڵکانێکی نامۆی وەك قەرەج.

بەلام قیبلەی کوڕیژگەی دێو کچی خەونەکانیان (فاتە) بوو، کە لەدێیەکی نێزیکەوە لەگەڵ خێزانەکەیدا هاتبوو، لەدەست کابرایەك رایانکردبوو کە دەیویست بەزۆر بیهێنێ: فاتە، خاوەنی جوانی‌یەکی کەم وێنەو لەدەوروبەری بیست ساڵیو

لەنێوان سپی پێستو گەنم ڕەنگداو بەژن زراف‌و بەلەباریکەو لەش ڕێک‌و گونجاوو گەردن‌و سینە جوان‌و خاوەن قژێکی ڕەشی ئاوریشمی‌و دووچاوی گەورەی کل ڕێژکراو - بەبێ کل بەکارهێنان - بوو. هێمن‌و ڕووخۆش‌و، خسڵەتی مێیەتیی تێدا سەرڕێژی کرد بوو. لەبزە گرتندا، دوو لێوی گوڵینی تەنک‌و دوو ریزدانی جوان‌و ڕێکی دەردەخست. کە دەخەنییەوە، هەردوو چاوە جوانە گەورەکەی‌و دوو گونا تەڕو پاراوەکەی‌و، تەنانەت پرچە پەخشان‌و بەوردی شانە کراوەکەیشی بزەیان دەگرت. گەردانەیەکی سادەی لادێیانە لەگەردنە جوانەکەی ئاڵا بوو، وەك مرواری‌و یاقووت دەردەکەوت. وا بەنازەوە دەڕۆیشت، سەرنج‌و ئارەزووی لاوانی دەورووژاند. پێم وایە ئەگەر دەرفەتی بەشداریکردنی لەپێشبڕکێدا بۆ بڕەخسایە، زۆر بەختی بەدەستهێنانی ناسناوی شای جوانانی هەبوو. هێندە جوان بوو، وەك بڵێی تێکڕای خوای جوانان هەوڵی خۆیانیان یەکخستووە تا بەم وێنەیە دروستی بکەن.

بەڵام لەبریی ئەوەی ئەم جوانی‌یە ببێتە هۆی ژیانێکی بەختیار بۆی، وەك ئەوە لەهێندێك کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا ڕوو دەدات، کەچی لەم کوردەوارییە پاشکەوتوودا کێشایەوە بۆ کوێرەوەری‌و بێزاری‌و زوو مردنی، چونکە دوا جار ناچار کرا- بەبێ خوایشتی خۆی - شوو بەو لاوە بکات کە هەم دەیبوغزاندو هەم لەبەر ئەویش هەڵاتن‌و هاتنە دێی تەکێ. ئەو لاوە کوڵە بنەو لووت پان‌و لچ ئەستوورو چەناگە درێژو ڕەنگ زەردو - بەگشتی - ناشیرین بوو. فاتە، دوو ساڵ پاش شوو کردنی، مرد.

# شێخ مەحموودی حەفید لەتەکێ

بچووك‌و لەدەوروبەری چوار ساڵیدا بووم، کاتێك شێخ مەحموودی حەفیدی پێشەوای نەتەوەییی شۆڕشگێڕ گەیشتە دێیەکەمان. لەچەند ڕووداوێك بەدەر، هیچم لەسەر ئەو دیدەنیە بەبیردا نایێ. پیاوە چەکدارەکانی بەسەر ماڵەکانی‌دێدا کە لەنەوەد ماڵێك پتر بوون، دابەش بوون‌و، خۆی‌و چەند کەسێك بوونە میوانی ماڵی ئێمە، سەرباری لەماڵەوە نەبوونی باوکم چونکە ئەو ڕۆژە لەسلێمانی بوو. بیرمە خزمێکم بردمیە لای شێخ‌و، ئەویش لەسەر کۆشی دانیشاندم‌و ماچی کردم. لێی پرسیم: ئاخۆ ئەسپمان هەیە. وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ دوو ماینمان هەیە.

- ئەی لەکوێن؟

- باوکم لەترسی چەتەی شێخ مەحموود بردوونی بۆ سلێمانی.

هەر ئەو وەڵامەم دایەوە کە لەماڵەوە چەندەها جار بیستبووم. نەمدەزانی پرسیارکەر شێخ مەحموود خۆیەتی. نازانم داخۆ وەڵامەکەم لەدڵەوە کاری لەشێخ کرد یان نا. بەڵام لەیادمە بەنەرم‌و نیانی دەستیی بەپشتمدا کێشاو گوتی:

- ڕاستت کرد! تۆ ڕاستت گوت‌و، هێشتاکە فێری درۆ نەبووی. بۆیە لەمنەوە شایانی پاداشتی.

دەستیی بۆ توورەکەیەکی لەخامی بۆرکراوی تەنیشتی درێژ کردو، بڕێکی لێ دەرهێنا، پاشتر بیستم پێنج رووپیی کانزایی بوو، نایە دەستم. کە پارەکەم وەرگرت، دەستبەجێ میوانەکەم بەجێ هێشت. گەورەو بچووکی دێ وەك یەك حەسوودی‌یان پێ دەبردم.

تا ئێستا دیمەنی ئەو پیاوە لەخوێن هەڵکێشراوەم لەزەیندا جێگیرە کە دوو چەکدار گرتبوویان‌و بەکۆڵانێکدا روو بەمزگەوتی دێ بەکێشیان دەکرد. دەم‌و دەست قاوی

ئەوەدا کەوت کە کوژراوەکە خەفیە " واتە سیخوڕ"ی رژێمی حوکمدارەو بەدزییەوە هاتووەتە نێو دێ‌و، هێندێك دێنیشین خەبەریان لێ‌داوە. لەوە دەچێ کەس بیری لەوە نەکردبێتەوە کە بیگرن تا لێی بکۆڵنەوەو بیدەن بەدادگا، بەڵکوو هەر کە یەکەم جار دۆزرایەوە کوژراو، مەسەلەی ناشتنیشی بووە گیروگرفتێك‌و دێنشینەکان بوون بەدوو تاقمەوە: یەکیان فتوای دەدا کە لەگۆڕستانی دێدا ناشتنی نا جایزە، سیخوڕیی بەسەر شێخی مەلیکەوە کردووەو ئەویش دەیکات بەکافرو نابێ لەگۆڕستانی دێدا بنێژرێت. جووتیاران شێخیان بەمەلیك ناو دەبرد. جووتیارێکی بەساڵدا چووی ژیر چارەسەرێکی گونجاوی بۆ گیروگرفتەکە دۆزییەوە، پێشنیاری کرد لەتەنیشت گۆڕستانەکە بنێژرێت. بەمە لەیەك کاتدا لەدەرەوەو ناوەوەی گۆڕستانەکەدا دەبوو.

ڕۆژی دوایی کە شێخ دێیەکەی بەجێ هێشتبوو، فڕۆکەیەك بەسەر دێدا سووڕایەوەو هێندێك بلاوکراوەی بەردایەوە. دانەیەکیان لێ‌برد بۆ شێخ عەبدوڵڵای مەلای دێ، تا پێیان بڵێت چیی تێدایە. مەلا پێی راگەیاندن کە پاش یەك سەعاتی تر دێ بوردومان دەکرێت. هەموان هەڵاتن‌و، بوو بەژاوە ژاوو قیژو هوور. من لەنێو ئەو کۆمەڵە ئافرەت‌و منداڵانەدا بووم کە پەنایان بۆ بەردێکی گەورەی نیزیك دێ برد. دیمەنی فڕۆکە هێرشبەرەکەم لەبیرە کە خەریك بوو بەر لق‌و پۆپی دار هەرمێی بەردەم بەردەکە بکەوێ. فڕۆکەوانەکە تەماشای ئافرەتەکانی دەکرد، دڵنیا بوو لەوەی کە هیچ چەکدارێك لەو ناوەدا نییە، بۆیە بوردومانی نەکرد. کە فڕۆکەکە رۆیشت‌و دێنشینان گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان‌و، بەهۆی کاکە حەمەی مامۆستامانەوە زانییان: بلاوکراوەکە لەهەڕەشەی بۆمباباران کردنی ئەو دێیانە زیاتری تێدا نییە کە پشتگیریی مەلیك مەحموود دەکەن، ئەوەیان پێ سەیرو جێی حەپەسان بوو. دەرکەوت مەلا نەیزانیبوو بلاوکراوەکە بەراستی بخوێنێتەوە.

چەند ساڵێك پاش ئەم رووداوە، سەر لەنوێ‌و لەقوپیی قەرەداخی نیزیکی دێ، چاوم بەشێخی حەفید کەوتەوە. ئەوسا یەکێك بووم لەو منداڵانەی کە لەسەربانێك

تەماشای یاریی دامەمان دەکرد، کاتێك پیاوێکی چەکداری نیوە ڕووت بەدیمەنێکی عەنتیکەوە بەرانبەر بەدێ قوت بووەوە. کە پێشوازیی لێ کراو هۆی ئەم وەزعە سەیرەی لێ پرسرا، گوتی:

- شێخی مەلیك ناردوومی. خۆیو پیاوەکانی لەقۆپین، داوای خواردن دەکات.

- ئەی بۆچی بەڕووتی هاتووی؟

- چونکە ناچاربووم بەمەلە لەچەند گۆمێکی نێودەربەند بپەڕێمەوە، بۆیە جلەکانم لەوێ بەجێ هێشت، تا لەگەڕانەوەدا لەبەریان بکەمەوە. هەر دەرپێو تفەنگەکەمم هێشتەوە.

شێخ لەدەورانی دووەم جەنگی جیهانیدا جارێکی دی لەرژێم ڕاپەڕی. دێ بەپەلە کەوتنە خواردەمەنی کۆکردنەوە، لەگەڵ دوو کاوڕدا بۆ سەربڕین. تاقمێکی زۆری دێنشینان کە منیشیان لەنێودا بووم، بەرەو قۆپی جوولاّ. تاقمەکە چوار ئافرەتی لەباشترین چێشتپەزەکانیان تێدا بوو. لەشێخ نێزیك بووینەوە، لەنێوان پیاوەکانیداو لەسەر کانیی دڵگیری (مۆتار) دانیشتبوو. بەتەوسەوە بانگی کرد:

- لەوە دەچێ ئێوە ئافرەتی جوانیشتان بۆ هێنا بێن.

ڕەنگە ئافرەتە لادێیەکان، سەرەڕای ئەوە کە پیر بوونو جوان نەبوون، بەم لەبز شیرینی نواندنە دڵخوش بوو بن. شێخ جلو بەرگی باوی کوردیی لەبەردا بوو. مشکیی لەسەر بەستبوو خەنجەرێکی دەبانی کرد بوو بەبەر پشتێنەو لەکەیدا. تفەنگەکەیی - بڕنەو لەجۆرە کۆنەکەی - بەفیشە لەغەوە لەتەنیشتی خۆی دانا بوو. شێخ جووتیارەکانی سەرسام کردو سەرنجی ڕاکێشان، کاتێك بەگوللەیەکی بڕنەو کەوێکی لەمەودایەکی تا ڕادەیەك دوورەوە کوشت. بەوە سەلماندی کە نیشانچی‌یەکی دەست ڕەنگینە.

من کە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانە دەهێنمەوە بیرم، هیچ شتێکی ئەوتۆیان تێدا نابینم کە بۆنی ئەوەیان لێ بێ: جوولاّنەوە نەتەوەییو ڕزگاریخوازە چەکداریەکەی شێخ ڕێکخستنی بەخۆوە دیبێ، نە لەکاروباری سیاسیو نە داراییو نە سەربازیدا.

ناوەڕاستی سالآنی چل بۆ دوا جار چاوم بەشێخ کەوت لەماڵە لادێییانەکەی لەدێی (داریکەلی). لەم دیدەنیەدا تەنیا یاوەرێکی باوکم بووم، جووتیارێکی(تەکێ) ڕووی لێ نابوو بچێتە لای شێخ، تا نامەیەکی لێ وەربگرێ بۆ فەرمانبەرێکی بەرپرس لەدەزگای دەوڵەتدا. بەخێر هاتنی کردین‌و، نیوەڕۆژەمان لەگەڵیدا کردو، سێ چوارسەعات ماینەوەو، بەبێ نامەی چاوەڕوانکراو گەڕاینەوە. شێخ لەداریکەلی ژیانێکی دێهاتیی ئاسایی‌و سادەی هەبوو، شوێنەواری ماندوویی‌و پیری‌و نائومێدیی سیاسی بەسەرو سیمایەوە دیار بوو.

لەدوا دواییەکانی سالآنی سیدا یەکەمین ئینگلیزم لەژیانمدا بینی.کابرا بەیاوەریی چەند پۆلیس‌و چاوساغێکی دێنشین لەقۆپی‌یەوە دابەزی بوو، هاتبووە دێیەکەمان. میوانمان بوو. جل‌وبەرگ‌و قژە زەردەکەی‌و بێ سمێڵەکەی سەرنجیان ڕاکێشا بووم. ئەوسا ئەگەر بویسترایە سووکایەتی یەکی گەورە بەلادێییەك بکرێت سمێڵی دەتاشرا، یا هەڕەشەی سمێڵ تاشینیان لێ دەکرد. ئەی چۆن ئەم پیاوە ڕێی بەخۆیدا سمێڵی بتاشێ ؟ شتێکی دیکەی سەیر ئەوە بوو حەوزێکی بچووکی لەقوماش دروست کراوی لەنێو ئەو ژوورەدا دانا کە تێیدا دادەنیشت. بڕێك ئاوی گەرمی کردە حەوزەکەوەو، خۆیی تێدا شوشت. پاشتر بیستم ئەو کەسە ڕاوێژکاری ئینگلیز بوو لەسلێمانی.

دێیەکەمان لەبناری چیایەکداو بەرانبەر بەدەربەندێك بوو کە نیزیکترین ڕێگەی بۆ قۆپیی قەراخ پێکهێناوە. ئەو دەربەندە جوانترین دەربەندی ئەو ناوە بوو بەدیمەنی دڵفڕێن‌و زۆریی تاڤگەی دڵگیرو گۆمی قووڵ‌و ڕوونیەوە. دێیەکە پایەیەکی ئاینیی باڵا دەستی هەبوو، چونکە زۆربەی دانیشتوانی بەپێی ئەو شەجەرەی بنەچەیەی کە لایانە، لەحەمزەی کوڕی مووسای کازم کەوتوونەوە. حەمزە پاش ئەوەی خەلیفەی عەباسی باوکیی بەبەندکراوی ژەهر خواردوو کرد، لەترسی جەورو ستەمی ئەو لەبەغدا هەلات. خەڵکی دێ وا ڕاهاتبوون، لەهەر کەسێکی دیکە زیاتر، سوێند

بەئیمام حەمزە بخۆن. هەروەها ڕاهاتبوون کە مەترسی یەك هەڕەشەی لیٚ دەکردن، یا کە باران کەم دەبوو بۆ زەرعاتەکانیان، سەریان لەنزرگەکەی دەداو داوای خێرو بەرەکەتیان لیٚ دەکرد. باش لەبیرمە، من لەچەند ڕێپێوانێکدا بەشداریم کردووە کە لەدێیەکەوە دەستی پیٚ دەکرد تا نزرگەکە. داوامان لەئیمام دەکرد: لەخوا بپاڕێتەوە تا باران ببارێنیٚ.

بەڵگەی پیٚ ناویٚ، مزگەوتە گەورەو کۆنە شوێنەوارەکەی دیٚ کە ڕووبەری بیناکەی دەگەیشتە دووسەد مەتری چوار گۆشەو پانیی دیوارەکەیشی پتر لەدوو مەتر، لەم پایە ئاینی - مێژووییەی دیٚ بەدوور نەبوو. پیرانی دیٚ دەیانگوت: ئەم مزگەوتە بەر لە۷۵۰ ساڵ دروست کراوە. هەرچی چۆنێك بیٚ، ئەو مزگەوتە بینایەکی شوێنەواریی شایانی دەست پێدا هێنان بوو وەك پەرستگایەك ـ مۆزەخانەیەك. صدام لەنیسانی ۱۹۸۸ دا هەموویی تەختو تاراج کرد.

دێیەکە بەوەیش دەناسرایەوە کە کەسانێکی زۆری تێدا بوو دەیانتوانی قورئان بخوێننەوە. ئەم کارە بەچەشنە ڕۆشنبیرییەك دادەنراو، دەبوە هۆی ئەوەی کە خەڵکەکەی لەدێیەکانی تر ڕێزیان لیٚ بگیرێت. بەڵام قورئان خوێندن سەبارەت بە(سالان)ی جووتیار بوو بەگێچەڵێکی وا کە دەیان ساڵ باسیان کرد. ئەوەیش وەختێك کە سالان بەگوێدرێژی بارەتریٚ بەسەرەوە گەیشتە دێی تەپە گەڕووس لەسەنگاو بۆ گۆڕینەوەی ترێکەی بەدانەوێڵە. کەیبانووی خانە خویٚ دڵی بەهاتنی کرابووە وە بەڵکوو نامەیەکی بۆ بخوێنێتەوە کە لەعەولڕەحیمی مێردیەوە بۆی هاتبوو. عەولڕەحیم بۆ جێیەکی دوور چوو بوو بۆ نان پەیدا کردن. سالان پاش هەولو کۆششێکی بیٚ ئەندازە چەند وشەیەکی نامەکەی خوێندبووەوە، لەوانە وشەی "سیروان" (ناوی کوردیی ئەو ڕووبارەیە کە خوارتر بەڕووباری دیالە ناودەبرێت)و دابوویە پڕمەی گریان، لەبەر ئەوەی کە ـ گوایە ـ مێردەکەی لەڕووباری سیرواندا خنکاوە. هەموو دیٚ لەگەڵیدا گریا بوونو، کۆمەڵێکی گەورەی دێنشین کەوتبوونە

ڕێ، بەڵکە لاشەی خنکاوەکە بدۆزنەوە. سالان خۆی داوای کردبوو نامەکە پێشانی مەلای دێیەکی دیکە بدەن. دەرکەت کابرا نەخنکاوە، بەڵکوو نووسیویە: "پاش دوو ڕۆژ لەگەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە، لەڕووباری سیروان دەپەڕێتەوە". هەلی ئەوەم بۆ هەڵکەوت لەسالان بپرسم: ئاخۆ باس و خواسی ئەم ڕووداوە هەڵپەستراوە، یا زێدە ڕۆییی تێدا کراوە؟ لە وەڵامدا بەسادە لەوحی‌یە لادێییانەکەیەوە گوتی: ڕووداوەکە ڕاست وەکوو چۆن گێڕدراوەتەوە ئاوا بووە.

دێنشینان هیچ کەسێکیان هێندەی پۆلیس کە بەرجەستە کردنێکی زیندووی دەسەڵاتی حوکمدار بوو لەو سەردەمەدا، نەدەبوغزاند. ئەوانە ڕۆژێک لەڕۆژان هەواڵێکی خۆشیان نەدەهێنایە دێ. سەردانی دێ بۆ ئەم پۆلیسانە بارێکی گرانی ماددی و گیانیی دەخستە سەرشانی جووتیاران، چونکە دەبوو جۆ بەئەسپەکەیان و باشترین خواردنیش بدەنە خۆیان. چاوەڕوانی ئەوەیش دەکرا هێندێکیان بۆ سەربازی بانگ بکرێن، ئای کە قینیان لەسەربازی بوو!. یا بزنانەیان لێ بستێنن. یا بەهۆی سکاڵای قەرز دەرێکەوە چەند کەسێکیان داوا بکرێن تد. مەلا خدری پۆلیسی یەکخەت لەنێو دێنشیناندا بەدڕی و بێ ئابڕوویی ناوبانگی دەرکرد بوو. ئەم پۆلیسە ئەندامی مافیایەك بوو بەڕێوەبەری ناحیە سەرۆکایەتیی دەکرد. هەر لاوێکی بهاتبایە ڕێ دەیگرت، تا بەبیانووی سەربازییەوە بیباتە مەڵبەندی ناحیەو، دەبوو لەوێ بەرتیل بدات بۆ بەربوون. ئەو تاکە هەواڵەخۆشەی کە پۆلیس دای بەگوێی دێنشیناندا ئەوە بوو: "ئەو کەسەی بەرازێك بکوژێ و هەردوو گوێچکەی تەسلیمی حکوومەت بکات، ١٥٠ فلس وەردەگرێ".

جاران بەراز کوشتن تەنیا بۆ خۆشی و ڕابواردن، یا بۆ پاراستنی زەرعات بوو. بەڵام وا ئەمڕۆکە بووەتە مایەی ڕزق و ڕۆزی بەخشین. ئای کە شتێکی سەیرو دڵخۆشکەر بوو! ئەوانەی کە بەدوو بەرازدا دەگەڕان بۆ کوشتنی زۆر بوون. ئەوەندەی نەخایاند فەرمانبەرانی دەوڵەتیش بوونە هاوبەشی ئەم خێرو بێرە، بەوەی کە لەگەڵ

جووتیاراندا پێکهاتن چەندین گوێچکەی دەستکرد لەچەرمی یەك بەراز دابڕن‌و بیاندەن بەحکوومەت، بەمەرجێك پاداشتەکەی لەنێوان هەردوو لادا دابەش بکرێت.

"گوڵە"ی بێوەژن دەهات، دەیبردم بۆ ماڵی خۆی. یەکجار پەرۆشی تەماشا کردنی سەگەکەی (بۆرە) بووم، کە کەرەکەیی لەماڵەوە را بۆ سەر لەوەڕگەکان دەبردو وەفادارانە بەدرێژاییی ڕۆژ پاسی دەکردو کەمێك بەر لەخۆر نشینیش دەیهێنایەوە ماڵ. بۆرە کە پاسی کەرەکەی دەکرد، نەیدەهێشت هیچ حەیوانێك یا مروڤێك توخنی بکەوێ.

عارف کە جووتیارێکی نەبووی وەجاغکوێر بوو، کەرەکەی خۆی کوشت، چونکە مانی گرت‌و لەرێگەی ڕوو بەئاسیاودا هەنگارێکی هەڵنە هێنایەوە. بەڵام کە بەرەو ماڵ دەبووەوە، چوار ناڵە تێی دەتەقاند. کەرەکەیی بەخەنجەر لەت‌و پەت کردو، بارەکەیی لەدووریی کیلۆ مەترێك لەدێوە لەنێو خۆڵ‌و خوێندا بەجێ هێشت‌و هاتەوەو، بەدەنگی بەرز جنێوی بەکەرو خاوەنەکەی‌و دروستکەرەکەی دەدا.

(کا خولە)ی جووتیار شوانی مەڕو ماڵاتی کەم‌و زۆر هەموو دێ بوو. پێم وایە هیچ ڕۆژێك نە بەدەست نەخۆشی‌یەك نەئازارێکەوە ناڵاندوویەو، هیچ ڕۆژێکیش نەبوە بەئاوی گەرم خۆی بشوات، یاسا بوون بۆ دەست یان خۆشتن بەکاربێنێ. هەرگیز گوێی بەدنیا نەداوەو، خۆیی لەکاروباری کەسانی دیکە هەڵنەدەقورتاندو، هەوڵی نەدەدا ناوی مەلیکی عیراق یا ناوی بەڕێوەبەری ناحیەکەی بزانێ. کا خولە، بەپێچەوانەی زۆربەی شوانانی کوردەوە، فێری شمشاڵ لێدان نەبوو بوو. بەڵام شارەزایەکی راستەقینە بوو لەکاروباری مەڕو بزنداو، ڕۆژانە بەسەری دەکردنەوەو، دەیزانی ئەم یان ئەو مەڕە هیی کێیەو، کە ئێوارانیش رانەکەی دەدایە بەر بەرەو دێ دەیزانی چ سەرێکی لێ بزر بووە.

پڕ مەترسیترین بەسەر هات لەمێژووی سالآنی سیی دێدا، هێرشی گەلە گورگێك بوو بۆ سەر رانی مەڕو ماڵاتەکەی. شوانە چەکی ئاگرداری پێ نەبوو، تەنیا

پشتی بەسەگەکەی دەبەست. بۆ نەگبەتی، سەگەکە لەو ڕۆژەدا لەبەرانبەر گەلە گورگەکەدا تێشکاو هەلاّتو، شوانەیش لەترسانداو بۆ پەنا هێنانە بەر دێ ڕای کرد. کە جووتیارەکان گەیشتنە ئەوێ کارەساتەکە قەوما بوو، چونکە گورگەکان ٢٥٠ ـ ٣٠٠ سەریان لێ خافلکوژ کرد بوون. ئەگەر هەر گورگێک بزنێکی بەسەرو بەرەوە بخواردبایە، کارەکە ئاسان دەبوو. بەلاّم گورگەکان پێش هەموو شتێک شەیدای کوشتن بوون. هەر گورگێك بەبێ ئەوەی تیکەیەك لەقوربانی‌یە کوژراوەکەی بخوات، وازی لێ هێنا بووو پەلاماری یەکێکی دیکەی دابوو. یەکەجار قەپی بەقورتمی نێچیرەکەدا کرد بوو تا زەبرەکە گورچکبر بێ. بەشی گەورەی قوربانیەکان مەر بوون‌و هەولّی هەلاّتنیان لەدەست دوژمن نەدا بوو، بەپێچەوانەی بزنەوە کە بەراکردن یا هەلّگەڕان بەدارو بەرد دا دەکەوێتە خۆ دەرباز کردن. پاش کارەساتەکە، حەیوانە مردووەکان لەجێی خۆیان بەجێ هێلران‌و، ئەوانەیش کە دەستیان لێ شۆردرابوو سەربڕدران. ئەو بریندارانەشیان کە ئومێدی چارەسەریان لێ دەکرا گوێزرانەوە، تێکڕای مالاّن کرانە نەخۆشخانەی بەیتالّی‌و، دەرمانیشیان خوّلەمێش‌و پارچە پەڕۆی چلکن بوو. هەموو دێ، ڕەنگە بۆ یەکەمین جار بوو بێ لەمێژوویدا، تێر گۆشت بوون. زیانی (ئەفروز)ی پیرە بێوەژن لەهەر کەسێکی دیکە زیاتر بوو، چونکە هەر چوار سەر بزنەکەی لەدەست دا.

ئەم بێوەژنە، پێش ئەم ڕووداوە بەچەند ڕۆژێك، بەلاّیەکی دیکەی بەسەردا هات. لەسەربانێك دانیشتبوو، تەشیەکەیی بەدەستەوە بوو. وای بەچاك زانی بوو یازدە جووچکە چکۆلەکەی لەکولانە دەربکات، تا ڕاستەوخۆ بەبەرچاویەوە بەرخۆر بکەون‌و هەوای پاك هەلّبمژن. لەترسی کۆلارە کە باڵدارێکی نا پاکی دوژمنیانە، بەیەك بەن هەموویانی پێکەوە بەستبووو جەمسەرەکەیی بەپێی دایکەکەیانەوە گرێ دابوو. کە پیرە ژنە خافلّ بوو بوو دوژمنەکەیان شالاّوێکی تیژ ڕەوی هێنا بوو، جووجەلّەیەکی بردبوو. جووجەلّەکانی دیکە بەرزبووبوونەوەو، بەنەکە لەبەر ڕاکێشان پچڕا بوو،

هەریەك جووجەڵە لەگەڵ دایکەکەیدا مابووەوەو کۆلارەیش ١٠ جووجەڵەکەی دیکەی هەڵگرتبوو بۆ شوێنی مەبەستی خۆی.

جووتیاران مەڕو ماڵاتەکەیان دۆڕاندو، بەئومێدی ئەوە دڵی خۆیانیان دایەوە کە لەباجی بزنانەی ئەو ساڵە ببەخشرێن. بەڵام هیواکانیان نەهاتنە دی، چونکە باجەکەیان لێ کۆکرایەوەو، هەر نەختێکی لێ داشکێندرا. فەرماندەری مەفرەزەی باجگرتن لەوەڵامی جووتیاراندا کە داوایان کردبوو باجیان لێ نەستێنن، گوتبووی:

- حکوومەت دادپەروەرەو، چەند سەرتان لەدەست دابێ باجەکەیتان لێ ناستێنێ.

دوو پیری لەهەموان بەتەمەنتر لەدێدا هەبوون. یەکیان مام کەریم کە تێکەڵی خەڵك دەبووو ئامۆژگاریی دەکردن‌و کێشەی نێوان دێنشینانی بەلادا دەخست. بەڵام مام فەرەج دوورە پەرێز بووو زۆر تێکەڵی خەڵك نەدەبوو، جووتە کوڕەکەی پاش ژنهێنانیان لێی جوێ بوونەوەو، لەگەڵ (خەجێ)ی کچیدا مایەوەو، رازی نەبوو بیدات بەهیچ کەسێك‌و، هەریەکێك داوای بکردبایە وا وەڵامی دەدایەوە:

بەگەرماو سەرما خۆمم رەتاندووە تا ئەم کچە پەروەردە بکەم، بۆ ئەوەی ئەویش خزمەتم بکات، نەك گەنجێك کە هێندەی گەردێك خۆیی بەبەخێوکردن‌و پەروەردەکردنیەوە ماندوو نەکردووە بیبات. خەڵکینە واز لەمن‌و کچەکەم بهێنن!

خەجێی داماو هەر شووی نەکرد. لەساڵانی هەشتادا لەدێی (بەلەکجاڕ)بینیم، پیرەژنێکی پشت کوماوە بوو، بۆ خۆ دەربازکردن لەبۆردوومانی فڕۆکە، بەگۆچانێکەوە دەڕۆشت هەتا خۆی بگەیەنێتە کونە تەیارەکە.

لەو دیمەنانەی کە لەبیرمدا چەسپاون شەڕو شۆڕێك بوو رۆژێکیان لەنێوان ئافرەتانداو لەهەواری هاوینانی دێدا قەوما. ماڵەکان - یا کەپرەکان - ئەڵقەیەکیان بەدەوری پانتاییەکدا پێکهێنابوو، شەوانە ران‌و گاگەلی دێی تێدا دەمۆڵی. شەڕو شۆڕەکە لەناوەڕاستی پەچەکەدا کراو، پتر لەبیست ئافرەتی تێدا بەشدار بوون. کێشەکە بەشەڕە جنێوی نێوان دوو ئافرەت دەستی پێکرد. ئەمجا تێك ئالان‌و،

بەتوندی کەوتنە یەکتر کوشتن‌و برین. لەگەڵێك ماڵەوە ئافرەتی دیکە بەهانایانەوە هاتن‌و، دوو تاقمی بەشەڕ هاتوو دروست بوون، لەدیمەنێکی کۆمیدیی راستەقینە دەچوو. هیچ ئافرەتێك تێلاً یا چەقۆ یا بەردی بەکارنەهێنا، چەکی عادەتی گازو چڕنووك‌و قژ راکێشان‌و هاوار بوو. هەر کە ئافرەتێکی دیکە قژی ئافرەتە شەڕکەرەکەی رادەکێشا، خۆیی بەدەستەوە دەدا. هێندەی نەدەبرد ئافرەتە براوەکە، بەهۆی قژ راکێشانیەوە لەلایەن ئافرەتێکی دیکەوە، دەبەزی. دەرکەوت سەرکەوتنی تاقمێکیان بەسەر ئەوی دیکەیانداو بەپشت بەستن بەئامرازە بەکارهێندراوەکانی شەڕ مەحاڵە. دوا جار جووتیارێکی بەساڵدا چوو هات‌و گۆچانەکەیی هەڵسووڕاند، کێشمە کێشەکەی بڵاوە پێکرد. ئێوارە کە پیاوەکانیان لەئیش هاتنەوە، هێندێك ئافرەت لەسزای ئەو کارەدا چینێکی باشیان لێدان خوارد.

بەهەزار حاڵ عانەیەکم (چوار فلس) لەدایکم پچڕی بۆ کڕینی "ئیجازەیەکی مار گرتن" لەحسەن ناوێکی فەڕاشی تیمارخانەی ناحیە، کە ژمارەیەك ماری لەتوورەکەیەکی قوماشدا هەڵگرتبوو بەدێهاتدا دەگەڕا بۆ فرۆشتنی ئیجازە یا پەچکە کاغەزێك کە چەند وشەیەکی بەدەستخەتێکی ناخۆش تێدا نووسرا بوون، وەك ڕاسپاردەیەك بۆ مار کە بەهەڵگرەکەیەوە نەدات. دان بەوەدا دەنێم کە من تەنانەت دوای وەرگرتنی ئیجازەکەیش، بەخۆمدا ڕانەدەپەرموو مار بگرم. ئەو قسەیەی حەسەن ترساندمی، کە ماری وا هەیە ئیجازە نایگرێتەوە. نازانم داخۆ دەیزانی کە ماری ژەهرداروهیی بێ ژەهریش هەن. لام وا نییە بیتوانیبایە ئەم دوو جۆرە لێك جویێ بکاتەوە. من خۆم دیم، کاتێك جووتیارەکان داوایان لێ کرد ئەو مارە بگرێ کە بەر لەچەند سەعاتێك بەعەبدوڵڵای جووتیاریەوەی دابوو، ئەمجا بۆ دۆزینەوەی خاکی ژێر دار هەنجیرەکەیشی بۆ هەڵکۆڵدرا، لەوەڵامدا گوتی: " ئەو مارە بێ ئیجازەیە". عەبدوڵڵا نێزیکەی پازدە سەعاتێك پاش پێوەدان مردو، چووە ڕیزی ڕەئووف‌و عەبدولکەریمەوە کە هەردوو گەنج‌و لەقوربانیانی مار پێوەدان بوون.

یەکەمین مرۆڤی بەزەبری خەنجەر کوژراوم بینی، ناوی ( حسێن دۆخۆر)و خەڵکی دێی ( بەڵخە) بوو، بەدەستی دێنشینێکی دیکە کوژرا.ئەمە بەهۆی ئەوەوە بوو کە کێیان پێشتر پاراو بکات. پاش ماوەیەك، تەرمی بکوژەکەیشم دی، بەمەفرەزەیەکی پۆلیس بۆ قەرەداخ دەگوێزرایەوە.

باوکم لەسەفەرێکمدا بۆ سلێمانی، وای پێ خۆش بوو لەقوتابخانەیەکی ئێواران ناو نووسم بکات. بەسایەی سەری حوجرەکەی کاکە حەمەوە یەکسەر لەپۆلی دووەم وەرگیرام. زۆربەی قوتابییەکانی پۆل لەمن بەتەمەنتر بوون. ئێوارەیەکیان مامۆستا لەهەموو پۆلەکەی پرسی:

- کێ دەتوانێ ۸۸ لەسەر تەختە ڕەشەکە بنووسێ؟

منی منداڵی لادێیی نەمدەزانی ئەوانەی ئارەزووی وەڵام دانەوە دەکەن پەنجە بەرز دەکەنەوە، چاوەڕوان دەکەن تا مامۆستا ئاماژە بۆ یەکێکیان دەکات. بەدەنگێکی بەرزو تەواو وەك چۆن لەحوجرەکەی کاکە حەمەدا دەمانکرد، گوتم:

- من دەزانم.

مامۆستا هیچی نەگوت، بەڵام قوتابییەکان دایانە تریقەو هووڕێکی گاڵتەجاڕانە. ڕۆژانی دواتریش، هەر کە قوتابییەکان لەگۆڕەپان یا ڕاڕەو یا ژوورەکانی قوتابخانەدا دەیاندیم، سەر لەنوێ پێ دەکەنینەوە. دوو لاوی سمێڵ با بڕ پتر لەقوتابییە چکۆلەکان زێدەڕۆییان لەپێکەنیندا دەکرد. لەبەر ئەم هۆیە قێنم لەقوتابخانەدا هات‌و، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بۆ باوکم ڕوون بکەمەوە، پاش چەند ڕۆژێکی کەم وازم لێ هێنا.

من‌و محەمەدی پوورزام ئارەزووی سەیر سەیرمان هەبوو. چەند حەفتەیەك تێپەڕین‌و، ئێمەش هەموو ڕۆژێك تەزبیحێکی تازەمان بەدوو فلسی ڕۆژانەکەمان دەکڕی‌و، دەمانخستە سەر تەزبیحە کۆنەکەمان کە لەدە مەتر درێژ تر بوو. جاروبار دوو قوتووی بەتاڵمان بەجەمسەری دەزوویەکی لەپەنجا مەتر درێژ ترەوە دەبەست‌و

دەمانکردە تەلەفۆنی نێوانمان. کاتێك محەمەد سەعاتێکی تازەی دەکڕی بەپەلە دەکەوتینە هەڵوەشاندنیو، پاشان نەماندەتوانی بیبەستینەوە، فڕێمان دەدایە سەبەتەی خۆڵەوەو مەسەلەکەمان لەپوورم دەشاردەوە. پوورم بەش بەخۆی مامۆستای حوجرەی هێندێك کچۆڵە بوو.

پایزی ١٩٤٠ نەخۆشی زۆری بۆ ( بابا عەلی)ی باپیرم کە تەمەنی پێی نابوە هەشتاکان، هێنا. ڕێکەوت منیش لەسلێمانی بووم. ئەو پیرە مێردە نەخۆشە کە دیارترین زانای ئاینیی زەمانی خۆی بوو لەشاردا، لەسەر بەڕە کۆنێکی چکۆلەی نێو ژوورێکی بچووك ڕاکشا بوو و مێزەرە سپیەکەیی لەسەر نەکردبووەوە. ماڵە شێوە کۆختەکەی لەنێزیك مزگەوتەکەی بووبەبێ دەنگ خۆیی لەبەر ئازاردا ڕادەگرت. بێیم نایێت پزیشکێکی بۆ هێندرا بێ، یان دەرمانێکی نۆشداریی خوارد بێ. دیدەنیکەران لەخەڵکی گەڕەكو برادەران هاتو چوویان دەکرد. ئەوانە بۆ ماوەیەکی کورت لەسەر بەڕە کۆنێك دادەنیشتنو، دوایی شوێنەکەیان بۆ کەسانێکی دیکە چۆڵ دەکرد. باپیرم لەسەعاتێکی درەنگی شەودا لەگیانەلاّدا بوو. بۆیە باوکم مجەوری مزگەوتەکەی نارد تا مستەفا سەفوەت بێت. لەکاتی مردنەکەیدا، ئەو وئەندامانی خێزانەکەیشمان ئامادە بوون. مستەفا سەفوەت بەگەرمی تکای لەباپیرم کرد سلاّوی بگەیەنێتە باوکی کە چەند ساڵێك بوو مرد بوو.

باپیرم سەرباری پایە ئاینی ـ کۆمەلاّیەتیە بالاّدەستەکەی کەرێیان پێدەدا، ئەگەر خۆی حەزی بکردبایە، دەوڵەمەندو خۆشگوزەران بێ، کەچی بەهەژاری ژیاو بەهەژاریش مرد. خەڵك خۆشیان دەویست چونکە ئایندارێکی لەگەڵ خودا ڕاستگۆ بوو. شار سەر پاکی کەوتە خۆ بۆ بەڕێکردنی لەمزگەوتەوە بۆ گۆڕستانی سەیوان. چەند پیاوێك لەنێو ئەو کۆڕە گەورەیەی بەڕێکردنی تەرمەکەدا بوون تەپڵو دەفیان لێ دەدا، چەند قسەیەکیان دەگوتەوە کە نیشانەی خەفەتو شینگێران بوون. باوکم سێ ڕۆژ دوای پێشوازیکردن لەسەرخۆشیکەرانی شار، گەڕایەوە بۆ دێی(تەکێ) بۆ پێشوازیکردن لەسەرخۆشیکەرانی خەڵکی دێهاتی قەرەداخو گەرمیانیش.

## - ٢ -

# لەشــــاری سلێـــمانـــی

مردنی باپیرم بووە هۆی گۆڕانێکی ریشەیی لەژیانی خێزانەکەماندا، چونکە باوکمی خستە سەر کەلکەڵەی بەجێ هێشتنی دێو جێگیر بوون لەشار، لەترسی ئەوەی نەبادا "مەلایەکی ئاوەکی" دەست بەسەر مزگەوتی باوکیدا بگرێ. دێ بەگریانو فرمێسکەوە خێزانەکەمانی بەڕێ کرد، دوای ئەوەی کۆڵیان داو باوکمیان پێ قایل نەکرا لەگەڵیاندا بمێنێتەوە.

گواستنەوەمان بۆ شار نزمبوونەوەیەکی بێ ئەندازەی ئاستی گوزەرانی خێزانەکەی لەگەڵدا بوو، چونکە دەرامەتی کشتوکاڵی لەدەست داین. لەکاتێکدا خێزانەکە یەکێکی وای تێدا نەبوو بتوانێ ئیش بکاتو بەشداریی ژیاندنی ببێ، جگە لەباوکم کە دەبوو نان بۆ چواردە کەس - خۆیو دوو ژنەکەیو یازدە منداڵەکەی - پەیدا بکات. سەرەڕای میوان کە مەگەر بەدەگمەن ماڵەوە میوانی لێ بڕایە. باوکم پاش هەوڵو هاتوچوویەکی پتر لەدوو ساڵ، مووچەیەکی مانگانەی سێ دیناریی دەستگیر بوو. دووەم جەنگی جیهانیش کێشایەوە بۆ گرانیو کەمیی کەرەستەی خواردەمەنی. دەبور هەموو پێداویستەکانمان بەپارە بکڕین. بۆیە بەدەست هەژاریو برسێتییەوە گرفتار بووینو، نەماندەتوانی تەنانەت لەنانی ئاردی جۆو گەنمەشامیش تێر ببین. باوکم توورەکەی ئاردەکەی لەلای خۆی گل دابووەوە، تا رۆژانە بەشێکی دیاریکراو بدات بەهەریەکە لەدوو ژنەکەیو نەهێڵێ دەست بڵاوی بکەن.

لەشار هەستم بەدڵتەنگییەکی کوشندە کرد، هەردەم دڵم بۆ چیاو دیداهەڵگەڕانیو بۆ گۆمەکانی دەربەندو مەلە تێدا کردنیانو بۆ گەڕان لەدارستانەکانداو بەتایبەت لەقۆپیدا لێی دەدا. بەڵام بەرە بەرە لەگەڵ ژیانە تازەکەدا ڕاهاتم. بەبەردەوامبوونی پێوەندیی پتەوم بەپوورزاکەمەوە کە هاوڕێی منداڵیم بوو،

گەلێك بــرادەری تــازەم پــەیدا کــرد. جــا بەحوکمی‌پێگەیشتنم وەك کــوڕی زانایــەکی ئاینی کە پێوەندی‌یەکی بەتینی بەزانایانی ئاینیی دیکەی شارەوە هەبوو، پــێ بــەپێ پێوەندییەکی توند وتۆڵم لەگەڵ مزگەوت‌و فەقێکانی گەلێــك مزگەوتدا پەیدا کرد.

کاتێك لەخەڵکم دەبیست مشتومڕیان لەسەر جوولانەوەی رەشــید عــالی گــەیلانی دەکــرد لــە١٩٤١ دا، هیــچ لەسیاســەت حــاڵی نــەدەبووم. جــەماوەر لەگــەڵ جوولانەوەکەدا‌و، بگرە بەهۆی بوغزاندنی ئینگلیزەوە لەگەڵ هیتلەریشدا هاوسۆز بوون. خەڵکە سادەکە لەسەر ئەوە یەك کەوتبوون کە هۆی بەزینی رەشید عالی تــەنیا نا پاکیی هێندێك کەسی نێو خودی جوولانەوەکە بــوو. ئــەو هۆشــیارییەم نــەبوو کــە هەڵبپیچێ بەدووی دیوە سیاسیەکەی ڕووداوەکانی جەنگدا بچم. بەڵام ڕۆژانــە گوێــم لــەباس‌و خواسی خــەڵك دەبــوو لەبابــەت گرانیــی دەرەنجــامی جەنگــەوە. زۆر جــار دەمبیست خەڵکانیك هــەن لــەبازاڕ ئیش دەکــەن‌و لــەخوا دەپاڕێنــەوە هیتلــەر ســەر بکەوێ، چونکە بەســایەی ئــەوەوە لەماوەیــەکی کورتــدا زۆر دەوڵەمــەند بــوون. ئەمــە لــەکاتێکدا ئەوانــە بــەر لەجــەنگ هیچیــان شــك نــەدەبرد. ئێوارەیــەکیان خــەڵکانی کۆبووەوەی دەوری زۆپای مزگەوت دادو بێدادیان بوو لەدەست بەرز بوونــەوەی نرخــی گۆشت. حەمە ئەمینی بەرگدرووی هەژار وەڵامی دانەوەو گوتی:

- من چارێکی بنەبڕی ئەم گیروگرفتەم دۆزیوەتەوە.

یەکیان لێی پرسی: - ئەم چارە چییە؟

- لەمڕۆ بەدواوە نە گۆشت دەکڕم نە دەیخۆم.

دێمان بەجێ هێشت، بــەڵام پێوەندیمــان بەدێنشــینانی خــەڵکی تەکیــەو گــەلێك دێی دیکەوە هەر بەتوندو تۆڵی مایەوە. مەگەر چۆنها، ڕۆژ نەبوو ماڵمان میوانێکی جووتیاری لێ نەبێ. مزگەوتەکەی باوکم ئوتێلێکی هەمیشەییی ئەوانە بوو کە بۆ دار یا خەڵووز فرۆشتن یا بۆ سەردانی دائیرەیەکی دەوڵەت یا نەخۆشخانە.. تد دەهــاتن. زۆر جار داڵانە بچووکەکەی ماڵمان دەبوە تەویلەی کەر گەلی میوانەکان بــەدرێژاییی

ماوەی مانەوەیان لەشاردا. ڕۆژێکیان "قادر"ی برا بچووکم کەری یەکێکیانی لەدالانەکە دزی‌و، بەمنداڵانی فرۆشت بەچوارفلس‌و دار لاستیکێك. کە خاوەنی کەرەکە هاتەوە کەرەکەیی نەبینی، ڕۆیشت بەشوێنیدا گەڕاو لەگەڕەکێکی تر دۆزییەوە. چەند منداڵێك سواری بوو بوون‌و ژمارەیەکی زیاتریش دەوریان دابوو، پاش بێنەو بەردەیەکی توند، هەتا چوارفلسەکەی بۆ کریارەکەی نەبژاردەوە نەیاندایەوە.

هاتنی جێژنی ڕەمەزان یا قوربان ڕووداوێکی گەورە بوو بۆ منداڵانی سلێمانی: جلی تازە لەبەر کردن، جێژنانە وەرگرتن لەکەس‌وکارو دۆست‌و برادەرانی گەورە، دواتر بەشەقاماندا گەڕان‌و سوار بوونی ئەسپ‌و ئەو عەرەبانانەی کە ئەسپ ڕایاندەکێشی‌و شیرینی کڕین وشتی دیکە. ئێمە سەرەڕای ئەوەی کە لەجێدا ماییمان هەبوو، من لەوێ فێری سواری بووم‌و لەو ناوەدا بەبۆنەی هەر بووك گواستنەوەیەکەوە پێشبڕکێم لەگەڵ ئەسپ سوارانداا دەکرد. کەچی لەشار پارەم لەجێژنانەکەم دەدا تا سواری ئەسپێك ببم بۆ دووریی سەد مەتر. گەورەکان لەجێژندا هێندەیان بەس بوو سەر لەیەکتر بدەن، شیرینی‌و چا یا قاوە پێشکێشی یەکتر بکەن. لەکاتێکدا ئەو ڕۆژانە فیستیڤاڵێکی ڕاستەقینەی منداڵان بوو. لەجێژندا زۆرترین پارەم دەهاتە دەست‌و کەم‌و زۆر هەموویم خەرج دەکرد. زۆرترین جێژنانە کە دەستم کەوتبێ شەش پەنجایی بوو، نووریی شێخ صاڵحی شاعیرو هاوڕێی باوکم ئەو ڕۆژەی کە چووین بۆ دیدەنیی دایمێ.

جێژنێکیان نەکرا جلی تازەم بۆ بکەن. بۆیە بۆیەم بەچوار فلس کڕی‌و، کەوا کۆنەکەمم پێ بۆیە کرد. ئەوسا لەسەرەتای هەرزەکاریدا بووم. یەکەم ڕۆژ لەبەرم کرد، بێ باك لەوە کە کراسە سپیەکەی ژێر کەواکەم سەوز بووە. ڕۆژی دووەم، کاتێك دانەویم هێندێك شیرینی لەدەستگێڕێکی دانیشتووی سەر شۆستەی شەقامە

قەرەباڵغەکە بکڕم کەڵلەیی بووم، چونکە کەواکەم دڕاو تەریق بوومەوەو گەڕامەوە بۆ ماڵ وەك بڵێیت خەڵك هەموو کەوتوونە تەماشا کردنم و پێکەنینیان بەحاڵم دێت.

لەشار، هەر لەماڵ دانیشتبووم و درێژەم بەخوێندن دەدا. سەرەتاکانی (النحو و الصرف)م خوێند. باوکم مامۆستای سەرەکیم بوو. کتێبێکم خوێند ناوی(تصریف الزنجانی) بوو. پێم وا بێ لەنێزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە هەر دەخوێندرێت. لەتەمەنی شازدە ساڵیدا بووم، وەختێك باوکم پێی لێ کردمە کەوش کە بچم بۆ مزگەوتێکی قەراخ یا هەڵەبجە یا بیارەو وەك فەقێیەك بخوێنم، بەڵکوو ببمە زانایەکی ئاینی و پاشتر پارێزگاریی مزگەوتەکەی باوکم بکەم، وەك چۆن ئەو دوای مردنی باوکی پارێزگاریی کرد. بەڵام ئارەزوەکەیم بەجێ نەهێناو لێم نەشاردەوە کەدەمەوێ لەباتیی خوێندنی ئاینی بچمە قوتابخانەیەکی ئاسایی ئێواران. ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئاین بخوێنم، من ڕەتم دەکردەوە. سەرەنجام چارەسەرێکی مام ناوەندیمان دۆزییەوە: هەر لەماڵ بمێنمەوەو، داواکاریەکەی ئەو و هیی خۆیشم جێبەجێ بکەم. بۆیە لەقوتابخانەی ئێواران ناونووس کرام. لەهەمان کاتیشدا درێژەم بەخوێندنی(النحووالصرف) دا تا ڕادەی وەرگرتن و دەسەڵات بەسەردا شکان. کە خوێندنی سەرەتاییم تێپەڕاند، وەکوو لاوێك بەشداریم لەکۆکردنەوەی ئیمزادا کرد لەسەر عەریزەیەك کە داوای کردنەوەی ناوەندییەکی ئێوارانی تێدا دەکرا. داواکەمان قبوول کراو، ناوەندیی ئێوارانمان بۆ دامەزرا. بەڵام نیوچە خۆماڵی(ئەهلی) بوو، دەبوو بەدوو قیست کرێی ساڵانەی خوێندن بدەین: هەر قیستێك ٤٫٥ دینار بوو. زۆر بەزەحمەت ئەو پارەیەم بۆ دابین دەکرا.

من پێش تێهەڵچوونم لەکاری سیاسی بەشێکی زۆری کاتم لەگەڵ برادەرە فەقێکانمدا دەگوزەراند، بەتاوو تاوەوە چاوەڕوانی ئێوارەی هەموو دووشەممەو پێنج شەممەیەکم دەکرد، تا بچمە ئەو جێیەی کە کۆمەڵێکی لەو فەقێیانە لێ بوو بۆ ئەوەی چەند یاری‌یەکی خۆش لەحوجرەی مزگەوتێکدا بکەین. هەردوو ڕۆژی

سێشەممەو هەینی پشووی خوێندنی فەقێ بوونو پشتاو پشت بۆیان مابووەوە. بەهاوکاریی ئەحمەد بانی خێلانیو عەزیز جوانڕۆیی کومەڵەیەکی ڕۆشنبیری ـ کۆمەلایەتیی نیوچە سیاسیمان بۆ فەقێیان دامەزراند. کۆمەڵە لەکۆبوونەوەیەکی دەستەی گشتیدا سەرکردایەتیی هەڵبژارد. ئێمە بابەتەکانی جوگرافیاو بیرکاریو هیی لەم چەشنەمان بەئەندامەکان دەخوێند. تاقمێکی بەرهەڵستمان لێ پەیدا بوو، لەوانەیە بەنێوە نێوی هێندیك مەلا بوو بێ، بەکافرو بلاوکردنەوەی بێ ئیمانی تاوانباریان دەکردین.

فەقێکان بەتێکڕاییی ٢ ـ ٤ فەقێ بۆ هەر مزگەوتێك بەسەر مزگەوتەکاندا دابەش بوو بوون. موستەعیدەکان دەرسی سوختەکانو زانا ئاینیەکانیش هیی موستەعیدەکانیان دادەداو، هەم بەو نانە کە ڕۆژانە کۆیان دەکردەوە ـ لەهەر ماڵێکی گەڕەك نانێك ـو هەم بەدەستگیرۆیی یا چێشتی هێندیك ماڵ لەئێوارانددا دەژیان. کۆمەڵگا خۆی لەماوەی خوێندنی فەقێکاندا ژیاندنیانی لەئەستۆ گرتبوو. بەم پێیە بەدرێژاییی چەند سەدەیەکی یەك لەدوای یەك توێژی ڕووناکبیری کۆمەڵگا دروست دەبوو.

لەنێو کوڕانی قوتابیی گەڕەکیشدا برادەرم هەبوو. نیزیکترینیان لەمنەوەحەسەنی عەنبەرخانو کەریمی شەریفو هیی دیکە بوون، لەدووکانی عارفو هاشم (دواتر عەلی فەوتاو) دادەنیشتینو چەند سەعاتێکی کەمان بەباسو خواسی خۆشەوە بەسەر دەبرد. بەشەوقەوە چاوەڕوانی مانگی ڕەمەزانم دەکرد، لەبەر شەو نشینیی شەوە بەتامەکانی کە لەپاش نوێژی تەراویحەوە دەستی پێدەکردو بەتەقاندنی تۆپی پارشێو دوایی دەهات. باوکم سەرتاسەری ڕەمەزان لەگەڵ تاقمێك برادەریدا لەزانایانی ئاینیو هێندێك هاوڕێیان بەنۆرە لەنێو مزگەوتەکاندا شەو نشینییان دەکرد، کاتەکەیان بەپێکەنینو نوکتە گێڕانەوەو دامە کردنو جاروباریش بەگۆرانیو بەستە گوتنەوە بەهاوبەشیی گەنجانێکی گۆرانیبێژی وەك سالح دیلانو

قادری حاجی حسێن‌و هیی دیکه بەسەر دەبرد. ئەو کۆڕە شەونشینەیش هەموو شەوێك چاو میوەهاتی دەخوارد.

(بێخود)ی شاعیر بەشدارێکی هەمیشەیی شەو نشینیی رەمەزان‌و یاریکەرێکی سەرەکیی دامەکردن بوو. پێوەندیی دۆستایەتیی نێوان باوکم‌و بێخود هەر لەسەردەمی خوێندنی تافی لاوییانەوە بەتین بوو. بێخود خۆی پیاوێکی رووخۆش‌و لەقسەکردندا زمان پاراو بوو، گەلێك نوکتەی لەبەر بوون بەنوکتەی جنسیشەوە، نەخوازەلاّ ئەوانەیان کە تایبەتن بەکاری جنسی لەگەڵ کوڕدا. هەروەها حەزی لەبەستەو گۆرانی‌گوتن دەکردو پێوەندیی بەهێندێك لاوی گۆرانیبێژەوە هەبوو. هەر لەماڵی براکەی ژیاو، هەرگیز ژنی نەهێنا. نازانم لەبەر چی.

شەوێکیان سەید عەلیی بیسمیللا لەکۆڕی شەونشینیەکەدا ئامادە بووو بێ دەنگ دانیشت، تەماشای یاریی دامەی دەکرد. بەلاّم وازی لێ نەهێندرا خۆشی لەشەو نشینیەکەی وەربگرێ. گەورەکان هانی ئێمەی منداڵیان دا هەتا وشەی (بسم الله) لەسەر پەچکە کاغەزێك بنووسین‌و فرێی بدەینە بەردەمی. کە خوێندیەوە بەتووڕەییەوە هەستاو کەوتە جنێودان‌و کاغەزەکەی دڕاندو لەکۆڕەکە کشایەوە. دوای ئەوە لەهیچ شەونشینییەکدا نەمبینیەوە.

* * *

(قانع)ی شاعیر کە سەری لەسلێمانی دەدا، هۆدەیەکی لەمزگەوتەکەی باوکم بۆ خۆی دەکرد بەئوتێل. بیرمە لەژوورەوە چامەیەکی بۆ کۆمەڵێکی بچووك خوێندەوە، باسی هەژاری‌و بەشبڕاویی خۆیی تێداکردبوو. بەم شیعرە گوێگرانی سەرسام کرد. قانع شاعیرێکی دێهاتیی بۆ زەمانی خۆی قابیل بوو، لەرژێمی حوکم‌و دەرەبەگایەتی‌و مرۆچەوسێنان بەقین بوو.

* * *

ماڵەکەمان لەپاڵ ئەوەدا کە گیرۆدەی دەستی هەژاریو نەبوونی بوو، گیروگرفتێکی دیکەی هەمیشەییی تێدا هەبوو، ئەویش دوژمنایەتیی نەگۆڕی نێوان دایکمو دووەم ژنی باوکم بوو. دایکم وەك دەستدرێژیکەرێك تێی دەڕوانیو پێی وابوو کە هاتووە ببێ بەشەریکە بەشی لەمێردەکەیدا. ئەم گیروگرفتە، کاتێك ئێمە لەلادێ بووینو ئەویش لەشار، تا رادەیەك چارەسەر کرابوو. بەڵام کە هەردوو ژنە وایان لێ هات شەوو رۆژ لەنێو ماڵێکی بچووکدا بەرانبەر بەیەکتر بن، گیروگرفتەکە توندو تیژ بووە وە. لام وابێ باوکم ئەو کاتە پەیی بەگیروگرفتی دوو ژنەییی پیاو برد، بەتایبەت لەهەلو مەرجی هەژاریو نەبوونیدا. زۆر جار نوکتەی لەبارەی پیاوی فرە ژنەوە دەگێڕایەوە، لەوانە: یەکێکیان لەگەڕانەوەیدا بۆ ماڵ درەنگ کەوت. هەردوو ژنەکەی لەدوو ماڵی جیادا بوونو، ئەو بەنۆرە لەلایان دەمایەوە. کە لەدەرگاکەیدا ژنە پێی وابوو فێڵی لێ کردووەو تا ئەو کاتە لەلای ژنی دووەم بووە. بەقینەدا چوو، دەرگاکەی لێ نەکردەوەو لەپشت دەرگاکەوە قیژاندی:

- بچۆرەوە بۆ ئەو شوێنەی‌کە تا ئێستاکە لێی بووی.

کە لەدەرگای دووەم ژنی دا، هەمان وەڵامی درایەوە. ناچار چوو بۆ مزگەوت، تا ئەو شەوە لەماڵی خواو دوور لەهەردوو ماڵەکەی خۆی بخەوێ.

باوکم پاش چەند ساڵێك لەپێکەوەو لەسەر یەك ماڵی بچووك ژیانی هەردوو ژن، پارچە زەویەکی بچووکی کڕی، رۆژێك بوو چاخانەی بەناوبانگی (سەرچیمەن) بوو. دوو هۆدەو هەیوانێکی بەقوڕ تێدا دروست کردو، دایکمی لەگەڵ ئێمەدا بۆ گواستەوە. بەمە گیروگرفتەکە کەمێك هێور بووەوە، چونکە دووریی پەنجا مەتر هەردوو ژنەی لێك دادەبڕی.

وێستگەی کارەبا دروستکردن، یا کە خەڵك پێیان دەگوت: ئاشی ئەلەتریك، لەماڵمانەوە نێزیك بووو، گرمو هووڕی ماتۆڕەکە بەتایبەت لەوەرزی هاویندا کە لەسەربان دەنوستین بێزاری دەکردین. ئاوێکی گەرم لەوێستگەکەوە دەهاتو دەڕژایە

حەوزی مزگەوتی "هەمزاغا"وە. حەوزەکە بەتەختەکرابوو بەدوو بەشەوە، تا دوو کەس بتوانن لەیەك کاتدا خۆیانی تێدا بشۆن. خەڵك بەدرێژاییی وەرزی زستانو، بەتایبەت بەرەبەیانان شەوەکی بەسەر ئەم حەوزە گەرمەدا دادەبارین، چونکە ئیسلام ئەوەی بەسەردا سەپاندوون پاش جووتبوونیان لەگەڵ ژنەکانیاندا یا شەیتانی بوونیانو شتی وا دەبێ وسڵی خۆیان دەربکەن.

* * *

ژنێکی لادێیی میوانمان ئاواتی خواست دوای ساڵێك بێتەوە لامان، بینی ماڵەکەمان ڕووناکیی کارەبای تێدایە. دایکم وەڵامی دایەوە:

- چرا نەوتیەکەمان بەسە و پێویستیمان بەڕووناکیی کارەبا نییە. لەخوا بپاڕێوە بۆمان، بەڵکوو بەلووعەیەکی ئاو بێتە ماڵەکەمانەوەو لەئاو بەسەتڵ هێنان لەماڵانی دیکەوە ڕزگارمان بێ.

* * *

پوورم چەندەها جار حیکایەتی خێوێکی بۆ دەکردین گوایە لەکۆڵانێکی تەسکی نێزیك خانوە بچووکەکەی جێ نشین بوو بوو. منو محەمەدی کوڕیو منداڵەکانی دیکەیش بڕوایەکی تەواومان بەڕاستیی گێڕانەوەکەی هەبوو. خێوەکە شەوان زیاتر جووڵە جووڵی پێدەکەوتو، جار نا جارێك لەوێنەی پشیلە یا سەگ یا بزن یا مرۆڤێکی عەنتیکە.دا دەکەوتە ڕوو. پارشێوێکی ڕەمەزان کە کارەبای تێدا بڕا بوو، لەماڵەوە لێیان پرسیم: ئاخۆ دەتوانم چێشتی برنج ببەم بۆ پوورم؟ وەڵامم دانەوە: بەڵێ. قاپە برنجەکەم بەدەستەوە گرت تا بەتاریکە ڕێیەکی دەوری ٢٥٠ مەتریدا ببیەم. کە گەیشتمە ئەو کۆڵانەی کە خێوەکەی لێ بوو، وام هاتە بەرچاو خێوەکە دەبینم بەرانبەرم دێتو شێوەی پشیلەیەکی وەرگرتووە. هێزی جووڵانەوەم لێ بڕا یا تەواو پەکم کەوت، وەك بڵێی تەنێك ئاسن بەسەر سەرمدا بەردراوەتەوە. خۆمم دا بەسەر دەرگای ماڵێکدا، بەدەست کوتامو داوای فریاکەوتنم کرد. لەخۆوە کەوتمە

گوتنــەوەی وشــەی " بیســمیللا . بیســمیللا". دەرگاکــەم لیٚ نەکرایــەوەو کەســیش بەفریام نەگەیشت. بەڵام کـەمێك گـوڕم دایـەوە بـەرخۆم، توانیـم بەقاپـە خاڵیەکـەی دەستمەوە بکەومە ڕێ، گەیشــتمە مـاڵی پـوورم، بـەتوندیو بەمەبەسـتی فریاکـەوتن لەدەرگام دا:

- پووریٚ خێرا دەرگاکە بکەرەوە.

بەپەلە دەرگاکەی کردەوەو پرسیی:

- چیت لیٚ قەوماوە بسم الله الرحمن الرحيم ؟

- تووشی خێوەکە بووم.

- دەمزانی ئەمە دەقەومیٚ بسم الله الرحمن الرحيم.

پوورم لەگەڵ ئافرەتێکی دراوسێیاندا گەیاندمیــەوە مـاڵ. چـەند مـانگێك لـەوە بەدوا، شەو بوایە یا ڕۆژ، لەهەموو تاریکییەك دەترسام.

* * *

چاخانــە وەرزیەکــەی فــەرەج لــەنێو داری چنــاری دەوروبــەری شــارو لــەپاڵ مزگـەوتیکدا بـوو کـە نـاوی " تەکیـەی شـێخ سـەعید " بـوو: چـەند کورسـی‌یەکی بچووكو ساکار لەبەر سێبەری نێو دارەکانداو لەسـەر گیـا سـەوزەکەو لەبـەر هـەوای سازگاردا بوون. ئەوەی سەری لەچاخانەکە بدابایە دەیتوانی پیاڵەیەك چا بخواتەوە، یا پاقلەی کوڵاو یان کاهوو بەسـرکەوە بخوات. ئـەو دەمـە لـەتافی هـەرزەکاریدا بـووم. جاروبار لەنێو برادەراندا لەم چاخانەیەدا دادەنیشتم، ئـەوەم بەچڵـە پوپـەی شـادمانی دادەنا. ئـەو ڕادیویـەی کـە خاوەنەکـەی داینـا بـوو بەرنامـەی عـەرەبیی لەلـەندەنو قوبرسو ئەنقەرەوە بـڵاو دەکـردەوە، پـتر خـەڵکی بـۆ ئـەم چاخانەیـە بـەکێش دەکـرد. هەواڵەکانی دووەم جەنگی جیهانیمان لـەم ڕادیویـەوە دەبیسـت. ڕۆژێکیـان لاوێکـی خەڵکی دێی(تەکیٚ) کە فەقیٚو کوڕی مەلای دیٚ بوو، لەگەڵماندا دانیشت.. محەمــەد یەکـەمین جـار بـوو لـەژیانیدا ڕادیـو ببینـیٚ. کـە ڕادیوکـەی دی بــەلقی دارێکـەوە هەڵواسراوەو کەوتووەتە قسە کردن بەدەنگێکی بەرز، لیٚی پرسیم:

ـ کێ لەوێ قسە دەکات ؟

ـ ئەوە بێژەر(مذیع) ێکە لەلەندەنەوە، لەدووریی هەزاران کیلۆ مەترەوە، قسە دەکاتو لێرە گوێمان لێ دەبێ.

ـ چۆن قسەکە لەلەندەنەوە دەگاتە ئێرە ؟

ـ زانست دەیگەیەنێتە ئێمە.

ـ ئەوە مەحاڵە. سوێند بەخوا ئەو قسەکەرە شەیتانە.

نەمدەتوانی قەناعەتی پێ بکەم کە قسەکەرەکە مرۆڤێکی وەك ئێمەیە، لەلەندەن لەژوورێکدا دانیشتووە. بەڵام ڕێکەوت هات بەهانامەوە. ڕادیوکە لەو کاتەدا کەوتە ئایەتی قورئان خوێندن. لەبرادەرەکەمم پرسی: ئەی شەیتان بۆی هەیە قورئان بخوێنێتەوە؟ وەڵامی دایەوە: ئەستەغفیروڵڵا. شەیتان قەت ناتوانی ئایەتی قورئان بخوێنێتەوە.

* * *

سەید عەلیی (کووتاڵفرۆش) بەدەمانچەکەی گوللەیەکی نا بەسەری کچە بیست ساڵانەکەیەوە. کچە لەو بەیانیە زووەدا نوستبوو. گوتیان: هۆیەکەی پێوەندییەکی دڵداری بوو کە گەیشتبوە ڕادەی ئیشی جنسی کردن لەگەڵ لاوێکی هاوڕێیدا. توێژێکی بەر بڵاوی دانیشتوانی سلێمانی، بەتایبەت لەلاوان، نارەزا بوونو بەبەشداریکردن لەبەرێکردنی تەرمی کچەکەدا بۆ گردی سەیوان ـ وەك بڵێی شەهید کراوە ـ هەستی تووڕەییان بەرانبەر بەباوکە بکوژەکەی دەربڕی. باوکی بەند کراو حوکمی ١٠ ساڵ بەندیی بەسەردا درا.

دراوسێیەکمان کچێکی جوانی هێنا. دیارە بەبێ ئەوەی کە پێشتر هیچ پێوەندییەکیان لەنێواندا بوو بێ. لەیەکەم شەوی زاوایەتیدا بۆی دەرکەوت ـ بەقسەی خۆی ـ گوایە لەکچێنی کەوتووە، چونکە بێ بن بوو و پارچە پەڕۆ سپیەکەی سوور نەکرد. بۆیە دەمو دەست وازی لێ هێنا، سەر لەبەیانیی ڕۆژی دوایی بەیەکجارەکی دەری کرد.

لاوێكی خزمیشم چیرۆكێكی پێچەوانەی لەگەڵ ژنەكەیدا هەبوو. چووە پەردەوەو نەیتوانی نە یەكەم شەوو نە شەوانی داهاتوو ئیشی جنسیی لەگەڵدا بكات. هەواڵەكە بڵاوبووەوەو كوڕە میزاجی تێكچوو. هێندیك دەیانگوت هۆكەی ئەوەیە لەكاتی مارەكردندا جادوویەك كراو. بۆیە دەبوو داوای یارمەتی لەژنە جادووكەرێكی (گوڵە نانی) ناوی ناسراوی شار یا لەهاوڕێیەكی ( عاسە بیجەرێنە)ناو بكرێت، ئەوانە بەپارەیەكی كەم جادوویان دەكردو جادوەكی پێشووی فیتی كەسێكی دیكەیان پووچەڵ دەكردەوە. ئیشی ژنەی جادووگەر سەری گرت. هەرچییەكی كرد بۆ خۆ تێهەڵقورتاندن لەپشت پەنجەرەوە تەماشایم كرد. كوڕە چووە ژوورەوە بۆ لای ژنەكەی‌و، توانیی ئەو قەلاّ لەگیران نەهاتووە ببڕێ كە لە١٠ ڕۆژی ڕابردوودا لێی عاسی بوو بوو.

* * *

ئیش‌و كاری خەڵكی ڕەشۆكی بەمەبەستەوە لەدائیرەی تەجنیدی سلێمانی ڕادەگیرا، تا خەڵكەكە بۆ ڕاییكردنی بەرتیل بدەن. بێ هوودەو بەبێ بەرتیلدان ماوەی سێ چوار ڕۆژ هەوڵی جێبەجێكردنی ئیشی دێنشینێكی خزمم دا. ناچار نیشانەیەكی دیاریكراوم لەسەر چارەكە دینارێكی كاغەز نووسی‌و، دامە جێگری ئەفسەرە (كاتب)ە كە. ئیشەكە جێبەجێ كرا. بڕیاری شكات كردنم دا. بۆیە چوومە لای ئەفسەری تەجنید كە كوردو كوڕی بنەماڵەیەكی ئەریستۆكراتی سلێمانی بوو. هەموو شتێكم بۆ ڕوون كردەوە. پێم وابوو سزای كاتبەكانی دائیرەكەی دەدات. تا مەسەلەكە تەواو ساخ نەبوەوە، دەركم بەوە نەكرد كە ئەویش بەشدارێكی سەرەكیی ئەو بەرتیلانەیە كە وەریاندەگرن. هەر ئەوەندە جێگری ئەفسەرەكەی بانگ كردو بەهێمنی‌و بەبێ هیچ قسەیەكی ناخۆش پارەكەی لێ وەرگرتەوەو دایمەوە، گوتی:

- ئێستا دەتوانم بتگرم، چونكە بەرتیلت داوە. بەڵام ئەمجارە ئەوە ناكەم. پارەكەت ببەوە، جارێكی دیكە قەرەی ئەم دائیرەیە نەكەوی.

* * *

جێژنی نەورۆز لەسلێمانی لەناوەڕاستی ساڵانی چلەوە بوو بەفیستیڤاڵێکی میلليی ڕاستەقینەی وا کە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی شار هاوبەشییان تێدا دەکرد. ڕۆژی فیستیڤاڵەکە هەر لەبەیانیی زووەوەو بەدڵێکی شادەوە دەچوونە دەوروبەری شار بۆ پەنا گردی(مامە یارە)، ئەو جێیەی کە لاوانو منداڵانو پیران لێی کۆدەبوونەوە تا ئاهەنگی جێژنی نەتەوەییان بگێڕن. ئیتر لەوێ، لەچەند شوێنێکی جیاجیادا هەڵپەڕکێو مۆسیقاو گۆرانیی پڕ جۆشو خرۆشی تاکەکەسیو بەکۆمەڵ بوو. لاوانی کوڕو کچ باشترین جلیان دەپۆشی، تا بێن بۆ فیستیڤاڵەکەو پێکەوە هەڵپەڕن. ئەمە لەکاتێکدا کە خێزانی وایش هەبوون لەسەر گیا سەوزەکەو دەوری سەماوەرو خواردنی تایبەتی ئەم ڕۆژەیان دانیشتبوون. جگە لەوە، چەندین کۆمەڵو دەستەی بچووکی لێرەو لەوێش هەبوون، هێندێکیان بەدامەکردنو هێندێکی دیکەش یاری کاغەز یا نوکتە بازییەوە سەرقاڵ بوون. ئەو پیرانەیش دەگمەن نەبوون کە لەگۆشەیەکی چەپەکدا دانیشتبوونو دەیانخواردەوە.

(پیرەمێرد) یەکەمین ڕێکخەری فیستیڤاڵەکە بوو. مشووری لێنانی سێ هەزار یاپراخی دەخوارد، تا بەسەر بەشداران یا هێندێکیاندا بیبەشێتەوە. (بێکەس) لەیەکێك لەم فیستیڤاڵانەدا شیعرە ناودارەکەی "بیستو حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم"ی لەبەردەم ئەو ئەفسەرە ئینگلیزەدا خوێندەوە کە لەتەنیشت پیرەمێردەوە دانیشتبوو.

* * *

بەر لەوەی بکەومە چالاکی سیاسی، جارێك بەغدام دیبوو. لەگەڵ باوکمو جووتیارێکی لاوی دێی(تەکێ)داچووم بۆگەڕان بە شوێن تەرمی لاوێکی دێنشینی (تاهیر) ناودا کە لەڕووباری دیجلەو نیزیك (سامەڕرا) خنکابوو، یان یەکێك لەتەماعی پارەکانیدا خنکاندبووی. ئەم داماوە بەدوو کەری بارە تووتن بەسەرەوە لەقەراخ دەرچووبوو. نەوەستابوو تا گەیشتبووە جێیەکی سەر ڕووباری دیجلە، بەڵکوو

بارەکەی بەنرخێکی گران بفرۆشێ. تووتنەکەی‌و ژیانی خۆیشی پێکەوە لەدەست دا. بێ ئەنجام هەوڵی دۆزینەوەی لاشەکەیمان دا. ئەم شێوە مردنەی تاهیر بووە هۆی خەفەتێکی هەمیشەیی‌و قووڵ بۆ عبدوڵڵای باوکی کە دێنشینێکی بەساڵدا چووبوو پاشتر بەمارپێوەدان مرد.

لەو سەردانەمدا، لەشەقامی رەشید بەدەر، هیچ شتێکم لەبەغدا نەبینی. لەو شەقامەدا رادەبوردم تا تەماشای کەل‌و پەلی پیشاندراوی کۆگاکان بکەم، ئەگەر چی لەچەند دە فلسی‌یەك زیاترم لەگیرفاندا نەبوو. دوو مانگ پاش گەڕانەوەم بۆ سلێمانی دینارێکم چنگ کەوت، ئاواتم خواست کە ئەوە پێش سەفەرەکەی بەغدام بوایە.

ئێوارەیەکیان لەگەڵ سێ خزمی دێنشینمدا لەهۆدەیەکی مزگەوتەکە بووین. یەکێکیان (ئەخان)ی جووتیارێکی هەژاری هەردوو چاو کز بوو، پێمگوت: "بڕوانە چۆن بەفوو گلۆپەکە دەکوژێنمەوە. پیاو دەبێ بزانێ لەکوێوە فووی لێبکات". کە پەنجەم دەنا بەسویچی دیوارەکەوە، فووم لەگلۆپەکە دەکردو دەکوژایەوە. هەردوو برادەرەکەی مەبەستیان بوو تیتاڵیی پێ بکەن، داوایان لەئەخان کرد بەر لەچوونە دەرەوەم خۆی تاقی بکاتەوەو فێر ببێ. ئەخان چەند جارێك فووی لەگلۆپەکە کرد تا بیکوژێنێتەوە. هەرگیز لەوە بەئاگا نەبوو کە سویچێك هەیە بۆ هەڵکردن‌و کوژاندنەوەی. دوو برادەرەکەی گلەییان لێ دەکرد چونکە نەیدەزانی دەبێ ڕێك فوو لەکوێ بکات.

* * *

هیتلەری حوکمداری نازی بەسەر هاوپەیماناندا، هاوسۆزیی خەڵکێکی زۆری لەعیراقدا بۆ خۆی بەدەست هێنا بوو، بەبێ ئەوەی خەڵکەکە هیچ لەسروشتی ئەو کابرایە تێ گەیشتبن. ئینگلیز هۆیەکی ئەو هاوسۆزییەیان بوو. بەڵام کە سوپای سۆڤیێتی کەوتە هێرشبردن‌و بەزاندنی سوپای ئەڵمانیا خەڵك میزاجی گۆڕا،

لەدەوڵەمەندانی جەنگ بترازێت کەس لەگەڵ هیتلەردا نەمایەوە. ئیتر سۆڤیێت بوونە جێی هاوسۆزیی ڕەشە خەڵکەکە.

* * *

کە لەدێ بووین، هاوبەشیی چەند ئیش و کارێکی سووکەڵەی کشتوکاڵم دەکرد، وەك پاراوکردنی تووتن و ئالیکدان بەماین و گوێدرێژەکەمان، یا لەگەڵ (فاتمە)و (عەتێ)ی جووتە خوشکمدا دەچووینە ڕەزەکەمان بۆ ترێ ڕنین و هەڵخستنی لەبەر خۆردا تا ببێ بەمێوژ. یان خولاوەمان دەکرد، بەوەی کە خۆڵەمێشمان لەمەنجەڵێکی گەورەدا بۆ چەند سەعاتێك دەکولاند، ئەمجا زەرداوەکەیمان لێ دەگرت تا بەتەنیاو بەبێ خۆڵەمێشەکە بکولێت و، هێشوە ترێکەمان بەر لەهەڵخستن تێهەڵدەکێشا. مێوژەکە بەم ڕێگەیە پاکترو جوانترو نەرمتر دەردەچوو. لەو هەشت ساڵەدا کە لەشار بەسەرم بردن، هیچ ئیشێکم نەدەکرد تا بڕێك پارەی پێ پەیدا بکەم، سێ ڕۆژ نەبێ کە ئیشی کرێکاریی بینام کرد ڕۆژی بەپەنجاییەك. بەڵام کە بووم بەلاوێکی هۆشیار، هاوینێکیان وەزیفەیەکی کاتیم لەدائیرەی تەندروستی بەنسیب بوو. سێ چوار مانگ بووم بەکرێکاری قەلاچۆکردنی مەلاریاو، بەمانگانەیەکی چەوری دوازدە دیناری کارم کرد. چەند دیاریەکم بەیەکەم مووچە بۆ دایکم و خوشکەکانم کڕی. ئێمە ١٠ کرێکار بووین، لاوێکی بەغدایی (عبدالکریم الیعقوبی)ناو بەرپرسمان بوو. جارێکیان کە سەرم لێداو چوومە ژوورەکەی، کتێبێکم لەبلاوکراوەکانی (ناودارانی ئازادی) - (اعلام الحریە) لەلادی. دەستم بۆ برد تا لاپەڕەکانی هەڵبدەمەوە، کەچی عبدالکریم لێی گرتم و گوتی:

- تۆ چیت داوە لەم کتێبە؟ وازی لێ بێنە. ئەمە کتێبێکی شیوعیی قەدەغەیە.

* * *

- ٣ -

# چوونه نێو جەنگەی سیاسەت

شار ڕێبازی ژیان‌و ڕێچکەی شتەکانی جێی بایەخی گۆڕی. ئێرە، بە پێچەوانەی لادێوە، چەندین کۆمەڵە خەڵك‌و بازاڕو قوتابخانەو دائیرەو چاخانەو رادیۆو رۆژنامەو کتێب‌و تد تێدا بوون. بە بێ ئەوە کەپێشتر هیچ پلانێکم هەبوو بێ، ڕوانیم وردە وردە وەك برادەرانی دیکەم بەرەو چالاکیی سیاسی ڕادەکێشرێم. کەشی سلێمانی هاندەری ئەوە بوو. هیچ یەکێك لە برادەرە نێزیکەکانم لە سەرەتای چوونە نێو ژیانی سیاسیدا لەگەڵدا نەبوو. بەڵام هاوڕێی دیکەم لە لاوانی بایەخدەر بە سیاسەت بۆ خۆم پەیدا کرد.

یەکەم بایەخدانم بە سیاسەت لە پەرەسەندنی ڕووداوەکانی دووەم جەنگی جیهانییەوە بوو. بە سەرکەوتنەکانی سۆڤێت بەسەر ئەڵماندا دڵشاددەبووم. هەر چاپکراوێکی کوردیم بکەوتبایە دەست دەمخوێندەوە. کوردی لەو سەردەمەدا تاکە زمانی خوێندنەوەم بوو. ئێمە بەشداریمان لە گۆڤاری کوردیی(گەلاوێژ)دا کرد بوو. عەلائەدین سەجادی کە پێشان لە مزگەوتەکەی باپیرم فەقێ بوو، ژمارەکانی گەلاوێژی بە خۆڕایی بۆ دەناردین. هەمان شت سەبارەت بە ڕۆژنامەی (ژین)کە (پیرەمێرد)ی دراوسێ‌و برادەری باوکم دەریدەکرد.

من بەر لە بڕانەوەی جەنگ بایەخێکی زیاترم بە خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامە ڕۆژانەیە دەدا کە لە بەغداوە دەهاتن. زمانە عەرەبیەکەم بەهێز بوو. هەر لەو ڕۆژگارەیشدا ڕۆژێکیان بۆ یەکەم جار ڕۆژنامەی بچووك‌و نهێنیی (القاعدة)م کەوتە دەست، بە پەرۆشەوە خوێندمەوە. دوای چەند ڕۆژێك ڕۆژنامەی نهێنیی(ئازادی)م چنگ کەوت کە بە زمانی کوردی دەردەکراو وەك (القاعدة) زمانی حاڵی حیزبی

شیوعی بوو. لەوە بەدوا، ئیدی خۆم بە دووی ئەو دوو ڕۆژنامەیەدا دەگەڕام. ئەوە سەرەتای پێوەندیکردنم بوو بە جوولانەوەی شیوعییەوە لە عێراقدا. بۆم دەرکەوت لایەنگری ئەو جوولانەوەیەم، چونکە لایەنی هەژاران دەگرێ کە ئێمەیش لەوانین‌و دژی کۆلۆنیالیزمی بێگانەو حوکمدارە ناوچەییەکانی نۆکەریەتی. هێندەی نەبرد دەستم کرد بەسۆراخی‌کتێبی مارکسی‌و پێشکەوتخوازو، هەرچی‌یەکم بهاتبایە دەست دەمخوێندەوە. یەکەم کتێبێك کە خوێندبێتمەوە لە بڵاوکراوەکانی زنجیرەی (اعلام الحریة) بوو. لەوانە: کتێبی(جمال الدین الافغانی)و، (کرومویل)کە ڕێبەرایەتی شۆڕشێکی کرد لە بەریتانیاو، (أبو ذر الغفاری) کە نوێنەریی بالێکی چەپڕەوی پێشکەوتخوازی دەکرد لە ئیسلامدا. هێندیك بەرهەمی(سلامە موسی) یشم خوێندەوە. بەڵام هیچ کتێبێك ئەوەندەی ڕۆمانی (دایك) ی ماکسیم گۆرکی کاری تێ نەکردم. ئەو کتێبە لە عێراق کرابوو بە عەرەبی. ئەمە لەو ڕۆمانە دەگمەنانەیە کە بۆ دووەمین جار ئارەزووی خوێندنەوەیم کردەوە.

کتێبخانەی (بیری نوێ) کە هیی لاوانی شیوعی‌و پێشکەوتخواز بوو، کارێکی دیاری کردە سەر چالاکیی فیکریم. کتێبمان بە کرێیەکی ڕەمزی دەخواست، تا بیخوێنینەوەو برادەران‌و ناسیارانیش هان بدەین بیخوێننەوە. لە هەمان کاتدا، لێرەو لەوێ لە هەوڵی کۆکردنەوەی کتێبی پێشکەوتخوازدا بووین‌و بەخۆڕایی پێشکێشی کتێبخانەکەمان دەکرد.

لە مێژ بوو بوومە یەکێك لەوانە کە ڕۆژانە هاتوچووی دووکانی (قادر ئاغای عەتار) یان دەکرد. خاوەنەکەی هێندیك سەکۆی بۆ دانیشتن تێدا دانا بوو، بە ڕۆژ کەسانی وەك من دەهاتن بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامە بەغداییەکان بە چوار فلس. هەر یەکێك ڕۆژنامەی بکڕییایە کابرا پێی دەفرۆشت. گیروگرفتی من ئەوە بوو کە ڕۆژی وا هەبوو بە زەحمەت چوار فلسەکەم بۆ دەدرا. بەڵام قادر ئاغا لێبوردنی هەبوو، قبوولی دەکرد هەر کاتێك پارەکە هەڵسووڕا ئەوسا بیدەن.

که ڕووناکیی کارەبا هاتە ماڵەکەی پوورم، پاشتر ڕادیۆیەکی کڕی. ئەمجا سەرچاوەیەکی گرنگی دیکەم بۆ بەدوودا چوونی هەواڵەکانی جیهان بۆ فەراهەم بوو، چونکە چوونە ئەوێ ـ لە هەر کاتێکدا بوایە ـ کارێکی شیاوو ئاسایی بوو.

*　　　*　　　*

جەنگ لە دوا ڕۆژەکانیدا بوو، کاتێك ئۆتومبیلێك گەیشتە سلێمانی دەزگایەکی گەڕۆکی سینەمای بەسەرەوە بوو، فیلمی سەرکەوتنی هێزەکانی بەریتانیاو هاوپەیمانانی بەسەر هێزەکانی هیتلەردا پیشان دەدا. گۆڕەپانی قوتابخانەیەکی ناو جەرگەی شار بۆ پیشاندانی فیلمەکان دەست نیشان کرا. ئێمە ڕقمان لە ئینگلیز بوو بەو پێیە کە داگیرکەر بوون، لەبەر ئەوەی دژی پیشاندانی فلیمەکانیان بووین. ئەوە بوو ڕێ بە پیشاندانیان نەدرا، چونکە دوای دەست پێکردنی پیشاندانەکە تەلەکان پچڕێندران و ئیشەکە تێك درا، هەوڕای دژ بە کۆلۆنیالیزم بەرز بووەوە. بۆیە ئۆتومبیلی سینەماکە کشایەوە. بیرم نایێ لەوە بە دوا هیچی لەم چەشنە کرابێ.

بە کۆتایی پێ هاتنی دووەم جەنگ قۆناخێك لە ئازادیی ڕادەربڕین و کەمکردنەوەی ڕاوەدوونان لە عێراقدا دەستی پێکرد. دەسەڵاتداران ڕێیان بە پێکهێنانی چەند حیزبێکی یاسایی دا، لەوانە ـ حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی (الحزب الوطني الديمقراطي) و حیزبی ئازادیخوازان (حزب الاحرار) و حیزبی سەربەخۆیی (حزب الاستقلال) و حیزبی گەل (حزب الشعب) و حیزبی یەکگرتنی نیشتمانی (حزب الاتحاد الوطني) (فەهد)ی سکرتێری (حشع )هەوڵیدا کەڵك لەم دەرفەتە وەربگرێ بۆ پەیدا کردنی ڕووکارێکی یاسایی، تا شیوعیەکان بتوانن چالاکیی سیاسییان ئەنجام بدەن. پێدەچێ ڕێکەوتنێك لە نێوان فەهدو (عەزیز شەریف)ی دامەزرێنی حیزبی گەلدا، تا ئەو حیزبە ئەم ڕووکارە بێ. بەڵام عەزیز شەریف لە سنووری ڕێکەوتنەکە دەرچوو. فەهدیش ناچار بوو بە شێوەیەکی جیاواز

مشووری مەسەلەکە بخوات. بۆیە دەستەی دامەزرێنی حیزبی رزگاریی نیشتمانی (حزب التحرر الوطني)، وەك دەستەی دامەزرێنی حیزبەکانی دیکە، داوای مۆڵەتی کرد. ئومێد نەدەکرا بەناوی (حشع)ەوە مۆڵەت وەربگرێت.

ئەوە بوو داوای مۆڵەت پێدانی حیزبی رزگاریی نیشتمانی لە پێتەختدا بە رێنوێنیی سەرکردایەتی حشع، هاو زەمانی رێکخستنی هەڵمەتێکی فراوانی پشتگیری بوو بە عەریزەو برووسکە ناردن لە شارو شارۆچکەکانەوە بۆ دەسەڵاتدارانی حکوومەت بۆ پاڵپشتی ئەم داوایە. ئەوە لە دوا دواییەکانی ١٩٤٥و سەرەتاکانی ١٩٤٦ دا بوو. من لەم هەڵمەتەدا چالاکانە لە شارەکەمدا بەشداریم کرد. ئەم بەشداریکردنە وەك پێناسەیەکی چوونە پاڵ حیزب وابوو، چونکە لەو کاتەوە خۆمم بە شیوعییەکی سەر بە حیزب دانا، بەبێ ئەوەی رۆژێك لە رۆژان کاغەزی خۆ پالاوتنم بۆ ئەندامەتی پڕ کردبێتەوەو ئاگادار کرابمەوە کە وەرگیراوم. لەبەر ئەوەی کە من ئەو ماوەیە بە هیچەوە خەریك نەبووم، جگە لە خوێندنی ئێواران کە کاتێکی کەمی لێ دەبردم، بۆیە هەر لە سەرەتای حیزبایەتیمەوە دەمتوانی تین و توانێکی گەورە بۆ کاری حیزبی ـ سیاسی تەرخان بکەم.

جەماوەری گەل، بە بێ ئەوەی لە یادیان بچێ کە ئێمە شیوعین، ئەو رۆژانە لە شاری سلێمانی دا بە ناوی (التحرریین)ەوە دەیانناسین. پێم وایە دەکرێت هەڵمەتی پشتگیری بۆ مۆڵەت پێدانی (حزب التحرر) بە خاڵی وەرچەرخانێك لە مێژووی جوولانەوەی شیوعی ئەو شارە دابنرێت، چونکە هەڵمەتەکە کێشایەوە: هەم بۆ وروژاندن و بە جووڵە خستنی کەشی سیاسی بە باری بەرژەوەندی (حشع)داو، هەم بۆ کۆبوونەوەی زۆربەی لاوان لە دەوری حیزب و وەرگێڕانی بە رێکخستنێکی جەماوەری کارامە.

ئەو رۆژانە چالاکترین لاوانی شیوعیم لە شاردا ناسی: وەك ئەنوەری حەمە ئاغا کە کاتێك هاتە نێو حیزب قوتابی بوو لە خانەی بالای مامۆستایان (کۆلێجی

پەروەردە)ی بەغداو، ئەحمەد غەفوور کە کاتێك هاتە ریزەوە قوتابی خانەی مامۆستایان بووو، (غەفوور کەریم)ی یەکێك لەو هەوەڵین کەسانە کە هاتنە پاڵ حیزبو، چەند لاوێکی دیکە.

ساڵی ١٩٤٦ بۆ یەکەم جار رۆژنامەیەکی کوردی نهێنی بە تایپڕایتەرو رۆنیۆ چاپکراوم خوێندەوە: ناوی (رزگاری) بوو. بابەتەکانی لە چاو هەردوو بلاوکراوەی (ئازادی)و (القاعدە)دا، زۆر دڵبەندیان نەکردم. ئەوسا وەکوو زۆربەی لاوانی سلێمانی، لە دوورەوە بە دووی هەواڵەکانی کۆماری مهابادی کوردستانی ئێراندا دەچووم‌و بابەتەکانی رۆژنامەی (کوردستان)م دەخوێندەوە. لە هەر ژمارەیەکدا بە شوێن شیعری تازەی هێمن‌و هەژاردا دەگەڕام، ئەگەر چی من لە ئاستێکدا نەبووم رێی شیکردنەوەی بارودۆخی ئەوێم لە سەر بنچینەیەکی راستو دروست بۆ خۆش بکات بەلاّم ئێمە هاوسۆزی ئەو کۆمارە ساوایە بووین کە کاریگەریەکی بەرچاوی لە بووژاندنەوەی جوولانەوەی رزگاریی نەتەوەییی کوردستانی عیراق بە گشتیو شارەکەماندا بە تایبەتی هەبوو. سلێمانی، سەبارەت بە کوردستانی عیراق، مەڵبەندی چالاکی نیشتمانیو نەتەوەییی شۆڕشگێڕانە بوو.

ساڵی ١٩٤٧ رۆژێکیان (مستەفا محەمەد)ی هاوڕێم کە قوتابیی دواناوەندیی سلێمانی بوو، سەری لێدام. منو ئەحمەد بانیخێلانیو فەتاحی جووتە هاوڕێمو فەقێی مزگەوتەکەی باوکمی هێنایە لاوەو لە ژوورێکی مزگەوتەکەدا لەگەڵماندا کۆبۆووەوە. قورئانێکی لە گیرفانی دەرهێناو لەبەردەماندا داینا، سوێندی داین:

- سوێند بەم قورئانە پیرۆزە دەخۆم کە من ناپاکی لە کوردو کوردستان نەکەم.

- لێم پرسی: ئەم سوێندە بۆچی؟

- با بتانهێنمە ریزەکانی پارتی (پدك)یەوە.

لام وابێ مستەفا تازەکی هەر بەو رێگەیە کە پەنای برد بوە بەر بۆ راکێشانی ئێمە، چوو بووە ریزی پارتیەوە. دەست پێشخەریم کردو وەلاّمم دایەوە:

ـ من سوێند ناخۆم‌و نایێمه پاڵ پارتی. حیزبی خۆمم هه‌یه، ئیشی تێدا ده‌که‌م.

هه‌ردوو هاورێکه‌یشم داواکه‌ییان ره‌تکرده‌وه‌و ژووره‌که‌مان به‌جێ هێشت. مسته‌فا شه‌رم دایگرت. چه‌ند مانگێك له‌وه به‌دوا هاته لام، مژده‌ی دامێ که وازی له پارتی هێناوه‌و هاتووه‌ته نێو حیزبمان.

* * *

ساڵی ١٩٤٧ بۆ یه‌که‌م جار بووم به رێکخه‌ری چه‌ند شانه‌یه‌کی حیزبی که خۆم هێندێك له ئه‌ندامه‌کانیانم راکێشا بووو هێندێکی دیکه‌یشیانم له چه‌ند هێلێکی دیکه‌ی رێکخستنه‌وه بۆ ره‌وانه کرا بوو. ئه‌ندامانی ئه‌و شانانه تێکه‌ڵێك بوون له کرێکارو زه‌حمه‌تکێش‌و قوتابی‌و هیی دیکه، له‌وانه: دارتاشێکی نووری ناوی تایبه‌ت به دروستکردنی بێشکه بۆ منداڵانی کوردو، کرێکارێکی بینای عه‌بدوڵلا ناوو، لاوێکی‌نانه‌وای ـ وه‌ك له بیرم مابێ ـ مه‌حموود چالاك ناو و، عه‌بدوول ناوێکی کرێکاری بینا.تد. پاش هه‌ڵمه‌تی کانوونی ١٩٤٨ ژماره‌ی ئه‌و که‌سانه که من رێکم ده‌خستن، زیادیان کرد. له ژوورێکی بچووکدا، یا راستتر بڵێم له ژێر خانێکی بچووك‌و تاریکی ماڵه‌که‌ماندا که نه په‌نجه‌ره‌ی هه‌بوو و نه له کاتی دیوار کردن‌و سه‌ر گرتنیه‌وه رۆژێك له رۆژان رووناکیی خۆری تێکه‌وتبوو، کۆبوونه‌وه‌ی حیزبیم به چه‌ند شانه‌یه‌کی حیزبی ده‌کرد. قوتوولکه‌یه‌کی نه‌وتیمان داده‌گیرساندو به‌وه رووناکمان ده‌کرده‌وه. به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ی نه‌ده‌خایاند ژووره‌که‌ی پڕ له دووکه‌ڵی ره‌ش ده‌کردو، ره‌نگی تفه‌که‌یشمان ره‌ش ده‌بوو. جاری وایش هه‌بوو کۆبوونه‌وه‌ی حیزبیم له‌و ژووره بچووکه‌ی مزگه‌وتدا بوو که دیواری به دیواری ژووره‌که‌ی باوکمه‌وه بوو. باوکم جاروبار سه‌رنجی ده‌داین‌و ده‌یزانی چی ده‌که‌ین. به‌ڵام ئه‌گه‌ر چێ پێی خۆش نه‌بوو خه‌ریکی چالاکیی سیاسی بم، بێ ده‌نگ ده‌بوو.

من له رۆژانی دادگاییکردن (محاکمه) ی یووسف سه‌لمان (فه‌هد)ی سکرتێری گشتیی حیزبدا، به‌ر له‌وه‌ی قادر ئاغا رۆژنامه‌ی پێ بگات جێیه‌کم له دووکانه‌که‌یدا

بۆ خۆم دەگرت. بێ ئارام چاوەڕێی ڕۆژنامەم دەکرد تا دەنگو باسی دادگاییکردنەکەی تێدا بخوێنمەوە کە لە چەند ڕۆژنامەیەکدا بڵاو دەبووەوە. دادگاییەکە ئاشکرا بوو، تۆمەت وە پاڵ نراوان پارێزەریان هەبوو، هۆڵی دادگایش پەیامنێرانی ڕۆژنامەو خۆولاتیی ئاساییی تێدا بوون. باسی ئەوە دەکەم تا بەراورد لە نێوان سەردەمی پاشایەتیو سەردەمی ڕژێمی بەعسیی تکریتیدا بکەم. کە دووکانەکەی قادر ئاغایشمان بەجێ دەهێشت، مشتومڕو قسەمان هەر لەسەر هەمان بابەت دەبوو.

* * *

مشتومڕی نێوان ئێمەو پارتییەکان بە درێژاییی ١٩٤٧ وپاشتریش توندو تیژ بوو. بەڵام تا ڕادەیەك دیموکراسیو ڕێزی یەکتر گرتنی تێدا پێڕەو دەکران. لێدوانەکە لەسەر دوو خاڵی سەرەکی بوو: ئایا کورد نەتەوە پێکدەهێنن یان نا؟ ئایا بوونی ڕێکخستنێکی شیوعی لە کوردستاندا ڕاستە یان نا؟ ئێمە بەوشکە باوەڕیو لەبەر ڕووناکیی نووسینەکانی ستالیندا لە بارەی نەتەوەوە قسەمان لەسەر مەسەلەکان دەکردو، پێمان وابوو ئەوە ڕایەکی ڕاستو دروستەو قابیلی قسە لەسەر کردن نییە. لایەنی دووەمیش هەر دوور لە ڕێوشوێنی زانستی قسەی دەکرد. بۆیە ڕاستی لە نێوان ئەمو ئەودا ون بوو بوو. دەمەتەقێی هەردوو لا خولیای قۆرخکردنی مافی چالاکیی سیاسیی تێدا بوو.

* * *

لە دێی تەکێ بووم کە هەواڵی سەرکەوتنی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ م لە سلێمانی یەوە پێ گەیشت. ڕۆژی دوایی چوومە نێو مزگەوتی دێو ئیزنم لە مەلا خواست تا ڕاستەوخۆ دوای تەواو بوونی نوێژی هەینی قسە بۆ ئامادە بوان بکەم. چەند دەقەیەك لەیەکەم کۆڕی سیاسیدا کە دێیەکە بەخۆوەی دی، ئاخاوتم. ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە ئەو ڕووداوە دەیسەلمێنێ ئەگەر گەل بەرێزی یەکگرتووەوە بۆ خەبات

ڕاپەڕێت، هەر ئەو بەهێز ترە. هەموان داوایان لە خواو ئیمام هەمزە کرد کە ببنە یاریدە دەری گەل دژی ئینگلیزو کافرانو خراپە کاران. یەکجار گران بوو دێنیشینی نەخوێندەواری لە دێیەکی دوورە دەستدا تەریك کەوتوو تێ بگات چ ململانێیەکی سیاسیی ئاڵۆز لە شەقامەکانی پێتەختدا لە کاردایە. کە گەرامەوە بۆ سلێمانی کەشێکی سیاسیی تازەی مایەی بووژاندنەوەو تەواو جیاوازم لە هیی چەند ڕۆژێك لەوەوپێش بینی. تەنانەت خاڵە مستەفایشم کە زانایەکی ئاینیی دیار بوو وجاران گلەییی لی دەکردم کە من ـ بە قسەی ئەو ـ شوێن خەیاڵ کەوتووم، کاتێك چاوم پێکەوت پیرۆزباییی سەرکەوتنی لا کردمو بە کەفو کوڵەوە گوتی:

ـ بەهادین، ئێستا کە باوەڕم بە گەل هێناوەو باوەڕم بەوەیش هێناوە کە تۆ لەسەر هەقی.

ئیتر عێراقیەکان بۆ یەکەم جارو لە هەلومەرجی ڕاپەڕینی مەزنی شۆڕشگێڕانەدا، دەیانتوانی بە ئازادیو بە خۆپیشاندان بڕژێنە سەر شەقامەکانو چییان دەوێ داوای بکەن، بەبێ ترس لە پەلامارو گرتنو کوشتن بەدەستی پۆلیس هەستو نەستیان دەربڕن.

خەڵك رقی هەرە زۆری لە کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزو حوکمدارانی ناوخۆی نۆکەری بوو. سلێمانی، هیچ شتێکی وای تێدا نەبوو نیشانەی بوونی راستەوخۆی ئەو کۆلۆنیالیزمە بێ لە مەڵبەندی ڕۆشنبیریی بەریتانیایی زیاتر کە بەڕێوەبەرێکی خۆماڵیی کوردی خەڵکی شارو لە لایەن گەلەوە نەفرەت لێکراوی عەلیی حاجی مەلا شەریف ناوێ هەبوو. بۆیە شیوعیەکان خۆپیشاندانێکی جەماوەرییان ڕێکخستو هوڕایان لە دژی کۆلۆنیالیزم کێشاو گەمارۆی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی ناوبراویان داو ئاگریان تێبەردا. عەلی لە چنگی خۆپیشاندەران دەرباز بوو، بەڵام مۆتۆرسایکلەکەی سووتێندرا. ڕۆژی دوایی کۆمەڵێکی گەورەی منداڵان کەوتنە سەر جادەو پاشماوەی مۆتۆرە سووتاوەکەیان هەڵگرتو بە خۆپیشاندانەوە ڕۆیشتن.

راپەڕینی کانوون وەزارەتی (صالح جبر)ی رووخاندو، دوای ئەویش داواکاریی گەل بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نوێنەرایەتی کە ئامادە بوو پەیمانی پۆرتسموت ئیمزا بکات تاوی سەند. کۆشکی شا ناچار بوو هەم ئەو ئەنجومەنە هەڵبوەشێنێتەوەو هەم بڕیارێك بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی نوێنەرایەتیی تازە دەربکات. (حشع) بڕیاری دا بەشداری هەڵبژاردن ببێ. ڕەنگە ئەوە لە مێژووی حیزبدا بۆ یەکەم جار بووبێ. ئینگلیز یاسایەکی بۆ هەڵبژاردن دانابوو یا لە هیندستانەوە هێنا بووی، لەوەی بەریتانیا خۆیشی جیاواز بوو بۆ دەستەبەر کردنی خۆسەپاندنی دەسەڵاتی راپەڕاندن بەسەر پەرلەمانیشدا گونجاو بوو. هەڵبژاردن بە پێی ئەم یاسایە بە دوو قۆناخ دەکرا: لە یەکەمیاندا تەنیا هەڵبژێرە نێرینەکان لە هەر بنکەیەکی هەڵبژاردندا چەند ١٠ کەسی یەکیان هەڵدەبژاردو ناوی "هەڵبژێردراوە پلە دووەکان"یان لێ دەنان. هەڵبژێردراوە پلە دووەکان لە قۆناخی دواتریشدا بە سەرپەرشتی هەمان دەسەڵاتدارانی ئیداری کۆدەبوونەوە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەندامانی ئەنجومەنی پیران سەرجەم لە لایەن پاشاوە دەست نیشان دەکران. وا بڕابووەوە کە پاڵێوراوانی کۆشکی شاو دەسەڵاتداران لە هەر جارێکدا هەموو کورسیەکانی نوێنەرایەتی یا زۆربەی هەرە زۆریان ببەنەوە. بەڵام راپەڕینی سەرکەوتووی کانوون بارودۆخەکەی گۆڕی‌و ئیتر دەسەڵاتداران پێیان نەدەکرا ساختە لە هەڵبژاردندا بکەن. ئێمە لە بەهاری ١٩٤٨و گەرمەی هەڵچوونی شۆڕشگێڕانەدا بەشداریی هەڵبژاردنی نوێنەرایەتیمان کرد. ئەوە یەکەمین کەرەت بوو کەمن لە هەڵبژاردندا بەشداری بکەم‌و ئازادانە دەنگ بدەم.

ئێمەی سەرپاکی شیوعیەکانی شار لاوی تازە کوورە بووین. مەرجی یاساییی خۆپاڵاوتن بۆ نوێنەرایەتی، بە تایبەت لە رووی تەمەنەوە، لە هیچ کەسماندا نەبوو. ئەوەندە گیرمان بە دەست ساز کردنی لیستی هەڵبژێردراوە پلە دووەکانی شیوعیەکان‌و باوکان‌و خزمانمان نەخوارد. من خۆم‌و باوکم لە نێو لیستی حیزبماندا

بووین بۆ هەڵبژێردراوە پلە دووەکان. باوکم کە پێم گوت ناوی لە نێو لیستەکەماندایە شادمان بوو، لە هەمان کاتیشدا دەترسا. هەردوو پاڵێوراوی ئێمە بۆ نوێنەرایەتی بریتی بوون لە: عەرەبێکی (شریف الشیخ العانی) ناوی بەرپرسی یەکەم رۆژنامەی ناوەندیی حیزب کە پاش راپەڕینەکە دەرکراو، یەکێکی دیکەی کوردی مەحموود هەمەوەند ناو. پێش دەنگدان بانگەشەو کۆبوونەوەیەکی جەماوەریمان بۆ هەڵبژاردن کرد. شیعرێکی شۆڕشگێڕانەم لە یەکەم کۆبوونەوەی هەڵبژاردندا خوێندەوە، جێی ئافەرین لێکردن بوو. ئەحمەد غەفوور پاش کۆبوونەوەکە پێی گوتم:

- شیعرەکەت بیری مارکسیی بە شێوازێکی سادەو باش پێشان داوە.

کۆبوونەوەیەکی جەماوەریتی دیکەی هەڵبژاردن کە لە گۆڕەپانی قوتابخانەی ئامادەییی شار بەسترا، شیعرێکم تێدا خوێندەوە بۆ پشتگیریی کێشەی گەلی فەلەستینو دژایەتی کۆلۆنیالیزمو زایۆنیزمو کۆنە پەرستیی عەرەبی تەرخان کرابوو.

بە درێژاییی سەعاتەکانی دەنگدانو جوێکردنەوەی دەنگەکان شەونخوونیمان بەدیار سنووقەکانەوە کێشا. نوێنەرانی پارتیو هێندێک لە بێلایەنەکان، وێڕای فەرمانبەرە حکوومەتیەکان، شەونخوونیيان لەگەڵدا کێشاین. هەڵبژاردن بە راستی ئازاد بوو، هیچ لایەنێك لەو کەشو دۆخەدا پێی نەدەکرا وەکوو جاران ساختەی تێدا بکات. لیستەکانمان بەشی هەرە زۆری دەنگەکانیان بە دەست هێناو لیستی ئێمەو لیستە نەیارەکەی پارتی جیاوازییەکی زۆریان لە نێواندا هەبوو. بۆیە دەبوو هەردوو کورسیی نوێنەرایەتیی شار بۆ حیزبمان بن. بەڵام مەسەلەکان بەر لە ئەنجامدانی دووەمین قۆناخی هەڵبژاردن، تەواو بە شێوەیەکی کتو پڕ گۆڕان. ئەوە بوو حوکمی عورفی لە ١٥ی ئایاری ١٩٤٨دا راگەیێندراو هێرشی راوە دوو نانی شیوعیەکانو بەرهەڵستانی دیکەی حکوومەت دەستی پێکرد. (شریف الشیخ)ی پاڵێوراومان بۆ نوێنەرایەتی، لە سەردانێکیدا بۆ سلێمانی گیراو لە ئاودەستخانەی بەڕێوەبەرایەتیی

پۆلیس توند کرا. (حشع) لەم هەلو مەرجە تازە خولقاوەدا پێوەندیی بە هەڵبژاردنەوە پچڕی. حکوومەت وەك لە سەردەمی پاشایەتیدا نەریت بوو، هەموو کورسیەکانی بۆ لایەنگرانی خۆی بردو، هێندێك کورسیشی بۆ بەرهەڵستە بۆرجوازیەکان یا بەرهەڵستە دەستکردەکانی خۆی چۆڵ کرد.

* * *

ئەو دەمە لە پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم، چالاکیی نەقابیی یەکێتیی قوتابییان بۆ یەکەم جار دوای راپەڕینی کانوون هاتە نێو قوتابخانەکەیشمان. قوتابخانەکەمان سەرتاسەر بەوە جویّ دەکرایەوە کە قوتابییەکانی لاوی گەورە گەورە بوون‌و نەیاندەتوانی لە قوتابخانەی بەیانیاندا خوێندن تەواو بکەن. بەربەرەکانیّ لە هەڵبژاردنی یەکێتیی قوتابیاندا لە نێوان ئێمەو پارتیدا هەبوو. هەردوو پالێوراوەکەمان بە زۆرایەتیەکی گەورەوە هەڵبژاردنەکەیان بردەوە. (جەمال محەمەد سەعید)ی دۆستی حیزبمان لە پۆلەکەماندا پالاوت. (عەلی مەحموود)ی پالێوراوی پارتی سەرنەکەوت‌و، لە پاش وازهێنانمەوە لەقوتابخانە لە دوادواییەکانی ١٩٤٨دا تا ساڵی ١٩٦٠ نەمدییەوە. لە ١٩٦٠ دا بینیم یەکێکە لەو هەڤاڵە شیوعیانەی کە لە شەقڵاوە بە بۆنەی بەستنی کۆنفرانسی مامۆستایانی کوردستانەوە لەگەڵیاندا کۆبوومەتەوە.

پێتەختم لە رۆژانی هەستانی شۆڕشگێڕانەی دوای راپەڕینی کانووندا سەر لە نویّ بینییەوە. لەگەڵ خوشکەکەم‌و مێردەکەیدا چوومە لای پزیشك. وا رێکەوت لە سەرەتای کۆنگرەی (السباع) دا ئامادەبم، واتە یەکەم کۆنگرەی قوتابیان لە عیراق کە نوێنەری لیژنەکانی یەکێتیی قوتابییانی عیراقیان بەشێوەیەکی یاسایی تێدا دامەزراند. (جەواهیری)ی کەڵە شاعیرم لە گۆڕەپانی (السباع) بینی کە کۆمەڵانێکی بەرینی لە هەزاران کەس زیاتری جەماوەری قوتابییانی تێدا خڕبووبوونەوە، شیعرەکەیی (یوم الشباب تحیةو سلام) لە نێو چەپڵە رێزان‌و هوڕای پڕ خرۆشی جەماوەردا دەخوێندەوە.

چەند رۆژێك دوای گەڕانەوەم بۆ سلێمانی وەفدێکی یەکێتیی قوتابیان لە بەغداوە هات، سەریان لێدایןو قوتابیانی سلێمانیش بە گەرمی پێشوازییان کردن. (بدرشاکر السیاب)ی قوتابیی شیوعی لە چاوپێکەوتنێکی قوتابییاندا کە چەند سەد قوتابییەکی تێدا بوو، شیعرێکی بە جۆشی خوێندەوە، چەند جارێك بە چەپڵە لێدان پێیان بڕی.

* * *

ئایاری ١٩٤٨، بە بەهانەی زامنکردنی پاشکۆی سوپای عیراقەوە کە چەند بەشێکی لیٚ چوو بووە نێو فەلەستینو لە یەکەم شەڕی نێوان عەرەبو ئیسرائیلدا بەشدارییان کرد بوو، ئیدارەی عورفی لە عیراق راگەیێندرا. ئەوە بوو رژێمە حوکمدارەکانی عەرەب بڕیاری دابەشکردنی فەلەستینیان رەتکردەوە کە دامەزراندنی دوو دەوڵەتی تێدا هاتبوو، لافی ئەوەیان لێدەدا کە بە زەبری هێز ریٚ لەوە دەگرن. کەچی شەڕەکەیان دۆڕاندو هێزە زایۆنیەکان دەستیان گرت بەسەر پتر لە نیوەی ئەو خاکەدا کە بۆ عەرەب تەرخان کرابوو. بەڵام شەڕی فەلەستین بەهانەو رووپۆشێك بوو بۆ شەڕی رژێمی عیراق دژی جوولانەوەی نیشتمانی، بە تایبەت دژی (حشع)ی خاوەن دەسەلاتێکی میللیی بەربلاو. موخابەراتی ئینگلیزی نەخشەیەکی تەواوی بۆ ئەم شەڕەی دوایی لەدژی جوولانەوەی شیوعیو نیشتمانی کێشا بوو. حیزبمان بە بلاوکردنەوەی بەلگەنامەیەك کە بەهۆی بەکرێگیراوێکی دوو سەرەوە کەوتە دەستی، پەردەی لە رووی لایەکی ئەم نەخشەیە هەڵدایەوە کە رایسپارد بوو ئاژاوەو ململانێی نەتەوەییو تیرەگەریو ئاینی لە نێوان عیراقیەکاندا بورووژێندرێن.

شالاوی توندو تیژی پۆلیسیی هاوکاتی شەڕی فەلەستین تاکە گیروگرفتی ئەو رۆژانەمان بوو. بڕیاری دابەشکردنو پشتگیری لە لایەن سۆڤێتەوەو بەرهەڵستیی هێزە نەتەوەییەکانیش هۆیەکی وروژاندنی پاشاگەردانیی فیکریی نێو شیوعیەکان بوو لە عیراقدا. بلاوکردنەوەی نامیلکەیەکی بۆ عەرەبی وەرگێڕدراو لە پاریس کە

چەندین راستیی تێدا بەهەڵەدا برابوون و شێوێندرابوون، پەرەی بەم پاشاگەردانی‌یەدا، لەبەر خاتری ئیسرائیل‌و فەرامۆشکردنی ئەو راستی‌یە کە ئەم دەوڵەتە هەر لە سەرەتاوە لەسەر بناغەی زۆرداری‌و داگیرکردن‌و دەربەدەر کردنی جەماوەری عەرەب لە خاکەکەی‌و زەوتکردنی مافی رەوای بنیات نراوە. هێرشی بە زەبرو زەنگی پۆلیسی کە گەیشتە رادەی لە زیندان توند کردنی هەزاران‌و لە سێدارەدانی دیارترین رێبەرە شیوعیەکانی عیراق، بواری ئەوانەی نەدا بە مێشکێکی ساف‌و لە هەل‌و مەرجێکی هێمندا لەو دۆخە تازە خولقاوە بکۆڵنەوە. ئەگەر چی ئێمە لەوە بێگومان بووین کە سەرکردایەتیی سۆڤێتی لە باریدا بوو لە بارودۆخەکە بکۆڵێتەوەو هەڵوێستی راستی بەرانبەر وەربگرێ، بەڵام خۆمان تین‌و توانی ئەوەمان نەبوو رووداوەکانی پێش چاومان لێك بدەینەوە.

* * *

ئەندامەتیی (حشع) لە سێ مانگی پاش سەرکەوتنی راپەرینی کانووندا بە رادەیەکی نابەجێ‌و بە شێوەیەکی بێ پلان زیادی کرد. حیزب کادێری توانای نەبوو ئەو کۆمەڵە فراوانەی خەڵك کە روویان کردبوە ریزەکانی لە خۆیدا جێ بکاتەوە. ئەوەیش هۆیەکی تێکچوونی شیرازەی دۆخی رێکخستنمان بوو، پاش پەلهاویشتنی هێرشی تیرۆرکارانە.

هێرش ئەو رۆژە دەستی پێکردو تا رادەیەك تاوی سەند کە یەك دەستەی حیزبی لەگەڵ بەهجەت‌و محەمەد مستەفادا بۆ ماوەیەکی کەم یەکی خستین، ئەگەر بیم بە هەڵەدا نەچوو بێ، (غەفوور کەریم)ی لاوی شیوعی گورج‌و گۆڵ کە تەواوی کاتی خۆی بە کاری حیزبی بەخشی بوو، رێکی دەخستین.

* * *

هاوینی ١٩٤٨، پێش ئەوەی ژیانی خۆشاردنەوەم دەست پێ بکات، دوا دیدەنیی دێی تەکێ‌و ئەنجا قۆپیی ـ بە لای منەوە ـ خۆشترین هەوارە هاوینەم کرد. لەگەڵ

پوورزاکەمدا بووم کە بڕوای بڕ پێوەندیی بە هیچ چالاکی‌یەکی سیاسی‌یەوە نەبوو، بەڵکوو ئامانجی لە ژیاندا ئەوە بوو: وەك مەلایەکی مزگەوت جێی باوکە کۆچکردووەکەی بگرێتەوەو لە نازو نیعمەتدا بژی. شەش لاوی خزمان لە تەکێ لەگەڵماندا هاتن، چەند کەسێکیان چەکیان پێ بوو کە هەر ئەوەندە بە کەڵکی راوو شکار دەهات. ئەو لاوانە نەیانتوانی راوی کێوییەك بکەن گۆشتی بخورێ. بەڵام توانیمان باشترین جۆری هەنگوین بدۆزینەوە. (سدیق) گوتی: من هەنگێکی کێوی پێ دەزانم، لەوانەیە هەنگوینمان لێ چنگ بکەوێ. هەر هێندەمان لە دەست هات بە پەرۆشەوە قایل بین ئەو هەنگە ببڕین. "مارف" مان بەجێ هێشت، چونکە شەو کوێر بوو. چووین بۆ جێ هەنگەکە. دار بەڕوویەکی گەورەمان لەبەردەمدا بوو، پوورەی هەنگەکە لە کلۆرە دارەکەدا بوو. سدیق دوای سەرو دەمو چاو پێچانی بە جامانەیەك، بە تەور کونی کرد. ئێمەیش لە دووریی چەند مەترێکەوە تەماشامان دەکرد. هەنگوین لە بەشی خوارەوەی دارەکەوە دەرکەوت. کەوتینە هەنگوین گرتن تا مەنجەڵۆ هەموو قاپەکانو تەشتی هەویر شێلانەکەیشمان پڕ بوون. هەنگوینەکە نێزیکەی (٣٠) کیلۆگرام بوو. واقم لە مەسەلەی جیاوازیی رەنگی چینەکانی هەنگوینەکە وڕما بوو، چونکە رەنگی بەشی سەرەوەی سپیو خوارەوەی رەشو هیی نێوانیشیان بەرەو خوار بەرەبەرە رەش دەبوو. سدیقی جووتیار ئەم دیاردەیەی بۆ لێك دامەوەو، گوتی:

- ئەم هەنگوینە بەرهەمی حەوت ساڵی ئەم هەنگەیە. رەنگە سپیەکەی هیی ساڵی دواییانەو، هەموو ساڵێکیش رەشاییی میوەکە لە بەرەوە زیاد دەکات.

* * *

پایزی ١٩٤٨ کەریم سۆفی کە لە خێزانێکی هەژارو کوڕی فەڕاشێکی قوتابخانە بوو، بوو بە رێکخەری من. کەریم لاوێکی نەرمو نیانو خاوەن هەستێکی بەرزی تێکۆشان بوو. ئەوسا هێشتاکە لە خوێندنی ئامادەییی ئێواران دانەبڕا بووم. بە

زەحمەت یەکەم قیستم لە کرێی خوێندن دابین کرد. درێژەیشم بە دەوامکردن دا تا بۆ یەکەم کەرەت فەرمانی دەستگیر کردنم دەرکرا. (عوسمانی مەلا)ی خزمم‌و قۆمیسەر لە لێکۆڵینەوەی تاوان (ئاسایشی گشتیی جاران)بەر لـەگرتنی ماڵمـان هەواڵەکـەی پێ گەیاندین. قایمکاریی خۆمـم کـردو ماڵـەوەم بـەجێ هێشت. دوای چـەند رۆژێـك مێردی خوشکەکەم کە عەریفی پۆلیس بوو توانیی مەسـەلەکە دابخـات. هاتـمەوە بـۆ مـاڵ، بـەڵام ماوەیـەکی کـورت مامـەوە چونکـە فـەرمانێکی تـازەی گرتنـم‌و خۆشاردنەوەیەکی تازەی چەند ساڵەیشی بەدوودا هات.

لەوە ئاگـادار نـەبووم کـە بەرپرسـەکان لـە بـەغدا لێیـان گـیراوەو هێندێکیـان روخاوون، کاتێك کەریم سۆفیی رێکخەرم لـە سەرەتاکانی ١٩٤٩دا پێـی راگـەیاندم کە سەرکردایەتیی حیزب بڕیـاری خۆپیشـاندانی داوە بـە بۆنـەی یەکـەمین سـاڵرۆژی ڕاپەڕینی کانوونەوە بە مەبەستی تازە کردنەوەی ڕاپەڕینەکە. هەروەها گوتی:

- " سەرکردایەتیی ئـێرەی ڕێکخراوەکـەمان بڕیـاری داوە ئـەرکی سـەرکردایەتیی خۆپێشاندانەکە لە سلێمانی بە تۆ بسپێرێ ". ئەمجا نامەیەکی حـیزبیی پێشـان دام، لەسەرکردایەتی حیزبەوە هاتبوو ڕێنوێنیی تێدا بوو لە بارەی ئـەو خۆپێشـاندانەوە کە دەبوو ببێتە هۆی تازەکردنەوەی ڕاپەڕینەکە. دەبوو هەموو خۆپێشاندەرێك بـەپێی نامەکـە لیسـێکی (٧٥ سـم) درێـژ هـەڵبگرێ‌و ئامـادەی پـەلاماردان‌و دەرکردنـی پۆلیس ببێ.

بەبێ دوو دڵی ڕازی بووم ئەرکی سەرکردایەتیی خۆپێشاندانەکە لە ئەستۆ بگـرم. تاکە داواکاریم ئەوە بوو جێیەکی لە بارم بۆ ساز بکەن خۆمی تێدا بشارمەوە. کەریم ئێوارەی هەمـان ڕۆژ بردمی بۆ مـاڵی فەتاحی بەرگدروو لاوی شـیوعی لـە گـەڕەکی مەلکەندی. بە داوای خۆم دەست نیشانکردنی ئەو شوێنە کە خۆپیشاندانەکەی لێـوە دەست پێ دەکات، بۆ خۆم هێڵرایەوە. خالێکی قەرەباڵغی ناوەڕاسـتی بـازاڕی شـارم هەڵبژارد. ئاگاداریی بەشداران کرایەوە کە لە کاتی دیاریکراودا ئامادەبن. خـۆم بـە

لەچك كراوی ئامادە بووم‌و، وەك نیشانەیەك بۆ دەست پێ كردنی خۆپیشاندانەكە یەكەم هوڕام كێشا. بۆم دەركەوت پۆلیس پێیان نەزانیوەو ئێمە لە ناخافڵدا لێیان پەیدا بووین، چونكە هیچ شتێكی وا سەرنجی ڕانەكێشام نیشانەی پێشتر بەخۆ كەوتنی ئەوان بێ. ژمارەی خۆپیشاندەران خۆی دابوو تەنیا لە دووسەد كەسێك. ئەمەیش ژمارەیەكی كەم بوو و، بەڵگەی ئەوە بوو كە خەڵك‌و ـ تەنانەت خودی شیوعیەكانیش ـ خۆیانیان ئامادە نەكرد بوو بەشداری تێدا بكەن. چەند لافیتەیەك لەگەڵ یەكەم هوڕا كێشاندا بەرزكرانەوە. لافیتەو هوڕاكان سەرجەم دژی ئیمپریالیزم‌و حوكمی بەكرێگیراوو بانگكردنی جەماوەر بوون بۆ تازەكردنەوەی ڕاپەڕینی كانوون. خۆپیشاندانەكە چەند سەد مەترێك ڕێی كردو، كۆمەڵێكی گەورەی پۆلیسی پیادەو سوارەو ئۆتۆمبێل لە دەورمان گرد بوونەوە. بەر لەوەی هیچ پێكدا هەڵپرژانێك روو بدات یا خۆپیشاندەرێك بگیرێت، لەبەردەم (گوومرگە سووتاو)دا فەرمانی بڵاوەلی‌كردنم دا.

شاری سلێمانی لەو كاتەدا سەرتاسەر بەرهەڵستی ڕژێم بوون‌و، بەشی هەرە زۆری خەڵكەكەی هاوسۆزی شیوعیەكان بوون. دەرگای ماڵانی خەڵك بۆ لە باوەش گرتن‌و شاردنەوەی هەر خۆپیشاندەرێك لە كاتی ڕاونانیدا لە لایەن پیاوانی ڕژێمەوە خرابووە سەر پشت. ئەگەر پۆلیس كاتی گەڕان بە شوێن خۆپیشاندەراندا خۆی بكردبایە بە ماڵێكدا كە خۆپیشاندەر پەنای بۆ هێنا بێ، زۆربەی كات بە دەست پێشخەری خاوەن ماڵەكەو لە سەربانەكەیانەوە خۆپیشاندەر دەگەیێندرایە ماڵێكی دیكە. نەمبیستووە پۆلیس ئەو ڕۆژانە توانیبێتی هیچ خۆپیشاندەرێك لە نێو یەكێك لەو ماڵانەدا دەسگیر بكات.

یەكەمین خۆپیشاندان بە سەلامەتی‌و بە بێ هیچ زیانێك دوایی هات. ئێوارە گەڕامەوە بۆ حەشارگە (مخبأ)كەم لە مەڵكەندی‌و، بەدەم ڕاپۆرتی خۆمم لەسەر خۆپیشاندانەكە دا بە كەریم سۆفی كە لەوێ چاوەڕێی دەكردم. داوای لێكردم

راپۆرتێکی نووسراویشی بدەمێ تا سەرکردایەتیی بیخوێنێتەوە. ئێوارەی ڕۆژی دوایی (قالە) چکۆلی پەیامنێری حیزب نامەیەکی بۆ هێنام، فەرمانی پێدەدام بە خۆ بکەموو دووەم خۆپیشاندان ساز بکەم. ئەوەم دوا خست تا یەکەمین ساڵڕۆژی ڕاپەڕینی کانوون ـ واتە ٢٧ی کانوونی دووەم ـ دا دێت. ئەمجارەیان کەژاوەیەکی (تەرمی) رەمزیی بە پارچەیەك قوماشی رەش داپۆشراومان ئامادە کرد، واتە تابووتێکی دارینی عادەتی کە تەرمی دەخرێتە ناو و بە شان دەبرێتە گۆڕستان. شار پێشان شتێکی لەم بابەتەی بە خۆوە نەدی بوو. نە خەڵکەکەو نە پۆلیس هیچ یەکێکیان پەییان بەوە نەبرد بوو کە ئەو شتەی سەر شانی خۆپیشاندەران تەنیا کەژاوەیەکی رەمزییەو مردوویەکی راستەقینە نییە. کەژاوەکە شانو شکۆی خۆپیشاندانەکەی زیاد کرد بوو، پۆلیس بە گران دەیتوانی پەلاماری بدات. خۆپیشاندان بازاڕەکەی بە هوڕا کێشانی خۆپیشاندەران بڕیو دووکاندارو ڕێبوارەکان تەماشایان دەکرد. ئەمجا بە شەقامێکدا کە بۆ گۆڕستانی سەیوان دەچوو ڕێی کرد. پاش دەرچوونمان لە بازاڕەکە، سەرئجم دا ژمارەی پۆلیس دەگاتە چەند قاتی ژمارەی خۆپیشاندەرانو چەند بەشێکی پۆلیسی سوارەو ئۆتۆمبێلی پڕ چەك لە پێشو پاشمانەوە دەڕۆنو وەختە پێمانەوە بنوسێن. ترسام بە گەیشتنە گۆڕستان یا لە جێیەکی گونجاودا بڵاوە لێکردن ببێتە هۆی گیرانی ژمارەیەکی زۆر لە خۆپیشاندەران. بۆیە بڕیارم دا خۆپیشاندانەکە لە شوێنێکدا بڵاوە پێ بکرێت کە ئۆتومبێلو پۆلیسی سوارەیان تێدا دەستە پاچەنو ناتوانن راوە دوومان بنێن. ئەگەر بە تەنیا پۆلیسی پیادەشمان بەرانبەر بمێننەوە ئەوە بەسەرماندا باڵادەست نابنو خۆ لە بەردەم بەرد بارانی ئێمەدا راناگرنو هەڵدێن. خۆپیشاندان کە لە بەردەم مزگەوتێکدا کە دوو دەرگای هەبوو بڵاوەی لێکرد تا خۆپیشاندەران بە یەکێکیاندا بچنە ژوورێو لە دووەمیشەوە بێنە دەرێ، بە بێ ئەوەی پۆلیسی سوارە یا ئۆتومبیلەکان بتوانن راوەدوویان بنێن. ئەم کەرەتە سێ هەڤاڵمان دۆڕاند، چونکە

پۆلیس توانیی بیانگرێ، لەوانە: فەرەج مەحموودو نووریی دارتاش کە پێشتر من ڕێکخەری بووم. ئەوانەی کە پێیان کرا بچنە نێو مزگەوتەکە نەگیران. یەکێکیان قوماشە ڕەشەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و تابووتە بەتاڵەکەی بۆ پۆلیس بەجێ هێشتبوو.

ئەمجارەیش دوای بلاوە لێ کردنی خۆپیشاندانەکە، بەرێکەوت خۆمم کرد بە نێو ئەو خانوەدا کە دوای بلاوە لێکردنی خۆپیشاندانی پێشوو تێی چووبووم. چەند ئافرەتێك لەوێ بوون، لە دەوری تەنوور دانیشتبوون‌و نانیان بۆ یەکێکیان دەکرد. دیارە هیچ کەسێکیانم نەدەناسی‌و پێویستیشم بەو ناسینە نەبوو. هەر هێندە بەس بوو بزانن کە من خۆپیشاندەرێکی دژی ڕژێم. یەکیان پەنجەی بۆ راکێشام بە پەیژەکەدا سەربکەومە سەربان، چونکە ئەوێ زۆر زامنتر بوو. بە دەستی خۆی دەرگای دەرەوەی خانوەکەی داخست. پاش چەند دەقەیەك کچۆڵەیەکی ١٠-١٢ ساڵانە هاتە لام‌و کولێرە بە ڕۆنێکی گەرمی دامێ، بە تاسووقەوە خواردم. دوای تێپەڕبوونی چارەکە سەدەیەك بەسەر ئەم بەسەرهاتەدا، واتە لە ١٩٧٤دا، لە سلێمانی لەگەڵ (ئەحمەد حامید)ی کادێری شیوعیدا دانیشتبووم. ژنەکەی لێی پرسیم:

- نامناسی؟ بیرت نایێ پێشتر یەکترمان دیبێ‌و ناسیبێ ؟

- نەخێر هیچم بە بیردا نایێ.

- من ئەو کچۆڵێیەم کە ساڵی ١٩٤٩، دوای بلاوە پێکردنی خۆپیشاندانێکتان، لە ماڵی ئێمە بووی‌و کولێرەی گەرمم بۆ هێنای.

پاش دووەم خۆپیشاندان دەبوو، بەپێی فەرمانی سەرکردایەتیی ڕێکخراو، خۆ بۆ سێیەم خۆپیشاندان ئامادە بکەم کە ڕۆژی ٣٠ی کانوونی دووەمی بۆ دیاری کرابوو. جێی کۆبوونەوەو دەست پێکردنەکەم بۆ شەقامی (سابوونکەران)ی تا رادەیەك چەپەك گۆڕی. داوام لە کەریم کرد یاریدەدەرێکم بۆ دابنێ، تا لە کاتی گیران یا کوژرانمدا جێم بگرێتەوە. داواکەم جێبەجێ کرا. ئەم کەرەتەیش دوژمنی حوکم بە

دەست ئاگای لە کاتو شوێنی خۆپیشاندانەکە نەبوو. ئەوە مانای وا بوو خەڵکانێکی خراپ نەخراونە نێو ریزەکانمان. ژمارەیەکی کەمی ٤٠ ـ ٥٠ کەسی ئامادەی خۆپیشاندانەکە بوون. هەر لەو شوێنەدا درێژەمان بە چەپڵە لێدانو هوراکێشان دا بەڵکوو کەسانێکی دیکە بێنە ناومان. بەڵام لە باتیی ئەوە، پۆلیس بە ئوتومبیلی پر چەکەوە قوت بوونەوە.. ئەوەندەی نەبرد ژمارەیان زۆر بوو. ئەمجا دوای پەلاماردانمان بە یەکدا هەڵپژاین. چەکی عادەتیی دەستمان بەرد بوو. ئەوانیش بەردیان بەکارهێنا. (ئەحمەد حسەن)ی قوتابیی دواناوەندیی یاریدەدەرم لەو یەکەمین کەسانە بوو کە پاش دەست پێکردنی پێکدا هەڵپژان هەڵاتن. ئێمەیش ناچار بووین بە کۆڵانێکی تەنگە بەردا کە ئوتومبیلی پێوە نەدەچوو، بکشێینەوە تا بە تەنیا پۆلیسی پیادەمان لە بەرانبەردا بمێنێتەوە. ئەحمەدی "سەرکردەی یاریدەدەر" لە یەکێك لەو خانوانەوە کە دەکەونە نێوان هەردوو بەرەی پێکدا هەڵپژاو، دەرپەری‌و بەرەو رووەمان فرکەی کرد تا لە شەرەکە دوور بکەوێتەوە. لیسێکم بە سەریدا کێشا. تێی نەروانیمو هەر رای دەکرد. زارەترەك بوو بوو. پێدەچێ لافی ئەوەی لێدا بێ کە پۆلیس زەبری پێ گەیاندووە. ئەو قووچاند بووی‌و دوور دەکەوتەوەو، ئێمەیش هەر بە پۆلیسدا هەڵدەپژاینو، دوا بە دوا دەکشاینەوەو درێژەمان بە هەورای دژی ئیمپریالیزمو رژێمی بە کرێگیراو دەدا. کە گەیشتینە پانتاییی بەردەم ماڵی حەمە ئاغای ملکخیوی ئەریستۆکرات، پۆلیس سوارە پشتی لێ گرتینو ئابلۆوقە دراینو نەماندەتوانی درێژە بە پێکدا هەڵپژان بدەین. ئیتر ئەرکی هەرە پێویستی هەر خۆپیشاندەرێك ئەوە بوو خۆی رزگار بکات. هێندێك چوونە ماڵانو، هێندێکی دیکە بە دارتێلی کارەبادا سەرکەوتنە سەریانو، چەند خۆپیشاندەرێکیش دەستگیر کران.

وەخت بوو ببمە یەکێك لە خۆپیشاندەرە گیراوەکان، چونکە لە نێو کۆمەڵە پۆلیسێکی سوارەدا زرمەی قۆناخە تفەنگم بسەردا داباری تا کەوتمە سەر ئەرزو

کەمێك لە هۆش خۆ چووم. پاشـان هۆشـم بـە بـەردا هاتـەوەو گـوڕم دایـە خـۆم. کـە کەوتمە خۆ هەڵبستمو رابکەم، پۆلیسێك لەئەسپەکەی دابەزی بمگریّ. بە دوومــدا رای کرد ، بەلاّم من خۆمم کرد بە مـاڵێکدا کە خاوەنەکەیم دەناسـیو یـەکێکیان عومـەر عەلیی ئەندامی لیژنەی قوتابیانی شار بوور هـاتبوە ریـزی ئێمـەوەو رێکخـرا بـوو. دەرگاکـەم لـە دوای خۆمـەوە پێـوەدا. ماڵەکـە هـەر ئاسـکەی لیّ بـوو، کچۆڵەیـەکی کارەکەر بووو بە هۆی زۆر هاتو چـوو کردنـی ماڵەکـەوە بـاش دەیناسـیم. پرسـیاری پەیژە دارەکەم لیّ کرد. کەچی بیّ دەنگ راوەسـتاو شـڵەژاو دەمـی هەڵنـە هێنایـەوە. خۆم بە شوێن پەیژەکەدا گەڕامو سەرکەوتمە سـەربانو بـە دوای خۆمـدا هەڵمکێشـایە سەرەوە. ئیدی وام دانا رزگار بووەم، چونکە پۆلیس نەیدەتوانی سەربکەوێتە سەربان. سـەربانی چـەند خانوویـەکم بـڕیو لـە مـاڵی عومـەر دوورکەوتمـەوە. ئـەمجا دابەزیمـە ماڵێكو بە دوو ئـافرەتی نێـو حەوشـەی خانوەکـەم گـوت:"مـن خۆپیشـاندەرم". بـە خێرهاتنیان کردمو کەوتنـە بگـرەو بـەردە لەسـەر میوانـداری کـردنم. یـەکیان پـەلی راکێشام بۆ ژوورەکەی کە لە نیزیك دەرگای دەرەوەی خانوەکە بوو. بە پەلە زۆپاکەیان ئاگرداو کەوتنە تیمار کردنم. زۆربەی جلەکانیان داکەندمو بە سامەوە روانیـیانـە ئـەو پەڵە شینانەی کە بە روخسارو لەشمەوە بوونو جێی لێدان بـوون. سـەرتاپای لـەشمیان بە رۆنی چێشت چەور کردو زۆر شێلامیانو بە دوو لێفە دایانپۆشیم تـا بحەسـێمەوەو ئارەق بکەمەوە. پاش سەعاتێك داوایان لیّ کردم هەڵبستم بۆ شێوکردنو کەیبانووی ماڵەکە گوتی:

ـ تکای لێبوردن دەکەم کە ساوەرمان بۆ داناوی. برنجمان نەبوو بۆتی لیّ بنێم.

بەر لە شێو کردن، چەند منداڵێك هاتنە ژوورەوەو هاوسـۆزیی قووڵـی خۆیانیـان بۆ دەرخستمو، لێیان پرسیم:

ـ تۆ لە حیزبی (تحرر)ی یان پارتی ؟

ـ من لە حیزبی (تحرر)م.

به یەك دەنگ وەڵامیان دایەوە: ئێمەیش هەموومان لە حیزبی (تحرر)ین.

کە گەیشتمە حەشارگەکەم لە مەڵکەندی، کەریم چاوەڕوانی دەکردم. پێی گوتم: چاوم بە ئەحمەدی یاریدەدەرت کەوتو دیم بە هۆی پێکدا هەڵپژانیەوە لەگەڵ پۆلیسدا سەری بریندار کراوە، بردین پێچێکیان بۆ تیماری برینەکەی هێناوە.

ـ نەخێر ترساو. بەر لەوەی لەگەڵ پۆلیسدا یەکانگیر ببین، ریزەکانمانی بەجێ هێشتو هەڵات. ئەو بریندار بوونەیشی ئەنجامی لیس تێسرەواندنی منە.

راپۆرتێکم لە بارەی خۆپیشاندانەکەوە نووسیو، باسی ئەوەم تێدا کرد کە جەماوەرو تەنانەت ئەندامانی حیزب خۆیشیان ئامادە نین بەشداریی خۆپیشاندان بکەنو هەلو مەرج بۆ درێژە پێدانی لەبار نییەو هەر دەبێ وازی لێ بهێنین. پێشنیارەکەم پەسەند کراو، خۆپیشاندانیش کە گیانی سەر پەرگریی چەپڕەوانەو سەرچڵیی لای سەرکردایەتیی بەرجەستە دەکردو ئەو رۆژانە خۆیی لە (ساسون دلال)دا دەنواند، راگیرا.

کانوونی دووەمی ١٩٤٩ لە کاتی دەست بە تاڵیمدا یەکەمین نامیلکەی بچووکم لە ژیانمدا بە ناونیشانی "هەلپەرستان چییان دەوێ" یا شتێکی لەو بابەتەوە نووسیو، دانەیەکم لێ نارد بۆ (ساسون دلال)کە ـ وەك دەرکەوت ـ دڵبەستەی بوو بوو. بڕیاری دابوو: من ببمە نوێنەرێکی ئەو کۆنفرانسە حیزبییەی کە بڕیاری لەسەر بەستنی داو سەری نەگرت. داڕشتنو تێزەکانی دوو تویی نامیلکەکە ئەوەیان ڕەنگ پێ دەدایەوە کە نامیلکەی " حیزبێکی شیوعی، نەك سۆشیال دیموکرات "ی فەهد کارێکی گەورەی تێکرد بووم.

* * *

شوباتی ١٩٤٩ لە حەشارگەکەم دانیشتبوومو خەریکی ڕوونووسکردنی نامەیەکی حیزبیی سەرکردایەتی بووم کە داوای تێکوشانی دەکرد بۆ ڕزگارکردنی ژیانی فەهدی سەرکردەمان. عیززە دین کە لاوێکی پەیامنێر بووو لە کەرکوکەوە هاتبوو لای ئێمە خۆیی شارد بوەوە، لە دەرگای دا گوتی:

- هەڤاڵ ئەم نامەیە بۆ تۆیە. نامەیەکی پەلەیەو دەبێ پاش خوێندنەوەی شوێنم بکەوی‌و لەگەڵمدا بێی.

نامە کورتەکەم خوێندەوە. هیچی تێدا نەبوو، لەوە زیاتر کە شوێن پەیامنێرەکە بکەوم بۆ چاوپێکەوتنی هەڤاڵێکی چاوەڕوانی من. پەیامنێر منی گەیاندە ماڵێکی بچووکی گەڕەکی (قەزازەکان) کە ئەوەندە لە ماڵمانەوە دوور نەبوو. چوومە ژوورێکی ئاسایی یەکەم قات.(شەوکەت غەفوور)م دی کە لاوێکی شیوعی بوو و پێشتر دەمناسی. هۆی بانگ کردنەکەمی بۆڕوون کردمەوە:

- چەند هەواڵێکی جێی داخم پێیە. هەڤاڵی بەرپرسمان( مەبەستی لە حەمید عوسمانی سکرتێری ڕێکخراوی پارێزگا بوو) نازانم بۆ کوێ سەفەری کردووە. بڕیار بوو کەریم سۆفی بێتە ئێرە، تا بە خۆشاردنەوە ژیان بباتە سەرو بەرپرسی بگرێتە دەست. بەڵام خۆیی دوا خست‌و لە ماڵ مایەوە، تا - وەك خوشکەکەی پێی گوتم - دوێنی ئێوارە مەفرەزەیەکی ئاسایشی گشتی دەوریان گرت‌و دەستگیریان کرد. (ڕەفیق چالاك )ی خۆ فرۆش یەکێکی مەفرەزەکە بوو.

- بە داخەوە. بەڵام بانگ کردنی من بۆ ئێرە پێوەندیی بەوەوە چییە ؟

- ئەوەندەی من پێ بزانم، دەبێ پاش گیرانی کەریم سۆفی تۆ یەکەمین بەرپرسیی ڕێکخراو بگریتە ئەستۆ.

من خۆم پێشان بە دوای ئەم بەرپرسیەدا نەگەڕا بووم‌و، کە خرایشە ئەستۆم خۆمم لێ نەدزیەوە. هەر بە نهێنی دەژیام‌و پێم باش نەبوو لەو ماڵە بمێنمەوە کە شەوکەتی تێدا جێنشین بوو بوو. پاش دوو حەفتە حەمید عوسمانی سکرتێری ڕێکخراو گەڕایەوەو سەر لە نوێ بەر پرسیەکەی درایەوەو، لەوە بە دوایش هەر بە نامە گۆڕینەوە پێوەندیمان بە یەکترەوە دەکرد.

* * *

شوباتی ١٩٤٩ نامەیەکم لـە حـەمید عوسمانـەوە بۆ هـات، فـەرمانی پـێ دەدام بچمە شاری قەڵادزێ بۆ بنیاتنانەوەی ئەو رێکخراوە حیزبییەی کە هێرشی پۆلیس لە بەریەکی هەڵوەشاند بوەوە. من کە بنهێنی دەژیام، بە بێ دواکەوتن سەفەرم کرد. لـە رێگە پۆلیسێکم هاتە رێ، دەیناسیم شیوعیەکی رۆژانـی راپـەڕینی شۆڕشگێڕانەی پـاش راپـەڕینی کـانوونم، بـەڵام هیچی لەسـەر خۆشاردنەوەو دەوری لـەوە بـەدوام نـەدەزانی. خـۆی لەگـەڵمدا هـات تـا بمداتـە دەسـت پۆلیسـخانەی قـەڵادزێو لێـم بکۆڵێتەوە. هەر لە پاسە دارینە کۆنەکەماندا بووینو بۆ سێیەم جار لە بریی پـرد بـە قـەیاخێکی سـەرەتایی کـە پاسـەکەی سـەردەکەوتو بـە سـیمێکی ئەسـتوورو دوو خولۆکەی هەردوو بەری زێیە خورەکەوە بەسترا بوو لـە زێـی بچـووك پەڕینـەوە. چـەند پیاوێکی بەهێز لەوێ بوون بۆ راکێشـانی سیمەکەو پاڵنـان بـە ئوتومبیلەکـەوە بـۆ ئەوبـەر. دیمەنەکـە بـەلای هێندێکیانـەوە سـامناك بـوو. توانیـم لـە رێگـەی روو بـە قەڵادزێدا قەناعەت بە پۆلیسەکە بکەم کە من بە کڕینو فرۆشتنەوە خەریکمو هـەقم بەسەر سیاسەتەوە نییەو بۆ ئەم مەبستەیش دەچمە ماڵی خزمێکم لە قەڵادزێ. بـەوە لە خشتەم برد کە لەوسەر بە دیاریەکی باشەوە دێمەوە لای.

هەر کە گەیشتمە قەڵادزێ دەست بەکار بووم. لە مـاڵی محەمەدی نانـەوا کـەریمی بەرگدروو لەگەڵ چەند لاوێکدا کۆبوومەوە، لەوانـە: عـەبدوڵلای سـۆفی رەحمـان کـە ئەوسا شیوعیەکی خوێن گـەرم بـوو (بیسـتم لـە سـاڵانی حـەفتادا بـوو بـە نۆکـەری رژێـم)و غـەفوور محەمـەدی قوتـابیو زاهـیری بـەرگدرووی شـیوعی. دوای چـەندین چاوپێکەوتنو قسە هێنـانو بـردن، سـەیرم کـرد عـەبوڵلا هـەرە لێـهاتوو ترینیانـەو هەموان پێیـان قبووڵـە ببـێ بـە یەکـەم بـەرپرسو، نانـەوا شیوعیە یـەکجار خوێـن گەرمیش یارمەتیی بدات. لیژنەیەکی حیزبیم بـە غـەفوورە چکـۆلی قوتابیشـەوە لـە پێنج ئەندام بۆ پێك هێنان.

لە قەڵادزێ بووم کە یەکێك هاتە لامو پێی گوتم:

- بوودەڵەکان تاوانەکەی خۆیانیان بەجێ هێنا. دوێنێ هەڤاڵ فەهدیان لە قەنارەدا.

- چۆن ئەزانی؟

- رادیۆی لەندەن هەواڵەکەی بڵاوکردەوە.

- ئەم هەواڵە لە ناخی ناخەوە هەژاندمیو خەریك بوو لەبەردەمی هەڤاڵەکانمدا بدەمە پڕمەیگریان. کە لە ژوورەکەدا بە تەنیا مامەوە بەراستی گریام. ئەو کاتە وەك سەرجەم شیوعیەکانی عیراق دڵبەندی فەهد بوو بوومو خۆشم دەویست.

* * *

ئەو زەمانە ئاسایی بوو خەڵك لە نێوان ناوچە کورد نشینەکانی عیراقو ئێراندا بۆ نان پەیدا کردن یا بۆ خوێندن لە مزگەوتدا یا بۆ دیدەنیی خزمان هاتوچوو بکەن، بە بێ ئەوەی یەکێك داوای پاسپۆرت یا هەر بەڵگە نامەیەکی دیکەیان لێ بکات. لە ماڵی کەریمی بەرگدروو لە قەڵادزێ چاوم بە لاوێکی کوردی ئێران کەوت کە بۆ فرۆشتنی هێندێك کەلو پەل هاتبوو. قسەم لە بارەی چەند مەسەلەیەکەوە لەگەڵدا کرد. ئەمجا لەسەر حیزبی توودە پرسیارم لێ کرد. وەڵامی دایەوە:

- ئەمە چ حیزبێکە لێی دەپرسی؟

بۆچی؟ تۆ لایەنگری نیت ؟

- شایانی ئەوە نییە کەس لایەنگریی بکات. ئەوانە پێخاوسن، پێڵاویان نییە بۆ خۆیان لە پێی بکەن. ئایا رەوای هەقە مرۆڤ حیزبێك دابمەزرێنیو خۆیشی پێخاوس بێ.

گەڕامەوە بۆسلێمانیو راپۆرتێکی تێروتەسەلم لە بابەت ئیشەکانی قەڵادزێمەوە خستە بەردەم سەرکردایەتیی رێکخراو.

* * *

هەرچەند رۆژێکی کەم رابرد بوون پەیامنێرەکە رۆژێکیان نامەیەکی پەلەی بۆ هێنام، داوای لیٚ دەکردم جێیەکی زامن بۆ هەڤاڵێکی حیزبی پەیدا بکەم تا کاتی سەفەر کردنی تێیدا بمێنێتەوە. هەڤاڵەکەم بردە ماڵی عومەر عەلیی لاوی شیوعیی ئەندامی لیژنەی قوتابیان. دوای چوار رۆژ دووەم نامەم بۆ هات، داوای لیٚ دەکردم میوانەکە بە سەلامەتی بەریٚ بکەم بۆ قەڵادزیٚ. کابرا سپی پێست‌و کەم دووو دەستە بوو. شێوە زمانی قسە کردنەکەی بەڵگەی ئەوە بوو کە خەڵکی هەولێرە. لەگەڵ لاوێکی چالاك‌و زۆر بلێی ناسراو بە (بلە جۆرج)دا رەوانەم کرد. جۆرج ناوی نهێنی‌و حیزبیی (بلە)بووو هەموان دەیانناسی. میوانەکە لە رێگە دەستگیر کراو بە پۆلیسێکدا وەك بارمتە بردرایە قەڵادزیٚ تا لێی دەکۆڵدرێتەوە. لەویٚ گوتبووی: وا هاتووەتە قەڵادزیٚ دیدەنیی محەمەدی نانەوای خزمی بکات. کە محەمەد لە لایەن بلە جۆرجەوە مەسەلەکەی پیٚ گوترا، خۆی چووە پۆلیسخانە تا خزمەکەی وەربگریٚ‌و لەگەڵیدا بیێتەوە ماڵ. دوای چەند رۆژێك میوانەکە لە شارەوە گوێزرایەوە بۆ دێیەك تا لە ماڵی ئاغایەکی بچووکدا جێنشین ببیٚ. لەویٚ پۆلیس هەڵیانکوتایە سەری‌و گرتیان. لەوانەیە بەهۆی دوو زمانیی یەکێکەوە تێکەوتبیٚ. دوایی زانیم ئەم پیاوە مەلا شەریفی بەرپرسی پێشووی هەم رێکخستنی حیزبی شیوعیی کوردستانی عیراق بووو هەم رۆژنامەی شیوعیی (ئازادی)ش کە بە زمانی کوردی دەردەچوو. زانیشم ناوبراو لە لایەن حەمید عوسمانەوە نێردرابوو، تا بگاتە ئێران‌و لەویٚ پێوەندی بە حیزبی توودەوە بکات.

* * *

# دوکەرتبوون

رۆژێکی نیسانی ١٩٤٩ پەیامنێری حیزب بلاّوکراوەیەکی حیزبیی بە کاربۆن روونووسکراوو لە پەراوێزدا ئیمزای بەرپرس لێدراوی بۆ هێنام و، رایانسپاردم چەند دانەیەکی لیّ روونووس بکەمەوەو بەسەر شانەکانی لای خۆمدا بیانبەشمەوە. خوێندمەوە، بۆم دەرکەوت باسی چەند کێشەیەکی ناوخۆی حیزب دەکات کە پێشتر شتێکم لە بارەوە نەبیستبوون. بەرپرس لەسەر گرتن و رووخانی بیّ ئەندازەی ئەندامان نووسیبووی و، نشوستیی لەوە بە دوای حیزبیشی خستبوەسەر شانی مەکتەبی سیاسی کە لە ساڵی ١٩٤٦ ـ ١٩٤٨ەوە لە زینداندا بوون، واتە فەهدو (زکی بسیم) و (حسين محمد الشبيبي). ئەو سیّ کەسە لە شوباتی ١٩٤٩دا حوکمی لە سێدارەدانیان بەسەردا جێبەجیّ کراو پاڵەوانانە تا دوا چرکەی ژیانیان خۆیان راگرت. دوایین برگەی بلاّوکراوەکە تەواو کەللەیی کردم. پێدەچیّ زیاتر لەبەر چەند هۆیەکی عاتیفی بوو بیّ نەك زانستی. بۆیە نامەیەکی ناڕەزایی دەربڕینم بۆ هەڤاڵی بەرپرس نووسی و داوام لێکرد دەستبەجیّ بلاّوکراوەکەی رابکێشێتەوەو تاوان نەخاتە پاڵ سەرکردە شەهیدەکانمان.

شتێکی دیکەم لە نامەکەدا بۆ قووت نەدەچوو، ئەویش ئەوە بوو کە "بەرپرس"ی خاوەنی بلاّوکراوەکە ـ وەك لە نووسینەکەدا دەردەکەوت ـ خۆیی خستبووە ناوەندێکی دژ بە ناوەندی تەقلیدیی حیزب کە نەریت وا بوو لە بەغدا بیّ نەك لەم شارەی ئێمە. وام هاتە بەرچاو وەك بڵێی ئەم بەرپرسە جۆرێك یاخیبوونی لە سەرکردایەتیی حیزب ئاشکرا کردووە. ئەو کاتە بە شێوەیەکی واقیعبینانە نەمدەزانی سەرکردایەتیی راستەقینە کێیە.

بەرپرس بە کەمێك هێمنی‌و سوور بوون لەسەر رایەکانی، وەڵامی نامەکەی دامەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە منیش پێ بە پێ سوور بووم لەسەر رای خۆم. لە نامەی دواییدا داوای لێکردم لەگەڵ پەیامنێردا بچمە لای تا بەیەك بگەین‌و پێکەوە باسی مەسەلەکە بکەین. چووم‌و خۆمم بە ژووردا کرد. روانیم لە بەردەم لاوێکی کورتە باڵای ڕەتووتەدام کە (ئەکرەم عەبدولقادریامولکی) بوو. ئەگەرچی پێشتر پێکەوە لە دەستەیەکی حیزبیدا ئیشمان نەکردبوو، باش یەکتریمان دەناسی. لێدوانەکەمان بە بن بەست گەیشت، چونکە هەریەکەمان سوور بوو لەسەر ڕای خۆی. ڕوونووسکردن‌و بە شینەوەی بلاّوکراوەکەیشم بە توندی ڕەت کردەوە. ئەوسا بەرپرسی بەشێکی گەورەی پاشماوەی ڕێکخستنە حیزبیەکانی شار بووم. بەم پێیە ڕێکخراوی سلێمانی دووکەرت بوو. پێشبڕکێی نێوانمان، هەر لایەو بۆ ڕاکێشانی ژمارەیەکی زۆری کادێران‌و ئەندامان، دەستی پێکرد. توانیم بە خێرایی هەریەکە لە عەلی حسێنی بەرزنجی‌و ئەحمەد حەللاق‌و عەبدوڵڵا خالیدو ئەسعەد بانی‌خێلانی‌و مەجید عەبدولڕەزاق‌و کسانێکی دیکە بقۆزمەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو پێوەندیمان بە سەرکردایەتیی بەغداوە کرد. ئەمدەزانی حەمید عوسمان بوو بووە سەرکردەی حیزب. بە نامە وەڵامم بەدەست گەیشت، لەگەڵ شفرەو پارچە کاغەزێکدا کە ناونیشانی نامە ناردنی تێدا بوو: بغداد، علاوي الحله ، المكوى حسن عوينه. لە هەمان کاتدا ئەکرەم هەوڵی دەدا لە شارانی دیکەی دەرەوەی سلێمانیش لایەنگر بۆ خۆی پەیدا بکات.

پاش دوکەرتبوونی ڕێکخستن تەنیا یەك جار ئەکرەمم دییەوە، ئەویش ساڵی ١٩٥٠ بووو جلێکی لە هیی ئاسایی خۆی جیاواز، لەبەر بووو بە شەقامێکی لا کۆڵانی شاری کەرکووکدا دەڕۆیشت. بەڵام ململانێی نێوانمان هەر لە توندو تیژ بووندا بوو. ئەو لە بەغدایش هێندێك کسی بە لای خۆیدا ڕاکێشا. ڕێکخراوی شاری (ناسریە)یشی ڕاکێشا کە (دلی مریوش)ی مامۆستای شیوعی سەرکردایەتیی دەکرد. دواتر ئەکرەم بلاّوکراوەیەکی (النجمة)ناوی دەرکرد کە

زمانحالّی فراکسیۆنەکەی بووو بە دەست روونووس دەکرایەوەو بە کەمی دەبەشرایەوە. بەلاّم تەمەنی ڕێکخراوەکەی ئەوەندە درێژ نەبوو، چونکە ڕێکخراوی (ناسریە)ی لا کشایەوەو گەڕایەوە بۆ لای ئێمە. ئەکرەم کەوتە دوخێکی واوە کە نەیدەتوانی درێژە بە ئیشکردن بدات. گوتیان: داوای یارمەتیی لە هێندێك خزمی ئەفسەری کرد بوو تا خۆ تەسلیمی ئاسایشی گشتی بکاتو خێرا بەر ببێ. کاتی خۆی دەنگ هەبوو ناوی ئەو کەسانەی دابێتە ڕژیم کە پێشان پێوەندییان پێوەی هەبوو. من لەوە دلّنیا نیم.

ئەوی ڕاستی بێ ئەو دوکەرتبوونە هیچ بنچینەیەکی فیکریو سیاسیی نەبوو. ئێمە لەسەر دروشمو ڕێبازی سیاسی ناکۆك نەبووین. ئەگەر ئێمەو ئەکرەمیش ئاستێکی بەرزتری هۆشیاریی تێگەیشتنمان هەبوایە، نەدەبوو بەرپرسیی هەموو هەلّەو ڕووخانێك بدەین بەسەر مەکتەبی سیاسیدا، چونکە ئەوە پاساوی دوکەرتبوونەکەی نەدەدایەوە. بەلاّم ئاستەنگەکانی دەرەنجامی نشوستی هێنانی حیزب لەو ماوەیەدا لەلایەکەوە، نزمیی ئاستی هۆشیاری لای هەموان لەلایەکی دیکەوە، زەمینەیەکی وایان خۆش کرد کە دەکرا دوکەرتبوونی تێدا ڕووبدات.

*   *   *

دوای دوکەرتبوونەکە دەست پێشخەریم کرد بۆ پێکهێنانی لیژنەیەکی تازەی سەرکردایەتی بۆ ڕێکخراوی پارێزگا لە منو عەبدوللاّ خالیدو عەلی حسێنی بەرزنجیو ئەحمەد حەللاقو، هەموو خۆمان شارد بووەوە یا دۆخێکی لەو چەشنەمان هەبوو.( ئەسعەد بانی خێلاّنی) مان بە بەرئەندامێکی لیژنە دانا. کە بوومە یەکەمین بەرپرسی ڕێکخراو، یەکەم بلاّوکراوەی ناوخۆییی ڕێنوێنیم بە ناونیشانی "ئەرکەکانمان " ەوە دەرکرد کە بەدەست لەلایەن هەڤالانەوە روونووس دەکرایەوە، چونکە ئامرازی چاپکردنمان نەبوو.

*   *   *

-٤-

# سکرتێری حیزب

حوزەیرانی ١٩٤٩ عەلی بەرزنجی نامەیەکی داخراوی بۆ هێنام، لە بەغداوە نێردرابوو. خوێندمەوە: حەمید عوسمانی یەکەمین بەرپرسی سەرکردایەتی گیراوە. پێشتر ڕایسپارد بوو هەواڵ بۆ بەرپرسی سلێمانی بنێرن تا کە ئەم گیرا ئەو ڕوو بکاتە بەغداو جێی بگرێتەوە. کەواتە دەبوو بچمە پێتەخت تا ببمە سکرتێری حیزب.

عەبدوڵڵا ئەحمەد بەرزنجیی هەڵگری نامە، لاوێکی بڕوا پێکراوو قوتابیی خانەی مامۆستایان لە بەغداو خەڵکی شاری سلێمانی بوو. هیچ ڕێی تێنە دەچوو بە تەڵەمەوە بکەن. لەگەڵ هەڤاڵانی دیکەی لیژنەدا لە مەسەلەکەم کۆڵییەوەو وەڵامی ڕەزامەندیم ناردەوەو، داوام کرد لە ژوانێکی دیاریکراوی ڕۆژی ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٤٩ دا چاوەڕێم بکەن. بەرپرسیی لیژنەیشم لە سلێمانی خستە سەر شانی عەبدوڵڵا خالید کە هێندەی نەخایاند - وەك پاشتر زانیم - وازی لە کاری حیزبی هێنا. لەگەڵ (عەلی بەرزنجی)دا بەپێ ڕێمان کردو لە شار دوور کەوتینەوە. دوای ئەوە سەرکەوتمە سەرباری لۆرییەکی دانەوێڵە. گەیشتمە بەغدا، بەبێ ئەوەی کەس لە ڕێگە پرسیارم لێ بکات. لە ئوتێلە بچووکەکەی (الزعماء)ی تایبەت بە هەژارانی عەودالی هەرزانترین جێ دابەزیم. ئێوارە کاتێك لەسەریان لەسەر جێگەکەم ڕاکشا بووم، چێژێکی خۆشم لە بیستنی مەقامی (اللامي) وەرگرت کە (محمد القبانچي) لە ڕادیۆی بەغداوە دەیگوت.

لە ژوانەکەدا، بەپێی ئەو پەڕلەیەی کە لەسەری پێکهاتبووین بە لاوێك گەیشتم، بردمیە هۆدەیەك لە گەڕەکی (حمام المالح ). پاشان زانیم یاوەرەکەم (بیلال عەزیز)ی ناوەو قوتابییەکی هەولێرییەو لە بەغدا لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی دەخوێنی. لە هۆدەکەیشدا چاوم بە (هادی سەعید)ی قوتابیی هەمان خانەو

(نووری عەزیز)ی قوتابیی کۆلێجی ماف کەوت. هادی پێی گوتم: ئەو بوو ڕاسپێریەکەی حەمید عوسمانی بەجێ هێناو نامەکەی بۆ ناردم. هەموان لەو هۆدەیەدا جێنشین بووین کە یەکێك بە کرێی گرتبوو. هۆدەکە هیچ ناو ماڵێکی جێی باسی تێدا نەبوو.

هەر بە گەیشتنە بەغدا بوومە بەرپرسی (حشع). بەبێ ئەوەی پێشتر بیم لە شتێکی لەم چەشنە کرد بێتەوە یا بە دوویدا گەڕا بم، بە بێ ئەوەی تەمەنێکی حیزبیی درێژ یا ئەزموونێکی سیاسیی وام هەبوو بێ بمکاتە شایستەی ئەم جۆرە پلەو پایەیە. لاوێکی بیستو دوو ساڵانە بوومو هێشتاکە چوار ساڵم لە تەمەنی حیزبیم تەواو نەکرد بووو، ڕۆشنبیریەکی تیۆریو ئەزموونێکی خەباتگێڕانەیشم نەبوو تا بۆ ئەم جۆرە پایەیەی سەرکردایەتی دەست بدەم. وێڕای ئەوە، ئەو هەلومەرجەی کە سەرکردایەتیم تێدا گرتە دەست، بە هۆی نشوستیی گەورەی ساڵانی ١٩٤٨ ـ ١٩٤٩ی (حشع)ەوە، ئەوپەڕی ناسكو ئاڵۆز بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا بە بێ سێو دوو لێکردن بەرپرسیەکەم قبووڵ کرد، چونکە خوێن گەرمییەکی شۆڕشگێڕانەو هەستێکی بەرزی تێکۆشانو دڵسۆزییەکی بێ ئەندازەم بۆ کێشەی گەلو کۆمۆنیزم هەبوو. بەرپرسیم لە کاتێکدا پەسەند کرد کە پەسەند کردنی ژیانی خەباتگێڕی دەخستە مەترسییەوە، چونکە دوژمنە نیشتمانیو چینایەتیەکەمان توانیبووی هەم لە نێوان تشرینی ١٩٤٨ ـ حوزەیرانی ١٩٤٩دا پێنج جاری یەك لەدوای یەکدا شالاوی کتو پڕ بباتە سەر یەك لە دوای یەکی ناوەندەکانی سەرکردایەتیو تێکیان بشکێنێو، هەم دیارترین سەرکردەکانی حیزب لە سێدارە بداتو هەزاران کادرو ئەندامی لەزیندان بپەستێو ئەندامە لەڕووی سیاسییەوە بوودەڵەکان بڕووخێنێو هێندێکیان بخاتە بەر بێگاری دەزگا سەرکوتکەرەکانی خۆی، وەك (مالك سيف)و ڕەفیق چالاکو (جاسم الطعان)و (صبری عبدالكريم )و مەجید ڕەئووفو..تد. ژمارەیەکی کەم لە گیراوەکانی نێو ناوەندەکانی سەرکردایەتی

خۆراگرییان نواند، لەوانە: وەك من بزانم (ساسون دلال)و حەمید عوسمانو مەهدی حەمید. من دەبوو لە ماوەی هەشت مانگداو بە تینو توانێکی ماددیی کەمو زەحمەتێکی زۆرو جەستەیەکی پڕ برینی قووڵی حیزبەوە، شەشەمین ناوەندی سەرکردایەتی پێك بهێنم. بەختم یار بوو، دوژمن پێی نەکرا ناوەندە تازەکەی سەرکردایەتی کە من پێکم هێنا، تێك بشکێنن. ئەگەر چی گورزێکی توندی تێگرتو وەخت بوو لە نێوی ببات.

زیندانو تاراوگەکان (المنافی)پر لە شیوعی بوونو ووره لە رادە بەدەر هاتبووە خوارو، جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەش لە داچوونێکی قووڵدا بوو. زۆربەی ئەوانە لە حیزبو گشت چالاکییەکانی سیاسی تەکینەوە کە رۆژانی رابوونی پاش راپەڕینی کانوون لە ریزی پێشەوە بوونو پر بە دەم هوراپیان دەکێشا. کار بەوە گەیشت حوکمداران، وەك (عەلی حیجازی)ی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیسی ئەوسا رایگەیاند. بە ئومێد بن هەموو چالاکییەکی شیوعیانە لە عیراقدا بۆ لانی کەم ١٠ ساڵ بنە بڕ ببێ. دیارە ئەگەر ناوخۆی حیزبو ئاشکرا کردنی نهێنیەکانی لە لایەن چەند بەرپرسو کادێرێکەوە نەبوونایە، نشوستییەکە تا ئەم ئەندازەیە قووڵ نەدەبوەوە. رووخاوەکان هیی وایان لە نێودا بور لەبەردەم ئەشکەنجەدا بەرگەی نەگرتو هەرچەند زانیارییەکی بە دەستەوە دا، بە بێ ئەوەی ئارەزووی دژایەتیی کۆمۆنیزم بکاتو بچێتە ریزی دوژمنانییەوە. هەیشیان بوو بە تەواوی خۆیی تەسلیمی دوژمن کردو، بە رادەیەك پێی هەڵخلیسکا کە ئیتر بێ پەردە یا ژێر بە ژێر سەروبەر خۆیی خستە ژێر نیری خزمەتی دەزگا سەرکوتکەرەکان.

* * *

چالاکیی حیزبیی تازەکیم لە ژووری ئەو قوتابیانەدا لە گەڕەکی (حمام المالح) دەستی پێکردو. لەو بارودۆخەیش کە پێشتر حیزب تێی کەوتبوو پێیم نەدەزانی، بەئاگا هاتمەوە. هادی بلاوکراوەیەکی دەستنووسی بەناونیشانی " ململانێ "

(الصراع)وە دامیٚ، وێنەی چەکوشێك بەسەر بەرگەکەیەوەو ڕستەی (زمانی حاڵی چینی کرێکاری عێراق)یش لە ژێر ناوەکەیدا بوو. پێی گوتم:

ـ کاتی خۆی حەمید عوسمان ئەم بڵاوکراوەیەی دەرکرد. پێش ئەوەی دووەم ژمارە دەربکات، دەستگیر کرا.

سەرەتا پێم وابوو دەبێ درێژە بە دەرکردنی بدەم. ژمارەیەکی تازەم لیٚ دەرکردو دواتر لە دەرکردنی کەوتم. هێمنانە تر بیرم لە مەسەلەکە کردەوەو لە خۆمم پرسی:

ـ دەرکردنی بڵاوکراوەیەك بە ناوی چینی کرێکاری عێراقەوە، بۆچی؟ ئەگەر شتێکی وا لە دەسەڵاتدا بێ، بۆچی بە ناوی حیزبی شیوعی خۆیەوە نەبێ ؟

مانەوەم لە ژوورەکەی (حمام المالح) دا زۆری پێ نەچوو، چونکە ڕووداوێك پەرەوازەی کردین. هەمووومان دانیشتبووین، یەکێکی کامڵی چەتەوڵی ڕەشتاڵە لە بەرگێکی مەدەنیدا قوت بووەوەو لەبەر دەرگای ژوورەکەمان ڕاوەستاو پرسیی:

ـ ئەم بینایە هۆدەیەکی چۆڵی تێدایە بۆ کریٚ ؟

زەلامە کە خافڵگیری کردمو ڕوانیمانە یەکتر، چەند ساڵێك بوو یەکترمان دەناسی. ناوی، ئەحمەد جێشانە)و خەڵکی سلێمانی بوو. عەریفی پۆلیس بوو، خولێکی بڕیبوو پاشان بوو بە قۆمیسەری پۆلیس و، ئەمجا چوو بووە ڕیزی مووچە خۆرانی ئاسایشی گشتیەوە لە بەغدا. لەوە بێ ئاگا بوو کە من خۆمم لە ڕژێم شاردووەتەوەو بۆ چالاکیی حیزبی وام لە بەغدا. کە پێی گوترا هۆدەیەکی چۆڵ نییە، ڕۆیشت. هەرچییەکم لەسەر کابرا دەزانی بە هەرسێ هەڤاڵەکەمم گوتو داوام لێکردن وەك قایمکاری یەكو بۆ خۆپاراستن هۆدەکە بەجێ بهێڵێن. هادی قسەکانی بەڕاست نەزانیو، سوور بوو لەسەر مانەوە. (نووری)یش گوتی:

ـ مستەفای کوببە فرۆشی بەردەم خانوەکە چاك دەیناسێ. دەچمە لای، پرسیاری ئەوی لیٚ دەکەم.

نووری چووو پاش کەمێك هاتەوەو گوتی:

- مستەفا دەڵێت: ئەم کابرایە تەنیا گەوادەو شتێکی دیکە نییە.

ئەوە زیاتر تەنگە تاوی کردم. زەحمەت بوو وایان لیٚ بکەم قەناعەت بە قسەکەم بکەن. بەڵام کوببە فرۆشەکە بە هەناسە بڕکیٚو لەرە لەری ورگیەوە بە جووتە دەست خۆیی دا بەسەر هەردوو لای دەرگاکەداو پێی گوتین:

- لەو دراوسێیەمم پرسی، باش ئەم کابرایە دەناسیٚ. گوتی: ئەمە قۆمیسەرە لە ئاسایشی گشتی. ئەگەر شیوعین، بەر لەوەی دەورتان بگرنو دەستگیرتان بکەن، دەمو دەست هۆدەکە بەجیٚ بهێڵن.

لە دڵی خۆمدا گوتم: " کەواتە مستەفا لە هێزی یەدەکی حیزبە ". هەموو قایل بوون ژوورەکە چۆڵ بکەن. هادی بردمیە هۆدەیەکی بچووکی خانوویەکی دووقات لە گەڕەکی ( عقد النصاری). کلیلێکی لە گیرفانی دەرهێناو دەرگاکەیی پێکردەوەو پێکەوە دانیشتین. ئێوارە دانیشتووی هۆدەکە هاتەوە، برادەرەکەم بە (عوسمان) بانگی دەکرد. لاوێکی تەمەن لە بیست ساڵ کەمتری دەستەی جوانکیلە بوو. پاشتر زانیم قوتابییەکی جوولەکەی شیوعییەو فەرمانی گرتنی دەرچووە، بۆیە ماڵی باوکیی بەجیٚ هێشتووەو ئەم ژوورەی لەسەر حسێبی خۆی بەکریٚ گرتووە. ناوی راستەقینەی (سعید خلاصچی) بوو. مانگی ئاب هادی چوو خەبەری لێداو تەسلیمی پۆلیسی کرد. گوتیان: سەعیدیش ڕووخا. لەوە بەدوا ئاگام لە هیچ شتێکی نەما.

لە هۆدەکەی (سەعید) یشدا تامی جێگیر بوونم نەکرد. دوای دوو یا سیٚ ڕۆژ، کاتێك لە هۆدەکەدا بە تەنیا بووم و چاودێری دەرگای دەرەوەی خانوەکەم دەکرد، مەفرەزەیەکی پۆلیسم دی وا خۆی بە ماڵدا دەکات. خاوەن ماڵە دیانەکە لە هۆدەیەکی قاتی یەکەمدا دادەنیشت، ئامبازیان بووو بەسەر ئەفسەری پۆلیسەکەدا نەڕاندی:

- بە چ هەقێك بەم شێوەیە دێنە نێو خانوەکەم ؟ کوا پسوولەی ڕیٚ پێدانی حاکم بۆ پشکنین؟ کوا موختاری گەڕەك کە دەبیٚ کاتی پشکنین لەگەڵتاندا بیٚ ؟

یەکێك لە پۆلیسەکان بە پەلە سەرکەوتە سەربانو بە بەردەم دەرگای هۆدەکەمدا ڕەت بوو. کە بینیی بە تالە، دابەزی. شەڕە قسەی خاوەن ماڵو ئەفسەرەکە لە حەوشەکەدا گەرم بوو. کە پۆلیسەکە هاتە خوار، یەکسەر بە هەڵ زانیو سەرکەوتمە بانو لەوێوە چوومە سەربانێکی دیکەو بەدار تێلێکی کارەبادا دابەزیمە نێو کۆڵانی پشتەوە. ئەوەم بە دەستکەوتێکی گەورە دانا، چونکە لە چنگی پۆلیس قوتار بوومو پێم وابوو بۆ ئەوە هاتبوون لە ناخافڵدا پەلاماری خانوەکە بدەنو بمانگرن. چووم سۆراخی هادیو سەعیدی جووتە شەیدای دانیشتنی چایخانە بکەم، تا ئاگاداریان بکەمەوە کە نەگەڕێنەوە بۆ خانوەکە. یەکەم جار (هادی)م دۆزییەوە، بە هاوکاریی ئەویش سەعیدمان دۆزییەوە. لەو مەترسییە داوێنگیرە دەرباز بووین، بەڵام بێ جێو ڕێ ماینەوە. من خۆم نەمدەتوانی شتێك بکەمو مشووری خۆم بخۆم. دەبوو چاوەڕێی دەستی هادی بکەم.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ هادی بە یارمەتیی سەعید بردمیە ماڵی کرێکارێکی شیوعی (ناوەکەیم بیر نا یێ)، بۆ ئەوەی بۆ چەند ڕۆژێكو تا چارەسەرێکی چاکتر بۆ گیروگرفتەکە دەدۆزینەوە لای ئەو بم. ئەم کرێکارە جوولەکەو شیوعییەکی خوێن گەرمو مرۆڤێکی سادە بوو، لەگەڵ دایکە پیرە جرپنە زۆر بڵێکەیدا لە ژوورێکی خانێکی سیو دوو ژووریدا کە سیو دوو خێزانی زەحمەتکێشی جوولەکەی تێدا دانیشتبوون، دەژیا. بەلوعەیەکی هاوبەشی ئاو لە ناوەڕاستی حەوشەی خانە پڕ لە زبلو زاڵەکەدا بوو، هەموان ئاویان بۆ خواردنەوەو چێشت لێنانو شتن لێدەبرد. دەوڵەمەندێکی جوولەکە خاوەنی خانەکە بوو، ڕێی بە هیچ خێزانێکی جوولەکە نەدەدا ـ ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بووە ـ کرێکەی دوا بخات.

سێ چوار ڕۆژ لە ماڵی ئەم کرێکارە شیوعییە خوێن گەرمە مامەوە. ئەو ماوەیە هەستم بە دڵتەنگی دەکرد. ئەمە ئەوەتی کە لە بەغدابووم سێیەمین شوێن بوو تێیدا جێنشین ببم. وام هات بە بیردا کە دەبێ لە چارەسەر کردنی گیروگرفتی خانوودا

پشت بە خۆم ببەستم تا هەم دڵنیاییەکی زیاترو هەم دۆخێکی باشتریش بۆ درێژەپێدانی ئەرکە حیزبیەکانم دابین بکەم.

ناچار چوومە شاری (بەعقووبە) کە کەس لەوێ نامناسی، تا چەند ڕۆژێکی تێدا بگوزەرێنم. لە ئوتێلێکی هاکە زاییی ئەوێ دابەزیمو وا خۆم دەرخست گوایە هاتووم لەبەردەم دادگادا شایەتی بدەم. دوای چوار ڕۆژ چوومە خانەقینو بە تیرێك دوو نیشانم شکاند: واتە بۆ بەسەر بردنی چەند ڕۆژێك لە لایەکەوە، بۆ پێوەندیکردن بە ڕێکخراوی حیزبمانەوەو تەماشا کردنی بارودۆخی لە لایەکی دیکەوە. بە دەستی خۆم نامەیەکی داخراوم نووسیو دامە (عەلائەدین مەحموود)ی بەرگدرووی شیوعی - ئەگەر بیرم بە هەڵەیدا نەبردبێ - کە دووکاندار بووو کرابووە ناونیشانی پێوەندیکردن. لە کاتی چاوەڕوانکردنی وەڵامدا، ڕۆیشتم بپرسم چ چاخانەیەك لە مانگی ڕەمەزاندا کراوەتەوە، تا نانو ئاوی تێدا بخۆم. پاش چارەکە سەعاتێك دوو پۆلیس لە بەردەممدا ڕاست بوونەوەو داوایان لێکردم لەگەڵیاندا بچمە پۆلیسخانە. پێم وابوو یەکێك هەیە ناسیومیەوەو خەبەری لێداوم. بەڵام لەوەختی وادا ڕێی تێناچێ تەنیا دوو پۆلیس بنێرن. بێ سوود هەوڵی دەم چەور کردنیانم دا. یەکیان وەڵامی دامەوە، گوتی:

- پۆلیسێکی نهێنی خەبەری لێ داوی، بۆیە بە خۆماندا ڕاناپەرموین بە پارە بەرەڵلات بکەین. ئەگەر ئێرانی بی ئەوا بەندت ناکەن، بەڵکوو هەر هێندە دەتنێرنە ئەودیو سنوورو لەوێوە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵی خۆت.

- ئەی ئەگەر ئێرانی نەبم ؟

- داوای ناسنامەت لێ دەکەنو بەرت دەدەن.

- بەڵام من لێرە ناسنامەم پێ نییە.

- کەواتە دەبێ کەفیلێك بهێنی.

دەم‌و دووی پۆلیسەکە ئاهێکی بە بەردا هێنامەوە، چونکە زانیم تاوانم دراوەتە پاڵ کە ئێرانیم‌و بەشێوەیەکی نا یاسایی خۆمم کردووە بە نێو عیراقدا. کەواتە لەبەر هۆی سیاسی خەبەریان لیٚ نەداوم‌و هیچ شتێك لە بارەی سیفەتی سیاسیمەوە نازانن. لە ژووری قۆمیسەری کاربەدەستی پۆلیسخانەکەیش دڵنیا بووم کە لەوە بەدەر هیچ هۆیەکی دیکە لە ئارادا نییە بۆ بانگ کردنم. قۆمیسەرەکە گوتی:

- تۆ ئێرانیت ؟

- نەخێر عیراقیم، ئێرانی نیم.

- ئا ناسنامەکەتم بدەرێ تا بۆمی بسەلێنی کە تۆ عیراقیت.

- من خەڵکی سلێمانیم. لای ئێمە داوای ناسنامە لە کەس ناکەن. لە کەرکوک ئیش دەکەم، لەوێیش داوای ناسنامە لە کەس ناکەن. لەبەر ئەوە ناسنامەم هەڵنەگرتووە.

- ئەگەر لە کەرکوك ئیش دەکەی، بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟

- لێرە لە کۆمپانیای نەوت بە دوای ئیشێکی باشتردا دەگەڕێم.

- یەکێك بێنە ببێتە کەفیلت، ئەمجا بەرەڵلآت دەکەین.

ناوی (عەبدولقادری مەلا ئەحمەد)م دا کە لاوێکی سلێمانی بوو لە منداڵیەوە دەمناسی. گرفتەکە لەوەدا بوو: چۆن ئەم لاوە بزانیٚ من لە بریی ناوی ڕاستەقینەم ناوی ( غەفوور محەمەد )م داوە. کە لەگەڵ پۆلیسێکدا گەیشتە لام گوتی: نایناسم. بەوە تەنگەتاو بووم. بە چرپەوە پێم گوت:

قادر چۆن وا دەڵێی؟ من بە تۆمەتی ئێرانی گل دراومەوەو پێویستیم بە یەکێك هەیە هەر ئەوەندە بڵێت من عیراقیم‌و بەس.

قادر وەڵامی دایەوە: " دەترسم ". زیاتر گومانم هەبوو کە ئەو یەکەم جار هۆی گلدانەوەکەمی لە لا ڕوون نەبوو، دەیزانی من شیوعیم‌و خۆمم شاردووەتەوە.

- کەواتە دەمەوێ هەواڵ بگەیەنی بە (شێخ عەلیی قەرەداخی)ی خزمم لە بازاڕی کووتاڵفرۆشان، بەڵکوو بێت‌و ببێتە کە فیلم. پێی بڵیٚ: غەفوور محەمەدی خزمت -

بیرت نەچێ غەفوور محەمەد ـ گـل دراوەتـەوەو پێویستیی بـە کـەفیلێك هەیـە بـەری بدات.

بەجێی هێشتمو گفتی دا هەواڵەکـە بگەیـەنێ بـە خزمەکـەم. پـاش بیـست دەقـە شێخ عەلی گەیشتە جێو لە دوورەوە هاواری کرد:

ـ سڵاو لە غەفوور محەمەدی خزمم. بۆچی گلیان داویتـەوە؟ بۆچـی دەستبەجـێ هەواڵت بۆ نەناردم ؟

لەگەڵ ئەودا بردیانمە لای ئەفسـەری پۆلیسـی ئێشـکگر. چـا خرایـە بـەردەمانو، داوای لێبوردنی لە خزمەکەم کردو، تا بەر دەرگا بەرێی کردین. ئەو شەوەم لە مـاڵی شێخ عەلی ڕۆژ کردەوە، بەبێ ئەوەی پێی بڵێم: ئیشە ڕاستەقینەکەم چییە. ئێوارەیـش قادرو موفتی خانەقینیی باوکی سەریان لێدامو شێویان لەگـەڵدا کردیـن. سـاڵێك زیاتر بوو خواردنی وا چاکم نەخوارد بوو.

ئەو هەڤاڵانەی کـە نامەکـەم بـە بەرگدروەکـەدا بـۆ نـاردن کـاتێك بـە مەسـەلەی دەسـتگیرکردنمیان زانـی، هـەوڵیان دا دوای گواسـتنەوەی چـاوەڕوانکراوم بـۆ نێـو سنووری ئێران، لەوێ بمقۆزنەوە. بەڵام من سەر لە بەیانیی ڕۆژی دوایی، بەبێ ئـەوەی هەوڵ بدەم پێوەندی بە یەکێکی خانەقینـەوە بکەم، هاتمەوە بەغدا.

کە هاتـمەوە پێتـەخت، گـیروگرفتی هـەرە گـەورەم خـانوو بـوو. بڕیـارم دا پشـت ئەستوور بم بە خۆمو سۆراخی هۆدەیـەکی کـرێ بکـەم. هێنـدەی نـەبرد لـە (حـەیدەر خانە) چنگم کەوت، مـانگی بە نیو دینار. هۆدەکە لە خانوویـەکی شـازدە هۆدەییـدا بوو کە سەرجەم بەهیی وەك من یا بە نیوچە خێزان درا بوون بە کرێ. سەیدە شـەلەی مێزەر سەوزی خاوەن خانوەکە لـە خانوویەکی تەنیشـتمان دادەنیشـت. ئەو هۆدەیـە لەبان دەرگای دەرەوەی بیناکەو نیزیك بە خانوەکەی سەید بووو، تەنانەت دەرگایەکی داخراویشـی هـەبوو دەچـوە سـەر هۆدەیـەکی سـەید. نـاو ماڵەکـەم بریتـی بـوو لـە لێفەیەکی کۆنی دڕاو،گوتیان میراتی حەمید عوسمانە، لەگـەڵ جانتایـەکی بچووکـی

شکاوو شەربەیەکی ئاوو جامێکی ئەلەمنیۆم بۆ ئاو خواردنەوە. هەر ئەوانەو هیچی دیکە.

سەرەتا هادی تاکە کەسێك بوو ناسیمو، جاروبار هاتوچووی دەکردم. پاشان توانیم پێشوازیی (مجید عبدالرزاق) بکەم کە فەرمانی گیرانی لە سلێمانی بۆ دەرکرا بووو ئیتر نەدەکرا لەوێ بمێنێتەوە. من لە لای خۆمەوە پێویستیم پێی هەبوو. لاوێکی بڕوا پێکراو بووو، وەك تەتەر بۆ پێوەندیکردن بە هێندێك هەڤاڵەوە سوودم لێ وەردەگرت.

بەر لە بەکرێگرتنی ئەم ژوورە، چونکە شوێنێك نەبوو بەدڵنیایی وئاسایی تێیدا دابنیشم، پێم نەدەکرا نامە حیزبییەکان بخوێنمەوەو وەڵامەکانیان بنووسمەوە. چەندەها جار ناچار دەبووم لە ئاو دەستخانەی مزگەوتێکدا نامەکان بخوێنمەوەو بگرە وەڵامیشیان بدەمەوە، لەبەر ئەوەی جێیەکی ئەمین بوو بەڵام ژوور بەکرێگرتنەکە جێیەکی دڵنیای بۆ دابین کردم. کەچی لەم ژوورە تازەیەمدا گرفتێکی دیکە بەرەنگارم بووەوە:

بە ڕۆژ چۆن‌و لە کوێ کات بەسەر ببەم؟ چونکە بە ڕۆژ مانەوەم لە ژوورەکەمدا دەبوە مایەی پرسیارو گومان لێکردن، بە تایبەت لەلای سەیدی خاوەن خانوو. هەرچی چوونە دەرەوەیش بوو بۆ سەر شەقامو نێو چاخانەکان بۆ ماوەیەکی درێژ، وەکوو هادی‌و هیی وەك ئەو دەیانکرد ، کارێکی جێی مەترسی بوو. کەواتە چار چی بوو؟ چار ئەوە بوو هۆدەیەکی دیکە بەکرێ بگرم. ئەوسا دوو ژوورم لە ژێر دەستدا دەبوون، بە ڕۆژ بە بیانووی شەوکاریمەوە لە یەکێکیاندا دەمامەوەو بە شەویش لەوی دیکەیاندا‌و گوایە بە ڕۆژ کاردەکەم. ژووری دووەمم لە خانووی پیاوێکی فەیلیدا دەست کەوت کە لەشەش ژوور پێکهاتبووو شەش خێزانیان بە منەوە تێیدا دادەنیشت. دام بە گوێیدا کە من چاوەڕێی خوشکەکەم‌و منداڵەکانی دەکەم. لە ڕاستیدا چاوەڕێی خێزانی (ڕەئووف محەمەد)ی کرێکاری نەوتی شیوعی‌و ڕاونراوم

دەكرد، تا لەكەركووكەوە بێتە لامانو یەكەمین هێلانەی شیوعی لە نێو بەغدادا پێك بهێنین.

پێوەندیی حیزبیم، بە ڕێگەی نامە گۆڕینەوە یان چاوپێكەوتنی ڕاستەوخۆی هێندێك كەس، بەردەوام پتر پەلی دەهاوێشتو ڕێكخراو دەبوو. ئێمەیش گەلێك شیوعیی گورجو گۆڵمان هەبوو، زۆربەی تینو توانی خۆیانیان بە كاری حیزبایەتی بەخشی، بۆ نموونە:( طارق الامین)ی قوتابیی كۆلیجی پزیشكی كە نامەی هەردوكمان بۆ یەكتر ژمارە (٩٩٩)ی لە پەراوێزدا دەنووسراو، (ثامر الجیبچی)ی قوتابیو كوڕی خێزانێكی ئەریستۆكراتو، (جورج حبیب)ی قوتابیی كۆلێجی ماف. كارامەترین هەڤاڵمان لە گەڕەكی (الكاظمیة) كە لە پێتەختدا بە گەڕەكی سوور ناسرا بوو، (جاسم یحیی)ی كرێكاری چنینو (محمد راضي شبر)ی قوتابیی دەركراوبوونو، لە گەڕەكی (السكك الحدید)یش، (الیاس بطاح)ی شیوعی كە فەرمانبەرێكی بچووك بووو، (سامی جرجیس)ی فەرمانبەری بچووكو (امین)ی كرێكاری چالاكیش هەڵكەوتن.

توانیمان پێوەندی بە ڕێكخراوە شیوعیەكانی نێو زیندانەكانەوە بكەین. دووبارە پێوەندیمان بە ڕێكخراوی هێندێك پارێزگای وەك بەسرەو حللەو كەركووكو هەولێرو خانەقینو هیی دیكەوە كرد. پێشتر ئەو پێوەندیە پچڕا بوو. ئیدی ئابوونەو پارەی پیتاكی مانگانە بەس بوون بۆ پڕكردنەوەی خەرجیی كەمی ئێمە.

هەر لە یەكەم ڕۆژەكانی گەیشتنە بەغدامدا (یعقوب قوجمان)ی لاوی جوولەكەی شیوعیم ناسی، ڕاوە دوو نرا بووو خۆیی شارد بوەوە. دیم پڕ كێشی كەرە، یارمەتیی داین دیسان پێوەندی بە چەند كەسێكی لە حیزب دابڕاودوە بكەین. هەمیشە جانتایەكی پچووكی پڕ لە ووردە تووتنی بە دەستەوە بوو. وەك ڕوونی كردەوە: مەبەستی پێ ئەوە بوو ئەگەر سیخوڕەكان چوار دەوریان گرت ئەو وردە تووتنە بكات بە چڕو چاویاندا، تا بتوانێ خۆ قوتار بكات. ئەوسا خۆیی بۆ سەفەر ساز

دەكرد. وەك بیرم بێ هاوینی ١٩٤٩ بە رێگەی خانەقیندا عیراقی بەجێ هێشت. پاش چەند ساڵێك بیستم بووە بە ئەندامێكی لیژنەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی ئیسرائیل. دواتریش بیستم ئیسرائیلو حیزبی شیوعیی ئیسرائیلی بەجێ هێشتووەو چووە لە بەریتانیا نیشتەجێ ببێ.

كە بەرپرسیی حیزبیم لە بەغدا وەرگرت، هادی سەعید ـ وەك دوایی بۆم ساخ بووەوە ـ خۆیی بە دووەم ئەندامی ناوەندی سەركردایەتی لە قەڵەم دەدا. بەڵام من هیچ شتێكی وام تێدا بەدی نەدەكرد كەوای لێ بكەن شایانی ئەندامەتیی سەركردایەتی بێو بە هاوبەشی خۆیشم دانەدەنا لە ناوەندی سەركردایەتیدا. ئەمە وای كرد زۆر رقی لە من بێ. جا كە پێی نەكرا لە رووی رێكخستنەوە شتێك لە دژم بكات، بڕیاری دا بە پەلە روو بكاتە بەسرە تا (زكي وطبان)ی سكرتێری رێكخراوی ئەوێ بهێنێو، بۆ مسۆگەر كردنی گەیشتنی بە ناوەندی سەركردایەتی كەڵكی لێ وەربگرێ. منیش بەش بە خۆم حەزم دەكرد زەكی بێتە بەغدا، بەڵكوو ببێتە دووەم ئەندامی ناوەندی سەركردایەتی كە ئەو رۆژانە بە تەنیا خۆم پێكم دەهێنا.

* * *

بەیانیەكیان (مجید عبدالرزاق) پێش من گەیشتەوە ژوورەكەمان لە حەیدەرخانە. كە گەیشتمە ئەوێ، دیم لە دەرەوەو لەبەر دەم دەرگای ژوورەكەدا راوەستاوەو هاتو هاواری سەیدە شەلەیش لە ناوەوە بەرز دەبێتەوە. دەرگاكەم كردەوە، سەیرم كرد ژنەكەیو دوو كوڕەكەیو كچەكەی لە پەنا سەیدەوە قڕو قەپو سەرسام بوون وكابرا خۆیشی یەكجار شپرزە بووە، چونكە ئەوشەوە بۆی دەركەوتبوو ئەو بزمارانە كە دەرگا داخراوەكەی نێوان ژوورەكەی منو یەكێك لە ژوورەكانی ماڵەكەیی پێ توند كرد بوون، شل بوونەتەوە. پێی لێ دەنێم: من بووم بزمارەكانم شل كردەوە، تا لە كاتی هەڵكوتانە سەر ژوورەكەمدا لە لایەن پۆلیسەوە، لەم دەرگایەوە خۆ بدزمەوە بۆ ماڵی سەیدو لەوێوە را بكەم. لەوە دەچوو خاوەن ماڵ كە ئەم راستییە ی بۆ ساخ بوو

بێتەوە، ترسابێ من نیازم خراپ‌و مەبەستم برینی ماڵەکەی بێ. کە لەوێ نەبوو بووم، ژوورەکەمی پشکنی بوو، هیچی وای بەدی نەکردبوو نیشانەی ئەوە بێ کە من لە پیێڕی دزان بم. بەڵام چەند بلاوکراوەیەکی شیوعیانەی کەوتبوونە بەردەست. بۆیە زانیبووی ئێمە شیوعین‌و، لەوە تۆقی بوو پۆلیس بدات بەسەرماندا. پێی گوتم:

- ئێوە دەتانەوێ ماڵم کاول بکەن.

- مامە گیان ! خوا یار بێ ماڵت کاول نابێ.

- ئەی ئەگەر پۆلیس بەسەرتاندا هات ؟

- بێ هوودە هەوڵی ئارامکردنەوەیم دا. داوای یارمەتیم لە کوڕە گەنجەکەی کرد تا ئارامی بکاتەوە. وەڵامی دایەوە:

- ئێمەیش هەر لەو هەمان تاقمەین، بەڵام کەس‌و کار رازی نین.

دوا جار بەم شێوەیەی خوارەوە مەسەلەکە یەکلایی کرایەوە: کرێی رۆژانی پێشوو کە چارەکە دینارێك بوو، دەدەین‌و یەکەو راست خانوەکە بەجێ دەهێڵین. لێفە کۆنەکەمان هەڵگرت‌و بۆی دەرچووین. کە سەد مەترێك دوور کەوتبوومەوە، دەنگێکی ژنانەم بیست لە پشتەوە بانگی دەکردم:

- عەلی ! عەلی ! کەمێك بوەستە !

وەستام. کچە عازەبەکەی سەید بە راکردن بەرەو رووم هات‌و کلێشەی نامیلکەی (الصراع)ی لە ژێر عەباکەیەوە دەرهێنا‌و نایە دەستم. کلێشەکەمان لەوێ لە بیر چوو بوو. گوتی:

- وریای کەل‌و پەلەکانتان بن، ونیان مەکەن.

- سوپاسێکی گەرمت دەکەم خوشکێ.

بەم پێیە ژوورەکەی حەیدەر خانەمان لە دەست دا. بەڵام زۆر تەنگە تاو نەبووم، چونکە ژوورەکەی (باب الشیخ)مان بە ساخی‌و سەلامەتی مایەوە.

ڕێنوێنیـەکم بەسـەر گشـت هـەڤاڵانی ڕێکخـراوی پێتـەختدا بلاّوکــردەوە، لـەو بارەیەوە کە زۆر پێویستیمان بە کەرەسـتەی چـاپ کردنـەو، ئەگـەر هـەر دەسـەلاّتێك هەبوو بۆ پەیداکردنیان ئاگادارمان بکەنـەوە. نامەیـەکمان لـە (سـامی جرجیس)ی شـیوعیی چالاکـەوە بـۆ هـات، تێیـدا گوتبـووی: "دەتـوانم ئـامێرێکیڕۆنیۆ لـە دامەزراوێکی کۆلۆنیالی بدزم، بەلاّم پێویستیم بە یەکێکی دیکە هەیە لە دزینەکەدا یاریدەم بـدات". پـاش دوو ڕۆژ (سـامی)و (ئـەمین)ی کرێکـاری چالاکی شـیوعی ڕۆنیۆیەکی (جیستتنەر)ی (ثامر الجیبچـی)یـەوە هـات، هـەواڵی ئـەوەی داینـێ کـە برادەرێکی هەیە لە دائیرەیەکی حکوومەتیدا ئیش دەکـات‌و ئامادەیـە دوای دەوامـی ڕەسمی چیمان بوێ بۆمـان لە چاپ بدات. ئەو وەختە نەماندەتوانی مـاڵێکی تایبـەت بۆ چاپکردن دابمەزرێنین. بۆیە ڕۆنیۆکەم بردە ژوورەکەی خۆم لە (بـاب الشـیخ). ئـەو خێزانە کە چاوەڕوانم دەکرد (أم نضال)و هەردوو منداڵە بچووکەکـەی بـوون‌و، پێـش ئەوە گەیشتبوونە جیێو لە هەمان خانوودا لەگەڵمدا دانیشتبوون. (زكي وطبان)یـش لەگەڵ هـادی سـەعید دا گەیشـت‌و، بـەو حسـێبەی کـە ئـەندامێکی سـەرکردایەتیی حیزب دەبێ، بە شێوەیەکی کاتی لەگەڵ خۆمدا جێم کردەوە.

دەبوو دوای پەیدا بوونی ڕۆنیۆ، هێندێك بلاّوکراوە دەربکـەین بـۆ بەرزکردنـەوەی ورەی هەڤاڵانمان. بـەلاّم ئیش پێکردنـی ڕۆنیۆکـە لـەو تاقـە ژوورەی تەنیشـت پێـنج ژووری دیکـەی خانوویـەکی بچووکـی خۆرەلاّتیـدا کـە چـەند خێزانێکیـان تێـدا دادەنیشت، کارێکی هەروا ئاسـان نـەبوو، بـە تایبـەت کـە ئێمـە پێمـل بووین ڕیێو شوێنی سەختی کاری نهێنی تێدا ڕەچاو بکەین‌و وەهای پێویست دەکرد کەس هیچ شتێك نەبینێو نەبیستێ. ئەی چار چی بوو ؟ بەشێکی ژوورەکـەمان بـە سـنووقێکی تەختـە نـاوبڕ کـردو، چـی نوێـن هـەبوو لــە سـەریمان هـەڵچنیو، ڕۆنیۆکەیشـمان خستەپشت ئەو دیوارە دەستکردە. پریمزێکی گەورەمان لە بەردەم دەرگای ژوورەکەدا ئیش پێکـرد، گرمـەو ناڵەیـەکی وەك هیـی لۆریـی کۆنی دەردەکـرد. (أم نضـال)

دایگیرساندو مەنجەڵێکی گەورەی پڕ لە ئاوی نایە سەرو لە پەنایەوە راوەستا، تا هیچ کەسێك لە دراوسێکان نەیێتە ژوورەکەمان. منو (زکي وطبان)یش لای رۆنیۆکە کە یەکەم جار بوو لە ژیانماندا ئیشی پێ بکەین دانیشتبووین، تا یەکەم بلاوکراوەی پێ چاپ بکەین. بلاوکراوەیەکی ناوخۆیی بوو

بۆ سلاو گەیاند بە خەباتکارانی خۆگرتووی بەردەم جەللادەکانی ئاسایشی گشتی لە بەندیخانەو زیندانەکاندا. ئەوە یەکەم ئەزموونمان بووو هەر چۆنێك بێ سەرکەوتوو بوو، ئەگەر چی چاپەکەی خاوێن نەبوو.

بۆ چاپکردنی دووەم بلاوکراوە کە ناونیشانی "بەیاننامەی حیزبی شیوعی عیراق سەبارەت بە بارودۆخی سیاسی ئێستا"مان بۆ دانا، وریاییەکی زیاترمان نواند. بڕیارمان دا پێشەکی رێکخستنەکانمان ساز بدەین، تا بە بەربلاوی بیبەشینەوە. چەند رێنوێنیەکمان لسەر چۆنایەتیی بەشینەوە بۆ گشت رێکخستنەکانمان دابەزاند، لەگەڵ راو تەگبیری خۆپاراستنی هەڤالان لە هەر هێرشێکی توندو چاوەڕوانکراوی دەزگا سەرکوتکەرەکان. رۆژی ١٩٤٩/٨/٢٤یشمان بۆ وادەی دابەشکردن دیاریکرد.

هادی سەعید پێملی رێنوێنیەکان نەبوو. لەوانەیە بە هۆی کەمتەرخەمیو نارەزایبوونیەوە بوو بێ. بۆیە وەك کردبووی بە پیشە، چوو بووە چاخانەیەکی بازاڕی (حنون). لە کاتێکدا ئاسایشی گشتی دوابەدوای بەشینەوەی بلاوکراوەکە شێتگیر بوو و مەفرەزەکانیی بەردایە ناوچە جیاجیاکانی پێتەخت. هادی نێچیری حازر بە دەستی ئەو مەفرەزانە بوو. گوتیان: کە گیرا، رووخاو ئامادەییی خۆی پیشان دا هاوکاریان بکات. دانی بە هەموو نهێنیەکانیدا ناو، بووە هۆی دەستگیرکردنی هەر هەڤاڵێك ناسیبێتیو توانیبێتی تەسلیمی بکات. نووریو عوسمان یەکەم کەس بوون لە بەغدا تەسلیمی کردن. بە هاوکاریی مەفرەزەیەکی پۆلیسیش چووە (حللة)و، سکرتێری رێکخراوی حیزبیی ئەوێی بە تەڵەوە کرد. لە هەولێر (وریا رەواندزي)و،

لە سلێمانی (قادری شێخ تەها)و، کەسانی دیکەیشی بە دەستەوە دا. هادی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەوڵ بدات منو زەکیو رەئووفی مێردی (أم نضال) کە پێش چەند رۆژێک گەیشتبوە لامان، بگرێ. چاوساخیی پۆلیسی کردو پەلاماری چۆڵکراوەکەی (حەیدەرخانە)میان داو، زانیاریەکی بە کەڵکیان دەست نەکەوت. نەمهێشت بە دووەم ژووری (باب الشیخ)م بزانێ، چونکە بڕوام پێ نەدەکرد. بەلاّم وەک پاشتر روون بووەوە، هەوڵیدا بوو شوێن پێمان هەڵبگرێ بۆ زانینی جێی ماڵەکەمان. ئەوە بوو زانیی کە ئێمە لە گەڕەکی (باب الشیخ)یان لەو نێزیکانە نیشتەجێ بووین. (منو زەکیو رەئووف)یش بۆ خۆپاراستن حەفتەیەکی تەواو بە درێژاییی رۆژ لە ماڵ ماینەوەو، بە شەویش دەهاتینە دەر بۆ راپەڕاندنی ئەرکە حیزبییەکانمان.

ئێوارەی رۆژی ١٩٤٩/٩/٢ حەفتەیەك بوو هادی گیرا بوو، هاتینە دەرێ، تا هەم لە گەڕەکێکی دیکە بە شوێن خانوویەکی تازەدا بگەڕێینو، هەم لە سەرچاوەی مەترسیەکە دوور بکەوینەوە. بە هۆی دەبەنگیمانەوە هەرسێکمان پێکەوە هاتینە دەرێ، بە بێ ئەوەی هیچ پێویست بکات وا بە کۆمەڵ بێینە دەرێ. هەر ئەوەندە (رەئووف)م راسپارد ٥٠ ـ ٦٠ مەترێك دوور لە ئێمە رێ بکات، تا ئەگەر تووشی مەترسی بووین تێی بتەقێنێ. کاتێك لە کۆلاّنەکەوە هاتینە سەر شەقامی (الشیخ عمر)تا بپەڕینەوە بۆ ئەوبەرو بەر لەوەی پێ بنێینە سەر شەقامە قیرتاوکراوەکە، وەختێکم زانی دوو پیاو لە پشتەوە پەلیان گرتووم، یەکێکیان رەفیق چالاك بوو. (هادی سەعید)یش لە دووریی چەند مەترێکەوە رەنگ زەردو شپرزە راوەستا بوو. دەرکەوت لەو بۆسەیەدا کە ئەم مەفرەزەیەی پیاوانی ئاسایشی گشتی بۆیان نابووینەوە، ئەو چاوساخیان بوو. بە بێ ئەوەی هیچ قسەیەکی لە تەکدا بکەم، لە دوور را تفم گرتە دەمو چاوی. ئەوپەڕی سووك بوو لەبەر چاوم، (زەکی)شم دی وەك من دوو کەس گرتبوویان. کە داوام کرد دەستم بکەنەوەو هۆی ئەم کارەم پێ بڵێن، رەفیق چالاك لەگەڵ هاوڕێیەکی مەفرەزەکەدا دووا:

- کەلەپچەکان بخە هەردوو دەستی.. بیکوژە.. بیکوژە.

گوڕم دایە خۆمو دەستم لەو دوو پیاوە کە گرتبوومیان راپسکاندو، شەڕێکی نابەرانبەرم کرد وەك ئەوەی کە لە هێندێك فیلمدا دەبینرێت. سیخوڕەکان لەو شەڕە کەم خایانەدا کە ئامرازەکانی دەستو پێ بوون، بێ سوود هەوڵیان دا بەسەرمدا زاڵ بن. هەر یەکێك یەخەگیرم ببوایەو بیویستبایە پەلبەستم بکات، زەبرێکی کوشندەم پێ دەگەیاند. رەفیق چالاك دوایین کەس بوو ملیم بـاداو، لـە چاو تروووکـانێکدا بـە ئەرزمدا کێشا. بۆیە ئازاری پێ گـەیی‌و، بـۆ یەکـەمین جـار کەوتـە جنێـو پێدانم بـە کوردی. کـە هـەردوو قـاچمم دایـە دەم بـاو، خـەڵکانی تماشـا کـەری خـۆ لـە شـەڕ هەڵنـەقورتێنیش بواریـان دام رابکـەم، پیـاوانی مەفرەزەکـە پـەنایان بـردە بـەر دەمانچەکانیانو پێم وابێ شانەکانیان خاڵی کردەوە. دڵنیا بـوم بـە قەسـتی کوشت تەقـەیان کـردووە، بـەڵام بـەختیان یـار نـەبوو. لـە مـاوەی چـەند چرکەیـەکدا لێیـان دوورکەوتمەوە. رایاندەکرد بە دوامداو پێیان نەدەکرا پێـم بگەنـەوە. لـە راکردنـدا زۆر لەوان بەکارتر بووم. نەمکرد بـە شـەقامەکاندا رابکـەم، چونکـە بـە باشـی شارەزای ڕێگەو کۆلانەکان بووم. تـا گۆڕەپانی (السـباع) هـەلاتم ، وەك بڵێـی لەگـەڵ چـەند راکردوویەکی دیکەدا پێشبڕکێمە. لە پێشدا بە دوامدا هەڵدەهاتنو هاواریان دەکرد:

- بیگرە شیوعییە ! بیگرە جوولەکەیە ! بیگرە زایۆنییە !

لاوێکی بـەغدایی گـەنم رەنگی دشداشە لەبـەرو جامانـە بەسـەر لەسـەری کۆلانەکەی نێزیکی ئەوان راوەستا بوو، گوێی لێ بـوو بانگیـان دەکـردو فـەرمانیان دەدا بمگـرن. بـاش گوێـم لێ بـوو وەلامـی دانـەوە: "گـوو بخۆن". کـوڕە هـانی دام رابکەمو، گوتی: "خێرا رابکەو. خۆت دەربکە".

لە گۆڕەپانی (السباع) ئاوڕم دایەوە، ئەوانەی کـە ڕاوەدوویـان نـابووم، ون بـوون هەستم بە ماندوو بوونێکی لە ڕادە بەدەر دەکرد. دەرگای مـاڵێك کـرا بـووەوە، خۆمـم پێدا کرد. چەند ژنێکی ڕەشۆکیم لە ڕاڕەوەکـەدا بینـی، لـە دەوری پیـاوێکی نیوچـە

سوور فل دانیشتبوون‌و پێده‌که‌نین: پرسیم: ده‌توانم بۆ ماوه‌یه‌کی که‌م له لاتان بمێنمه‌وه. پیاوه‌که ئاماژه‌ی بۆ کردم سه‌ربکه‌ومه بانی خانوه‌که. ئافره‌تێکی جامولکه ئاو به‌ده‌ستمه‌وه به دووم‌دا سه‌رکه‌وت. ئاوه‌که‌ی دامیٚ‌و پرسیی:

- کوڕم، چیت لیٚ قه‌وماوه؟

- من سه‌ربازێکی هه‌ڵاتووم، ئینزباتی عه‌سکه‌ری ڕاوی نام.

- بۆچی له سوپا ڕاتکردووه؟

- ده‌بیٚ دایکم‌و خوشکم به‌خێو بکه‌م. له من به‌ده‌ر که‌سیان نییه به خێویان بکات.

- ده‌ك کوێراییم دابیٚ. کوڕه‌که‌ی منیش ڕای کرد بوو، گرتیان. خوا که‌ریمه.

من هێشتا له جێی خۆم دانیشتبووم، پاش چه‌ند ده‌قه‌یه‌ك دووسه‌ر له پشت حه‌ساری سه‌ربانه‌که‌ی دراوسێیانه‌وه قووت بوونه‌وه‌و یه‌کیان گوتی:

- مه‌ترسه ئێمه لێره‌وه چاودێری ده‌که‌ین. ئه‌گه‌ر هاتن بتگرن، ئێمه به‌م سه‌ربانانه‌دا ده‌تبه‌ین‌و دوورت ده‌خه‌ینه‌وه.

- لیٚم پرسین: جا ئێوه چووزانن من چیم ؟

- دایکم هه‌موو شتێکی پیٚ گوتین. کۆڵانه‌که هه‌موو ده‌زانن.

ته‌ریك که‌وتنی ڕژێمی حوکمدار وه‌ك خۆر ئاشکرا بوو. له‌ویٚ خه‌ڵك له باوه‌شیان گرتم‌و، هێندێکیان بوونه پاسه‌وانم. ئه‌گه‌رچی که‌سیان نه‌یده‌ناسیم وته‌نیا به سه‌ربازێکی هه‌ڵاتوو و له‌لایه‌ن ڕژێمه‌وه ڕاوه دوو نراویان داده‌نام. پاش تاوێك پیره‌ژنه‌که به ده‌فرێکی پڕ له شووتی‌یه‌وه هاته لام. ئه‌مجا چوار ماڵ سه‌رکه‌وتنه هه‌مان سه‌ربان‌و، که‌وتنه کێشمه کیش له‌سه‌ر داوه‌تکردنم بۆ شێو کردن‌و چا خواردنه‌وه.

که شه‌و تاریك داهات گه‌ڕامه‌وه بۆ ژووره‌که‌م، نه زه‌کی‌و نه ڕه‌ئووفم نه‌بینی. به په‌له که‌وتمه سووتاندنی هێندیك کاغه‌ز، تا ئه‌گه‌ر پۆلیس ده‌ستبه‌جیٚ ده‌وری ماڵه‌که‌یان گرت نه‌که‌ونه ده‌ستیان.(أم نضال)وه‌هه‌ر سیٚ کچه‌که‌یم برد، تا له

مەترسی دووربکەوینەوە. سێیەم کچیان تەمەنی لە دوو سێ ڕۆژێکی تێنەپەڕاند بوو. ڕۆنیۆ ئازیزەکەم بەجێ هێشت. شوێنێکی دیاریکراوم نەبوو ڕووی تێ بکەم. مشوور خواردنی وەزعەکە کارێکی هەر وا ئاسان نەبوو. ملمان نا بەرەو نزرگەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە پەناگەیەکی سروشتیی دەروێشانو هەژاران بوو. بە ئومێد بووم ئەگەر بۆ شەوێکیش بووە، پەنایەکی تێدا بدۆزمەوە بۆ خۆمان. بەڵام زێوانێکی نزرگەی دەری کردینو گوتی:

- ژنو منداڵ لێرە جێیان نابێتەوە، ناهێڵن بمێننەوە.

کەواتە شێخ عەبدولقادریش لایەنگریی پیاوی دەکرد، نەك ژن. چار نەبوو، دەبوو نزرگەکە بەجێ بهێڵین. بۆیە چووینە خانە نێزیکەکەی (الصدرية)ی پەناگەی ئەو جوتیارانە بە کەرەوە دەهاتنە پێتەخت بۆ سەوزەو میوە فرۆشتنو ناچار دەبوون شەو بمێننەوە. ژوورێکی حسیری قامیش تێدا ڕاخراومان بە بیست فلس بە کرێ گرت بۆ یەك شەو. منداڵە تازە لە دایکبووەکە بە درێژاییی شەو لە گریان نەکەوت، دایکیشی هەر خەو نەچوە چاوی. شەوێکی دژوار بوو. سەر لە بەیانیی ڕۆژی دوایی ئوتومبیلێکی کرێمان گرتو ڕوومانکردە (الكرادة الشرقية) بەڵکوو (جورج حبيب) یارمەتیمان بداتو، چارەیەك - با کاتیش بێ - بۆ ئەم گیروگرفتە بدۆزینەوە. بەڵام جورج داوای لێبوردنی کرد کە ناتوانێ پێش سەعات نۆ، واتە پێش لە ماڵ چوونە دەرەوەی باوکی، پێشوازیمان لێ بکات. باوکی دووکانێکی مەی فرۆشتنی خۆیی هەبوو. ناچارلە شەقامێکی لا کۆڵانی ئەو ناوە دانیشتین. بەرێکەوت (صبري سباهي)ی کرێکاری شیوعی بەسەر پاسکیلێکەوە پەیدا بوو. (صبري) سەهۆڵی ڕۆژی بە دوو سەد فلس بۆ دوکاندارێك دابەش دەکرد. من پێشان (صبري)م ناسیبوو، نامەیەکم دابوویێ تا بە دایکیدا بینێرێ بۆ زیندانیە شیوعیەکان لە بەندیخانەی (نوگرە سلمان). کە ئێمەی دی هاتە لامانو، کاتێك زانیی لە چ وەزعێکداین، بێ چەندو چوون بردینیە ئەو کۆختەیەی کە خۆیو دایکیو (صبيحو

عبدالاله)ی جووته برای بچووکی له گەڕەکی (الزویة)ی (الكرادة الشرقیة)تێیدا دەژیان. بەم پێیە چارەسەرم بۆ گرفتی خانوو دۆزییەوەو پیاوەتیەکەیشی هیی ئەم کرێکارە شیوعییە بوو.

بەر لەوەی بزانم زەکی‌و رەئووفی جووتە هەڤاڵم چییان لێ بەسەر هاتووە، تەگبیرێکی وردم بۆ (صبري)و (أم نضال) کردو ناردمن رۆنیۆو کەلو پەلەکانمان بە سەلامەتی لە ژوورەکەی (باب الشیخ) دەربکەن. وەختێك پاشتر بە هۆی ئیعترافی ئەم دوو پیاوەوە هەلیانکوتایە سەر ئەو ژوورە، تەواو چۆڵ بوو. خاوەن ماڵ کوردی فەیلی‌و بە (پاشا) ناسرا بوو. گیراو چەند حەفتەیەك ئەشکەنجەیان دا، بە بێ ئەوەی گوناحێکی هەبێ‌و بتوانێ هیچ زانیارییەك بداتە پۆلیسی نهێنی. دوایی زانیم لە کاتێکدا زۆربەی مەفرەزەکە سەر قاڵی راوە دوونانی من بوون، (زەکی)ش بەش بە خۆی هەوڵی هەلاتنی دابوو توانیبووی خۆ دەرباز بکات، بەلام گوللەیەك لە قاچی درابوو بریندار بوو بوو کەوتبوو. زەکی لە دواییدا رووخاو نهێنیەکانی خۆیشی درکاند. (يحيى صالح)ی بەرپرسی رێکخراوی (بەسرە)یشی بەدەستەوە دا. هەرچی (رەئووف)یش بوو، بە هۆی پەشۆکان‌و گەمژەیی خۆیەوە گیرا. چوار رۆژ خۆی راگرت. ئەوە هەلی بۆ رەخساندین کەل‌و پەلەکان بگوێزینەوە. دواتر رێنوێنی کردن بۆ ماڵەکە.

(صبری سباهی) بە داوای من خانوویەکی قوڕی بچووکی لە نێزیك ماڵی خۆیان پەیدا کرد تا بە کرێی بگرین. گواستمانەوە بۆ ئەوێ. مانگی بە دوو دینار بوو. هەر شەوێکمان تێدا کردەوە. نا خافڵ ژنی خاوەن ماڵ بە قیژو هووڕو لەرزە لەرز هاتە سەرمان‌و داوای لێکردین دەم‌و دەست چۆڵی بکەین. بە هێمنی وەڵامم دایەوە:

- بچۆرەوە ماڵ. پیاوەکەتمان بۆ بنێرە تا رێك بکەوین.

رۆیشتو مێردەکەی هات. بە بێ ئەوەی هیچ هۆیەك دەربخات، پێی لەسەر هەمان شت داگرت. کرێی پێشەکی دراوی یەك مانگی بۆ گێڕاینەوە ناچار بووم برۆم سۆراخی خانوویەکی دیکە بکەم. هەمان رۆژلە تەنیشت نەخۆشخانەی عەزل (ئێستا نەخۆشخانەی ـ الکرامة ـ یە )ی بەری کەرخ پەیدام کرد. پاسێکی دارینی بچووکم هێنا بۆ گواستنەوەی کەلو پەلەکان. سەیرم کرد ئەو خاوەن ماڵەی کە پێشتر دەری کردین، وا لەوێ یەو دەستەو داوێنم دەبێ بمێنمەوە. داواکەیم رەتکردەوە. پاشان دەرکەوت ئەو یەکەم جار وای زانیبوو ئێمە جوولەکەین، بۆیە بڕیاری دەرکردنمانی دابوو. ئەمجا کە زانیی کوردین، لە کردەوەی خۆی پەشیمان بووەوەو داوای لێکردین بمێنینەوە.

دراوسێیەکی کوێرمان لە خانووەکەی بەری (کەرخ) هەبوو، ژیانی لەسەر قورئان خوێنیی کۆڕی پرسە یا گۆڕستان .. تد بووو، دوو کچی عازەبی هەبوو. پێوەندیی دراوسێیەتی‌و سەر لەیەکتر دان کەوتە نێوان ئەوان‌و (أم نضال). دەرکەوت کچێکیان خۆشی ویستووم، یا مرخی لەوە خۆش کردبوو شووم پێ بکات، بە بێ ئەوەی ئاگام لێ بووبێ یا حەزم کردبێ بیهێنم. کە (أم نضال)باسی ئەوەی لا کردمەوە دایکی کچە حەز دەکات کچەکەیم بداتێ، دەتگوت شوولکی تەڕ لەسەری لووتمدا دەدەن. بەو بەهانەیەوە کە گوایا کچێکی خزمی خۆم دەزگیرانمە، خۆمم لە مەسەلەکە دزییەوە. ئیتر لەو ساتەوە لەبەر چاوی ئەو ژنە رەش بووم.

* * *

- ٥ -

# گواستنەوەی بارەگای سەرکردایەتی بۆ کرکوك

چەند رۆژێك پاش رووداوی بەیەکدادانمان لەگەڵ مەفرەزەی ئاسایشی گشتیدا بە هۆی رووخانی (هادی سەعید)ەوە، بیرێکی تازەم لە لا کاڵە بوو ئەوسا سەر لە نوێ‌و دوای گیرانی (زەکی وطبان)، بە تاك کەوتوویی لە ناوەندی سەرکردایەتیدا مامەوە. بیرەکە: کشانەوە لە پێتەختو گواستنەوەی سەرکردایەتی بوو بە شێوەیەکی کاتی بۆ شارێکی دیکە. ئەوەم لەبەر چاو گرتبوو کە دوژمن هەر لە بەغدا بە شوێنمدا دەگەڕێتو، بە هۆی ئیعتراف کردنی (هادیو زەکیو رەئووف) یشەوە زانیارییەکی زۆرو زەبەندی چنگ کەوتووە. گەیشتمە قەناعەت کە کەرکووك باشترین جێگەیە. چوومە ئەوێو (بیلال)یشم لەگەڵ خۆمدا برد، لە بەغدا نەکەوتبووە دەست (هادی سەعید) بەڵام (بیلال)م لە کەرکووك لێ‌وونبوو. جانتای جلەکانیشمی لەگەڵدا بێ سەرو شوێن بوو، کەواو سەڵتە (مێژوویی) یەکەمی تێدا بوو کە لە هێندێك سەفەردا بۆ خۆ گۆڕین لەبەرم دەکرد. ئیتر لەو کاتەوە بۆ نێزیکەی دوو ساڵێك هیچم لە بارەی ئەم کابرایەوە نەزانیو، لە ریزی وون بوواندا دامنا.

کە بەغدام بەجێ هێشت رۆنیۆکەم گل دایەوە. ئەمجا (صبري سباهي) بە هەڵوەشاوی هێنای بۆم بۆ کەرکووك. نەمانزانی پارچەکانی لێك بدەینەوە، بۆیە کەمو زۆر لە دەستمان دا. ( محمد راضي شبر)و (مجيد عبدالرزاق)یش لەگەڵمدا هاتنە کەرکووك. لە کاتێکدا بەرپرسیی کاری حیزبیم لە بەغدا بە (الیاس بطاح)ی فەرمانبەرێکی بچووکی سکەی شەمەندەفەر سپارد. رێوشوێنم بۆ پێوەندیی حەفتانە لەگەڵیدا داناو، (صبری سباهی)ی جێ متمانەمم کردە تەتەرێکی حیزبیی نێوان منو پێتەخت.

لە کەرکووك، یەکەم جار لە کوختەی (ئەحمەد)ی شیوعی‌و کرێکاری کۆمپانیای نەوت نیشتەجێ بووم. ئەحمەد ماڵو مووچەوخویی خستبوە بەر خزمەتی حیزب. کۆختەیەکی نێزیك بە گۆڕەپانی گاور باغی هەبوو. کرێکارێکی دیکەی نەوتیش بە ناوی (نەجم) ەوە، زۆربەی مووچەی مانگانەکەیی بۆ ئێمەو خێزانی کەریم ئەحمەد داودیی زیندانیی شیوعی خەرج دەکرد. دوای ماوەیەك کۆختەکەی ئەحمەدم بەجێ هێشت‌و خانوویەکی بچووکم لە گەڕەکی (ئیمام عەباس) بە کرێ گرت‌و لەگەڵ خێزانی کەریم ئەحمەددا تێیدا دانیشتم.

کە لە بەردەرگای چوونە ژوورەوەی کۆمپانیای نەوتدا ڕادەوەستام‌و تەماشای کرێکارانی نەوتم دەکرد، پیس‌و چڵکن‌و چەورن‌و بە چەند زمانێکی وەك کوردی‌و تورکی‌و عەرەبی‌و ئاشووری‌و ئەرمەنی قسە دەکەن، لە شەمەندەفەر دادەبەزن، بە پەلە دەکەونە پاڵە پەستێ، ئەم بۆ پاسکیلەکەی‌و ئەویان بۆ پاسە دارینە کۆنەکەی ئەوێ، تا بگەڕێنەوە بۆ ماڵو کۆختەکانیان ؛ ئەو کاتە هەستم بە ئەندازەیەك شادمانی‌و دڵگرانەوە دەکرد. گەڕەکێکی باڵای ئەورووپایی کە لەچەند ڤێللاو کۆشکێك پێکهاتبوو بە باخچەی دڵگیر دەور درا بوو، لە نێزیك خاڵی بڵاوە لێکردنی ئەو کرێکارانە بوو. ئەو ئەندازیارو فەرمانبەرە بیانیانە کە هاتبوون سوودی نەوت‌و کاری کرێکارەکانمان بخۆن‌و لەسەر حسێبی ئێمە لەم نازو نیعمەتەدا بژین، تێیاندا دادەنیشتن. ئەمەیش تابلۆیەکی زیندوو بوو، چەوساندنەوەی نیشتمانی‌و ڕووتاندنەوەی چینایەتیی پێکەوە بەرجەستە دەکرد.

لە بەغدا گەرم‌وگوڕیی لاوان‌و جۆش سەندنی شۆڕشگێڕانەو کۆبوونەوەی جەماوەرێکی فرە ژمارەم لە دەوری (حشع) دەبینی. کەچی دۆخەکەی کەرکووك شێوەیەکی پێچەوانەی هەبوو: بە دەنگەوە نەهاتن‌و تەریك کەوتن‌و نەبوونی هیچ کەف‌و کوڵێك بۆ خەباتی شۆڕشگێڕانە، لە کاتێکدا ئەوێ پرۆلیتاریای پیشەسازیی تازە کوورەی لێ بوو. ئەو کەف‌و کوڵە شۆڕشگێڕییەیشم لەوێ بەدی نەکرد، وەك لە

سلێمانی هەبوو کە هیچ کوبوونەوەیەکی کریکاریی تێدا نەبوو. لە شارانی وەك نەجەف و کەربەلاو (الکاظمیة)دا کە مەڵبەندی ئاینیی شیعە بوون، (حشع) سەرکەوتووانە بەربەرەکانێی هێزە ئاینیی و کۆنە پەرستەکانی کرد بوو. بەڵام لە شاری کرێکار نشینی کەرکووکدا، لە چاو دەسەلاتی کۆنە پەرستیی تورکمانیدا، هیچ دەسەلاتێکی جێی باسمان نەبوو، بە تایبەت لە نێو جەماوەری تورکماندا. ئەوە بۆچی؟ ئەم دیاردەیە بە چی لێك دەدرێتەوە ؟ ئایا دەستکردی ئینگلیز، یا دەرەنجامی هەڵەی شیوعیەکان بوو، یان هۆی دیکەی هەبوو ؟

کانوونی یەکەمی ١٩٤٩ کە لەگەڵ (حەمدیە)و خوشکەکەیدا لە ماڵێکدا بووین، رووداوێکی سەیرمان لیّ بەسەر هات. جەنجاڵی خوێندنەوەی هێندێك نامەی حیزبیی و وەڵام بۆ نوسینەوەیان بووم، (شوکریە)ی چکۆلەی بە راکردن و شپرزەیی هاتە لام و گوتی:

- کاکە پۆلیس چواردەوری گرتین.

تەقەی توندو لە پەستای دەرگای خانوەکە رایپەڕاندم. خۆم چووم تا دڵنیا ببم ئاخۆ ئەوانە بە راستی پۆلیسن یان نا. ئەنجا بە راکردن هاتمە دواوەو، پڕمکرد بە توورەکە بچووکە پر لە نامە حیزبییەکانمداو، سەرکەوتمە سەربان. لەوێوە بە چەند سەربانێکی دیکەدا رۆیشتم و، گەماڵێکی زل لە سەربانێکیان قاچمی گست و شەڕێکی گەرمم لەگەڵدا کرد. تێلایەکم لەوێ پەیدا کردو توند تێم سرەواند. کە دابەزیمە حەوشەی خانوویەك، چەند ئافرەتێکی تورکمان شالاویان بۆ هێنام و دەیانقیژاند: " خیر خز ! خیر خز ! - واتە دزە. یەکێکیان گازی لە دەستم گرت، ناچار مام تێلایەك بگرمە ئەویش. بە پەلە خۆمم گەیاندە (محمد راضي شبر) و ئاگادارم کردەوە کە نابێ بچێتەوە ماڵ. دەگەرام بە دووی (مجید عبدالرزاق)دا تا ئەویش ئاگادار بکەمەوە. (شوکریە) لە دوو را دەرکەوت، دەرەوەم بە شوێندا دەگەڕا تا پێم بڵێت: ئەو پۆلیسانە بە هۆی کێشەی نێوان دوو خێزانی دراوسێوە هاتبوون،

نەك بۆ ئەوەی هەڵبكوتنە سەر خانوەكەمان. دوا بە دوای ئەم ڕووداوە ناچار بووم، لە بریی ئەم خانووە، خانوویەكی دیكە لە گەڕەكێكی دیكە بە كرێ بگرم.

نێزیكەی مانگێك پاش ئەوە، كارەساتێكی دیكەی یەكجار ترسناكتر قەوما. منو (محمد راضي شبر)بە پیادە ڕێی ئاساییدا لە شەقامی گاوریاغی دەپەڕینەوە. پۆلیسێكی نهێنیمان بینی، دوو ڕۆژ لەمەوبەر دوامان كەوتبوو. بە هەمان ڕێگەدا گەڕاینەوە، تا خۆمانی لیّ لابدەین. لە گەڕانەوەداو لە ناوەڕاستی شەقامداو هەر بە ڕێكەوت لووتمان بوو بە لووتی پیاوانی ئاسایشی گشتی كە لە بەغداوە هاتبوون بۆ گەڕان بە شوێن شیوعیەكاندا لە كەركووك. (جاسم الطعان)ی كۆنە شیوعییان لە نێودا بوو كە خۆیی بۆ خزمەتكردنی ڕژێم تەرخان كرد بووو، (محمد راضي شبر)ی باش دەناسی. هەردوكیان یەكتریان دی. محەمەد چرپاندی:

ـ هەڤاڵ، ئەمە (جاسم الطعان)ە !

ـ وەڵامم دایەوە: گویّ مەدەییّو بڕۆ.

ـ (جاسم الطعان)، چەند مەترێك دوور لە ئێمە بانگی كرد: كوڕە بوەستە !

وەڵامەكەمان ئەوە بوو، تا تینمان تێدا بوو پڕ بە پیّ هەڵاتین. محەمەد بە هۆی تا نەخۆشیەوە تەندروستیی ناساز بووو پاڵتۆ كۆنە پۆلیسیەكەمی لەبەردا بوو كە پێش دوو ساڵ لە بازاڕی كۆنەفرۆشانی سلێمانی كڕیبووم. من سووكەڵەترو لە ڕاكردنەدا بەكارتر بووم. محەمەد لە یەكەمین سەد مەتردا پێی هەڵخلیسكاو گرتیان. بە ڕاكردن كەوتنە شوێنمو، وەك كردبوویان بە پیشە هاواریان كرد:

ـ بیگرە شیوعییە ! بیگرە زایۆنییە !

دەیان توركمانی دانیشتووی نێو چاخانە میللییەكانی نێزیك نەخۆشخانەی (عەزل) بە دەنگیانەوە هاتنو لە پێشەوە هێرشیان بۆ هێنام. ناچار مام بە كۆڵانێكی دیكەی تەنگە بەردا بگەڕێمەوە بۆ هەمان خاڵی دەست بە هەڵاتن كردنم، تا لە شەقامەكە بپەڕێمەوەو خۆ بكەم بە نێو باخەكەی گاوریاغیدا. بە ڕاكردنەوە

جزمەکانم لە پێ داکەندو، چاکەتەکەیشمم توورڕ دا. کە لە گرتنم نا ئومێد بوون، تەقەیان لێ کردم. بەلاّم من لێیان دوور کەوتبوومەوە. لە ترسی تورکمان هەلاّتمە جێیەکی نێزیکی قەراخ شار، تا لە شوێنێکی دیکەوە بێمەوە نێو ماڵەکان. لە چەمی (خاسە) پەڕیمەوە ، ئاوەکەی لەبەر بارانی زۆر هەستا بوو. کاتێك خۆمم کرد بە گەرەکی (شۆڕیجە) دا خۆر روو لە ئاوا بوون بوو. شۆڕیجە لە خانووی قوڕ پێکهاتبوو. دەبوو لە گۆشەیەکی تاریکی نێزیك بە حەوزێکی ئاوی مزگەوت بۆ پتر لە نیو سەعات بمێنمەوە، چاوەڕوانی دنیا تاریك داهاتن بکەمو بۆ هەر کوێیەك دەمەوێ برۆم، بۆ ئەوەی بەم جووتە پێیەخاوس‌و جلە تەڕانەوە سەرنجی رێبواران رانەکێشم. ئەو شەوە لای برادەرێك رۆژم کردەوە لە قەلاّ. رێکەوتێکی خۆش بوو کە (ئەسعەد بانی خێلاّنی)م لەوێ دی. بۆیە رۆژی دوایی بەیانەکەی بۆ ناردم بۆ لای (مجید عبدالرزاق) تا بەسەر هاتی ئێمەی پێ بڵێت‌و، بکەوێتە چۆلکردنی ئەو کۆختەیە کە بە کرێمان گرتبوو چەند مەترێك لە شوێنی گەیشتن بە مەفرەزەکە دوور بوو، خێزان‌و رۆنیۆکەیش بباتە جێیەکی دیکە.

رۆژی دواتر لە کاتێکدا من هەوڵی ئاگر بڕ کردنی مەترسیەکەم دەدا، ئەسعەد بە بێ هیچ پاساو دانەوەیەك چووە ماڵی (بەهێ)ی خوشکی (حەمدیە)و، هەمان مەفرەزە چوار دەوری گرت. وەك نێچیرێکی حازر بە دەست گرتیان. کە پەلاماری ماڵەکەیان دا، یەکیان لێی پرسی:

- چی دەکەی لێرە ؟

- هاتووم مێوژ بکڕم.

- بۆچی ئێرە هیچ بەقاڵێکی مێوژ فرۆشی لێیە ؟

بە لەدەستدانی (محمد راضي شبر)و (ئەسعەد بانی خێلاّنی)زیانێکی گەورەمان لێ کەوت. محەمەد لاوێکی دەست چالاك‌و زیرەك‌و رەوشت جوان‌و یەکجار خۆبەختکەر بوو. ئەو دووانە خۆیانیان راگرت‌و، دەزگای سەرکوتکەر بۆی نەلوا سەرە

داوی نهێنیەکیان لێ دەربهێنێ. زەبرەکە گورچکبڕ بوو. منو (مجید عبدالرزاق) پێوە نەبووین. بۆیە ژوورێکی بچووکی خانوویەکی قوڕم لە گەڕەکی شۆڕیجەی شێوە دێی دەوروبەری کەرکووك بە کرێ گرت. خانووی قوڕی ئەم گەڕەکە سەرتاسەر دەستکردی ئەو دێنشینە کوردانەیە کە لە ناو زۆرداریی ئاغا یا لەبەر هەژاری یان بەهۆی کێشەی خێڵەکیی نێوان خێزانەکانەوە دێیەکانی دەشتی بە پیتی گەرمیانیان چۆڵ کرد بوو هاتبوونە شار.

بڕیارمان دا تا هێرشی ڕاوە دوونانی پۆلیسی کەم دەبێتەوە لە کەرکووك دوور بکەوینەوەو بۆ چەند ڕۆژێك بچینە شاری سلێمانی. بەپێ کەرکووکمان بەجێ هێشت تا چەند کیلۆ مەترێك دوور کەوتینەوە. ئەجا سواری پاسێکی دارین بووین بۆ چاخانەکەی تەینالّ ـ بازیان. لەوێ پۆلیسێك هاتە لامانو بۆرە لێکۆڵینەوەیەکی لەگەڵدا کردین، تا بزانێ ئاخۆ سەربازی هەلاّتوو نین. بەلاّم زۆر بە توندی نەجوولاّیەوە.

دوا بە دوای ئەوە بڕیارمان دا لە ترسی ئەم چەشنە پۆلیسە نەفرەتیە بە پێ تێ هەڵبکەینەوە بۆ سلێمانی. خۆر وەخت بوو ئاوا ببێ. پاش نێزیکەی سەعاتێك شەوێکی ئەنگوستە چاو داهاتو بارانێکی بەلێزمە دایکرد. ناچار پەنامان بردە بەر کەلاوەیەك کە کاتی خۆی چاخانەیەکی سەرەڕێ بووو پاشتر چۆڵ کرا بووو ڕووخا بوو. بە درێژاییی شەو لە ژێر بارانو بەر سەرماو سۆڵی بەتینی زستان ماینەوە. بەرە بەیان زوو هەستاینو ڕۆیشتین. لە نیوەڕۆدا، بەپێو دوور لەو جادە قیرتاو کراوەی کە ئوتومبیلی پێدا دەهاتو دەچوو، چووینە نێو سلێمانی. سەرەتا چووینە لای مەلایەکی پێش نوێژی مزگەوت کە ناوی ، (مەلا حسەنی گردە زیڕی )و پیاوێکی ئاینیی لاور لە دۆستانی(حشع)بوو. ڕۆژی دوایی چوومە ماڵی خوشکمو لەوێ چاوم بە باوکمو دایکم کەوت. باوکمو خالّم هەوڵێکی زۆریان لەگەڵدا دام تا قەناعەتم پێ بکەن لە شار بمێنمەوە، یا بۆ دوور کەوتنەوە لە چالاکیی حیزبی بچمە

دێیەك. ئەوەم بە توندی رەت کردەوەو، تکام لە باوکم کرد هێندە ئەم داوایەم نەداتەوە بە رووداو لە گوێ رایەڵ نەبوونم زویر نەبێ.

من خۆم دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخسا بوو هیچ چالاکییەکی حیزبی لە سلێمانی بکەم. بە شێوەیەکی زۆر ئاسانتر گەڕاینەوە بۆ کەرکووك. کە (مجید عبدالـرزاق ) لە هۆدەی شۆڕیجە هەوڵی دا پریمزەکە دابگیرسێنێ بۆ چا سازکردن، بۆی دەرکەوت پەمپی هەواکەی پەکی کەوتووە. داوام لێکرد پەمپەکە دەربهێنێو واشەرەکە چەور بکات. بە هێمنی وەڵامی دامەوە:

- هەڤاڵ، من قەت مەکینەی پریمزم نەکردووەتەوەو، شتێکی لە بارەوە نازانم.

پێکەنیمو پەمپەکەم چەورکردو پریمزەکەم ئاگردا. بەڵام مانەوەمان لەو هۆدەیە زۆر درێژەی نەکێشا. ئەمجارە هۆیەکەی هێرشی پۆلیس نەبوو بۆ سەر ئێمە، بەڵکوو مەجیدی هەڤاڵم خۆی بوو. رۆژێکیان ژوانی حیزبیی لەگەڵ کرێکارێکی پێڵاو درووردا هەبوو، چووە دەرێو نەهاتەوە. زۆرم چاوەڕێ کرد، هەر نەهاتەوە. ئەو پەڕی نیگەران بووم. لەو بڕوایەدا بووم کە ئەویش لە لایەن دەزگا سەرکوتکەرەکانەوە دەستگیر کراوە. ئەو زەبرە کە بە رێکخستنەکانی کەرکووکمان گەیەندرا، قووڵ بووەوە. بەم پێیە لە نێو ئەو پێنج هەڤاڵەدا کە لە بەغداوە روومانکردە کەرکووك، بە تەنیا خۆم مامەوە. بەڵام لەگەڵ (صبری سباهی)دا هەر بەیەك دەگەیشتین، وەك چۆن پێوەندیم بە چەندین رێکخستنی حیزبیی دیکەی دەرەوەی کەرکووکەوە مابوو.

دوای لە دەستدانی مەجید، ئەو هۆدەیەم چۆڵ کرد کە پێکەوە تێیدا دەژیاینو هۆدەیەکی دیکەم لەوبەری گەڕەك بە کرێ گرت. یەکەم شت رۆنیۆکە بوو بە کۆڵ هەڵمگرتو بۆ هۆدە تازەکەی ماڵی عەبدوڵڵا رۆژ بەیانیی دێنشینی هەژارم گواستەوە. عەبدوڵڵا دوای چەند ساڵێك بەندی بە هۆی کێشمە کێشی شەخسییەوە، لە بەندیخانە هاتبوە دەرو لەگەڵ خێزانەکەیدا لە کەرکووك مابووەوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا ئەگەر بگەڕێتەوە دێیەکەی دوژمنەکانی تۆڵەی لێ بستێننەوە. ژنێکی نیوچە

ســوور فلی (حەلیمە) ناوو دوو منداڵی بچووکــی هەبوون. منداڵێکیـانم کـرد بـە مـامۆستای خۆم، بەو هیوایەی کەشتێك لە زمانی توركـی فـێر ببم ؛ حـەزم دەکـرد فێری ببم‌و بۆم نەدەچوە سەر. ژوورێکی دیکـەی چکۆلـە لـە خانوەکـەی عـەبدوڵلاّ دا هەبوو، دانرا بوو بۆ کرێ بە مـانگانەی چارەکە دینارێك. لە بەرژەوەندی مـنـدا نـەبوو کرێچییەکی دیکەی نەناس بێتە ماڵەکەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر چی پێویستیشم پێـی نەبوو، خۆم بە کرێم گرت.

پەروەردە بوونم لە دێداو شارەزاییم لە داب‌و نەریتی جووتیاران، یارمـەتییان دام بە خێرایی پێوەندیم بە عەبدوڵلاّوە توندو تۆڵ بکەم. متمانەی پـێ کـردم. ئـەوە رێـی بۆ خۆش کردم تا وەزعی تایبــەتی خۆمــی لـە لا بکەمــەوە. ئاگـادارم کـرد کـە مـن پیاوێکی لە لایەن رژێمەوە راوە دوونراوم‌و، نامەوێ ببمە هۆی مـاندوو بوونی یەکێکی وەك ئەو کە هاورێیەکی باشەو هیچ شتێکم لەسەر نازانێ. دوو رێگـەم لـە بـەردەمدا دانا: یا مـاڵەکە چۆڵ دەکەم ئەگەر مانەوەمی پێ خۆش نـەبێ، یـان رەزامـەندیی ئـەو دەمێنمەوە بە مەرجێك بەڵێنم بداتێ سوور بێ لەسەر سەلامەتیم. لێی پرسیم: بۆچی رژێم راوەدووت دەنێ ؟ پێم وابێ یەکەم جار بــە زۆری بـیری بـۆ کێشـەی خێڵـەکی یـا شەخسی چوو بوو. وەڵامم دایەوە:

- من راوەدوو نراوم، چونکە شیوعیم.

- ئا تێگەیشتم. جا چ زیانێك لەوەدایــە کـە شـیوعی بی؟ خزمێکـی مـنیـش شیوعییە.

- ناوی چییە ؟

- مەلا جەمیلی رۆژ بەیانی.

مەلا جەمیلم دەناسی، چونکە پێشتر چەند جـارێك دیدەنیـی بـاوکمی کـرد بـوو. نەمبیستبوو شیوعی بێ، بەڵام هەوڵی دەدا وەك پیـاوێکی هاوچـەرخ یـا مەلایـەکی تەرزی نوێ دەربکەوێ. لەوانەیە ئـەوە وای لـە عـەبدوڵلاّ کردبێ کـە پێـی وابـێ ئـەو

شیوعییه. دیاره منیش پێم خۆش بوو خۆی به خزمی یەکێك له شیوعیەکان دابنێ. پێوەندیی شەخسیمان وردە وردە بوو به پێوەندییەکی سیاسیو حیزبی. ئیتر خۆیو ژنەکەیشی چەند به تەنگ کوڕێکی ئازیزیانەوە بوون، هێندە سوور بوون لەسەر پاراستنم.

رۆژێکیان کتێبێکم دەخوێندەوە، حەلیمە به گورجی هاتە لامو گوتی:

- عەلی ! هەردوکتان بچنە دەرێ، تۆو میوانەکەت بۆ ماوەیەك له ماڵ بچنە دەرێ. (صبری سباهی)م لەلا بوو.

- بۆچی له ماڵ بچینە دەر ؟

- چونکە پۆلیس ماڵە دراوسێکان دەپشکنێو به شوێن تووتنی قاچاخدا دەگەڕێت.

- ئەم ماڵە تووتنی قاچاخی تێدا نییە. ئەوان به دوای خەڵکدا ناگەڕێن.

- تکات لێ دەکەم بۆ سەعاتێك بچۆرە دەر. دەترسم شتێك بقەومێ سەرەنجامەکەی خراپ بێ.

رۆژێکی دیکەیش (صبری)م لەلا بوو. حەلیمە هاتە لامانو، گوتی:

- ژنەکەی دراوسێمان دەیەوێ بتانبینێ.

- بۆچی ؟

- چونکە کابرایەك هاتووەتە لایو خەڵەتاندوویەو رۆنەکەیانی دزیوە. کابرا هاتووە پێی گوتووە: مێردەکەت له بازاڕەوە ناردوومی هێزە رۆنەکەی بۆ ببەم بۆ فرۆشتن. ئەویش هێزەکەی داوەتێ. ئێوارە که مێردەکەی هاتووەتەوە، دەرکەوتووە کەسی نەناردووەو، کابرا دزێکی فێڵباز بووە.

- باشە. ئەی ئێستا ژنەی دراوسێ چیی دەوێ ؟

- گومانتان لێ دەکات.

- ئەو زەلامە دەناسێ که دزیی لێ کردووە ؟

ـ دەڵێت گوایە باش دەیناسیٚ.

لە ژوورەکـە هاتینـە دەر. ژنـە راوەسـتا بـوو، چـاوەڕوانی دەکردیـن. ئێمـەی دی‌و، روانییە دەم‌و چاومان‌و، گوتی:

ـ ئەمڕۆ دنیایەو سبەینیٚ قیامەتە. خوا لێمی قبوولٚ ناکات خەڵکێکی بیٚ تـاوان تاوانبار بکەم. ئەم دوو زەلامە لەو کسە ناچن کە دزیی لیٚ کردووین.

دوو حەفتە زیاتر بە سـەر ون بوونـی (مجیـد عبدالـرزاق)دا تێپـەڕی بـوو، کـە لـە کەرکووك بە (نووری جەلال)ی لاوی شیوعیی خەڵکی سلێمانی گەیشتم‌و هەواڵێکی لە ناکاوم بیست: مەجید لە سلێمانی‌یەو نەگیراوە، بەڵکوو چووەتە پـاڵ فراکسـیۆنی "الاتحاد" کە لێمان جویٚ بوونەتەوەو، لە دژی ئێمە کەوتووەتـە چالاکی لـە نێویـان. بەڵام ـ بەقسەی نووری ـ زۆر پێدەچـیٚ ئێسـتاکە ریـزی ئـەوانی بـەجیٚ هێشـتبیٚ، یـا دەریانکرد بیٚ. بـە (نـووری)م گـوت: مـن ئـەم هەڵوێـستەم لــە مـەجید چاوەڕوان نەدەکرد، چونکە دەیتوانــی بـە شـێوەیەکی ئاسـایی‌و بـە بـیٚ خۆشـاردنەوەو هـەڵاتن بڕوات.

* * *

چەنـد قسـەیەك لەسـەر فراکسـیۆنی " الاتحـاد". بـەم نـاوە نـاودێرکرا چونکـە بڵاوکراوەیەکی بە هەمـان ناوەوە دەرکرد. لە (سلیمانی)ش سەری هەڵدا، پاش کـەرت بوونی رێکخراو بۆ تاقمی ئێمەو تـاقمی (النجمة). دامـەزرێنی (الاتحـاد) (کـەریم سۆفی)ی بەرپرسی حیزبیی جارانم بوو. دوای نێزیکەی ساڵێك بەند کـردن، چـالاکیی حیزبیی دەست پیٚ کردبووەوە. لە تاقمی ئێمـەو تـاقمی (النجمـە)یش رازی نـەبوو. بۆیە بە بیانووی ئەوەوە کە هەر خۆی راستە، سـێیەم فراکسـیۆنی دامـەزراند. کـەریم توانیبووی بە سوود وەرگرتن هەم لە سومعەی باشـی لـە شـارداو هـەم لـە نـەبوونی کادێری لێوەشاوە لای نەیارەکانی، فراکسیۆنێك پێکەوە بنیٚ کە ـ با بۆ ماوەیەکیش بوو بیٚ ـ بەشی هەرە زۆری شیوعیەکانی شاری بۆ لای خۆی بە کێش کرد. خـۆم وەك

لاوێکی دڵسۆزو پاكو شایانی متمانە پێکردن دەمڕوانییە کەریم. نامەیەکم بۆ نارد، ئەم متمانەیەم تێدا بۆ دەربڕیو داوام لێکرد چاوێك بە هەڵوێستیدا بگێڕێتەوەو لە نێو ڕێکخستنێکی شیوعیی یەکگرتوودا هاوکاریمان بکاتو دەست بخاتە دەستمانەوە. بەڵام بە ڕەفتار کەوتە هەڵەوە، چونکە نەك هەر بە دەنگ داواکەمەوە نەهات، بەڵکوو نامەکەمی کردە بەڵگەی ئەوە کە ئێمە دان بە "بۆڵشەفیەتی ئەودا" دەنێین، لە کاتێکدا ئەو لە لای خۆیەوە قایل نییە دان بە شیوعیەتی ئێمەدا بنێ.

کەریم زۆر نەمایەوەو تامی ئارامیی نەکرد. ڕژێم سەر لەنوێ گرتیەوە. تووشی سیل بوو بووو، پێویستیی بە چارەسەرو سەرپەرشتی هەبوو. هیچ شتێکی لەم بابەتەیان بۆ دابین نەکرد، تا بە شەهیدی لە یەکێك لە نەخۆشخانەکاندا کۆچی دوایی کرد.

* * *

لە کەرکووك بە تەنیا مامەوە. دەبێ پێی لێ بنێم کە ئێمە ئەو چەند مانگەی ژیان بەسەربردنمان لەم شارە بەرفراوانەدا، نەمانتوانی ڕێکخستنێکی حیزبیی تازە بنیات بنێین یا پێوەندیی توندو تۆڵ لەگەڵ کرێکارانی نەوتو توێژە میللیەکانی دیکەدا ببەستین. لە نێو هەلو مەرجێکی ئەوپەڕی ئاڵۆزدا بووینو لە جەماوەر دابڕابووین. ئەو ژمارە کەمەی هەڤاڵانو دۆستانیشمان لە شاردا یا کورد یان لە کەمە نەتەوەکان بوون. جەماوەری تورکمان لە بەردەم چالاکیی حیزبیماندا تا رادەیەك وەك خاکێکی قەدەغەو داخراو مانەوە. بە پێچەوانەی دۆخی بەغداو هێندێك پارێزگای دیکەوە کە لە رووی بنیاتنانەوەو فراوانکردنی پێوەندیی حیزبەوە بە جەماوەر، کەمو زۆر خێراتر سەرکەوتنیان تێدا بە دەست دەهات. نزمیی ئاستی فیکریمو کەمیی ئەزموونی سیاسی ـ حیزبیم کۆسپێك بوون لەبەردەم گەشە کردنی چالاکیماندا، چونکە بەرنامەیەکی‌وامان بۆ کاری حیزبی دانە نابوو کە لەگەڵ

پێداویستەکانی هەلومەرجی شارەکەدا بگونجێت. هەرچی ئەو هێڵـە سیاسـیەش بـوو کە پێڕەومان دەکرد، تا ئەندازەیەك نـەگۆڕ بـوو: خـۆ خـەریککردن بـە خـەباتی دژی ئیمپریالیزمو نەهێشتنی دەسەلاتیەوەو، خۆ بەستنەوە بە دروشمی رووخاندنی رژیم یا وەزارەتی بەکرێگیراو.

ئیتر پاش لە ئارادا نەمانی ئەم هۆکارەی کە ناچاری کردین بە شـێوەیەکی کـاتی لە کەرکووك بمێنینەوە، بەهاری ۱۹۵۰ بیری چوونەوە بـەغدام لـە لاخـەملی. (صـبری سباهی)م راسـپارد سـۆراخی خانوویـەکی بچووکـی کـرێ بکـات لـە بـەغدا. دەبـوو خانووی عەبدوڵلاّ رۆژبەیانیی هاوڕێی جووتیارو هەڤاڵی خەباتگێڕم بەجێ بهێڵم. کە یەکەم جار بە عـەبدوڵلاّ گەیشتم مرۆڤێکـی نـەخوێندەواری بـاشو سـادە بـوو، هـیچ پێوەندییـەك بـە جووڵانـەوەی سیاسـییەوە گـرێ نـەدەدا. کـاتێکیش بـەجێم هێشـت خـەباتگێڕێکی شۆڕشـگێڕی راسـتەقینە بـوو، ماڵـە بچووکەکـەیی وەك هێلانـە بـۆ چالاکیی حیزبی خستبوە بەردەستی هەڤالاّن.

لەگەڵ (صبری)و عـەبدوڵلاّ دا کەرکووکم بـەجێ هێشـت. بڕیـارم دا بـە مووسـڵدا بڕۆم، تا بەتیرێك دوو نیشانە بپێکم: لەوێ لە لایەکەوە چاوم بە بەرپرسی رێکخـراوی حیزبمان دەکەویو لە بارودۆخی ئاگادار دەبمو، لە لایەکی دیکەیشەوە بـە رێگەیـەکی سەلامەتتردا دەچمە بەغدا. هەولێرم بۆ یەکـەمین جـار دی. بـەر لـەوەی بکەوینـە رێ، کەمێك تێیدا ماینەوە. هەولێر شارێکی مۆرك دێـهاتی بـوو، ژمـارەی دانیشـتوانی خۆی لە سی هەزار کەس دەدا. کە گەیشتینە مووسڵ لە ئوتێلێکی بچووك دابـەزین، چاوەڕێمـان دەکـرد رۆژی دوایـی پێوەنـدی بـە سـکرتێری رێکخراوەکـە بکـەین. (مووسڵ)یشم بۆ یەکەم جار بینی. (عومەر)ی سکرتێری رێکخـراو مامۆسـتایەکی لاوی سوورکاری هێمنو کەشخە بوو. لە دەرەوە کۆبوونەوەیەکی درێژم لەگەڵدا کـردو لە گەلێك کاروباری سیاسیو رێکخراوەییمان دواین. لەو کۆبوونەوەیە زۆر لە دۆخـی

ئەوێی حیزبمان حاڵی نەبووم. عومەر ٧٥دیناریشی لە دەسکەوتی ئابوونەی مانگانەو پیتاك دامێ.

ئێوارە بلیتمان بڕی بۆ سەفەر بەو شەمەندەفەرە کە کورسیە دارینەکانی لەو ڕێگە درێژەدا سەر نشینان باش ناحەوێننەوە. شۆستەی ئێستگەو واگۆنەکان قەرەباڵغو پڕ ژاوە ژاو بوون. کورسیی خۆمامان گرتو چاوەڕوان بووین شەمەندەفەر روو بە پیتەخت بجوولێت. لاوێکی کەڵەگەتی بە لە باریکەی جلێکی مەدەنیی سپۆرت لەبەر هاتە لامان. چەند پیاوێکی بەرگی پۆلیسی یا بەرگی مەدەنی لەبەر بەدوایەوە بوون. داوای ناسنامەی لە منو عەبدوڵلا کرد. ناسنامە ساختەکەمم دەرهێنا کە لە بنەڕەتدا هیی برا مردووەکەی حەلیمە بوو. ئەوسا دەفتەری نفووس وێنەی پێوە نەبوو. ئەو تاکە شتەی ناسنامەکە کە سەرنجی کابرای راکێشا، نەگونجانی مێژووی لە دایکبوونەکە بوو لەگەڵ سەرو سیمامدا، چونکە لەوە دەچوو من کەم تەمەنتر بم. بۆیە لێی پرسیم:

- رێی تێدەچێ ئەمە تەمەنی تۆ بێ ؟

- باوکم بەم شێوەیە ناونووسی کردووم. مەسەلەکە گوناحی منی تێدانییە.

ئێوە لەو جوولەکانە نین کە دەتانەوێ رابکەن ؟

- (أشهد ان لا اله إلا الله، أشهد أن محمدا رسول الله).

پۆلیسە نهێنیەکە ئەم وەڵامەی پێ سەیرو چاوەڕوان نەکراو بووو هەستی بە چەشنە خەتایەك کرد. ئەمجا پرسیی: ئاخۆ سەربازی هەڵاتوو نیم. بە (نەخێر)وەڵامم دایەوە. بەڵام بەوە نیگەرانی کردم کە پرسیاری سێیەم کەسی لێکردم. مەبەستی (صبری سباهی) بوو کە کورسییەکی چۆڵی لە تەنیشتمانەوە چنگ نەکەوتو چەند مەترێك دوور لە ئێمە دانیشت. پرسیار کردن لە سێیەم کەسمان وای پیشان دەدا کە ئێمە پێشتر چاودێری کراوین. وەڵامم دایەوە ئێمە هەر دوو کەسین، کەسی دیکەمان لەگەڵدا نەبوە. پشکنیانینو هیچیان لە لا نەدۆزینەوە. کوڕە لاوە کەڵەگەتەکە

فەرمانی بە پۆلیسێکیان دا لە لامان بمێنێتەوە تا خۆی دەگەڕێتەوە. لەگەڵ یاوەرەکانی دیکەیدا رۆیشت. رەنگە چوو بێ بە شوێن سێیەم کەسماندا بگەڕێت. راستەوخۆ دوای رۆیشتنی، توانیم پۆلیسە پاسەوانەکە بخەڵەتێنم بەوەی کە پێمگوت:

ـ ئێمە برسیمانە، نازانم لێرە دەتوانین چی بکڕین بۆ خواردن ؟

ـ لێرە جۆرەها خواردەمەنی لەسەر شۆستەکان دەفرۆشن.

ـ کەواتە (أبو اسماعیل) بڕۆ خواردن بۆ ئێمەو خۆیشت بهێنە. یا بمانبە پێکەوە بیکڕین.

ئەو بڕە پارەیەی کە دامێ، نیو دیناری تەواو، مایەی فریو دانی بوو. دابەزی لە دووریی چەند مەترێکەوە خواردەمەنی بکڕێ. ئێمەیش دەستو برد بە دوایدا دابەزینو خۆمانمان لە قەرەباڵغیی سەر شۆستەکەدا ون کرد. بە پەلە ئێستگەکەمان بە جێ هێشتو جێیەکمان پەیدا کرد تێیدا بمێنینەوە. سەر لە بەیانیی رۆژی دوایی منو عەبدوڵلا زوو موسڵمان بەجێ هێشتو چووینەوە بۆ کەرکوک. رۆژی دواتر (صبری)ش لە بەغداوە گەیشتە لامانو پێی گوتین: مەفرەزەی پۆلیسەکە تا شەوێکی درەنگ بە شوێن ئێمەو ئەودا نێو واگۆنەکانی شەمەندەفەرەکە دەگەڕا. ئاگاداریشی کردمەوە کە خانوویەکی چکۆلەی گونجاوی لە بەغدا بەکرێ گرتووە.

پاش سێ رۆژ بە ئوتومبیل چوومە کفریو، لەوێشەوە بە شەمەندەفەر بۆ بەغدا. پیرەژنەکەی دایکی حەلیمەو کەریمی کچەزایم لەگەڵ خۆمدا برد، تا کاتێك بە شێوەیەکی باشتر رێو شوێن بۆ ئیشو کارەکانم دادەنێم، لەو خانوەدا بۆ ماوەیەك لەگەڵمدا دابنیشن. سەر لە نوێ بوومەوە بە دراوسێی نەخۆشخانەی عەزلو نزرگەی (الست زبیدة)ی ژنە بەناوبانگەکەی (هارون الرشید). (صبري) بۆ ماوەیەك هەر ئەڵقەی پێوەندیی نێوان منو بەرپرسی رێکخراوی پێتەخت بوو کە توانیبووی لە بنیاتنانەوەی خۆیدا چەند سەرکەوتنێك بە دەست بهێنێ.

* * *

## - ٦ -

# سەر لە نوێ پێتەخت

که گەڕامەوە بۆ بەغدا، هیچ نەخشەیەکم بۆ چالاکیی سیاسی یا کاری داهاتووی ڕێکخستن لەگەڵ خۆدا نەبرد بوو. لە عۆدەی ئەم چەشنە کارە نەدەهاتم. بەڵام سەبارەت بە کێشەی کاروباری نهێنیو خۆشاردنەوە، چەند ئەزموونێکی لەبار یا باشم لەلا کەڵەکە بوو بوون. ئەو ڕێبازەی کە لە گەیشتنمەوە بە بەغدا لە حوزەیرانی ١٩٤٩ داو تا ناوەڕاستی ١٩٥١ گرتمە بەر، ڕێبازی کشانەوەی ڕێکخراو بوو؛ واتە خۆلادان لە خۆپیشاندانو مانگرتنو هەموو خەباتێکی جەماوەری کە زەمینەیان بۆ خۆش نەبوو بووو، خەریککردن بە بنیات نانەوەی حیزبو پەروەردەکردنی کادێری باش. نەمدەتوانی بۆ پاساودانەوەی ئەم ڕێبازە، هیچ ڕوونکردنەوە یا فۆر موولەیەکی تیۆری بەردەست بخەم. بەڵام ئەزموونی ئەو خۆپیشاندانانەی کە لە دەورانی سەرکردایەتیی (ساسون دلال)دا لە سلێمانی ڕێبەریم کردن، قەناعەتیان پێ کردم کە ئەم چەشنە ڕێبازە سیاسی - ڕێکخراوەییە لەو قۆناخەدا ڕاستو دروستە.

کاتێك دیسان کەوتمەوە چالاکی، - وەك کرد بووم بە پیشە - لە نێو زەحمەتکێشانو گەڕەکێکی میللیدا نیشتەجێ بووم ؛ وەك ئەوان دەخواردو دەمپۆشیو دەژیامو پێوەندیی ئاساییی دراوسێیەتیم لەگەڵدا دەبەستن، بەبێ ئەوەی پەردە لە ڕووی ناسنامەی حیزبی - سیاسیم یا سروشتی چالاکیی ژێر زەمینیم بۆ هیچ یەکێکیان هەڵبماڵم. بۆم دەرکەوت دۆخەکە، بە بەراورد لەگەڵ ماوەی پێش سەفەر کردنمدا بۆ کەرکووك، زۆر باشترە. ڕێکخستنەکان فرە ژمارە ترو فرە چالاکی ترنو، پێوەندیش لەگەڵ ڕێکخراوە حیزبییەکانی دەرەوەی پێتەختدا فراوانترو ڕێکخراوترە. لە هەموو ئەوانەیش گرنگتر، زانیاریەکانی دوژمن کۆن بوو بوونو کەڵکیان بۆی نەبوو. لەو کاتەوە کەچوو بوومە کەرکووك، زانیاریی تازەی دەست

نەکوتبوو، نە لەسەر منو نە لەسەر کادێرانو ئەو ڕێکخستنە تازانە کە لەو ماوەیەی دواییدا هێنرا بوون.

من تا ئەو دەمە بە تەنیا ناوەندی سەرکردایەتیی حیزبم پێکدەهێنا لە دوای گیرانی (زکی وطبان ) ەوە، هاوبەشێکی دیکەم نەبوو. بەڵام بۆ ڕاییکردنی کاروباری ڕۆژانە، یارمەتیم لە چەند کادێرێکی تازە کوورەی دەورم ـ محمد راضيو صبری سباهيو مجید عبدالرزاق ـ وەردەگرت. کە لەکەرکووك زۆربەیانم لەدەست دا، گەلێك دژواریی گەورەترم لەڕاییکردنی کاروباردا بەرپشەوە بوون. کاتێك هاتمەوە بۆ بەغدا، وەزعم لەو ماوە کورتەدا گۆڕا، بە تایبەت دوا بە دوای کۆتایی پێهاتنی ماوەی حوکمو لە زیندان دەرچوونی (هادی صالح)و( صادق الفلاحی )ی کرێکارانی چنینو پێوەندیکردنم پێیانەوە. بۆم دەرکەوت دوو تێکۆشەری گورجو گۆڵو خۆبەختکەری ڕاستەقینەن، هەموو وزەیەکی خۆیانیان خستووەتە بەر خزمەتی حیزب. (صادق) بەبێ ڕاڕایی قایل بوو دایکی بهێنێ تا لە پەناگەیەکی حیزبیدا لەگەڵیدا یا لەگەڵماندا دابنیشێ. بەڵام دایکە مانەوەی دوور لە هاوڕێیانو چاوپێکەوتنو کۆڕی گەرە لاوژەی ڕۆژانەی لەگەڵ ژنانی کۆڵانە میللییەکەیاندا بۆ نەدەچوە سەر چونکە پێشتر دەقی بەو ژیانەوە گرتبوو. باری ژیانی خۆشاردنەوەی نێو ماڵە حیزبییەکانو بەربەستەکانیی دەرنەدەبرد. بۆیە دوای چەند حەفتەیەك بەجێی هێشتین. هەرچی (هادی صالح)یش بوو ، ئەوە نەك هەر خۆیی بە حیزب بەخشیبوو، بەڵکوو خێزانەکەیشیی بە درێژاییی سالآنێکی یەك لە دوای یەك کردە خزمەتکاری حیزب. ژنە نەخوێندەوارە سادەکەی، بوو بە نموونەی ژنە خەباتگێڕی میللیی لەخۆبوردوو. بە پێویستی دەزانم دان بەوەدا بنێم کە من قەرزار باری ئەم خێزانە کرێکارە باشەم، کە لە ڕاییکردنی کارو بەدیهێنانی ئەرکە حیزبییەکانمو خزمەتکردنیشمدا بۆ ماوەی پتر لە دوو ساڵو تا گیرانم لە نیسانی ١٩٥٣دا یارمەتییەکی زۆری دام.

ئەو خێزانەی دیکەیش کە دەرگای ماڵی بۆ خستمە سەر پشتو چەند بۆی هەڵبسورابایە لە راییکردنی چالاکیی حیزبیمدا یاریدەی دەدامو کارێکی کرد قەرزار باری ببم، خێزانی کرێکارانی چنینی خەڵکی (الکاظمیة)(خضیر)و (ابراهیم)و دایکە زەحمەتکێشە نەخوێندەوارە دلێرەکەیان بوو، کە هەر کارێکی نامە بردنو پۆستە گواستنەوەمان پێ بسپاردبایە بە جۆشو خرۆشەوە رایدەپەڕاند. هەروەها بە درێژاییی ئەو ماوەیە کە نیزیکی بووم، وەك دایکێکی راستەقینە هەڵسو کەوتی لە تەکدا دەکردم. ئافرەتێکی ئازای گەشبینو نەفس بەرز بوو. بە دەگمەن رێ دەکەوت تەشیی بە دەستەوە نەبێ، جا ئیتر لە ماڵەوە دابنیشتبایە یا بە هێندێك ئیشو کارەوە خەریك بوایە. تەشی بە لای ئەوەوە هەر ئامرازێکی نان پەیدا کردن نەبوو، بەڵکوو هۆیەکی کات بەسەربردنیش بوو.

ئەگەر بۆم هەبێ وەك خەباتکارێکی شۆڕشگێڕی لە ناخەوە باوەر هێناو بە کێشەی گەلو کۆمۆنیزم، کە لەو قۆناخەدا ژیانم بۆ تەرخان کرد، شانازی بەو کارانەوە بکەم کە کردوومنو بەو دەسکەوتانەیش کە بەدیم هێناون، دەبێ پێ لەو راستییە بنێم کە من لە توانامدا نەبوو ئەو کارانە بە ئەنجام بگەیەنم ئەگەر یارمەتیو بەشداریی خەباتگێڕانەی چەند کرێکارێکی لە رووی سیاسییەوە هۆشیارو دڵسۆزانە تێکۆشیوی وەك (صبری سباهی)و (صبیح سباهی)و (هادی صالح)و (صادق الفلاحی)و (خضیر عباس الکاظمي)و (جاسم یحیی)و چەند سەربازێکی دیکەی نەناسراو نەبوونایە، کە بە بێ چاوەڕێکردنی پاداشتی هیچ کەسێكو بە بێ سڵکردنەوە لە تیرۆرو راوەدوو نانی رژێمی پاشایەتیی نۆکەر کایان کردو قوربانییاندا.

(هادی صالح) کە درێژترین ماوەی ژیانی خۆشاردنەوەم لەگەڵ خۆیو خێزانەکەیدا گوزەراند، بەر لەوەی بیناسم ساڵێکی لە زیندان بەسەر برد بوو. ژنە لادێییەکەی لە ماوەی زیندانیدا ژیانی خۆیو سێ مندالەکەیی بە فرۆشتنی شیری مانگاکەی

بەڕێوە دەبردو، شەو نشینیی بە دیارەوە دەکرد. پێی وا بوو باشترین مانگایە لە جیهاندا.

تەنانەت پاش گواستنەوەی بۆ ماڵێکی حیزبیو مانەوەی لەگەڵماندا، ئەو مانگایەی هەر لەگەڵ خۆیدا هێشتبوەوەو مشوور خۆری بوو. بڕێکی لە شیرەکەی دەفرۆشتو، شیرو ماستی دەرخوارد دەداین. بەیانیی رۆژێکیان سەرنجمان دا ئاو دەکاتە ئەو شیرەوە کە لەسەر پرێمزە نەوتییەکە بۆی گەرم دەکردین. مێردەکەی بە تووڕەیی پێی گوت:

- کچی پیاو تۆ هەتا فێڵ لە منداڵەکانیشت دەکەی.

- پێکەنیو گوتی: باوکی عەدنان شیرەکە بەش ناکات!

جاروبار کاروباری چاپکردنیشم دەدا بەسەر (هادی)دا. رۆنیۆیەکو تایپڕایتەرێک (طابعة) لە ماڵەکەیدا بوون. خانوویەکی بچووکی حاجییەکی (الشکرچی) ناوی لەوێ بە کرێ گرتبوو. جارێکیان بڵاوکراوەیەکی حیزبیی لە ژوورێکدا چاپ کردبوو. بۆ ئەوەی هیچ دانەیەکی بڵاوکراوەکە بە مەرەکەبی ئەویتر پیس نەبێ، لە ژوورەکەدا بڵاوی کردبوونەوە. پێش ئەوەی کۆیان بکاتەوە ژوورەکەی بەجێهێشتبوو. دوای تاوێك (الشکرچی)ی خاوەن خانوو لەگەڵ دوو کچە عازەبەکەیدا بۆ بەسەرکردنەوەی خانوەکە یان دیدەنیی کرێچییەکانی هاتبوون. بەبێ ئیزن خواستن لە کەیبانووی ماڵ کەسەر قاڵی جل شتن بوو بوو،چوو بوونە ژووری ڕۆنیۆکەو ئەم دیمەنە سەیرو عەنتیکەیەیان دیبوو: تایپڕایتەرێکو ڕۆنیۆیەکو سەدان دانە لە بڵاەکراوەیەکی چاپکراو. کچێکیان دانەیەکی لە بڵاو کراوەکە برد بووو ناونیشانو ئیمزاکەی پەراوێزیی خوێندبوەوەو گوتبووی:

- بابە! ئەمە چاپخانەی حیزبی شیوعییە!

حاجی (الشکرچی) سەرباری ئەوەی کەپیاوێکی نەخوێندەوار بوو، دەرکی بە هەموو شتێك کرد بوو. بە هێمنی وەڵامی کچەکەیی دابوەوە:

- نا کچی خۆم! ئەمە تایپی حکوومەتەو ئەم کرێچی یەیش کاتبە لـە دائیرەیـەکی حکوومەتیداو ئیشی بەسەردا کەڵەکە دەبێ. بۆیـە ناچارە پـاش دەوامـی ڕەسمی لـە ماڵەوە تەواویان بکات. دەی با بچینە دەرەوە.

لەگەڵ دوو کچەکەیدا هاتبوە دەرێو دەرگاکەی بـە هێواشـی پێوەدا بـووو، چەند قسەیەکی عـادەتیی لەگەڵ کەیبانووی یەکجار شلەژاوی ماڵدا کرد بوو. لە ماڵەکـەی ڕۆیشتبوونو (أم عـدنان) یـان بـە گینگـڵ و واق وڕمانـەوە بـەجێ هێشـتبوو. کـە چوومە نێو خانوەکە بلاوکراوە چاپکراوەکە ببەم، بووم بە بارانی ڕەحمـەتو بەسـەریدا داباریم. بە پەلە بەسەر هاتەکەی بـۆ گێڕامـەوە. دووکچەکـە لەسـەر بـانی خانوەکـەی تەنیشتمانەوە کە ماڵی پووریان بوو، تەماشایان دەکردینو پێدەکـەنینو بـە لایانـەوە سەیر بـوو چاپخانـەی (حشع) لـەم شـوێنەدایەو بـەم شـێوەیە. ئیتر دەبـوو نـەهێڵم وەختەکە بەفیڕۆ بڕوات. دوای ئەوەی دایکی عەدنانم ڕاسپارد شتە مەترسیدارەکان بـە کـۆڵ بـۆ دووکـانی برادەرێکـی ناسـیاو (الشیخ معـروف ) بگوێزێتـەوە، ڕۆنیـۆو تایپرایتەرو بلاوکراوە تازە بە تازە چاپکراوەکەم خسـتە دوو سـەبەتەوەو بـە سـوکانی پاسکیلەکەمدا هەڵمواسینو دەستبەجێ ماڵەکەم بـەجێ هێشـت. پـاش بیست دەقـە کەمتر لە بازاڕ پێی گەیشتمو پێمگوت بە مێردەکەی بڵێت: با بـەبێ دواکـەوتنو لـە گەڕەکێکی دوور لە (الرحمانیة) بە شوێن خانوویـەکی دیکـەدا بگـەڕێ. هـەمان ڕۆژ خانوەکەی لە نێو باخەکاندا، لەو جێیەدا کە دوایـی کۆشـکی کۆمـاریی لێ دروسـت کـرا، پـەیدا کــرد. خانوەکـە ڤیللایـەکی باشـی بە باخچەیـەکی گـەورەی پـڕ لـە دارخورمای هەڵچوو وداری میوەهات دەورە دراوبوو. مۆڵکداری خاوەنی خانوەکە بۆ خۆیـی بینـاکرد بووو، ئـەمجا عێـراقی - ڕەنگـە لەبەر نەخۆشی بوو بـێ - بـەجێ هێشتبوو. دایان بە ئێمە بـە کرێـی مـانگی سێ دینـار. تـا ئـەو کاتـە گـەورەترینو دڵگیرترین خانوو بوو تێیدا ژیابم. بەڵام (حمود الراوی)ی شیوعیی چالاکی چەنەبازو لاپرەسەن نەیهێشت زۆر تێیدا بمێنینەوەو خۆشیی لێ وەربگرین.

( فضيلة) ی خوشکی (خضير) که کچۆڵەیەکی تەتەر بوو بە پەشۆکاویەوە هاتە ژوور. پێش ئەوەی ئەو نامەیە بداتە دەستم کە لە یەکێکەوە بۆی هێنا بووم، گوتی:

- کە هاتمە ژوور ئاوڕم دایەوە. سەیرم کرد هەڤاڵ (حمود ) شوێنم کەوتووە.

هەواڵەکە کتو پڕو سەرنجڕاکێش بوو. ئیمە (حمود ) مان بە کادیرێکی چالاکی ناوەنجی خۆمان دانا بووو، بڕای بڕ گومانمان لیٚ نەدەکرد. ئەوەتا ڕەفتارێکی سەیری وای لیٚ دەوەشێتەوە، گومان لە خۆی دەورووژێنیٚو دەبێتە هۆی نیگەرانییەکی ڕەوایش بۆ ئێمە. لە (فضيلة)م پرسی:

- بۆچی پێش ئەوەی بگەیتە لامان ، لە ڕێگە نەتزانی شوێنت کەوتوون ؟

- لە دوا ساتدا نەبیٚ سەیری دواوەم نەکرد.

لەوانەیە (حمود ) تەنیا بە مەبەستی خۆ تێهەڵقورتاندن رەفتاری وای لیٚ وەشابێتەوە. بەلاّم ناچار بووین پرسیاری زیاتر لە خۆمان بکەینو، خراپترین ڕێتێچوون ڕووبەڕووی بارودۆخەکە ببینەوە. ڤێللاکەمان چۆلٚ کردو، پاش کەمتر لە چل رۆژ باخو خورماو میوەهاتمان بەجیٚ هێشت. هادیماڵێکی تازەی لە گەڕەکی (كمپ الصليخ) دۆزییەوەو گواستمانەوە بۆ ئەویٚ. (حمود )، سەرەڕای ئەم ڕەفتارەیشی، نەرمو نیانیم لەگەڵدا نەنواند. ئەوە بوو لە حیزبەوەدەرم ناو ئەوەم بە خەڵك ڕاگەیاند. بەلاّم تاوانی سیخوڕیم نەدایە پاڵ، بەڵکوو گوتم چەنە بازەو تێکدەرەو حەز دەکات لە هەموو دیزەیەکدا ئەسکویٚ بیٚ. ناویشمان نا "تیتۆییی چەنەباز". خۆم حاڵی نەبوو بووم کە مرۆڤ تیتۆیی بیٚ (ناوی تیتۆی پێشەوای شیوعیی یۆگۆسلاڤی‌یە) مانای چییە. بەلاّم تەواو لەسەر هەق بووم کە سیفەتی چەندبازیم بەسەردا بڕیبوو. ئەویش پیٚ بە پیٚ زۆر باکی لەوە نەبوو پێی بگوترێت چەنە بازە، بەلاّم ناوی (تیتۆیی) ئەوپەڕی کاری تێدەکرد. هەتا بە یەکێکیانی گوت:

- رازیم بە چەنەبازو تێکدەرم دابنێن، بەڵام من تیتۆیی نیمو، تاکە تکایشم ئەوەیە حیزب ئەم تاوانەم نەخاتە پاڵ. من تێکدەرمو هەڵپەرستم، بەڵام تیتۆیی نیم.

کە بۆ یەکەمین جار رادیۆ هاتەماڵەکەوە، لەگەڵ خێزانی (هادی صالح)دا دادەنیشتم. پێی دڵشاد بووم، چونکە هۆکارێکی باش بوو بۆ بەدوودا چوونی هەواڵو رووداوەکانی جیهان کە لە رۆژنامەو رادیۆ بەدەر هیچ رێگەیەکمان نەبوو بۆ بەدوودا چوونیان. رۆژێکیان لە ژوورەکەم دانیشتبووم، وەڵامی هێندێک نامەی حیزبیم دەدایەوە، (أم عدنان) بە پەلە پڕووزێ هات بەسەرمداو بەسەر سامییەوە پرسی:

- بۆچی رادیۆ ناکەیتەوە ؟ بۆچی ؟

- بۆچی دەبێ بیکەمەوە ؟

- لەمیعە تۆفیق گۆرانی دەڵێت.. گۆرانیی "نایل" دەڵێت !

- رادیۆکەم کردەوەو لەگەڵ دایکی عدناندا گوێم لە گۆرانیەکە گرت. بیمە بە راستی دڵبەندی ئەو گۆرانیە دێهاتییە خەمگینو نایابە بووم.

* * *

پێوەندیی حیزبیم لە بەغدادا پەلی هاوێشت، هەتا ناوچە جیاجیاکانی شاری گرتەوە. هاتوچووی ڕۆژانە ئاسان نەبوو. بەکارهێنانی ئوتومبیلی کرێ لە نێو ئەو شارە گەورەیەدا، سەرەڕای پارە تێچوونی، هێندێک مەترسیی هەبوو. سەیرم کرد سواری پاسکیل بوون باشترین شتە. بەڵام ئەمە بۆ منی لاو کە بە بچووکی فێری نەبوو بووم، کارێکی ئاسان نەبوو. پاسکیلێکی بەکار هاتووم کڕیو دەستم بە مەشق کرد لەسەری. پێش فێر بوونی لێخوڕین، پتر لە دەیان جار کەوتمە خوار. ناتوانم ئەو رووداوە لەبیر ببەمەوە کە پێش فێر بوونم بە باشی بەسەرمدا هات، ئەو ڕۆژەی کە سواری بووم و لە ماڵی (خضير ) ەوە لە (الكاظمية ) ڕووم کردە ماڵی (صادق الفلاحی) لەبەری کەرخ. بە پاسکیلەکە بە شەقامێکی تەنگەبەرو پەنا عەماراوی

نێزیکی گۆڕەپانی (الزهراء)(الکاظمیة) دا ڕێم دەکرد. ئوتومبیلێك بەرەو ڕووم هات. چوار ئافرەتی گامێشەوانی ماستفرۆش لە خالّی بە یەکگەیشتنماندا بە تەنیشت یەکەوە دەڕۆیشتن. بەهۆی خراپیی لێخوڕینەکەمەوە دوو ڕێگەم لەبەردەمدا بوو: یا خۆمم بکێشابایە بە ئوتومبیلەکەدا کە مەترسی یەکی کوشندەی تێدا بوو، یان خۆمم بدابایە بە ئافرەتێکیاندا. چونکە ئەم شەڕەیان سووكو ئاسانتر بوو. ڕێگەی دووەمم هەڵبژارد. خۆ پێدانەکە شتێکی نا خافڵ بوو بۆ ژنە ماستفرۆشە پێخاوسەکان. ویلی پاسکیلەکەم چوو بە ناوگەڵی کچێکی کەڵەگەتی ڕەشتاڵەی بەڵە باریکەدا کە چاو زلو لەچك کردووو عەبا لە خۆوە پێچاوو لەوەستانو ڕۆیشتندا قنجوقیت بوو. کچە سێ سنووقی تەختەی گەورەی پڕ لە ماستی لەبان سەری هەڵگرتبوو. بەڵام سنووقەکەی سەروویانی لە دەست دەرچوو، بە سەرمدا قلّپ بووەوەو ماستەکە وەکوو یەك بەسەر گشت ئەندامەکانی لەشمدا ڕژا. لە پاسکیلەکە دابەزیمو داوای لێبوردنم لە کچەکە کرد. ئەم بەرکەوتنە نا خافڵە یەکەم جار کچەی حەپەساند. کە دەمی هەڵهێنایەوە، یەکەمین قسە داوای کرد هەقی ماستەکەی بۆ ببژێرم. چارەکە دینارێکی داواکرد واتە کەمو زۆر نرخی هەرسێ سنووقەکە. کە بۆی دەرکەوت بە بێ پەڵپگرتن پارەکە دەدەم، چەشکە بووو داوای درهەمێکی دیکەی کرد. درهەمە زیادەکەم داو گوێم نەدایە ئەو ماستەی کە لە تەوقی سەرمەوە تا قولە پێمی سپی کرد بووو، روو بە کەرخ تێم تەقاند. خەڵك لە هەر کوێیەك بیاندیبام پێم پێدەکەنین.

لەو ماوەیەی دواییدا زۆرم کەڵك لە پاسکیل وەرگرت. بەرێگەی لا کۆڵانو لاڕێدا. دوور لە چاوی پۆلیسی نهێنی کە بە عادەتی بڕیبوویانە گۆڕەپانو شەقامە سەرەکیەکان، هەموو گەڕەکەکانی پێتەختی هەر لە گەڕەکی (الزوية) وە تا (الگریعات)و لە گەڕەکی (العاصمة) وە تا گەڕەکی (الشاکریة)، پێ دەگەڕام.

* * *

پاش گەڕانەوەم بۆ بەغدا بیرم لە دووبارە دەرکردنەوەی (القاعدة)ی رۆژنامەی حیزب کردەوە، بەڵام نە کەرەستەی چاپو نە دەسەڵاتی نووسینمان هەبوو. پێم باشتر بوو ئەگەر بەدەستخەتیش بووە هەم وەك ئامرازێك بۆ ورە بەرزکردنەوە دەری بکەین‌و، هەم لە هەوڵی خۆمان نەکەوین بۆ دابینکردنی کەرەستەکانی چاپ. لام وابێ دوو ژمارە بەم شێوەیە دەرکرا. قەڵەمی هەڤاڵان‌و دەستخەت خۆشەکان خەریکی رووننووسکردن بوون. (عطشان ضيول الازيرجاوي)ی ئەفسەری شیوعیی لە سوپا دەرکراو، دەست پێشخەریی کرد بۆ کڕینی یەکەم رۆنیۆ لە کۆمپانیای بازرگانیی ئەفریقایی. چووە کۆمپانیاکەو وا خۆی پیشان دا کە گوایە رۆنیۆکەی بۆ کڵێسە دەوێ. داوای نووسراوێکی رەسمییان لێ کرد. رۆژی دوایی نووسراوێکی رەسمیی ساختەی بۆ بردن کە کڕینی دەزگاکەو گواستنەوەیی بۆ عەیادەی دوکتۆری شیوعی (محمد الچلبی)بۆ ئاسان کرد. دوکتۆر محەمەدیش بە ئوتومبیلەکەی خۆی گواستیەوە بۆ جێیەکی دیاریکراو. دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە (عطشان) تێکۆشەرێکی چالاك‌و جەرگ کون تێ نەبوو بووو سەرپاکی وزەی خۆیی‌دا بە کاری حیزبی، ئەگەر چی بەردەوام حەزی دەکرد خۆی دەربخات‌و بەشان‌و باڵی ئیشەکانیدا هەڵبدات، بە پێچەوانەی (محمد الچلبی)یەوە کە شیوعییەکی سپۆرت‌و سەربازێکی ونی دوور لە هەر خۆ دەرخستنێك بوو.

هەر لەو کاتەوە کە دەزگای رۆنیۆمان مسۆگەر کرد، (صبيح سباهي)ی لاوی شیوعیی چکۆلە بوو بە چاپکەری سەرەکیی (حشع). ئەو لە تەمەنێکی زووەوە، پێش ئەوەی بگاتە هەژدەساڵی، خۆیی بە گەل بەخشی‌و پارچەیەك بوو لە پاکی‌و بێوەیی‌و خۆ بەختکردن‌و رەوشتی چاك. (صبيح) لەو ساڵانەدا کە سکرتێری حیزب بووم، دەستە راستم بوو بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری هونەریی چاپە گورج‌و گۆڵە ژێر زەمینیەکەمان کە دوژمنی هەراسان‌و دۆستانیشی شاگەشکە کردبوو.

* * *

ساڵی ١٩٤٩، دوا بە دوای کۆبوونەوەی جیهانیی لایەنگرانی ئاشتی لە ستۆکهۆڵمو دەرکردنی بانگەوازی ناوداری ستۆکهۆڵم کە بانگهێشتی بۆ قەدەغە کردنی چەکی ئەتۆمی دەکرد، بزووتنەوەی جیهانیی ئاشتی دامەزرا. ساڵی ١٩٥٠یش بزووتنەوەی ئاشتی لە عیراقدا، لە ناوەندی هەلو مەرجێکی دژواردا، لە وڵاتێکدا کە دیموکراسیی تێدا نەبوو بەرهەڵستانی ڕژێمو بە تایبەت شیوعیەکانو هەموو هێزە چەپڕەوەکان ڕاوە دوو دەنران دامەزرا. شاعیری گەورە (الجواهری) دەورێکی شەخسیی گرنگی هەبوو و بانگەوازێکی ئاڕاستەی ڕۆژنامە ئاشکراکان کردو بانگی عێراقیانی کرد بۆ ئیمزا کردن لەسەر بانگەوازەکە. بەڵام (حشع) داینەمۆی سەرەکیو ڕاستەقینەی پشت سەری دامەزراندنی ئەم بزاڤە بوو لە گۆڕەپانی عێراقدا. هانی (الجواهری) مان دا لەدەست پێشخەریەکەیداو؛ پێشتر هەر کە بانگەوازەکەیشی بڵاوبووەوە، لە چوار چێوەی ڕێکخراوی حیزبیماندا بانگەوازەکەمان بۆ دەستکردن بە ئیمزا کۆکردنەوە ئامادەکرد. چالاکترین ڕۆشنبیری بەم یان بەو شێوەیە بەحیزبەوە بەستراوی وەك (عطشان ضیول) و(عبدالرزاق الشیخ علی)و(عبدالجبار وهبی) و(غضبان السعد)و(عامر عبدالله)و(توفیق منیر)و هیی دیکە لەم بزاڤەدائیشیان کرد. ڕەنگە لەبەر ئەم هۆیە بوو بێ کە بزاڤی ئاشتی لەلایەن نەك هەر لایەنگرانی ڕژێمی پاشایەتی، بەڵکوو تەنانەت زۆربەی ڕێبەرانی حیزبە بۆرجوازیە نیشتمانیە بەرهەڵستەکانی ڕژێمەوەیش بە بزاڤێکی شیوعیانە یان سەر بە حیزبی شیوعی لە قەڵەم دەدرا. ئەم تۆمەت وە پاڵ خستنە لەگەڵ ڕاستیەکاندا نەدەگونجاو پشتی بە هیچ شتێك نەدەبەست، لەوە بەدەر کە شیوعیەکان لە ڕیزەکانیدا چالاك بوون. ئەم بزاڤە لە قەدەغە کردنی چەکی ئەتۆمیو دوورخستنەوەی مەترسیی جەنگی گەردوونی زیاتر هیچ ئامانجێکی دیکەی بۆ خۆی دانە نابوو.

کەدەست کرا بە کۆکردنەوەی ئیمزا بۆ بانگەوازی ستۆکهۆلم، (الیاس بطاح)ی بەرپرسی ڕێکخراوی بەغدا هەڵگەڕایەوە وقایل نەبوو فەرمانی حیزب جێبەجێ بکات، لەبەر ئەوەی گوایە (الجواهری)ی خاوەنی دەست پێشخەریەکە کەسێکی بۆرجوازییەو ڕاست نییە ئێمەی شیوعی شوێنکەوتەی بۆرجوازی بین. بەرامبەر بەم سەرپەڕگری "تطرف " ـەی (الیاس)، پێ بە پێ توندوتیژیم لەگەڵیدا نواند. ئەم توندوتیژی نواندنە لەو قۆناخەدا باو بوو. ئەوە بوو دەم ودەست بڕیاری سزا دانیم دا؛ بەوە نا کە بەرپرسیی حیزبیی لێ بستێنمەوە، بەڵکوو لەحیزب وەدەری بنێمو تاوانباری بکەم بە تیتۆیی.

* * *

کە لە ساڵی ١٩٥٠ دا هەواڵی قەومانی دوکەرتبوون (انشقاق)ێکمان لە ڕێکخراوی زیندانی (نوگرە سەلمان) دا پێ گەیشت، برینەکانی حیزب سەرەڕای بەدەست هێنانی چەند سەرکەوتنێك لە تیمار کردنیاندا، هێشتاکە خوێنیان لێدەتکا. لەوە دەچێ زۆر گیوگرفت بەرەنگاری شیوعیەکانی ئەوێ بووبنەوە و(سالم عبید النعمان) ی بەرپرسی ڕێکخراوو هێندێك لە نێزیکەکانی خاوەن ئاکارێکی بیرۆکراتیانەو جاروباریش مایەی بیزارییان لەگەڵ هەڤاڵەکانیاندا هەبوو بێ. لە کاتێکدا (حەمید عوسمان)ی لە حوزەیرانی (١٩٤٩)وە زیندانی، توانیبووی خاڵی بێهێزییان بقۆزێتەوەبۆ هاندان لە دژیان و زەمینە خۆشکردن بۆ دوکەرتبوون یا ئەوەی‌کە ناویان نابوو(پاککردنەوە). حەمید توانیی بەشی‌هەرە زۆری شیوعیەکانی بەندیخانە لە دژی (سالم ) کۆبکاتەوە. بەڵام (سالم )و هێندێك لەوانەی کە تا سەر لایەنگری بوون، ڕازی نەبوون نە لە کەلی شەیتان بێنە خوارێو نە پێ لەوەیش بنێن کە زۆربەی بنکەکەیان دانی خێریان پێدا نانێن. سالم نێزیکەی هەموو یا زۆرینەی بەرپرسە شیوعیەکانی وڵاتانێکی وەك عیراق، چنگی لە کورسیی بەرپرسی گیر کرد بوو و بە زۆر لانەبرابایە لێی دوور نەدەکەوتەوە. لەبەر ئەوە دوکەرتبوونەکە قەوما.

ژمارەیەکی کەم لە کادێرانی کۆنی وەك (محمد حسین أبو العیس‌و نافع یونس‌و یوسف حنا تد) لەگەڵ (سالم)دا بوون.

( حەمید عوسمان) ی سەرکردەی تاقمە هەڵبڕاوەکە یەکەمین سەرچاوەی ئەو زانیاریانە بوو کە لەسەر ڕووداوەکە پێمان گەیشتن. کلیلەکە لە دەستماندا یا لە دەستی شەخسی خۆمدا بوو، تا لە بەغداوە بڕیار بدەم کێ لە بەندیخانەدا براوەو کێیش دۆڕاو دەبێ. هێندەم سێ‌و دوو لێ نەکردو لایەنگریی (حەمید عوسمان)م کرد. زۆربەیش دژی سالم‌و ئەوانە بوون کە لەگەڵیدا مانەوە. ئەم هەڵوێستەی ئێمە سەرەکیترین خاڵی هێز بوو لای حەمید عوسمان، چونکە هەر ئەوەندە بەس بوو کە حیزب دژ بە لایەنی دووەم پشتگیریی دەکرد. لایەنی دووەمیش بێ هوودە هەوڵی پێوەندی بەستن‌و ڕێکخستن‌و دامەزراندی دەدا لە دەرەوەی بەندیخانە.

ئەگەر بە پێی عەقڵیەتی ئێستاو پێوانەی ئەمڕۆم حوکم بەسەر مەسەلەکاندا بدەم ئەوا لەو قەناعەتەدام کە من ئەوسا لە بڕیاردانی پشتگیریی حەمید عوسمان‌و ڕەت کردنەوەی (سالم عبید) دا پەلەم کرد بوو. دەبوو پەلە نەکەم‌و هەوڵی پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنە بدەم کە کەوتبوە نێوان هەردوو تاقمی زیندانیە شیوعیەکانەوە. ئەوە بەلای منەوە وەك یەکەمین بەرپرس لە حیزبدا کارێکی شیاو و ئاسان بوو. خراپترین ئەنجامی ئەم ڕووداوەیش ئەوە بوو کە لەوە بە دوا زنجیرەیەك کودەتا زیندانە سیاسیەکانی گرتەوە. بۆیە بە هەمان شێوە بەرپرسەکانی زیندانی (کووت)و بەغدا لابران. هیچ یەکێك لە لایەنگرانی کودەتای نێو زیندانەکان پەییان بەوە نەبرد بوو کە بەرپرسێکی تازەی لە چەشنی (حمید عوسمان) لە چاو (سالم عبید) دا کەم لێوە شاوەترو زۆر بیرۆکراتیترو تاکڕەو تر دەبێ.

* * *

کاتێکی درێژ بەسەر هاتنەوەمدا بۆ بەغدا ڕانەبورد بوو کە داوایەکمان لە پاشماوەی تاقمی (الاتحاد) ەوە پێ گەیشت بۆ باس‌و خواس‌و گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا

بۆ یەکگرتنەوەمان. (الاتحاد) کەریم سۆفی دایمەزراند بوو. زۆر خۆمم ماندوو نەکرد سۆراخی چارەسەرێکی گونجاوی گیروگرفتەکە بکەم، بەڵکووەڵامەکەم لە کارەکانی ساڵی ١٩٤٥ی فەهد دا بەرانبەر بە تاقمی یەکێتیی تێکۆشین (وحدة النضال) دۆزییەوە، کاتێك داوای گفتوگۆیان کرد بوو بۆ یەکگرتنەوە. فەهدیش وەڵامی دابوونەوەو گوتبووی: هیچ گفتوگۆیەکتان لەگەڵدا ناکەین، بەڵکە دەبێ ڕێکخستنەکەتان هەڵبوەشێننەوەو تاکە تاکە داوای هاتنە ریزی حیزبمان بکەن. حیزب یەکە یەکە بڕیار لەسەر هەموو داوایەك دەدات. چیی ویست هێنایە دی، بەشە کوردیەکەی یا راستتر بڵێین: بەشەکەی هەولێری ئەو تاقمە نەبێ کە سالح حەیدەری بەرپرس‌و حەمید عوسمان‌و نافیع‌و یوونس‌و جەمال حەیدەری‌و عەزیز محەمەدیش ئەندامی بوون، ناچار بوون ساڵی ١٩٤٦ خۆ هەڵبوەشێننەوەو تاکە تاکە داوای هاتنە ریزی (حشع) بکەن.

که تاقمی یەکگرتن (الاتحاد) هەڵوەشایەوە بڵاوکراوەیەکی نهێنیی بچووك بە ناوی تێکۆشین (النضال)ەوە هەر بە بەردەوامی دەردەچوو، بڵاوکراوەی فراکسیۆنێکی بچووك بوو لە ١٩٤٩ دا سەنگەری لە ئۆردووگای نیشتمانیی نامارکسییەوە گواستەوە بۆ نێو ئۆردووگای شیوعی. عەزیز شەریف سەرۆکی ئەم فراکسیۆنە بوو. لێرەدا حەز دەکەم مەسەلەکان بە شێوەیەکی باشتر روون بکەمەوە:

دوابەدوای دووەمین جەنگی جیهانی‌و هاتنە گۆڕیی قۆناخێك بۆ رادەربڕینی دیموکراتیانەو پێکهێنانی حیزبی یاسایی رێ پێدراو، فەهد لەگەڵ (عەزیز شەریف) دا لەسەر ئەوە رێکەوتن عەزیز حیزبێکی دیموکراتیی یاسایی دابمەزرێنێ، شیوعیەکان بە بێ لە دەستدانی (حشع) وەك حیزبێکی نهێنیی خەباتکەر پاڵپشتی بکەن‌و بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکی سیاسیی ئاشکرا لە ژێر ئالاکەیداو لە چوار چێوەیەکی دیموکراتیدا کەڵکی لێ وەربگرن. بەڵام عەزیز شەریف هەر هێندەی دەستی لە رێ پێدانی یاسایی حیزبی گەل (الشعب) گیر بوو، وازی لە

ڕێککەوتنەکە هێنا. لە باتیی ئەوەی ئەم حیزبە ببێ بە مەیدانێك بۆ چالاکیی جەماوەری ـ یاساییی شیوعیەکان، عەزیز شەریف لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکەیدا (نیشتمان ـ الوطن) کەوتە بانگەواز کردن بۆ هەڵوەشانەوەی (حشع)وکۆبوونەوەی شیوعیەکان لە ژێر ئاڵای حیزبێکی دیموکراتی یاساییدا بە سەرکردایەتیی خۆی. فەهد ئەم بانگەوازەی ڕەتکردەوەو، سوور بوو لەسەر ئامانجی خۆی کە هەوڵدان بوو بۆ دامەزراندنی حیزبی ڕزگاری نیشتمانی (التحرر الوطني) بە سەرکردایەتیی (حسین محمد الشبیبی).

وەختێك ئیمپریالیزمی ئینگلیزی لە ١٩٤٧ دا نەخشەی بۆ پەیماننامەی (پۆرتسمۆت) دادەنا، ڕژێم ئیجازەی حیزبی (الشعب)ی کێشایەوە. لە ١٩٤٨ یشدا، هێندێك لە دیارترین کادێرانی حیزبی (الشعب) (وەك عبدالجبار وهبیو عامر عبداللەو تۆفیق منیر) ڕیزەکانی ئەو حیزبەیان بەجێ هێشتو ڕوویانکردە (حشع). عەزیز شەریف ژمارەیەکی کەم کادێری لەگەڵدا مایەوە. ناوبراو لە دەورانی بە توندی نشوستی هێنانی (حشع) دا لە ساڵی ١٩٤٩ دا، دەستی لە بیری هەڵوەشاندنەوەی حیزبی شیوعی هەڵگرتو، کەوتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە پاشماوەی حیزبەکەی بکاتە ڕێکخراوێکی شیوعیو، بڵاوکراوەیەکی نهێنیی بە ناوی تێکۆشین (النضال) ەوە ـ وەك ڕۆژنامەیەکی شیوعیانەی نهێنی ـ دەرکرد. بە ئومێد بوو ئەم ڕێکخستنەی جێی (حشع) کە چەند برینێکی قووڵ کەوتبوونە جەستەیەوە، بگرێتەوە.

* * *

حکوومەتی عیراق لە ١٩٥٠ دا یاسایەکی دەرکرد، ڕێی بە جوولەکە عیراقیەکاندا ڕەگەزنامەی (جنسیە)ی عیراقییان پووچەڵ بکەنەوەو کۆچ بۆ دەوڵەتی ساوای عیبری بکەن. دەرچوونی یاساکە هاوزەمانی بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك واتە وات بوو بۆ ترسو بیم خستنە دڵی جوولەکەی دانیشتووی شارە جیاجیاکانی

عیراق‌و بە تایبەت بەغداوە، تا هەڵیان بپێچن دەست بەرداری رەگەزنامەی عیراقییان بن‌و بگوێزنەوە بۆ ئیسرائیل. ئەو جوولەکانە لە دێر زەمانەوەو، رەنگە لە سەردەمی بابلیەکان‌و ئاشووریەکانەوە، عیراقی بووبن. من ئەگەر چی هیچ زانیاریەکی بەردەستم نییە، بەڵام باوەڕێکی بە تینم هەیە کە دەرکردنی ئەم یاسایە ئەنجامی دەست تێکەڵ کردنی حوکمدارانی بەغداو لەندەن لە لایەکەوەو زایۆنیزمی حوکم بە دەستی ئیسرائیلیش لە لایەکی دیکەوە بوو. ئەوەیش خزمەتێکی جێی مەبەست بوو بۆ ئیسرائیل.

بەو پێیە کە سکرتێری حیزب بووم، پشتگیریم کرد لە بەخشینی ئازادیی کۆچکردن بە جوولەکە عیراقیەکان. لەوەدا ئەو راستییەم لەبەر چاو گرت کە ئەوانە لە عیراقدا ئازار دراون‌و پێدەچێ ئازادیی کۆچکردن رێگەیەك بێ بۆ رزگار بوونیان لە ئازاردان، سەرباری ئەوەی کە مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە لە هەر کوێیەك ئارەزوو بکات نیشتەجێ ببیّ‌و بژی. پاش ماوەیەك ئەم هەڵوێستەمم گۆڕی‌و یاسا دەرکراوەکەی حوکمدارانی بەغدام ریسوا کردو، پێم وابوو دەست تێکەڵکردنە لەگەڵ ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزمدا.

پێم خۆشە بەم بۆنەیەوە لا لە بابەتێك بکەمەوە کە دوژمنانی کۆمۆنیزم، لە سەردەمی پاشایەتیدا بوو بێ یا سەردەمانی دوایی‌و بە تایبەت سەردەمی رژێمی رەگەزپەرستی بەعس، گەلێك گوتارو نامیلکەو جاروبار کتێبی قەبەیان لەسەر نووسیوە. مەبەستم مەسەلەی دەستگرتنی جوولەکە بەسەر جووڵانەوەی شیوعیەتدا لە عیراق‌و کاریگەریی ـ وەك ناویان ناوە ـ دەسەڵاتی زایۆنییە لە سیاسەتی (حشع) دا. ئەوانە کۆششێکی لە رادە بەدەریان کردووەو زۆریان پارە خەرج کردووە، تا زایۆنیزم‌و کۆمۆنیزم وەکوو یەك شت پێشان بدەن‌و ئەو هاشەو هووشەیە بسەلمێنن: کە گوایە جوولەکە داشی بەسەر (حشع) دا سوار بووە.

هەموو ئەو نووسینانەی کە ئەوانە لەم بارەیەوە بلاّویان کردوونەوە، هەر زۆر درۆو دەلەسەن‌و بە مەبەستەوە هەڵبەستراون، چونکە جوولەکە عیراقیەکان کەمە

نەتەوەیەکی لە رووی ئاینیو تایەفەییو نەتەوەییەوە ئازار دراو بوون. ئەوانە کە جوولەکە بوونو هەرگیز عەرەبو کوردو شتێکی دیکە نەبوون، لەوە بەدەر هاوبەش بوون. دیارە ئاسایی بوو بەشێکی گەورەیان، وەك هەر کەمە نەتەوەیەکی چەوساوە، لە دەوری ئەو تاکە حیزبە عیراقیە خڕ ببنەوە کە بە راشکاوی دژی هەلاواردنی ئاینی ـ تایەفەیی راوەستاو داوای یەکسانیی نێوان هەموانی کردو ئەو حیزبەیش (حشع) بوو. زۆربەی هەرە زۆری جوولەکە عیراقیەکان هەر بە تەئسیری سیاسەتی دوژمنایەتیی زایۆنیزم کە (حشع)پێڕەویی کرد بوو، لە قۆناخێکی دیاریکراودا بەرانبەر زایۆنیزم وەك بیر و وەك جوولانەوەیەکی سیاسی راوەستانو بە توندی دوژمنایەتییان کرد. ئەم راستییە لە گەلێك بەسەر هاتدا زەق بووەوە، لەوانە: یەکەمین عیراقی کە لە خۆپیشاندانێکی دژ بە زایۆنیزمو لایەنگری کێشەی گەلی فەلەستیندا بە گوللەی رژێمی پاشایەتی شەهید کرا، (شاؤول طویق)ی کرێکاری جوولەکەی شیوعی بوو.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکە عیراقیەکان چوونە نێو ریزەکانی کۆمەڵەی بەربەرەکانی زایۆنیزمو، لە سالانی ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ دا دەورێکی کارایان لە خەباتی پڕ سەروەریی ئەو کۆمەڵەیەدا گێڕا.

دیارە جوولەکە عیراقیەکان ژمارەیەکی تا رادەیەك زۆر بازرگانو دەوڵەمەندی لە بازارو ژیانی ئابووریی‌ولاتدا دەستڕۆیان لە نێودا هەبوو. ئەوانە رۆژێك لە رۆژان هاوسۆزی (حشع) نەبوون، بەڵکوو وابەستەی چینی حوکمداری عیراق بوونو بۆ ماوەیەکی درێژ مەودایش نوێنەری خۆیانیان لە‌وەزارەتو پەرلەمانو دەزگا حکومەتیەکانی دیکەدا هەبوو، لە کاتێکدا زەحمەتکێشانو هەژارانی جوولەکەو رۆشنبیرانی توێژە مام ناوەندیەکان لە (حشع)یان رادەبینی بەرژەوەندەکانیان بخاتە روو، بۆیە روویان دەکردە ریزەکانی.

من وەك کابرایەکی بە درێژاییی چلوشەش ساڵی ڕابردوو هاوزەمانی جوولانەوەی شیوعیەت لە عێراقدا و، وەك مرۆڤێك کە بۆم هەلکەوت سالانێك لەگەڵ جوولەکە

شیوعیەکاندا لە زیندانو دەرەوەی زیندانـدا بژیـم، ئاشکرای دەکـەم جوولەکـەی ڕیزەکانی (حشع) کاتی خۆی هاتنە ڕیزی حشع، چونکە هەسـتیان کـرد ئـەم حیزبـە دژی هەڵاواردنو چەوساندنەوە ڕاوەستاوەو داکۆکیی لە مافی ڕەوایـان کـردووە، وەك چۆن داکۆکیی لە مافی عیراقیەکانی دیکەیشی کردووەو شێلگیرانەو دڵسۆزانە دژی ئیمپریالیزمو کۆنە پەرستی حوکم بەدەست تێکوشاوە. من درۆ دەکـەم ئەگـەر بڵێم: ئەو شیوعیە عیراقیانە کـە وا ڕێکـەوت تێکـەڵیان ببـمو ئیشـیان لـە گـەڵدا بکـەم، بەهۆی جیاوازیی ئاین یا مەزهەب یا نەتەوەوە جیاوازیم لە نێواندا دیون.

من خەڵکانێکی شیوعیی ڕەوشت باشو دڵگەرمو لە خەباتدا خۆبـەختکردووم لـە نێـو جوولەکـەکاندا دیـوە، وەك چـۆن لـە نێـو موسـڵمانو دیانەکانیشـــدا دیومـــن. هەروەها شیوعیی خراپو هەلپەرستو ترسنۆکیشم لە نێو جوولەکـەو موسـڵمانانو دیانەکاندا دیوە. ئەگەر جوولەکەکان شیوعیی وایان لە نێودا بـوو بـێ وەك (یـهودا صدیق)، ئەوا شیوعیی غـەیرە جوولەکـەی رووخـاوو ناپـاکی وەك (مـالك سـیف)ی عەرەبی صابیئیو (هــادی هاشـم)ی عـەرەبی موسـڵمانو (عزیـز الحاج)ی کـوردی موسڵمانو.. یش هەبوون. شایانی باسـە دەسـەڵاتدارانی حوکـم بـە دەسـت جوولەکـە شیوعیەکانیان زیاتر لـە شـیوعیە موسـڵمانو دیانـەکان عەزیـەت دەدا. ئەمـە لـە کاتێکدا کە جۆرە نەرمییەکیان لەگەڵ جوولەکە زایۆنیەکاندا دەنواند.

لێرەدا ڕووداوێکی سەیرم بـیر دێتـەوە، سـاڵی ١٩٥١ لـە بـەغدا قـەوماو پـەردەی لەسەر هەڵوێستی ڕاستەقینەی حوکمداران بەرانبەر بە زایۆنـیزم لـە عـیراقدا دەسـت پێکردو توانییان دیارترین کەسانی سەرکردایەتیی زایۆنی بگرن، لەوانە: (عــزرە)ی سەرۆکی ڕێکخسـتنی زایۆنـیو (رودنـی)و (صـالحون)ی جووتـە زایۆنـــی کـە لــە ئیسرائیلەوە نێردرا بوون بۆ بەشداریکردن لە سەرکردایەتی ڕێکخراوەکەدا. سـەرۆکی ڕێکخراوەکە لە یەکەمین ڕۆژانی گرتنندا بە دزیەوە بەرەڵلا کـرا. ڕەنگـە باڵیۆزخانـەی بەریتانیا ڕاستەوخۆ دەسـتیی خسـتبێتە ئـەم مەسـەلەیەوە، یـان بـەرتیلێکی زۆر بـە

هێندێك حوكمدار درابێ. لە باتی (عزرە)، جوولەكەیەكی بەغدایی (شلومو كرادی) ناو كە بیست ساڵ دەبوو شێت بوو لە زیندانێكی ئاسایشی گشتیدا بەند كرا. دادگا حوكمی بەندیی هەمیشەییی بەسەر ئەم شێتە داماوەدا داو، (عزرە)یش رۆیشت تا لە ئیسرائیل یا وڵاتێكی دیكە خەریكی چالاكیی خۆی بێ. دەسەڵاتدارانی سەردەمی پاشایەتی لە كاتێكدا بەم شێوەیە لەگەڵ سەركردەی رێكخراوە زایۆنیەكەدا جووڵانەوە، هەمان كات فەهدو (زكی بسیم )و (محمد حسین الشبیبی)ی رێبەرانی (حشع) یان لە ١٩٤٩ دا لە سێدارەدا. دەسەڵاتدارانی بەعسی حوكمداریش ساڵی ١٩٦٣ (سلام عادل)ی سەركردەی (حشع)و هەڵبژاردەیەكیان لە بەرپرسانو كادێرانی بە ئەشكەنجەدان كوشت، وەك چۆن زۆر لە كادێرانی حیزبیش لەم سەردەمەی دواییی حوكمی بەعسدا كوژران.

*　　*　　*

حیزبی شیوعی دەورێكی بەرچاوی لە جووڵانەوەی نیشتمانیو دیموكراتیی عیراقدا بینیو هەر خۆی تەوەری چالاكیی دیموكراتیی چەپڕەوانەو داینەمۆی خەباتی جەماوەری بوو. بۆیە نشوستیی حیزب لە ١٩٤٩ دا، نشوستی هێنانی هەموو جووڵانەوەی نیشتمانیی عیراقی بوو. ئەم راستییەیش جارێكی دیكە كەوتەوە روو كاتێك (كامل الجادرچی)ساڵی ١٩٤٩ بە بەهانەی لەبار نەبوونی هەلو مەرجەكە بۆ هەڵسووڕانی چالاكیی حیزبی نیشتمانیی دیموكراتی(الوطني الديمقراطي) تا كاتێكی دیكە رابگرێ. سەركردایەتیی حیزبی(الوطني الديمقراطي) لە ١٩٥٠ دا بڕیاری دەست پێكردنەوەی چالاكیی حیزبیی ئاساییی خۆیی دا. ئەمەیش پێوەندییەكی بەتینی بە سەركەوتنەكانی (حشع)ەوە لە بنیات نانەوەی خۆیو هاتنەوەیدا بۆ سەر شانۆی سیاسی هەبوو.

*　　*　　*

لەو رۆژە تووشانەدا کە بەسەر حیزبدا هاتن و، ئەو رۆژە کە یەکجار پێویستیمان بە کادێری حیزبیی پێشکەوتوو هەبوو، ساڵح حەیدەری دوور خراوەیەکی سیاسی بوو، حوکمی دوورخستنەوەی لە سامەڕڕا یا جێیەکی دیکە - بیرم ناکەوێتەوە - بەسەر دەبرد. داوامان لێکرد هەڵبێت و پێوەندیمان پێوە بکات بۆ هاوبەشی لە کاری حیزبیدا. بە هۆی ئەو قسانەوە کە پێشتر لە هێندێك هەڤاڵم بیستبوون لە بارەیەوە، بیرو ڕایەکی باشم بەرانبەری هەبوو. بەڵام نائومێدی کردم و، هەڵاتن و ژیانی خۆشاردنەوەی لە پێناوی کاری حیزبیدا رەتکردەوە.

* * *

رۆژێکیان نامەیەکی حیزبیم بۆ هات، باسی لە ئەورووپاوە هاتنی هەڤاڵێکی تێدا هاتبوو کە دەیویست چاوی بە بەرپرسێکی حیزبی بکەوێ. ژوانێکی چاوپێکەوتنی سەر جادەم بۆ نارد لە گەڕەکی (الشیخ معروف). دەرکەوت لاوێکی کەشخەیەو لە وتووێژ کردنیدا لەگەڵمدا، بە تایبەت لە یەکەم چاوپێکەوتندا، کەمێك ڕاڕا بوو. پێی گوتم: هەڤاڵە عیراقیەکانی فەرەنسە هێندێك دیاریی هاکەزاییان بۆ حیزب ناردووەو لە چاوپێکەوتنی داهاتوودا دەیانهێنم. پاش دوو رۆژ لە ژوانی دووەم چاوپێکەوتندا زمانی بەر بووو، کەوتە قسەو گوتی: هەڤاڵە عیراقیەکان لە پاریس نشوستیەکەی حیزبیان بیستووە، لەو باوەڕەدا بوون زەبرەکە توندو کوشندە بوو بیو چیتر ناوەندێکی سەرکردایەتیی حیزب لە نێو عیراقدا نەبێ. پێشیان وایە جێی گونجاو بۆ ئەم چەشنە ناوەندە پاریس یا هەر وڵاتێکی دیکەی ئەورووپایە. بەڵام هەر کە بڵاوکراوەی حیزبیی ئێمەیان بەرچاو کەوت، دەستبەجێ وازیان لەم بیرە هێناو بە هەڵەیان دانا. درێژەی پێدا:

- سڵاوی گەرم و برە پارەیەکی کەمی ٧٥ دیناریم لەگەڵ تایپڕایتەرێکی عەرەبیدا لەو هەڤاڵانەوە بۆ هێناون.

- سڵاوو ڕێزمان بۆ هەڤاڵانی ئەوێ.

ـ دەمەوێ ئەوەیش بڵێم: کە من لە یەکەم چاوپێکەوتنی تۆدا سڵم کردەوەو دوو دڵ بووم. دەترسام بە تەڵەوە بوو بم. بەڵام کاتێك بۆم دەرکەوت تۆ کرێکاری، لە ناخەوە گەلێك شادمان بووم‌و بە باری سەرنجێکی باشەوەیش دەگەڕێمەوە بۆ پاریس.

دوایی زانیم ئەو لاوە (صفاء الحافظ)ی قوتابیی عیراقی بوو لە زانکۆیەکی فەرەنسە.

جاروبار لەگەڵ (حمدی أیوب العانی)ی قوتابیی کۆلیجی ئادابدا بەیەك دەگەیشتین، ئەگەر چی من بەرپرسی حیزبیی ئەویش نەبووم. ناوبراو بەرپرسی حیزبیی رێکخستنە حیزبییەکانی خوێندکاران بوو لە کۆلێج‌و ئامۆژگاکانی پێتەختدا. کوڕی خێزانێکی هەژارو لاوێکی گورج‌و گۆڵی زیرەك بوو، هەر لە یەکەم هەنگاوماندا بۆ بنیاتنانەوەی رێکخستنی حیزبی لە بەغدا ـ خۆیی تەرخان کرد بۆ کێشەی خەباتی شۆڕشگێڕانە. دوای تێپەڕبوونی یەکەمین حەفتەکانی دەست پێکردنی ساڵی خوێندن‌و لە چاوپێکەوتنێکماندا گوتی: حیزب دەسەڵاتی فراوانی لە نێو قوتابیاندا هەیە. بەڵام مەحاڵە ئەم ژمارە زۆرە لە رێکخستنی حیزبیدا ببێتەوە. لە گەرمەی باس‌و خواسی نێوانماندا بیری دروستکردنەوەی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عیراق کە دوابە دوای سەرکەوتنی راپەڕینی کانوونی ۱۹٤۸ دامەزراو لە دەورانی هێرشی پۆلیسیی ساڵانی ۱۹٤۸ ـ ۱۹٤۹ دا بۆ سەر جووڵانەوەی جەماوەری سەرکوت کرا، هاتەوە ئاراو کاکڵە بوو. لیژنەیەکی سەرکردایەتی لە ماوەی چەند رۆژێکی پایزی ۱۹٥۰ دا بۆ رێکخستنی تازەی قوتابیان بە ناوی "لیژنەی باڵا" وە پێکهێندرا، هەموو ئەندامەکانی قوتابی بوون‌و یەکەم بەرپرسیشی (حمدی) خۆی بوو. ئەندامانی ئەم لیژنەیە بەبێ هیچ هەڵبژاردنێك دانران.

دەسەڵاتی یەکێتیی قوتابیان، سەرباری نهێنی بوونی، بە خێرایی پەلی هاویشت‌و، هێندەی پێ نەچوو لە نێو قوتابیانی کۆلێج‌و ئامۆژگاکان‌و، تەنانەت

قوتابیانی قۆناخی سانەوی‌و ناوەندیشدا تۆڕێکی بەرینی لە لیژنەکانی یەکێتی پێکهێنا. یەکێتیەکە بوو بە ڕێکخراوێکی جەماوەری‌و دیموکراتیی بە ڕاستی نا حیزبی، وەك سەرکردایەتیەکی جەماوەریی قوتابیان دانی پێدا نرا. شیوعیەکان سەرکردەی بوون‌و جەماوەری قوتابیانیش ئەم ڕاستیەیان دەزانی وپێی ڕازی بوون. وای لیٚ هات هێندێك کۆلێج‌و ئامۆژگا (وەك کۆلێجی ئاداب‌و خانەی بالاٚی مامۆستایان‌و کۆلێجی ماف‌و تد) کەم‌و زۆر هیی یەکێتی بوون‌و، ئیدی هەر کاتێك بیویستبایە دەیتوانی لە زۆربەی کۆلێجەکاندا مانگرتنی قوتابیان رابگەیێنیٚ.

نهێنی سەرکەوتنی یەکێتی لەوەدا بوو کە توانیبووی ئامانجە سەندیکایی - پیشەییەکانی قوتابیان لەگەلٚ داواکاریە نیشتمانیە گشتیەکانیاندا گریٚ بدات. یەکێتی (خەباتی قوتابیان - (کفاح الطلبة)ی ڕۆژنامەی نهێنیی خۆیی دەرکرد. هەروەها بە پێی پێویستی بارودۆخەکە بانگەوازو بەیاننامەی قوتابیانەو جاروبار نیشتمانیی گشتیی دەردەکرد. یەکێتی لەو سالاٚنەدا ڕێنوێن‌و سەرکردەی کەس لە عۆدەنە هاتووی مانگرتنەکانی قوتابیان بوو. قوتابیە بەرهەلٚستەکانیش هەر کەمینەیەکی بچووکیان لە ناوەندی قوتابیاندا پێکدەهێنا کە ڕێکخراو نەبوو نەیدەتوانی بچێتە ژێر باری هیچ ململانیٚیەکی شێلگیرانەی دژ بە یەکێتی.

جەماوەری قوتابیان، سەرەڕای ئەو مانگرتنانەی کە لە سالیٚ (١٩٥١)ەوە دەستیان پێکردو زۆر جار لە کۆلێج‌و ئامۆژگاکاندا دووپات کرانەوە، بۆ یەکەمین جار لە عیراقدا شێوازی پەناگرتن (الاعتصام) یان لە کۆلێجەکاندا داهێنا. کۆلێجی ئاداب کە لە (باب المعظم) بوو، مەلبەندی سەرەکیی پەناگرتن‌و سەرچاوەی نارەحەتکردنی دەسەلاٚتدارانی ڕەسمی بوو. پەناگران، ئەگەر پۆلیس توخنی بینای کۆلێج بکەوتبایە، بەرد بارانیان دەکردو بۆ چەند سەعاتێك درێژەیان بە هوڕای دژ بە ئیمپریالیزم‌و ڕژێمی نۆکەر دەدا.

* * *

له حوزەیرانی ١٩٤٩ وە تا ئایاری ١٩٥١ سەر قاڵی بنیاتنانەوەی حیزب بووین‌و نەخشەمان بۆ هیچ چالاکیەکی جەماوەریی وەك مانگرتن‌و خۆپیشاندان نەکێشا بوو. لە مانگرتنی دوا دواییەکانی ١٩٥٠ ی ٦٠٠ کرێکاری (کری مکنزی) (حەوزەکانی پاپۆڕ چاککردنەوە) لە بەسرەو، هێندێك وردە مانگرتنی کرێکارانی دەزگا نیوچە پیشەییەکان بەو لاوە شتێکی وا نەقەوما. (ناصر عبود)ی کرێکاری بەندەر دەورێکی دیاری لە رێبەریکردنی (کری مکنزی)دا بینی. جا کە توانیمان تا رادەیەك رێکخستنمان بنبەست بکەین‌و رۆژنامەو چاپکراوەکانمان بە رێکوپێکی دەربکەین‌و ژمارەیەکی زۆر لە کادێرانی لاو و دڵگەرم‌و سەر بە خەبات سپاردوو.. تد بخەینە کار، وامان بە باش زانی چەند دەستکارییەکی رێبازمان بکەین، تا بەرە بەرە پێ بنێینە قۆناخی خەباتی جەماوەری. یەکەم خۆپیشاندانیش کە بە بۆنەی جێژنی یەکی ئایاری (١٩٥١)ەوە کردمان، بچووك‌و کەم خایان بوو و نێزیکەی ١٥٠ خۆپیشاندەر بەشدارییان تێدا کردو تەنیا سێ لافیتەی تێدا هەڵگیراو بە نیوچە راکردنێکەوە چەند هەنگاوێك رۆیشتن تا خۆ لە گێچەڵی پۆلیس لا بدەن. (طالب عبدالجبار)ی لاوی شیوعیی زیتەڵەو زەحمەتکێش سەرکردایەتیی خۆپیشاندانەکەی کرد. ئەم خۆپیشاندانە یەکەم جۆری مەشق‌و یەکەم خۆپیشاندانی پاش نشوستیی ١٩٤٩ بوو. لە شەقامی (الشیخ عمر) کرا کە کرێکاران‌و زەحمەتکێشان لێی کۆدەبنەوەو، مەبەستە چاوەڕوانکراوەکەی هێنایە دی‌و بە بێ قوربانی بڵاوەی لێکرد.

دوای گیرانی (زکی وطبان) لە ئەیلوولی ١٩٤٩ داو رووخانی‌و، ئەمجا رووخانی (یحیی صالح)و، درکاندنی ناوی پاشماوەی رێکخستنی (بەسرە)مان لە لایەن هەردوکیانەوە، پێوەندیی حیزبیمان لەگەڵ بەسرەدا بۆ نێزیکەی ساڵێك پچڕا. نەماندەزانی لەوێ چی هەیەو نەماندەتوانی کارێکی شێلگیرانە بکەین بۆ بنیاتنانەوەی رێکخراوەکە. لە ناکاودا رێکخراوی حیزبیی ئەوێ پێوەندیی پێوەکردین. دەرکەوت (ناصر عبود)ی کرێکاری بەندەرو (علی شعبان)ی کرێکار

توانیبوویان سەر لە نویٚ ڕێکخراوەکە بنیات بنێنەوە. (ناصر) ماوەی زیندانیەکەیی کۆتایی پیٚ هێنابوو، گەڕا بوەوە بۆ کۆختەکەی لە بەسرە. یەکەم جار هەریەکەیان جیا بە جیا ئیشی کرد بوو، بە بیٚ ئەوەی هیچ یەکێکیان شتێك لەسەر ئەوی دیکەیان بزانیٚ. پاشان یەکتریان ناسیبوو دەمو دەست یەکیان گرتبوو، بە بیٚ ئەوەی کۆسپو ئالۆزی قووت بکەنەوە وەك بە زۆری هێندێك ڕۆشنبیر لەم چەشنە حاڵەتانەدا دەیکەن. (علی شعبان) پێی لەوە نابوو کە (ناصر)چوستو چالاکترەو پتر شایانی سەرکردایەتیە.

(ناصر) لەبەر ئەوەی کە لە کرێکارانی بەندەر بوو، پێوەندیی بە کرێکارانی (کری مکنزی)یەوە هەبوو. پایزی ١٩٥٠ چالاکانە بەشداریی لە ڕێنوێنیی مانگرتنەکەیاندا کرد. ڕێکخراوی بەسرەیش بەش بە خۆی، وەك مەشقێکی خەباتگێڕانەو وەك ڕێگەیەك بۆ فراوانکردنی پێوەندی لەگەڵ کرێکاراندا، کەڵکی لەم مانگرتنە بینی.

جووڵانەوەی سەندیکایی بە بووژانەوەی بارودۆخی (حشع) کەمێك بووژانەوەی بە تایبەت لە بەغدادا تێکەوت. سەرەتا کەوتینە بنیاتنانەوەی ئەو سەندیکایانەی کە پێشتر دەسەڵاتداران مۆڵەتی یاساییان لیٚ نەکێشابوونەوە، وەك سەندیکای کرێکارانی چنینو سەندیکاکانی میکانیكو چاپخانەو دارتاشیو تد. دەسەڵاتدارانیش نەختێك نەرمییان بەرانبەر بە چالاکیی سەندیکایی لە سەندیکاکانی تایبەت بە کرێکارانی سەنعاتکارو نیوچە سەنعاتکار لە کەرتی خۆماڵی (ئەهلی‌دا) پیشان دەدا. لە هەمان کاتدا بە توندیو سەرسەختانە بەرەنگاری هەر چالاکیەکی سەندیکاییی نێو دەزگا پیشەسازیە گەورە حکوومەتیو بیانیەکان وەك سکەی شەمەندەفەر (السكك)و نەوتو بەندەر دەبوونەوە. ئەو ئینگلیزانەی کە لەوڵاتی خۆیاندا دانیان بە مافی ڕێکخستنو چالاکیی سەندیکاییی کرێکاراندا نابوو، بە توندیو سەختگیرانەو بە پەنا بردنە بەر ئاگرو

ئاسن دەجوولانەوە بۆ تێشکاندنی هەر چالاکیەکی سەندیکایی کە لەم ولاتەو لە دەزگاکانی سەر بە خۆیان سەریان هەڵدەدا.

ژمارەیەکی زۆر کادێری لاو و گورجی حیزبی ـ سەندیکایی لە جەرگەی چالاکیی سەندیکاییدا دەرکەوتن. بۆ یەکەم جاریش لە عیراقدا یەکێتیی سەندیکاکانی کرێکاران بە دەست پێشخەریی ئەوانە بە ناوی "نووسینگەی هەمیشەییی سەندیکاکانی کرێکاران "ەوە دامەزراو هەموو ئەندامەکانی شیوعی بوون. ئەم نووسینگەیە چالاکیەکی سەندیکاییی بەربلاوی کرد بۆ داکۆکیکردن لە مافی کرێکاران‌و پەرەپێدانی گیانی هاوکاریی چینایەتی لە ریزەکانیانداو پشتگیریکردنی خەبات‌و مانگرتنەکانیان لەم یان لەو کەرتدا. چالاکیی ئەم نووسینگەیە بوو بە هۆی بێ ئەندازە هەراسانکردنی رژێمی حوکمدار کە تۆمەتی ساختەی بۆ سەرکردەکانی هەڵبەست‌و لە ١٩٥٢ دا دانی بە دادگا. دادگاییکردنەکە گۆڕا بە تێکۆشانێکی فراوانی دژ بە ئیمپریالیزم‌و نۆکەرە ناوچەییەکانیان‌و بۆ ریسوا کردنی ئاکارە چەپەڵەکانیان. لەگەڵ ئەوەدا حوکمی زیندان بۆ ماوەی جیاجیا درا بەسەر رێبەرانی (یەکێتی)داو هیی هێندێکیان گەیشتە چوار ساڵ.

ئەو سەردەمە کەرتی سەرەکی لە پیشەسازیی خۆماڵیی عیراقدا چنین‌و جگەرە بوو. (حشع)دەسەلاتێکی تەواوی لە هەردوکیاندا، هەم لە سەندیکاکانیان‌و هەم لە نێو کرێکارانیاندا، هەبوو. مانگرتنی کرێکارانە زیاد لە هەر کەرتێکی دیکە لەم دوو کەرتەدا دووپات دەبوونەوەو، شیوعیی کارامەی وەك (صادق الفلاحی)و (هادی صالح)و (جاسم یحیی)و (حیدر حاتم)و (عبدوللا)و (زامل)ی جووتە برای‌و (طه حسین)و هیی دیکەشیان تێدا دەرکەوتن.

* * *

لە ١٩٥١ دا (عزیز الشیخ)مان بە رێگەی قاچاخدا نارده سووریا تا پێوەندی بە سەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی سووریاوە بکات‌و، هەوڵی رێکخستنی سەفەرێك

بدات بۆ فیستیڤاڵی لاوانو قوتابییانی جیهان لە بەرلین. کە من لە ناوەندی سەرکردایەتیی حیزبدا بووم، ئەوە یەکەم پێوەندیکردنمان بوو بە لایەنێکی دیکەی شیوعیی دەرەوەی عیراقەوە. لە ڕێگەی (عزیز الشیخ)ەوە داوای هێنانەوەی (عبدالقادر اسماعیل)مان کرد بۆ لامان. ناوبراو ئەندامی لیژنەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی سووریا بوو. کە (عزیز الشیخ)هاتەوە لامان گوتی: (خالد بکداش) پشتگیریی داواکەی کردو ئامۆژگاریی (عبدالقادر)ی کرد تا بگەڕێتەوە. بەڵام ئەو عوزرخوایی بۆ هێنایەوە کە ناتوانێ داواکە بەجێ بهێنێو رازی نەبوو بگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی گوایە گەڕانەوە دووچاری لە سێدارەدانی دەکات. (خالد بکداش) پێی گوتووە:

- تەنانەت ئەگەر لە سێدارەیش بدرێیت، تۆ لە فەهد بەنرختر نیت کە ڕژێمی پاشایەتی لە قەنارەی دا. پێم وابێ (عبدالقادر) بەم بەهانەیە یا لەبەر ئەم هەڵوێستەی لەوێ سزا درا. تا پاش شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ کە ڕژێمی پاشایەتیی بەکرێگیراوی خست، نەگەڕایەوە بۆ عیراق. (عزیز الشیخ) چووە بەرلینو سەرۆکایەتیی وەفدی لاوانی عیراقی کرد بۆ فیستیڤاڵ. ئەو تاکە کەسێکیان بوو لە نێو وڵاتەوە هاتبێ. هەروەها یەکەم هاوبەشیی ئەم چەشنە فیستیڤاڵانەی شیوعییەك بوو کە ڕاستەوخۆ لە عێراقەوە چوو بوو.

پێش ئەوەی عەزیز لە هەندەران بگەڕێتەوە لە بەغدا بڵاوکراوەیەکمان دەرکرد، وەکوو ڕاگەیاندنی سەرەتاییی پێکهێنانی یەکێتیی لاوانی دیموکراتی عێراق وەها بوو. حیزب بڕیاری دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوەی دابوو. بەڵام لە ڕووی هەڵسووڕانی کاروبارەوە، وێڕای ئەوەی کە هەموان دەیانزانی سەر بە (حشع)ـە، بوو بە ڕێکخراوێکی دیموکراتیی ناحیزبیو جەماوەرێکی بێ ئەژماری لاوانی تێوە ڕاپەڕیناڵا. ئەوە بوو لیژنەیەکی سەرکردایەتی بە ناوی "لیژنەی باڵای یەکێتیی لاوانی دیموکراتی عیراق"ـەوە لە چەند لاوێکی شیوعی کە خۆمان بە بێ کۆنگرە

بەستن یا هەڵبژاردن دامانان، پێکهێنرا. ئەوسا - ئەگەر بیرم بە هەڵەیدا نەبردبێ - (عزیز الشیخو عبدالجبار و وهبیو محمد صالح العبللیو پاشتر دللی مریوشو نزیهە الدلیمی )لە لیژنەی باڵادا بوون. دەزگای چاپکردنی تایبەت بە ڕێکخراوە دیموکراتیەکان - قوتابییانو لاوانو پێوەندیی ئافرەت - مان دامەزراند. (دلّی مریوش) کە لە (ناسریە)وە هاتبوو بۆ بەغدا، دەست نیشان کرا بۆ سەرپەرشتی ئەم دەزگایە.

*　　*　　*

کە لە (کمب الصلیخ) بووین، (دایکی عەدنان) بە مردنی مانگا دۆشەنیەکەی کارەساتێکی بچووکی بەسەردا هات. مێردەکەی لە بریی رۆژانە کڕینی وێنجە، پارچە زەویەکی پڕ وێنجەی لە نێزیك ماڵەوە بە ئیجار گرتبوو. رۆژێکیان مانگاکەی تێدا بەرەڵلاّ کرد بوو تا بە دڵی خۆی بلەوەڕێت. تا رادەی ئینتیلا یا خۆکوشتن خوارد بووی. ئەم کارەساتە بەگران بەسەر دایکی عەدناندا شکایەوە، چونکە کاتێك مێردەکەی لە بەندیخانە بوو قەدری مانگاکەیی دەزانیو سەرچاوەیەکی بەخێو کردنی خێزانەکەی بوو. بەڵام کارێکی گەورەتری کرد بوە سەر (شحاذة)ی برای کە لە لادێوە هاتبوو. کە دایکی عەدنان مانگاکەیی لە دەست دا، (شحاذة) لە دڵدانەوەی خوشکەکەیدا گوتی:

- خۆزگە مردوەکە، لە باتیی ئەم مانگایە، یەکێك لە کوڕەکان بووایە.

هادی بە قسە رەقیە عادەتیەکەی خۆی وەڵامی دایەوە: بێ دەنگ بە کەرە !

ئەو ساڵانەی کە لەگەڵ ئەم خێزانەدا بووم، ئەوە دوا دیداری دایکی عەدنانو مانگا بوو. دوایی کەیبانووی ماڵ بزنێکی دۆشەنیی بیانیی لە جیاتیی مانگاکەی کڕی.

*　　*　　*

(عطشان ضيول)، (نعمه)ی برایی بۆ ئەندامەتیی حیزب پاڵاوتبوو و، کەوتبوە ڕۆشنبیر کردنیو وردە کاروباری پێ دەسپارد. (نعمة) ئەگەر چی جێو خواردنی لە ماڵی خۆیاندا بۆ دابین کرا بوون، لاوێکی بێ کاری گیرفان بەتاڵبوو. ناوبراو بەبێ ئەوەی (عطشان) ئاگای لە هیچ کەینو بەینێکی بێ، خۆیی بە ڕژیم فرۆشتبوو و بوو بووە نۆکەری ئاسایشی گشتی.بەڵام ڕێکەوتێکی خۆش پەردەی لە ڕوو هەڵماڵی. (کامل السامرائي)ی لاوی شیوعیی ئەندامی لیژنەی بەغدا لە ژوورێکی ئاسایشی گشتیدا بەند کرابوو. کامل درەنگانێك دوای نیوە شەو گوێی لە ژاوە ژاوی دەرەوەی ژوورەکەی بوو بوو و، لە پەنجەرەکە نێزیك بوو بووەوە تا بزانێ چ باسە.بۆی دەرکەوتبوو سەرخۆشێك لە تیاترۆخانەیەکی شەوانەدا بێ ڕەوشتیی نواند بوو و دەست درێژیی کرد بوو. دوو پۆلیس هێنا بوویانە ئەم دائیرەیە، چونکە لە ڕێگە پێی گوتبوون گوایە مووچە خۆرێکی ئاسایشی گشتییە. پۆلیسەکانیش هێنا بوویان تا بزانن ڕاست دەکات یان نا. جا کە ئەفسەری ئێشکگر لە دائیرەی ئاسایشی گشتی پرسیاری ناسنامەکەیی لێ کردبوو، وەڵامی دابوەوە:

- دەتوانی تەلەفۆن بۆ (نایل عیسی ) بکەی‌و، پێی بڵێی ژمارەی نهێنیم ئەوەندەو ئەوەندەیە.

ئەفسەرەکە هاتبوەوە بۆ ژوورەکەیو تەلەفۆنی بۆ (نایل) ی دووەم بەرپرسی ئاسایشی گشتی کردبوو. ئەنجا هاتبوە دەرێو فەرمانی بە پۆلیسەکان دابوو، کابرا لە دائیرە بەجێ بهێڵنو بگەڕێننەوە بۆ جێی خۆیانو بۆ دڵنیاییش پێی گوتبوون: چیی گوتووە ڕاستە. کامل بە تەواوی گوێی لەم حیکایەتە بوو بوو، زانیبووی دەنگەکە دەنگی (نعمە)یە کە زۆرجار لە ماڵی خۆیان دیویە. جا بۆ ئەوەی هەواڵەکە بە زووترین کات بگەیەنێتە حیزب، بەیانیی ڕۆژی دوایی خۆیی نەخۆش خستبوو، تا - بەقسەی خۆی - " بەر لەوەی بمرێ یا شێت ببێ ". چیی ویست بۆی هاتە دی. چیی بیستبوو و دیبوو بە دایکی گوت تا ئەویش پێ بە پێو بە پەلە حیزب تێ بگەیێنێ.

من بەو سیفەتە کە یەکەم بەرپرسی حیزب بووم، بڕیارم دا دەستبەجێ (نعمە) لە حیزب دەربکرێت‌و وەك نۆکەرێکی ئاسایشی گشتی ئابڕووی ببرێت. خێزانەکەی نەفرەتیان لێ کرد، بە دایکە پیرەکەیشیەوە کە ئەوی بە مایەی شوورەییەکی گەورە داناو بە ڕیسوایی‌و سووکایەتی پێکردنەوە لە ماڵ دەری دەکردو پێی گوت:

- بڕۆ دەرێ لەم ماڵە. ناهێڵم جارێکی دیکە پێ بنێیتەوە ناوی‌و ئەرزەکەی پیس بکەی. لەمڕۆ بە دواوە کوڕی من نیت.

دەیانگوت: (نعمە) لەوە بەدوا بەسەر گەردانی ژیاو تەمەنی زۆر درێژ نەبوو.

هەر ئەو ماوەیە دەستی خەفیەیەکی دیکەی نێو حیزب بەناوی - ئەگەر بیرم بە هەڵەیدا نەبردبم - (طه محمود)ەوە کەوتە روو. چۆنێتی ئاشکرابوونەکەی ئەوەی پێشان دا کە هەم ڕژێمی حوکم بەدەست تا چ ڕادەیەك تەریکی چنگی ناوەتە بینی‌و، هەم خەڵك چەندە رق‌و بێزارییان بەرانبەر بە خۆی‌و دەزگا سەرکوتکەرەکانی قووڵ بووەتەوە. تەها دارتاشێکی بێکارو ئەندامێکی سادەی حیزب بوو، هەمیشە بۆ درهەمێك دامابوو. زۆر جار داوای پارەی لە خاڵۆزایەکی خۆی دەرکرد (ناوەکەیم بیرناکەوێتەوە) کە ئەندامی حیزبێکی نەتەوەیی بێ هێزو دابڕاو بوو. کاتی خۆی (سامی شوکت)ی خاوەن خولیای نازیگەری دایمەزراند بووو حیزبی ریفۆرم (حزب الاصلاح) یان پێ دەگوت. خاڵۆزاکەی کتوپڕ سەرنجی دابوو تەها ئەو نابووتەی جاران نییە، پارەی هەیەو هاتوچووی سینەماو چێشتخانەکان دەکات‌و، تەنانەت پارە بۆ برادەرەکانیشی خەرج دەکات، لە کاتێکدا هێشتا بێ کار بووو سەرچاوەیەکی پێ زاندراوی وای نەبوو پارەی لێ چنگ بکەوێ. ئەوە وای لێکرد خانە گومان بێ‌و تاقیبی مەسەلەکە بکات. کەوتە سۆراخ‌و لێکۆڵینەوە لەگەڵ تەهادا، تا دانی بەوەدانا کە لەبەر هەژاری‌و برسێتی خۆیی بە ئاسایشی گشتی فرۆشتووەو ئێستاکە دەرهەق بە خزمەتەکانی مووچەیەکی باشیان لێ وەردەگرێ. هەروەها

گوتبووی: لەبەر ئەوە ئەم نهێنییە لای خاڵۆزاکەم دەدرکێنم، چونکە بڕوام بەوە هەیە بە هیچ کەسێکی ناڵێت.

ئەگەر چی خاڵۆزاکەی لە ڕێکخستنێکی نەتەوەییی دژ بە کۆمۆنیزمدا بوو، کەچی لەم گوناحەی تەها خۆش نەبووو ڕازی نەبوو بۆی بپۆشێ. بگرە بڕیاری دا بە هەر نرخێك بووە هەواڵەکە بە (حشع)بگەیێنێ. ئیتر بە درێژاییی حەفتەیەکی تەواو هەوڵی پەیداکردنی یەکێکی بڕوا پێکراوی دابوو، تا نامەیەك بگەیێنێتە (حشع). سەرەنجام ئەو کەسەی دەست کەوتبوو. خۆم نامەیەکم خوێندەوە کە ئاوا دەستی پێکردووە: ناوبراو ئەندامێکی (حزب الاصلاح)ەو لە ڕۆژنامەکەیدا کاردەکاتو هاوسۆزی کۆمۆنیزم نییە. بەڵام قایل نییە هیچ هاوڵاتیەکی بەشەرەف بچێتە ڕیزی پۆلیسی نهێنیی دژ بە گەل. بۆیە بڕیاری داوە هەواڵی پێوەند بە خاڵۆزاکەی بگەیەنێتە حشع تا وریا بێو خۆیی لێ بپارێزێ.

ئێمەیش هەر ئەوەندە تەهامان لە حیزب دەرکردو وەك سیخوڕێك ئابڕوویمان برد، بیرمان لەوە نەکردەوە هیچ کارێکی دیکەی بەرانبەر بکەین. ئەمە کردەوەی ئاساییمان بوو دەرهەق بە کسانی وەك تەهاو (نعمە). لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا کەوا ڕێکەوت یەکەمین بەرپرسی (حشع)بم، لەوە بەدەر کە ئاماژەم بۆ کرد، حیزب هیچ ڕووداوێکی پێزاندراوی شاردنەوەی نا پاکانی لێ ڕوونەدا. ئێمە، بە هۆی هەڵسو کەوتی جێی گومانو ڕاپۆرتی ئەمو ئەوەوە، لە یەکتر دەکەوتینە شکەوە. بۆ نموونە، (عطشان) نامەیەکی خستە بەردەست کە تێیدا گومانی لە (شنور عودە) کردبوو. (شنور) کادیرێکی لێوەشاوە بوو. بەڵام ئێمە مەسەلەکەمان دوایی پێ هێنا، بەڵکوو بۆ دڵنیا بوون لە بێ تاوانی یا ساخکردنەوەی تاوانباریی (شنور) بەوردی لێی کۆڵاینەوە. بەڵگەیەکی وامان دەستگیر نەبوو پاساوی هیچ سزادانێکی حیزبیی ئەو بدەنەوە.

منیش پێبەپێ بیرم لەوە کردەوە چەند هەڤاڵێك لە نێو ڕیزەکانی ئاسایشی گشتیدا بشارینەوە، بۆ ئەوەی هێندێك زانیاریی بە سوودمان بۆ بدزن، یا چەند

زانیاریەکی هەڵەو شێواو بە دوژمن بگەیێنن. بەلاّم چەند ئاستەنگێکی سەرەکی دەهاتنە ڕێمان. هەرگیز ئاسان نەبوو قەناعەت بە هەڤاڵێکی حیزبیی باش بکەی تا ئیش لەو دەزگایەدا بکات، لەبەر ترسان لە ناو زڕانو دڵە ڕاوکەی دەروونیی لەوە بە دوا. خۆم لە بەغدا هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ کادیرێکی ناوەنجیی (صالح سطام) ناودادا، تا ڕازیی بکەم بچێتە ڕیزی پۆلیسی نهێنییەوە، ئامانجی ئەوەم بۆ لێکدایەوە. نەك هەر داواکەی ڕەتکردینەوە، بەڵکوو ناڕەزاییەکی توندی لە دژی ئەم داوایە دەربڕی کە ـ بە قسەی ئەو ـ سووکایەتی بە کەرامەتیو دەست درێژیی بۆ سەر شەرەفی خەباتگێڕانەی ئەوی تێدا بوو. ئەوەیش وای لیّ دەکرد بیر لە سوودی ئەنجامدانی کاری حیزبی بکاتەوە لەگەڵماندا.

ئێمە بەم یان بەو ڕێگەیە خەڵکانێکمان لە نێو ئاسایشی گشتیدا پەیدا دەکردو ئامادەبوون هاوکاریمان لە تەکدا بکەن. بەلاّم زەلامی وایش هەبوون تێوەگلاوو مووچەخۆری ئاسایشی گشتی بوون یا لە پۆلیسی ئاساییەوە کرابوونە پۆلیسی نهێنی، ئەمانە بە هۆی هێندێك خزمو برادەری جێی متمانەیانەوە پێوەندییان پێمانەوە هەبوو و هەر زانیاریەکیان لە بەردەستدا بووایە دەیانگەیاندە ئێمە. لاوێکی (عانە)یی (حسن شرهان) ناو کە خۆیی بە شیوعی دادەنا، هەرە چالاکترینی ئەوانە بوو ؛ ڕۆژانە چ زانیاریەکی چنگ بکەوتبایە دەیدا بە ئێمە. دواتر دەسەلاّتداران ئاینو ئۆینەکەییان بۆ ئاشکرا بووو حوکمی زیندانکردنیان بەسەردا دا. (ڕژێمی پاشایەتی هەر ئەوانەی زیندان دەکردو بەس. ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێکی بە تاوانی پێوەندیکردن بە حیزبێکی بەرهەڵستەوە، یا زانیاری بردن بۆ لایەنێکی دیکە نەدەکوشت ؛ بە پێچەوانەی ڕژێمی بەعسەوە کە سەدان یا هەزارانی بە تاوانی لەم چەشنە کوشتووە). ناوبراو لە نێو زیندانیە شیوعیەکاندا وەك یەکێك لەوان ژیاو، تەنانەت پاش لە بەندیخانە دەرچوونیشی هەر دڵسۆزی بیری خۆی بوو.

* * *

ئێمە لە سایەی حوکمی پاشایەتیدا دادو بێدادمان بوو بە دەست گرتنی ملهوڕانەو پێشێلکردنی یاساو بێ بەشکردنی گیراوەکان لە مافی داکۆکی لە خۆکردنو بێ بەشکردنی زیندانیە سیاسیەکانیش لە مافی یاساییانو ڕێنەدان بە هێنانە ژوورەوەی کتێبو ڕۆژنامەو رادیۆ بۆیانو.. تد. هەقمان بوو سکاڵا بکەین، چونکە یاسا کۆمۆنیزمی وەك بیروباوەڕو جووڵانەوەیەکی سیاسی قەدەغە کرد بوو. دەسەڵاتداران جووڵانەوەی دیموکراتییان بە بزاڤی لایەنگرانی ئاشتیشەوە وەك بەشێکی جووڵانەوەی کۆمۆنیستی خستبوە ژێر باری گرانی یاساوە. دەزگا سەرکوتکەرانیش ئەشکەنجەی دەروونیو جەستەیی گیراوە سیاسیەکانیان دەدا، بۆ ئەوەی هەڵیان بپێچن دان بەنهێنیە حیزبیەکانیاندا بنێن. ئیدارەی عورفی لە زۆربەی کاتەکاندا بە بێ هیچ پاساوێکی راستەقینە هەبوو. دادگا عەسکەریەکانیش بە بێ لێووردبوونەوە یا لەبەر چاوگرتنی یاسا حوکمی قەرەقۆشییان بەسەر تۆمەت وەپاڵ نراواندا دەدا. نموونەی بەرچاویش بۆ پەردە هەڵماڵین لە رووی ئەوە، ئەو حوکمە بوو کە سەرۆکی دادگایەك لە ساڵی ١٩٤٩ دا دەری کرد. (النعساني) ئەرکی خوێندنەوەی ناوی تاوانبارانی کە لە قەفەزی تاوانبار کردنی بەردەمیدا ریز بوو بوون نەخستبوە بەر خۆی، بەڵکوو بە شێوەیەکی جووتیارانەی گاڵتە ئامیز حسێبی کرد بوو.

- لە (أبو السترة) وە تا (أبو الضراوية) دوو ساڵ زیندانیو، لەوە بەولاوەیش چوار ساڵ.

ئاوا کۆمەڵێکی زۆر لە تۆمەتبار کراوان بە خۆپیشاندان چوونە زیندان. (کاتبی) دادگایش ناچار بوو خۆی ناوی دوو ساڵ حوکمدراوەکان لە هیی چوار ساڵەکان جوێ بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا بە پێویستی دەزانم ملهوڕیو زۆرداریی ئەو سەردەمە لەگەڵ هیی ساڵی ١٩٦٣و ئەمجا ساڵانی ١٩٦٨ - ١٩٩١ ی رژێمی بەعسدا بەراورد بکەم. تاوانبار لە سەردەمی پاشایەتیدا، ئەو کاتانە نەبێ کە ئیدارەی عورفیی تێدا

رادەگەیێندرا، لە دادگایەکی مەدەنیدا دادگایی دەکرا. دەیتوانی پارێزەرێك بۆ خۆی بگرێ، یا لیژنەی هاوکاریی دادپەروەریی لای سەندیکای پارێزەرانی بۆ رابگیرێ‌و، ئەو حوکمە تەمیز بکاتەوە کە بۆی دەرچووەو، لەگەڵ هاورێکانیدا لە زیندانێك یا تاراوگە (منفى)یەکدا بژیو، مانگی جارێك پێشوازیی خێزانەکەی بکات‌و، لە کاتی نەخۆش کەوتنیدا داوای پزیشك بکات یا بۆ نەخۆشخانەیەك بگوێزرێتەوە.. تد.

عیراق بە درێژاییی سالآنی سەردەمی پاشایەتی هەشت حاڵەتی لە سێدارەدانی هاووڵاتیان بە تۆمەتی کۆمۆنیزم زیاتری بە خۆوە نەدیوە.

بەڵام هەموان دەزانن لە سالآنی سەردەمی بەعسدا چ تیرۆرێکی خوێناوی‌و چ قسابخانەیەك بۆ بەرهەڵستانی رژێم‌و کەسانێك کە گومان لە ملکەچییان بۆ صدام دەکراو، تەنانەت بۆ بەعسیەکان‌و لایەنگرانی رژێمیش دادەنراو ئێستایش دادەنرێت. ئەگەر جەماوەری عیراق بیانزانیبایە رژێمی پاشایەتیی دەڕووخێ‌و، رژێمی خوێناوی‌و فاشی‌و رەگەزپەرستی بەعس کە مێژوو تا ئێستا ـ لە رووی هەرچی‌و پەرچێتی‌و حەز بە کوشت‌و بڕ کردنیەوە ـ شتی وای بە خۆوە نەدیوە جێی دەگرێتەوە، ئەوا عیراقیەکان بەرگریان لە پاشاو (نوری السعید)دەکرد ، وەك بەرگری لە شتێکی ئازیزی خۆیان بکەن.

سەندیکای پارێزەران سالآنی حوکمی پاشایەتی لە ژێر دەستی بەرهەڵستانی رژێمدا بوو و، بە پێی تین‌و توان لایەنگریی لە رۆڵە ئازاردراوەکانی وڵات دەکرد. "لیژنەی پشتگیری دادوەری"، بە دەست پێشخەریی پارێزەرە شیوعیەکان‌و پێشکەوتخوازەکان، لە لایەن سەندیکاوە پێکهات‌و ئەرکێکی پڕ سەروەریی خستە سەرشانی خۆی: واتە داکۆکیکردنی خۆبەخشانەو بە خۆڕایی لە سەرجەم گیراوە شیوعی‌و نیشتمانیەکان لەبەردەم پۆلیس‌و دادگادا. ژمارەیەکی زۆریش لە پارێزەران ئامادە بوون بەشداریی راپەڕاندنی ئەم ئەرکە مرۆدۆستیە جوامێرانەیە بکەن، لەوانە: (عامر عبداللەو توفیق منیرو عبدالوهاب القیسی‌و خالد عیسی طە و نافع

سعیدو رزوق تلوو عبدالستار ناجیو هیـی تـر). دەسـەلأتداران ئـەوەیان لیٚ قبـوولٚ دەکـردن، ئەگـەر چـی نـاو جـەرگی ئـاو دەدان. بۆیـە پۆلیسـخانەکان دەرگایـان بـۆ دەخستنە سەر پشت تا چاویان بەو گیراوانە بکەوێ کە ئەوانیان کـرد بـوو بـەوەکیلی خۆیـان. دادگاکـانیش بواریـان دەدان ئامـادە بـن. ئـەوانیش بـە زارو بـە نووسـین بەرگرییان دەکردو پەردەیان لەسەر دەستدرێژیو پێشێلکردنی مافەکانیان لادەدا.

* * *

سالّی ١٩٥١ یەکەم خـولی خوێندنـی حیزبیمـان کـردەوە. دیـارە بـە نـهێنی بـوو. ژمارەیـەك شـیوعی چالاکمـان بـۆ مـاوەی سـی ڕۆژ یـا زیـاتر لـە یـەکێك لـە مالّـە حیزبیيەکانماندا کۆکردەوە، تا چەند موحازەرەیەکیان لە بـارەی ئـابووریی سیاسـیو مێژووی حیزبی شیوعی سۆڤیتیو کێشەکانی کاری حیزبی ـ جەماوەرییەوە پێـی بلّێن. سەرچاوە سەرەکیەکانی ڕۆشنبیر کردنیش مێژووی حیزبی شیوعی لە یەکێتیی سـۆڤیتو کتێبـی " بنچینـەکانی لینینـیزم " ی سـتالینو بەرهەمـەکانی فـەهد "پێداویستەکانی خەباتمان "و " حـیزبێکی شـیوعی، نـەك سۆشـیال دیموکـرات "و هیی دیکە بوون. ژمـارەی بەشـدارانی خولەکـە دیـاریکراو بـوو. دەبـوو تـا خولەکـە کۆتاییی دێت لەبەر خۆپاراستن لە مالّەکەدا بمێننەوەو تێیدا بخۆنو بخەونو نەدەهێلّرا بچنە دەرێ. یەکەمین گرفتی ڕاستەقینەمـان نەبوونی موحازیری بە توانا بوو بـۆ ئـەم خولانە. بەلاّم نزمیی ئاستی ڕۆشنبیریی گوێگرەکان، نزمیی ئاستی موحازیرەکـانی پووش بەسەر دەکرد. جار نا جارێك خۆم یەکێك بووم لە موحازیرەکان. ئەوی ڕاسـتی بێ، ئەگەر سـەرپاکی شـیوعیەکانی ولاّت ئاسـتێکی نزمیـان نەبوایـە، نـەمدەتوانی ئـەوە بکـەم. (شـریف الشـیخ) ی پـارێزەر کـە لـە ١٩٤٧ یـا ١٩٤٨ دا هاتـە ڕیـزی حیزبەوەو دوای نشوستیی ١٩٤٩ شـوێنە ون بـوو، موحازیرێکیـان بـووو، بگـرە لـە ماوەیەکی دیاریکراودا بوو بە موحازیری سەرەکیمان. بەلاّم پاش ئـەوەی کـەیبانووی مالّی تەرخانکراو بۆ خولەکە سکالاّی کرد کە ناوبراو یەخەی پێدەگرێ. ناچار بووین لەم ئیشەی دوور بخەینەوە.

* * *

ڕۆژێکیان نامەیەکی داخراوم کردەوە بۆ ناوەندی سەرکردایەتی نێردرابوو. کە خوێندمەوە ناوەڕۆکەکەیم پێ سەیر بوو. بۆ یەك خاڵ تەرخان کرا بوو: (عبدالقادر العیاش ) ی نامە نووس کە کرێکاریکی شیوعیی چالاك بوو، دانی بەوەدا نابوو کە لە دووکانی برادەرێك کاری جنسیی لەگەڵ کچێکدا کردووە. نووسیبووی: ئەم لەوێ لای برادەرەکەی دانیشتبوو، کچێکی لەشفرۆش هاتووەو. برادەرەکەی ئیشی جنسیی لەگەڵدا کردووەو ئەمیشی لە خشتە بردووە تا چاو لەو بکاتو سواری ببێ. گوتبووی: پەشێمانە لەم کردەوەیەو پێچەوانەی ئەو ڕەوشتی شیوعیانەو دابو نەریتی کۆمەڵایەتیەیە کە ئەم گفتی دابوو ب ئەمەك بێ بۆیان. بۆیە بڕیاری دابوو ئەم نامەیە بنێرێ بۆ حیزب، تا ڕاستیی لەبەردەمدا بخاتە ڕووو لەسەر ئەو تێوە گلانەی ڕەخنە لە خۆی بگرێ. کە بەڕاشکاوی ئەمەی بە حیزب گوتووە، ئامادەیە خۆ لە ژێر باری هەر سزایەکی حیزبیدا ڕابگرێ.

بە نامەیەکی داخراو وەڵامم دایەوەو تێیدا گوتم: ئێمە ڕەخنە لەو کردەوەیەی دەگرینو بە کاڵای پڕ بە باڵای ئاکاری خەباتگێڕێکی شیوعیی نازانین. بەڵام ڕێز لە ڕاشکاویی شیوعیانەو ڕەخنە لە خۆ گرتنی بەجەرگانەی دەنێین. مادامێکیش خۆی کردەوەی خۆیی ئاشکرا کردووە، سزای نادەین. بەڵام داوا دەکەین پەندی لێ وەربگرێو دووپاتی نەکاتەوە.

ڕۆژێکیان نامەیەکی لەم چەشنەم لە کادیرێکی حیزبی ئاشووریی خەڵکی ناوەڕاستی عێراقەوە بۆ هات. باسی ئەوەی تێدا کرد بوو کە چەند ساڵێکە پێوەندیی جنسیی بە ژنێکی بەشووی ئاشووریەوە هەیەو زۆربەی منداڵەکانی لەون نەك لە مێردەکەی. بەپێی نامەکەی خۆی بە گوناهبار زانیبوو و داوای ئامۆژگاریی کردبوو، بەشێوەیەك حیزب لەو بارەیەوە بڕیاری هەرچی بدات پێی قبووڵ بێ.

ئەم ڕووداوو نامانە نەك هەر تەرزە بە هاو بنەمایەکی ڕەوشتیی باوی کۆمەڵی ئەوسای عیراق، بەڵکوو متمانەی کادیرو ئەندامانی حیزب بە سەرکردایەتیو حیزب

خۆی‌و، قه‌ناعه‌تیشیان به‌ پێویستیی ڕاشکاویی ته‌واوو ته‌نانه‌ت نه‌شاردنه‌وه‌ی کێشه‌ شه‌خسیه‌کانیش ده‌خه‌نه‌ ڕوو.

* * *

ده‌زگای چاپی ژێر زه‌مینیمان ورده‌ورده‌ رووی له‌ باشی کردو په‌ره‌ی سه‌ند. ئێمه‌ به‌ شێوه‌یه‌کی سه‌ره‌کی پشتمان به‌ تایپڕایته‌رو رۆنیۆ ئه‌ستوور بوو، له‌به‌ر ئاسانیی ئیش پێکردن‌و دانه‌ی تازه‌ خستنه‌ جێی هه‌ر ئامێرێکی له‌ کارکه‌وتوویان. نامه‌یه‌کم له‌(عبدالجبار وهبی)یه‌وه‌ پێ گه‌یشت، باسی‌ئه‌وه‌ی ده‌کردکه‌ مه‌کینه‌یه‌کی بچووکی چاپ هه‌یه‌ له‌گه‌ڵ قاسه‌ی پیته‌کاندا به‌ پێ ئیشی پێ ده‌کرێت‌و به‌ قه‌واره‌ی نیو فولسکاب چاپ ده‌کات. ئه‌گه‌ر حیزب پێویستیی پێی هه‌بێ ده‌توانین به‌ نرخێکی گونجاو په‌یدای بکه‌ین. رۆژی دوایی سواری پاسکیله‌که‌م بووم‌و له‌ گه‌ڕه‌کی (الكاظمية)وه‌ چوومه‌ گه‌ڕه‌کی (البتاوين). گه‌یشتمه‌ ماڵی (عبدالجبار)تا له‌و باره‌یه‌وه‌ راسته‌وخۆ له‌گه‌ڵیدا بدوێم. پاش روونکردنه‌وه‌و لێدوان، ده‌زگاکه‌مان به‌ چل دینار کڕی‌و خرایه‌ ژێر ده‌ستی (صبيح)و به‌ خێراییه‌کی پێوانه‌یی فێری پیتچنین بووو چه‌ند بڵاوکراوه‌یه‌کی پێ چاپ کرد. به‌ڵام هه‌ر رۆنیۆی له‌به‌ر ئاسانیی خستنه‌ گه‌ڕو به‌رهه‌می زۆر به‌ ده‌سته‌وه‌دانی، به‌لاوه‌ چاکتر بوو.

داوایشم له‌ (عزيز الشيخ)ی ئه‌ندامی لیژنه‌ی به‌غداو مامۆستای یاریده‌ده‌ر له‌ کۆلێجی په‌روه‌رده‌ کرد تایپڕایته‌رێکی تازه‌مان بۆ بکڕێ. ناوبراو له‌ هه‌مان کۆلێج به‌ پله‌ی یه‌که‌م ده‌رچوو بوو. له‌ ژوانه‌که‌ی دواتردا تایپڕایته‌ره‌که‌ی هێنا. نرخه‌که‌یم لێ پرسی تا بیده‌مێ، گوتی:

ـ به‌ چل دینار کڕیم.

ـ باشه‌. ئه‌ی ده‌توانین دوایی پاره‌که‌ت بده‌ینێ، دوو حه‌فته‌ی دیکه‌ پاره‌مان دێته‌ ده‌ست ؟

ـ ده‌کرێت هه‌ر پاره‌یش نه‌ده‌ن. من ئێستا مووچه‌ی مانگانه‌ وه‌رده‌گرم‌و ئیتر قوتابیه‌که‌ی جاران نیم. با مووچه‌ی ئه‌م مانگه‌ پێشکێشی حیزب بێ ئه‌مه‌ هه‌ر قوربانیه‌کی بچووکه‌.

ـ هەڤاڵ، پارەکە زۆرە.

ـ بنیادەم دەتوانێ چ قوربانییەك بە حیزب ببەخشێ، ئەگەر ئامادە نەبێ دەست لە مووچەی یەك مانگ هەڵبگرێ ؟

چاپی ژێر زەمینیمان لە ١٩٥٢ دا بە چڵە پۆپەی چالاکیەکانی خۆی گەیشت، بە تایبەت بە هۆی خڕ بوونەوەی ژمارەیەك لاوی گورجو گۆڵەوە لە ماڵی چاپخانە نهێنیەکەی نێزیك بە مزگەوتی (الامام الاعظم). (صبیح) هێشتاکە چالاکترینو دەست رەنگینترین چاپکەری سەرەکیمان بوو. چەند کەسێکی دیکەی لە لا دانیشتبوو، وەك (محمد صالح العبللی)و (حنا مارین)و (عبدالاحد)ی برا بچووکی وهەروەها (ثمینة ناجي) (پاشتربوو بە ژنی (سلام عادل)ی سکرتێری حیزب)کە بۆ ماوەیەکی کورت مایەوە. کتێبی "بنچینەکانی لینینیزم " کە ستالین پاش کۆچی دوایی لینین داینا بوو، لەم ماڵەدا چاپ کرا. هەروەها مێژووی حیزبی شیوعی لە یەکێتیی سۆڤێتو نامیلکەی "حیزبێکی شیوعی، نەك سۆشیال دیموکرات" کە فەهد داینا بووو نامیلکەی "کێشە ئابووریەکانی سۆشیالیزم"ی ستالینو کتێبی دیکەیش. تەکنیکی چاپەکە سەرەتایی بوو. بەلاّم سوور بوونو هەولّی بێ پسانەوەی چاپکەران هۆی زۆرو زەبەندیی بەرهەم بوون.

ئەم ماڵە شتێکی وای بەسەردا هات وەزعی لێ تێك دا. (حنا)و براکەی لە بازاڕەوە بۆ ماڵ دەهاتنەوە. دوو سەد مەترێك دوور لە ماڵەوە لووتیان بوو بە لووتی بۆسەیەکەوە پۆلیسی نهێنی بۆیان نابوونەوە. بۆیان نەچوە سەر پێکەوە دەرباز بن، (حنا)یان دەستگیر کراو (عبدالاحد)یش توانیی بە ڕاکردن قوتار ببێ. دوای دەوری چارەکە سەعاتێك لە لایەکی دیکەوە خۆیی کردەوە بە ماڵداو بۆ (صبیح)و (محمد صالح العبللی)ی گێڕایەوە کە ڕووداوەکەیان لە نێزیکی ماڵەکە لێ قەوماوە. ئەمە مانای وابوو خانوەکە دوو چاری مەترسیی چوار دەور گرتن بووە، چونکە ڕێی تێدەچوو بە هۆی چاودێریکردنی جموجوولّی (حنا)وە لە ڕۆژانی پێش بۆسەکەدا

شوێنەکەی پێ زاندرا بێ. جگە لەوەش، لەوانەیە (حنا)ی کرێکاری شیوعیی گیراو لەبەردەم دوژمناندا خۆیی پێ ڕانەگیرێو، ماڵە چاپخانەکە ئاشکرا بکات. چاپکەرانی ماڵەکە وەك نەریتێکی پێڕەوکراوی ئەو کاتانە دەمو دەست چۆڵیان کردو دەزگاکانی چاپیان لە پاش خۆیان بە جێ هێشت کە لە چاو کادێرە حیزبییەکاندا بایەخێکی گەورەیان نەبوو. ڕووداوەکە سەر لە بەیانی قەوما. چاپکەرانیش هاتنە دەرێو کەسیان ماڵی منی پێ نەدەزانی. پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە نامەیەکم لەسەر ڕووداوەکە لە (صبیح)ەوە پێ گەیشت. یەکسەر (هادی صالح)م لەگەڵ خۆمدا بردو بەرەو ماڵی چاپخانەکە ملمان نا، بەڵکە بتوانین بە هەر شێوەیەك بووە دەزگاکان بگوێزینەوە. لە بازاڕی (الاعظمیة)ی نێزیکی خانوەکە، پڕ بە زەمیلەیەك میوەمان کڕیو دامانە منداڵێکی حەماڵ بۆمانی هەڵبگرێو لە پێشمانەوە بڕوات. منو هادی پەنجا مەترێك دوور لە دەرگای خانوەکە ڕاوەستاین، منداڵەکەمان بە تەنیا ناردە ماڵەکەو پێمانگوت:

- بچۆرە لای ئەو دەرگایەو لێی بدە تا دەکرێتەوە. کێی لێ بوو ئەم سەبەتەیەی بدەرێو پێی بڵێ: عەبدوڵلا ئەم میوەیەی بە دیاری بۆ ناردوون. کە گەڕایتەوە سەبەتەکە بهێنەوەو بیبەوە بۆ دووکاندارەکە.

ئەم هەموو ڕاوە ڕێویەمان بۆ ئەوە بوو بزانین پۆلیس پەلاماری ماڵەکەی داوە یان نا. لە دوور ڕا ڕاوەستاین تا چاومان لێ بێ چی ڕوو دەدات و ئاخۆ بۆسەیان ناوەتەوە. منداڵەکە دوای لێدانێکی بەردەوامو زۆر چاوەڕێکردن هاتەوە لامانو گوتی: ماڵەکە کەسی تێدا نییە. کەواتە پۆلیس پەلاماری نەداوەو دەبێ کاتەکە بە فیڕۆ نەدەین. هادی چوو ئوتومبیلێکی پیکاب بە کرێ بگرێو بە پەلە دەست بکەین بە گواستنەوەی شتە گرنگەکان بۆ شوێنێکی کاتیی دیکە، تا ئەگەر ڕۆژی دوایی (حنا) ڕووخاو ماڵەکەی ئاشکرا کرد هیچ شتێکی گرنگی کەرەستەی چاپیان بەر دەست نەکەوێ. تەواوی شتەکانمان بۆ جێیەکی ئەمین گواستەوە. (حنا)یش پاڵەوانانە لە ژێر ئەشکەنجەی دڕندانەدا خۆیی ڕاگرت.

پێم وا بێ دەترسان درێژە بە ئەشکەنجە دانی (حنـا) بـدەن، چونکـە ماوەیـەك بـەر لەوە بە هۆی ئەشکەنجەو دەست درێژیی جنسی بۆ سەر (سلمان)ی برای کە شـیوعی بوو، روو بە رووی گەورەترین ئـابڕوو چـون بوونـەوە. ئێمـەیش بـە بـەربڵاوی لـە بنـی هەمانـەی ئـەم دەسـتدرێژییەمان دا ، کـە ـ بـە پێـی زانیـاریی مـن ـ شـتی وا لـەو قۆناخەدا دووبارە نەبوەوە. بە پێچەوانەی رژێمی بەعسەوە کە لە سایەی ئەودا هـەزاران جار شتی وا بەسەر ژنو پیاوانی گیراودا هاتوون.

* * *

کە لە ١٩٤٩ دا گەیشـتمە بـەغداو تـا دوو سـاڵ لـەوە بـەدوایش، خۆم بـە تـەنیا سـەرکردایەتیی (حشع)م دەکـردو، تەنانـەت ـ هـەر بـە نـاویش بـێ ـ لیژنەیـەکی سـەرکردایەتیمان نـەبوو. یـا راسـتتر بڵێم: دوای گیرانی فـەهد لــە ١٨ی کـانوونی دووەمــی ١٩٤٧ داو تـا سـەرکردایەتی گرتنـە دەسـتم، لیژنەیـەکی وا نـاوی لـە کوولەکەی تەرپیشدا نـەبوو. بـەڵام بـەردەوامبوونی کـاری حـیزبیو بەدەسـتهێنانی چەندین سەرکەوتنی گشتی لە بنیاتنانـەوەدا وەچەیـەکی تـازەو تـا رادەیـەك بـەرینی کادێرانی لاویـان لـە نێـو کرێکـارانو قوتابیـانو رۆشـنبیرانو سـنعاتکارانو هیـی دیکەدا بۆ حیزب دابین کرد. خەسڵەتی جوێکەرەوەی کادێرانمان بـە گشـتی، هـەر لـە منی سکرتێری حیزبەوە تا دەگات بە هەموان لە ئاستە جیاجیاکاندا، ئـەوە بـوو کـە ئێمە لاوی کەم تەمەن بووین. (سليم الچلبی)نەبێ کە سەرو ریشـی کـەمێك مـاشو برنج بوو بوو، بیرم نایێ لە نێو کادێرانماندا چاوم بە کەسانێکی سەر سـپی کـەوتبێ. کاتێك هەڤاڵانمان بە هێندێك سەرکردەی حیزبە بۆرجوازیەکان دەگەیشتن، هەسـتمان دەکرد ئەوانە هەم بە چاوێکی سووکەوە تەماشامان دەکەن ، هـەم لـە هـەمان کـاتدا بـەخیلیمان پـێ دەبـەن. هـۆی سـووکایەتیەکە ئـەوە بـوو کـە بــە منداڵــە وردکـەی سیاسەتیان دادەناینو، ئەوان خۆیشیان پـیرو پەککەوتـە بوون. هـۆی بەخیلیەکـەیش ئەوە بوو دەیانبینی حیزبی ئەو "منداڵە وردکانە" چ دەسەڵاتێکی میللیـی فـراوانو چ تینو توانێکی گەورەی خەباتگێڕانەی هەیە.

دیـاره پەلهاویشـتنی چـالاكیی حـیزبو گەشـەكردنی دەوری خەباتكارانـەی پێوەندیەكی لە پسان نەهاتوویان بـە هـەبوونی ئەم ژمـارە زۆرەی كـادێری حـیزبیی چالاكـەوە هـەبوو. هـەر لەبـەر ئـەم دیاردەیـەش بـوو پـاش تێكشكانی ئـەو لیژنـەی ناوەندیـەی كـە سـاڵی ١٩٤٥ لـە یەكـەم كۆنگرەی حیزبدا پێكـهات، لیژنەیـەكی ناوەندیی تازەم بۆ حیزب پێكهێنا. لیژنە تازەكە حەوت ئەندامی تێدا بـوو، خـۆم لـە كادێرەكان هەڵمبژاردن. ئەو رۆژانە بە بیری منو بیری كەسیشدا نەهات كە دەبـێ بـە هەر شێوەیەك بووە هەڵیان ببژێـرن. ئەندامـەكان، جگـە لـە مـن، بریتـی بـوون لـە: (ناصر عبود)ی كرێكاری بەندەری بەسرەیی‌و، (صادق جعفر الفلاحی)ی كرێكـاری چنینـی بـەغدایی‌و، (كـەریم ئەحـمەد)ی مامۆسـتای هـەولێریی دەركـراوو كـوڕی خێزانێكی وەرزێری نەدار، (محمد راضي شبر)ی قوتابیی بەغدایی دەركراوو، (سلیم الچلبـی)ی فەرمانبـەری بـەغدایی دەركـراوو رۆڵـەی چینـی نـاوەندی، (كاكـەی فەللاح)ی قوتابیی دەركراوی خەڵكی سلێمانی‌و كوڕی خێزانێكی جووتیاری هـەژار. لەوانەیە بشێت لەسەر ئەوە گلـەییم لێ بكرێـت كە كـەمێك درەنـگ ئـەم هـەنگاوەم هەڵهێنایـەوە. بـەڵام هۆیەكـەی ئـەوە بـوو كـە پێكـهێنانی لیژنـەی نـاوەندی لـەو هەلومەرجـەدا كۆتـاییی بـە شـێوازی سـەركردایەتیی تـاكڕەوی‌و بیروكراسـیی بـاو نەهێناو نەیدەتوانی كۆتاییی پێ بێنێ. ئەوسا شێوازی تـاكڕەویی ـ بیرۆكراتیانـە لـە عـیراق‌و گـەلێك وڵاتـی دیكـەی بـە تایبـەت پاشـكەوتوودا بەسـەر جووڵانـەوەی كۆمۆنیزمـیدا زاڵ بوو. من بـە عەقڵیـەتی ئـەم شـێوازانە پـەروەردە بـووم. فـەهدمان دەپەرسـت، وەك خوایـەك یـا پێغەمبـەرێك بـوو بـێ‌و دینـداران بیپەرسـتن. ئـەم تاكپەرستییە بەردەوام عەقڵیەتی سەركردایەتیی تاكڕەویی دەبووژانـدەوە. لـێرەدا كـە باسی فەهدو شێوازی سەركردایەتیی تاكڕەوی دەكەم، نامەوێ بـە خـراپ لێم حـاڵی بن. مـن ئـەو كاتـەو هێشـتاكەیش دڵبـەندی فـەهدم وەك پیـاوێكی مـەزن كـە سەركردایەتیی پرۆسەی بنیاتنانی (حشـع)و وەرگـێڕانی بـە حـیزبێكی جـەماوەریی

گەورەی کرد. سەرکردەیەکی گەورەو تێکۆشەرو خۆبەختکردوو بوو، بە هەموو مانایەکی ئەم وشانە. بەڵام خوا نەبوو، بەڵکوو وەك ئێمە مرۆڤێك بوو لە خوێن و گۆشت، لە کاتێکدا ئێمە لە پاڵ چەند خوایەکی گەورەتری جیهانیی جووڵانەوەی کۆمۆنیزمیدا کردمانە خوایەکی ناوچەکەمان.

دێمەوە سەر کێشەی لیژنەی ناوەندی. لە ڕاستیدا من هەر لەسەرروو لیژنەی ناوەندی مامەوە، وەك چۆن هەموو بەرپرسێکی دیکەی سەراوردی لیژنە دەبوو بە سکرتێری حیزب. کۆبوونەوەکانی لیژنەی ناوەندیمان ئەندازەیەك ڕێکوپێکییان تێدا نەبوو، ئەندامەکانیشی لەو ئاستە فیکری ـ سیاسیەدا نەبوون وا پێویست بکات بە کۆمەڵ سەرکردایەتی بکەین. ڕووداوەکانیش جەختیان لەسەر ئەوە کرد بوو کە من سەرباری نزمیی ئاستی فیکری ـ سیاسیم لە هەموو ئەندامەکانی لیژنەی ناوەندی لێهاتوو تر بووم. لام وابێ پاش گیرانم لە نیسانی ۱۹۵۳داو کاتێك کەریم ئەحمەد جڵەوی سەرکردایەتیی گرتە دەستو، بە تایبەت دوای دانی ئەم جڵەوە بە حەمید عوسمان کە توانیبووی لە بەندیخانە هەڵبێت، ئاستی کاری سەرکردایەتی ڕووی لە خراپی کرد.

* * *

بۆ یەکەمین جار لە ژیانمداو لە ماڵی خوشکی (سلیم الچلبی) لە (الکرادة الشرقیة) سووپم خواردو چەتاڵم بەکارهێناو لەسەر کورسییەکو لە پشت مێزێکی نانخواردن دانیشتم. سەلیم بردمیە ئەوێ، گفتوگۆمان لەسەر هێندێك مەسەلە کرد. پێکەوە نیوەڕۆژەمان کرد. ڕانەهاتبووم بەم چەشنە نان بخۆم. هەموو شتێکی ژووری نانخواردنەکە مایەی سەرنجڕاکێشان بوون بۆ منی لە بنەڕەتدا لادێیی تێکەڵ نەبووی دەوڵەمەندانی عیراقی کە ئەو سەردەمە لاسایی ژیانی ئەوروپایان دەکردەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: "بۆرجوازیەکان ئاوا دەخۆن".

* * *

سالّی ١٩٥١ بۆ یەکەم جار چاوم بە (محمد صالح العبللی) کەوت کە کوڕی خێزانێکی میللیی زەحمەتکێشی گەڕەکی (قنبر علي)ی پێتەخت بوو. سالێکی لە بەندیخانە تەواو کردبوو، دەبووحوکمی سالێك بە چاودێریی پۆلیس بەسەر ببات‌و ڕۆژانە بچێتە پۆلیسخانەو لە تۆمارێکدا ئیمزا بکات. هات سکالای کرد کە ئەم چاودێریکردنە تەنگەتاوی دەکات‌و چالاکیی حیزبیی کەم دەکاتەوە. لێم پرسی: ئامادەی خۆت بشاریتەوەو تەواوی چالاکیی خۆت بۆ کاری حیزبی تەرخان بکەی ؟ بەم پێشنیازە قایل‌و پێی خۆش بوو. لە ڕۆژی دواییەوە بردمانە مالێکی دیکەی دوور لە مالّی خۆی، لەوێ بژیو خۆیی تێدا بشارێتەوە. بەلاّم خۆشاردنەوەکەی لە چەند ڕۆژێك زیاتری نەخایاند. نامەیەکی بۆ حیزب نووسی، تێیدا بە ڕاشکاوی گوتبووی: ناتوانم ژیانی خۆشاردنەوە دەرببەم. کە چاوم پێی کەوت تا باشتر لە وەزعی حالّی ببم، پێی گوتم:

- کاتێك بە شەقامەکاندا ڕێ دەکەم، هەر ڕێبوارێك ببینم وا دەزانم پۆلیسێکی نهێنییەو ڕایانسپاردووە چاودێریم بکات‌و ڕاوەدووم بنێ. بۆیە پێم ناکرێت ژیانی خۆشاردنەوە دەرببەم.

- کەواتە واز لە خۆشاردنەوە بهێنەو مشووری گەڕانەوە بخۆ بۆ مالّەوە، با پۆلیس چاودێریت بکات‌و وەك جاران درێژە بە چالاکیی حیزبیت بدە.

ئەوە یەکەم مەشقی (محمد صالح العبللی) بوو بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی دژوارییەکانی خۆشاردنەوە لە پێناوی کاری حیزبیدا. پاشتر سەر لە نوێ‌و بە دلّی خۆی‌و بە شێوەیەکی ئاسایی‌و بەبێ ڕاڕایی خۆیی شاردەوە. کە پۆلیس لە ١٩٥٣دا گرتمی، (محمد صالح) کادێرێکی حیزبی بوو خۆیی شاردبووەوە. کە ١٩٥٨یش لە زیندان دەرچووم، لە نێو دەزگای سەرکردایەتیی حیزبدا بووو لە مۆسکۆ لە قوتابخانەی حیزبی دەیخوێند.

* * *

ئێوارەی ڕۆژێکی کانوونی دووەمی ١٩٥٢ لەگەڵ (عزیز الشیخ ) دا ژوانمان لە گەڕەکی (الوزیریة) هەبوو. لە پاسکیلەکەم دابەزیم‌و نێزیکەی نیو سەعاتێك بە شەقامەکەدا ڕۆیشتین. ئەنجا ئەو سواری پاسێکی مسلەحە بووو، منیش سواری پاسکیلەکەم بووم ڕوو بەوێستگەی شەمەندەفەری (باب المعظم) (ئەم وێستگەیە چەندەها ساڵە نەماوە )، لاوێکی پاسکیل سوار لە نێزیك باڵوێزخانەی میسر سەرە ڕێی پێگرتم‌و گوتی:

- بە یارمەتی خۆت دەقەیەك بوەستە.

- چیت لێم دەوێ ؟

- دەمەوێ بوەستی.

ڕازی نەبووم بوەستم‌و بەرەو دەروازەی وێستگەکە خێراتر کەوتمە پایدەرلێدان. لاوەکەیش بە پاسکیلەکەیەوە کەوتە پێشبڕکێ‌و پێشم کەوت. کاتێك گەیشتینە ژێر پردی شەمەندەفەرەکە کە بەسەر دیجلەدا دەپەڕێتەوە، سیخوڕەکە بە دەنگێکی بەرز قیژاندی:

- کوڕە عەباس، ئەوە خۆیەتی !

شەش پیاو لە هەردوو بەری شەقامەوە بەدەم هاوارەکەوە هاتنە دەرێ‌و بەراکردن شالاویان بۆ هێنام. کوڕەی سەر پاسکیلەکەیش لەبەر ئەوەی کە لە ڕێکردندا لە من خێراتر پێی پێوە نابوو، ڕێگەکەی لێ داخستم. کەلامدا پێشی بکەوم، کەمێك لە قیرتاوەکە دەرچووم‌و بۆم دەرکەوت پاسکیلەکەم لە قوڕدا چەقیوە. هەر ئەوەندەم بۆ مایەوە بەجێی بهێڵم‌و بکەومە خۆ بەپێ ڕابکەم. ئەوە دەرفەتی بە پاسکیل سوارەکەو پیاوەکانی دیکەی مەفرەزەکەدا بگەنە لام. یەکێکیان هەردوو قۆڵمی گرت. دەمانچەکەمم دەرهێناو هەڕەشەم لێکردن، گوتم:

- ئەوەی بمگرێ، یا هەوڵ بدات شوێنم بکەوێ، دەیکوژم.

هەموویان بە زەبری هەڕەشەی دەمانچەکە چەندهەنگاوێك لێم دوور کەوتنەوە. پێ بە پێ دەمانچەکانیان دەرهێناو بەیەك دەنگ هاواریان کرد:

ـ هەتیو دەمانچەکە فڕێ بدە! دەمانچەکە فڕێ بدە !

هەڕەشەکەم دووپات کردەوەو تێم تەقاندو هەڵاتم. ڕایانکرد بە دوومداو دەستیان کرد بە تەقە کردن. شەوو تاریکاییەکە لە بەرژەوەندی مندا بوون. لە ڕاکردندا بووم، زانیم ئەگەر بگەمە بەر دەرگای بە خەڵكو پۆلیسو ئینزیباتی عەسکەری قەرەباڵغی وێستگەکە ئەوا نیوچە مەحاڵێکە لە دەستیان دەربچم. لە قیرتاوەکە لامداو، بەلا ڕێیەکی تەنگە بەری سەرووی پاشماوەی ئەو بەربەستە خۆڵینەدا ڕامکرد کە ڕۆژی خۆی بۆ پاراستنی پێتەخت لە مەترسیی هەڵسانی ئاوی دیجلە کرا بوو. جارێکی دیکە بەدەنگی بەرز هەڕەشەم لێکردنەوە. شانەی دەمانچەکانی خۆیانیان خاڵی کردەوە. زیاتر لێیان دوور کەوتمەوە، تاریکیەکیش کارێکی کردگوللەی تەقەکانم بەرنەکەون. کە خۆمم کرد بە لاڕێ قوڕاویەکەدا، ئەوان لە دووم نەهاتن. پاش تاوێك تەماشا دەکەم وام لە نێوپانتاییی پەرژینکراوی وێستگەکە کە بۆ عەماری تەختەو دانەوێڵەو کەلو پەلەکانی تەرخان کرا بوو. بە ڕاکردن بە لای دوو پاسەوانی دانیشتووی بەر ئاگرێکی خۆشدا تێپەڕیمو سەگەکەیان کەمێك راوی نام، بەڵام ئەوان پێیان نەزانی.

ئێستا من لە نێو وێستگەکەدام. چار چییە ؟ چۆن خۆ دەرباز بکەم ؟ ناتوانم لە پەرژینەکە بپەڕمەوە، چونکە هیچی وام پێ نییە تێلەکەی پێ ببڕمو، نایشکرێت پێیدا هەڵبگەڕێمو باز بدەمە ئەودیو. روو بە ئاپۆرەی وێستگە پڕ لە خەڵکەکەیش بچم ؟ ئەویش هەر مەترسیی راستەقینەی تێدایە، چونکە رەنگە زۆربەی پیاوانی شوێن پێهەڵگری مەفرەزەکە لەوێ بن، بە دوامدا بگەڕێن بۆ گرتنم. هەر یەك رێگەم لە بەردەمدا ماوە: بۆ چەند سەعاتێك خۆم لە پانتاییی وێستگەکەدا شوێنە ون بکەم، تا مەفرەزەکە نائومێد دەبێو دەست لە سوراخکردنم هەڵدەگرێ. سەرەڕای ئەوە تاریکیش یارمەتیی خۆشاردنەوەم دەدات. بەڵام مادامێکی لە قەفەزێکی پەرژینکراوی مولکی رژێمی حوکمدار خۆیدا ئابلۆوقە دراوم، مەسەلەکە هەروا ئاسان نییە.

ئەوەندەی پێ نەچوو پیاوانی مەفرەزەکە بە مەبەستی پشکنین هاتنە ناوەوە، مەترسی بە ڕاستی لێم نێزیك بووەوە. ئەوان ژمارەیەکی بە بەراورد زۆرن و پڕچەکن، منیش تەنیام و دەمانچەیەکم بە چەند گوللەیەکەوە پێیە. ئەگەر ناچاری پێکدا هەڵپژان کرام، ئەوا دەیکەم و لەوانەیە هەموویان ببەزێنم. بەڵام قوتار بوونم لەم قەفەزە هەرچی چۆنێك بووە ئاسان نییە. دەبێ وەك دوا چارەسەری ناچاری پەنا بۆ چەك ببەم. ئەگەر بکرێت بە بێ بەیەکدادان دەرباز ببم، باشتر وایە خۆمی لێ لابدەم.

پانتاییی وێستگەکە جۆگەی هەڵکەندراوی تێدا بوو بۆ ئاوەڕۆ، بەرمیلی کۆنکرێتیی بە دەوردا دانرا بوو کە بۆ دروست کردنی ئەو ئاوەڕۆیانە بەکاردەهێندران. جۆگە ئاوێکی ڕەوان لەو ناوەدا بوو، گژوگیا لەمبەرو ئەوبەری شین بوو بوو. ئایا چاکتر وایە خۆ لەو چاڵەدا بشارمەوە که ئاوی تێدا نییە ؟ نەخێر ناگونجێت. ئەوانە یەکەم جار ئاوەڕۆ هەڵکەندراوەکان دەپشکنن. هەرە زامنترین شوێن ئەو جۆگە ئاوەیە کە قووڵییەکەی دەگاتە ٥٠ ـ ٦٠سم. خۆمم کرد بە نێو جۆگەکەداو لە ئاوەکەدا راکشام و نوقم بووم، سەرم و دەستی راستم نەبێ کە دەمانچەکەم پێ گرتبوو، بەدەرەوە بوون. خۆمم بەگژوگیای هەردوو بەری جۆگەکە داپۆشی. پۆلیس بۆ سۆراخکردنم گەیشتنە جێ. چەند جارێك لە دووریی چەند مەترێکەوە بەلامدا ڕەت بوون، بە چرپە قسەیان دەکرد. کە نێزیك دەبوونەوە گوێم لێیان دەبوو. ئاوەڕۆکانیان بە باشی پشکنی. جۆگەی ئاوەکە نەبێ، هەموو جێیەکیان پشکنی. بە خەیاڵی هیچ یەکێکیاندا نەدەهات ئەو مرۆڤەی کە لەم شەوە یەکجار ساردەی زستاندا راوە دووی دەنێن، خۆیی لە نێو ئاوی سارددا شاردووەتەوە. پشکنینەکە لە سەعات (٥ر٧)ەوە تا پاش ١٠ شەوی خایاند. پانتاییەکە فراوان و پڕ لە عەمارو عەرەبانەی شەمەندەفەرو تەختە کۆن و شتی وابوو. پێدەچێ بە تەما بوو بن سەرەنجام بمدۆزنەوە. بەڵام نائومێدی بەرەبەرە سەری تێکردن و، گوێم لێ بوو یەکێکیان بە هاوڕێکانیی دەگوت:

- کابرا توانیویه رابکاته دەرەوەی وێستگەکە. گەڕان بە دوایدا سوودی نییە.

- یەکێکی دیکە وەڵامی دایەوە: لەوانەیە لێرە خۆیی شاردبێتەوە. چاکتر وایە کە لە حەشارگەکەی هاتە دەر، بۆسەی بۆ بنێینەوە.

- ئێمە بە دوایدا دەگەڕێینو نازانین چییە. چ سوودێك لەوەدا هەیە. هەر ئەوە دەزانین دەمانچەیەکی پێیە.

- رەنگە نێچیرێکی چەور بێ بۆ ئێمە.. کادێرێکی شیوعی یا دزێکی ترسناك بێ.

دوا جار لە پشکنین کەوتنو، بۆسەیان لای ئەو دەروازانەوە نایەوە کە لەبەر رووناکیی گلۆپەکاندا دەمبینین. سەعات یازدە لە ئاوەکە دەرهاتمو چوومە نێو بەرمیلێکی کۆنکریتی. بۆ یەکەم کەڕەت هەستم بە سەرما کرد. کە لەو ئاوە یەکجار ساردەدا درێژ بوو بووم هەستم بە هیچ سەرمایەك نەدەکرد، چونکە هێزێکی بێوێنەم لا پەیدا بوو بوو بۆ خۆگرتن لەبەر سەرمادا. لەوانەیە دەماخم بڕی ئەو گەرمییەی کە بە شێوەیەکی ئاسایی لە لەشمدا دروست دەبوو، کرد بێ بە چەند ئەوەندە. کاتێك بەرهەڵستیی سەرما دەبێتە رێگەیەك بۆ دەرباز بوون لە کەسانێك تۆیان بۆ زیندانو ئەشکەنجەو تەنانەت لە سێدارەدانیش دەوێ، ئەوا خۆگریەکی نائاسایی بەرانبەر بە سەرما یا هەر شتێکی یەخە گیری وا پەیدا دەکەی.

پۆلیسەکان نا ئومێد بوونو دوا بۆسەیان لە سەعات یەکی پاش نیوە شەودا هەڵگرت. ئیتر دەمتوانی لە حەشارگەکە بێمە دەر. بەڵام هاتنە دەر دووچاری مەترسیی دەکردم، چونکە لەشم تەڕوبڕو قوڕاویو پێخاوس بووم. دەشیا ئەوەیش ببێتە مایەی گومانکردنی حەسحەسەکانی شەوو ئەو رێبوارانەی کە رەنگ بوو بێنەرێم. پێم وابوو چاکترە تا بەرەبەیان لە جێی خۆم بمێنمەوە. کە گوێم لە بانگی بەیانیی چەند مزگەوتێکی ئەو نێزیکانە بوو، حەشارگەکەم چۆڵ کردو بە پێ بەرەو (کمب الصليخ) بەسەر ئەو بەربەستە خۆڵینە درێژەکەی بەرانبەر گەڕەکی (الوزيرية)دا رۆیشتم. پێش هەتاو کەوتن لە دەرگای ئەوماڵەی گەڕەکی (کمب

الصليخ)م دا كە تێیدا دەژیام. (أم عەدنان) دەرگاکەی کردەوە. هادی لە پشت دەرگاکەوە راوەستا بوو. کچێکی عازەبی کوڵەبنەی شیوعیی (مادلین) ناو پێش چەند رۆژێك هاتبوە ئەم ماڵەو پاشتر بوو بە هاوسەرم، لە پشت هەردوکیانەوە بوو. ئەوانە بە روخسارێکی تێکەڵ لە خۆشیو سەرسوڕمانو نیگەرانی بە پیرمەوە هاتن. شەو لایان نەبووم و ئەوە مایەی دڵە راوکە بوو بۆیان. دڵخۆش بوون چونکە هاتمەوە لایان.

دیمەنە سەیرەکەم سەرسامی کردن، لەبەر ئەوەی تەڕو قوڕاویو پێ پەتی بووم. کەیبانووی ماڵەکە پرسیی:

- چیت لێ بەسەر هات ؟ بۆچی شەو نەهاتیەوە لامان ؟ نارەحەتت کردین تا بەیانی.

- ڕووداوێکی ناخۆشم لێ قەوماو بە سەلامەتی لێی هاتمە دەر. ئێستایش پێویستیم بە کەمێك حەوانەوەو شێلان هەیە.

مادلین تیمار کردنو شێلانی دەزانی، چونکە پێشتر وەك پەرستارێك لە نەخۆشخانەیەکدا ئیشی کردبوو. یارمەتیی (أم عەدنان )ی دا بۆ چەور کردنی لەشم و بە نەرمیو بایەخێکی بێ ئەندازەوە شێلامی، تا لە جێیەکی گەرمدا خەوم لێ کەوت. دوای چەند سەعاتێك لە خەو هەستام. وام هەست نەدەکرد ئەو شەوە هیچ کارێکی کردبێتە سەر تەندروستیو چالاکیم.

ئێوارەی ڕۆژی دوایی، سەر لەنوێ لەژوانێکداو هەر لەشەقامێکی (الوزیریە) چاوم بە(عزیز الشیخ) کەوتەوە. ڕووداوەکەی لێ پرسیم و باسی ئەوەی کرد کەهەر کەمێك پاش لێك جوێبوونەوەمان، قرمژنی گوللەی هاتبوە گوێو نیگەران بوو بوو. دوو ڕۆژ لەوە بەدوا چەند زانیاریەکمان لەسەر هۆی ئەو بۆسەنانەوەیەدەست کەوت. شیوعییەك فێر بووبووچەند شەوێکی یەك لەدوای‌یەك بڵاوکراوەی لەنێو گەڕەکی (الوزیریة) دەبەشیەوە. لەوە دەچوو لەبڵاوکراوە بەشینەوەکەدا پاسکیلی

بەکارهێنابێ. مەفرەزەی ئاسایشی گشتی بۆسەیەکی بۆنایەوە، کەچی من پێوەی بووم.

* * *

پایزی ١٩٥١، دوای هاتنە گۆڕێی ڕێکخراوەکانی لاوانو قوتابیانو یەکێتیی سەندیکاکان، هەوڵمان دا مۆڵەتێکی یاسایی بۆ ڕێکخراوی دیموکراتیی ئافرەتان بەناوی (پێوەندیی بەرگریکردن لە مافی ئافرەت ) ەوە بە دەست بهێنین. داواکە لەلایەن تاقمێك ئافرەتی شیوعیو دیموکراتیی نا حیزبیی وەك (نزيهة الدليمي)ی ژنە پزیشکی شیوعیی چالاكو (خالدة القيسي)ی دیموکراتیی ناحیزبییەوە خرایە بەرچاوی دەسەڵاتداران. وەزارەتی ناوخۆ هەر لەبەر ئەوە کە لەو باوەڕەدا بوو چەند کسێکی شیوعی یا وەك خۆیان ناویان نابوو " چەند کسێکی ناحەز " لە پشت داواکەوەن، قایل نەبوو مۆڵەتەکە بدات، ئەگەر چی داواکەو ئیمزاکەرەکانیشی هەموو مەرجێکی یاساییان تێدا هەبوو. دوا بە دوای ڕەتکردنەوەی داواکە، هەڤاڵانی ئافرەتی شیوعی نامەیەکیان دایە حیزب، پرسیاری ئەوەیان تێدا کردبوو کە ئاخۆ دەبێ لە هەنگاوی دواییدا چی بکرێت. وەڵامی نامەکەمان دایەوە (پێم وابێ ئەوە لە ئاداری ١٩٥٢ دا بوو )، ڕامانسپاردن درێژە بە ئیش بدەن بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکە بکەنە ڕێکخراوێکی دیموکراتیی نهێنیی تایبەت بە کاری ئافرەتان، تا وەك ڕێکخراوی دیموکراتیی لاوانو یەکێتیی گشتیی قوتابیان ئیش بکات. بەم شێوەیە ڕێکخراوی "پێوەندیی بەرگری" بە پێی بڕیارێکی حیزبی دامەزراو لەبەرەوە بوو بە ڕێکخراوێکی دیموکراتیو جەماوەریی ئافرەتان.

(پێوەندیی بەرگری) لیژنەیەکی باڵای بۆ دروست بوو کە هێندێك لە ئەندامانی لیژنەی باڵای - هیچ نەبێ لە قۆناخێکی دیاریکراودا - پیاو بوون. بە هاوکاریی ئێمەو ئافرەتە شیوعیەکان بەرنامەیەکی بۆ داڕێژراو بلاوکراوەیەکی نهێنیی تایبەت بە خۆیی دەرکرد. (دوابەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ مۆڵەتی یاسایی دەستگیر بوو).

* * *

قۆناخێکی مێژووی زیندانە سیاسیەکان، بە تایبەت لـە هەلومـەرجی هـەڵچوونی شۆڕشـگێڕانەو جەماوەریی سـاڵانی ١٩٥١ ـ ١٩٥٣ دا، گـەلێك مـان لـە خـواردن گرتنی زیندانیە سیاسیەکانی لە پێناوی مافە سیاسیو مرۆڤایەتیەکانیاندا بـەخۆوە دی. (هەست بە پەشیمانی دەکەم کاتێك دێتەوە یادم کـە مـن جارێکیـان رامسـپارد مان بگرن ). لە گەرمەی هەر مانگرتنێکدا کەمو زۆر چەندین بانگەوازمان بۆ گـەل دەردەکرد، تا پشتیوانیی داخوازی ڕەوای مانگران بکەن. زۆربەی کات خێزانەکانیان کۆدەبوونەوە بۆ یاداشتنامەدان بە دەسـەڵاتدارانی حکومـەتیو حیزبو سـەندیکاو رۆژنامە نیشتمانیەکانو بانگیان دەکردن بۆ پشتگیری رۆڵە مانگرەکانیان. جاروبـار ئەو خێزانانە بە خۆپیشاندانەوە دەهاتنە دەر تا سەرنجی خەڵك بـۆ لای کێشـەی رۆڵـە مانگرەکانیان رابکێشن.

کە مانگرتنەکە درێـژەی دەکێشـا، تەندروسـتیی هێندێـك لـە مـانگران رووی لـە خراپـی دەکـردو دەبـوە هـۆی گواسـتنەوەیان بـۆ نەخۆشـخانە بـۆ چارەسـەرکردنیان. (نعمـان محمـد صــالح)ی زیندانیـی شـیوعی یـەکێك بـوو لـەو مانگرانـەو بـۆ نەخۆشـخانەیەکی بـەغدا گوێزرایـەوە. پـاش فـەحس پزیشـکەکان پێیـانگوت ئەگـەر لەسـەر مـانگرتن بـەردەوام بـێ وا چـاوەڕوان دەکـەن بمرێ. هێندێکیـان هـەوڵێکی مرۆدۆستانەو دڵسۆزانەیان دا تا ناچاری بکەن مانگرتنەکە دوایی پێ بـهێنێ، یـا ـ لانی کەم ـ رازی ببێ بە رێگەی نۆشداریی وەك ئاوی خۆراکبەخش (الماء المغـذي) یـا دەرزی لێدان خواردنی بدەنێ. بەڵام ئەو لاوە بە تاقی تـەنیا مـانگرتن شـکاندنی بـە توندی رەتکردەوەو پێ داگر بوو لەسەر دوایی پێـهێنانی هـەر کـاتێك دەسـەڵاتداران ملیـان بـۆ داواکـاریی خـۆیو هـاوڕێ مانگرەکـانیدا. هـەروەها قـایل نـەبوو ئـاوی خۆراکبەخش یا شتی وا وەربگـرێ، گاڵتـەی بـەو مردنـە دەهـات کـە بـاڵی بەسـەردا کێشا بوو. سەرەنجام لە نێو نەخۆشـخانەدا مـرد. رۆژی دوایـی هەڤاڵـە شـیوعیەکانی لەبـەردەم نەخۆشـخانەدا کۆبوونـەوەو تەرمەکـەیيان لـە دەسـەڵاتداران سـەندو بـە

خۆپیشاندانێکی جەماوەریی مێژوویی پتر لە بیست هەزار کەسی بەرپیان کرد. گەلێك پیاوی نیشتمانپەروەری حیزبە بەرهەڵستەکانی رژێمو بێلایەنەکان هاوبەشیی خۆپیشاندانەکەیان کرد. (الجواهری)ی کەڵە شاعیر لە نێو بەشداراندا بوو، بە چەند قسەو دێرە شیعرێك لاوانی خستە جۆشو خرۆشو، سەر گوتاری ژمارەی رۆژی دواتری رۆژنامەکەیی (الرأی العام) بۆهەمان بابەت تەرخان کردو رژێمو ئیمپریالیزمی بەریتانیای تێدا ئابرِوو بردو ریسوای کردن.

ئاخرو ئۆخریی ١٩٥١ بیری دەستکاریی پەیماننامەی نیشتمانی - بەرنامەی حیزب - م لە لا پەیدا بوو کە ماوەیەکی کەم بەر لە کۆتایی دووەمین جەنگی جیهانی لە ١٩٤٥ دا بڕیاری لەسەر درا بوو. ئەرکی یەکەمین دارشتنەوەیم گرتە ئەستۆ. هەروەها بەڵگە نامەی ١٩٤٥ م کردە بنەرەتو شێوە کورتکراوەو روونەکەیم پاراست چونکە دڵبەستەی بوو بوومو، گەلێك بەندیم بە بێ دەستکاری هێشتەوەو دەستکارییانم بە پێویست نەزانی. بەڵام دەستکاریەکی سەرەکیی کێشە ستراتیجیەکانو دەسەلاتو مەسەلەی نەتەوەییی کوردو کێشەی کشتوکاڵم کرد.

- پوختەی دروشمی ستراتیجی پێوەند دار بە دەسەلات لە بەڵگەنامەی ١٩٤٥دا "دامەزراندنی حکوومەتێکی نیشتمانیی دیموکراتی" بوو، بە بێ هیچ دەستبردنێك یا ئاماژەکردنێك بۆ پاشە رۆژی رژێمی پاشایەتیو مرۆڤ وای لێ حاڵی دەبوو: حیزب ژێر زارەکی بە مانەوەی ئەو رژێمە قایلە. من لەوەدا نامەوێ گلەیی لە فەهد بکەم کە لە ١٩٤٥دا بەرنامەکەی دارشتووە، چونکە هەلومەرج تەواو جیاوازو دووەم جەنگ بەردەوام بوو. رژێمی عیراقیش لە پەیمانی دژ بە فاشیزمدا ئەندام بوو..تد. بەڵام لە ساڵانی دوای جەنگدا چەندین گۆڕانکاریی بایەخدار بەسەر باروودۆخی عیراقو جیهانداهاتن. پێم وابوو ئیتر وەختیەتی دروشمی ستراتیجیی پێوەنددار بە کێشەی دەسەلات بگۆڕدرێت. بەو پێیە دارشتنە تازەکەی بیری رووخاندنی رژێمی پاشایەتیو دامەزراندنی حوکمێکی کۆماریو میللیی نوێنەری خواستی کرێکارانو جووتیارانو جەماوەری گەلی تێدا جێ کرایەوە.

ـ دارِشتنە کۆنەکەی پەیماننامە کە گەلی کوردی تێدا بە کەمە نەتەوەیەکی عیراقی خاوەن مافی یەکسانی دانرابوو، هیچ ئاماژەیەکی تێدا نەکرا بوو بۆ ئەوەی کە ئەم گەلە دووەم نەتەوەی عیراق پێکدەهێنێ‌و مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەیە. لام وابێ ئەم دارِشتنە هیی کاتێکە کە گیروگرفتی کورد لە عیراقدا لای فەهد روون‌و ئاشکرا نەبووو، رێکخستنە حیزبییە شیوعیەکانی نێو کوردی عیراقیش نەگەیشتبوونە ئەو ئاستە کامڵەی کە کێشەی ئەم گەلە بە لێکۆڵینەوەیەکی راست‌و دروستەوە پێشان بدەن. بەڵگەنامە دەستکاریکراوەکە لە جیاتیی ئەم بەرچاو خستنە ناتەواوە، مافی بڕیاردانی چارەنووسی بۆ گەلی کورد لە عیراقدا تێدا بوو.

ـ بەڵگە نامە تازەکە لە بریی بە تەنیا داواکردنی بەشینەوەی زەوی‌و زاری میری بەسەر جووتیاراندا (وەك لە بەڵگەنامەی ١٩٤٥دا هاتبوو)، بەشینەوەی زەوی‌و زاری دەرەبەگ‌و موڵکدارە گەورەکانیشی بەسەر جووتیاراندا تێدا بوو.

ـ بەڵگە نامە تازەکە هەڵوێستێکی ئاشکرا تری تێدا بەرانبەر بە سەرمایە خستنەوە (استثمارات)و بنکە ئابووریە ئیمپریالیەکان لەوڵاتەکەماندا جێ کرابووەوە.

دارِشتنی پەیماننامە (بەرنامە) تازەکە بەهاری ١٩٥٢ لە لایەن کۆمیتەی ناوەندیمانەوەو بە بێ هیچ کۆنگرە یا کۆنفرانس بەستنێك بۆ لێدوان‌و چەسپاندنی ئەو دەستکاریانە بڕیاری لەسەر دراو بڵاوکرایەوە. بیرم نایێ هیچ شیوعیەکی دەرەوەی بەندیخانە بەرهەڵستیی ئەو دەستکاریانەی کرد بێ. بەڵام هێندێك شیوعیی نێو بەندیخانە بەرهەڵستیی بیری رووخاندنی رژێمی پاشایەتی‌و دامەزراندنی کۆماری میللییان کرد. ئەم بەرهەڵستیکردنە یەکێك بوو لەو بنەما فیکرییانەی کە دووکەرتبوونی تاقمی ئاڵای کارگەران (راية الشغيلة) لە ئازاری ١٩٥٣دا پشتی پێ بەست.

دیارە جەماوەری هاوسۆزی (حشع) دارِشتەی بەرنامە دەستکاریکراوەکەی پەسەند کردو، هەر ئەوەیش زەمینەی کۆمەڵایەتیی زەینیی بۆ خستنە رووی دروشمی

رووخـاندنی رژێـمی پاشـایەتیو دامـەزراندنی کۆمـاری لەسـەرو بـەندی راپـەڕینی تشرینی ١٩٥٢ دا خۆش کردو سەدان هەزار خۆپیشاندەر لە شـەقامەکانی بـەغدادا بە هوراکێشان ئەو دروشمەیان دەگوتەوە.

* * *

گـەلێك وەفـدی کرێکـارانو قوتابییـانو لاوان چـەند دانەیـەك سـکالاّ نامـەو برووسـکەیان بـۆ حیزبـە نیشـتمانیەکانو رۆژنامـە بەرهەڵسـتەکان دەبرد، داوایـان لێدەکردن پشتگیریی داواکاریە سەندیکاییو سیاسیەکانیان بکەن. پێشتر ئەو سکالاّ نامـەو برووسـکانەیان ئاراسـتەی دەسـەلاّتداران کـرد بـوو. ئـەو وەفدانـە لـە سـەردانێکیاندا بـۆ بارەگـای رۆژنامـەی (الاهـالی)ی زمانحـاڵی حیزبی نیشـتمانیی دیموکراتی (الوطني الديمقراطي)، گلەییەکی توندیان لە رۆژنامەکەو خودی (کامل الچادرچی)کـرد بـوو، چونکـە لـەو رۆژانـەی رابـردوودا سـکالاّو داواکـاریی ئـەوانی بلاّونەکردبوەوە. (کامل الچادرچی) بە قسەیەکی وا وەلاّمی دابوونەوە:

- برایان ! بۆچی وەزعی ئێمە بە هەند ناگرنو کـەمێك بـە داد نـابن لەگـەڵماندا؟ نابینن ئینگلیز (حسین جمیـل)ی کـردووە بـە چـاودێر بەسـەرمەوە ، تـا هەناسـەکانم بژمێرێ؟

ئەگەر چی من زانیاریی وا بڕواپێکراوم لا نییە رێم بـدەن (حسـین جمیـل) ریسـوا بکەم یا بێ تاوانیی بسەلێنم، هەر ئەوەندە دەزانم کە سـکرتێری حیزبی نیشـتمانیی دیموکراتی (الوطني الديمقراطي) بوو، بەلاّم لە نێو عیراقیەکاندا هەمهەمەی لەسـەر بووو بەوە تاوانباریان دەکرد کە پێوەندیی بە ئینگلیزەوە هەیە.

* * *

(صادق الفلاحی) لە خانوویەکدا دادەنیشت کە بۆ خێزانی (باقر جعفر) مـان بـە کرێ گرتبوو. پاش ماوەیەك بۆی دەرکەوت پارەکـانی گیرفـانی کـەم دەکـەن. لـە (أم باقر)و خوشـکەکەی بـە گومـان بـووو مەسـەلەکەی لا کردمـەوە. ئامۆژگـاریم کـرد پیشەکیو بەر لە تاوانبار کردنی هەر کەسێك، دڵنیا ببێ. لێی پرسیم:

ـ جا چۆن دەکرێت دڵنیا ببم ؟

ـ پێش داکەندنو هەڵواسینی چاکەتەکەت، پارەکانی گیرفانت بژمێرە. کە لەبەری دەکەیەوەو لە ماڵ دەچیتە دەرێ، دیسان بیانژمێرەوە.

کە لە ژوانێکی دیکەدا یەکترمان بینیەوە، پێی گوتم: دڵنیا بووم. لەسەر ئەوە پێکهاتین لەگەڵ خێزانێکی ئاوادا نەژی. شوێنێکی دیکەی گونجاومان بۆ پەیدا کرد. بۆیە سواری پاسکیلەکەی بوو، بەیانیەکی زوو هەموو کەلو پەلێکی لە گوێزانەوە هاتووی خۆیی لە پاشکۆی پاسکیلەکەیدا هەلگرتو ئەو ماڵەی بەجێ هێشت. کەلوپەلەکانی لە چەند کیلۆ گرامێکی کەم زیاتر نەبوون. لە ڕێگە مەفرەزەیەکی پۆلیسی گەرۆك نیزیك بە گۆڕەپانی (السباع) گومانی لێ کردبوو، چونکە قۆمیسەری بەرپرسی مەفرەزەکە پێی وابووە ئەم پاسکیل سوارە جانتا شەتەك دراوەکەی پشتیی دزیوە. داوایان لێکردبوو بوەستێ.ئەویش لە ترسی ئەوەی نەبادا ناسیبێتیانەوە، گوێی پێ نەدابوون. ڕاوە دوویان نابوو تا پاسکیلەکە بەر لەمپەرێك کەوتبووو هەڵنووتابوو، (صادق)یش کەتبوە خوارو بەناوی دزەوە گیرا بوو. کە جانتاکەییان کردبوەوەو پشکنیبوویان، لەبریی کەلوپەلی دزراو بلاوکراوەی شیوعیانەیان تێدا دیبوو. بردبوویانە ئاسایشی گشتیو وەك نەریتیهەمیشەییان بەبارمتە خستبوویانە ژێر ئەشکەنجەو لێکولینەوە.

ئەم کەرەتەیش وەك کەرەتی پێشوو، ئازاو خۆ ڕاگر مایەوە. دایان بە دادگا، سەرلەنۆی حوکمی چوار ساڵ زیندانیان بەسەردا دا.

* * *

کە ساڵی ١٩٥٢ (مادلین میر)ی کچە جوولەکەی بەغدابیم هێنا، تەمەنم ٢٥ ساڵ بوو. مادلین خەباتکارێکی زیتەڵەی پێشکەوتوو بوو. پاش ئەوەی دەسەلاتداران فەرمانی دەستگیر کردنیان دا، خۆیی شاردەوە. مادلین سەرباری ئەوەی کە هەم کوڵە بنە بووو هەم نەدەکرا بخرێتە ڕیزی شۆخە کچانەوە، بەڵام ئاکاری شەخسی وسیاسیی

باش بوو. جارێکیان (خالد بکداش) گلەییی لێکردم کە ئافرەتێکی جوولەکەم هێناوە. وەڵامم دایەوە کە من مرۆڤێکی تێکۆشو شیوعییەکی باشم کردووە بە هاوسەرم. ئەوی ڕاستی بێ من هەرگیز هەستم بە تەنگە تاوی نەکردووە لەبەر ئەوەی کچێکی جوولەکەم هێناوە، هیچ کچێکی موسڵمان یا دیانم لەو پێ باشتر نەبوە.

ژنهێنانەکەم نە ئەنجامی - هیچ نەبێ سەبارەت بە خۆم - پێوەندییەکی کۆنی دڵداری بووو، نە پێشتریش لە پێوەندییەکی جنسی گلا بووم، بەڵکوو لەبەر ئەوەی پێویستم بە ماڵێك هەبوو تێیدا دابنیشمو بەخێزانێکی تایبەت بەخۆمو بەئافرەتێکیش لەسەر جێگە لەگەڵیدا بنووم. ئیتر بەبێ نەخشە بۆ کێشانی پێشوەخت سازبوو. بەر لە ژنهێنان، لە بەغدا بە حوکمی کاری حیزبیم چاوم بە گەلێك کچی دیکە دەکەوت. بەڵام قەت هەوڵم نەدەدا پێوەندییەکی شەخسی - دڵداری یا جنسی - لەگەڵ هیچ یەکێکیاندا ببەستم. ئەو شتە کە مێشکی خەریك دەکردم، حیزبو بە تەنیا حیزب بوو. لەبەر ئەوەی بەرپرسێکی حیزب بووم، یەکجار بە تەنگ بێ گەردیی شانو شکۆمەوە بووم.

پاش ژنهێنان، ئەمجا دەمتوانی لە ماڵێکی سەربەخۆو بارودۆخێکی - لە ڕووی ئەنجامدانی چالاکیی حیزبییمەوە - باشتردا لەگەڵ ژنەکەمدا بژیم. ژنم هێنا بەبێ ئەوەی تاکە فلسێك بۆ ڕێ ورەسمی ژنهێنان یا بۆ کڕینی شتێك بۆ خۆم یان بۆ ئەو خەرج بکەم. ناو ماڵەکەمان هەر بە سادەییو، بگرە لە سادە کەمتریش مایەوە. بەدرێژاییی ئەو ساڵەی تێدا پێکەوە ژیانمان هیچ شتێکمان نەکڕی، نە قەرەوێڵەو پێخەوی بووکێنیو دارو تەختەو نە هیچ شتێك. دوو شۆڕشگێر بووین، لەوە بەدەرکە ئەرکی حیزبی بەباشترین شێوە ڕابپەڕێنین، هیچ خەفەتێکی دیکەمان نەبوو. فلسێکمان لە پارەی حیزب بۆ جلوبەرگی خۆمان خەرج نەدەکرد. هەر ئەوەندەمان پێ بەس بوو چەند پارچەیەك لەو جلوبەرگانە هەڵبگرین کە هەڤاڵانو دۆستانی خاوەن گوزەرانێکی باشتر ناو بە ناو دەیانبەخشین بۆ بەشینەوەیان بەسەر خێزانە دەستکورتەکاندا.

نێزیکەی ساڵێك لەگەڵ مادلیندا ژیام. ئەو ماوەیە درێژەی بەچالاکیی حیزبیی خۆی دەدا. بیرم نایێ هیچ ڕۆژێك گیروگرفتێکی ڕاستەقینە - لە ڕووی پێوەندیی شەخسیمانەوە - لە نێوانماندا پەیدا بوو بێ. بەڵام سەروبەندی پێکەوە ژیانمان چەند ساتێکی ئەستەمان بەسەردا تێپەڕین. ساتی هەرە ئەستەمان دوا دواییەکانی ۱۹۵۲ بوو، کاتێك لە خانوویەکی بچووکی گەڕەکی (الاعظمیة) دادەنیشتین. خەریکی پاککردنەوەی دەمانچەکەم بووم‌و، ئەویش نێزیك بە ناوەوەی هۆڵەکە ڕاوەستا بوو. وەك چۆن لاوان لەم یا لەوولات پەنا دەبەنە بەر گاڵتەو گەمەی بۆش‌و بێ مانا، ڕووی دەمی دەمانچەکەم کردە سەری، بە تەواوی پێم وابوو دوا گوللەم لێ خاڵی کردووەتەوە. پەنجەم نا بە پەلە پیتکەکەدا. گوللەکە دەرپەڕی. ئای کە گوللەیەکی ترسناك بوو! لەوانەیە یەك سانتیمەتر یا کەمێك زیاتر دوور لەدەم‌وچاوی فرتەی کرد بێ. لای وابوو من گوللەکەم هەر بۆ گاڵتەوگەمەو ترساندن تەقاند بێ. بەبێ ئەوەی هەست بە ترسێکی ڕاستەقینە بکات، گوتی:

- هەڤاڵ، کەڕت کردم!

منیش تاوێك کەوتمە حاڵی نیوچە لە هۆش خۆ چوونێکەوەو ڕەنگم بە یەکجاری زەرد هەڵگەڕا، چونکە وا مزانی گوللەکە پێکای.چاوەڕوانم دەکرد بەمردوویی بکەوێتە سەر ئەرز. بێگومان هەر بە ڕێکەوت پێوە نەبوو، ڕێکەوتێکی بە لای منەوە ئەوپەڕی خۆش بوو. کە بۆم دەرکەوت گوللەکە بەری نەکەوتووە، کەمێك هاتمەوە سەر خۆم. بەڵام ڕووداوەکە لەو ماوەیەی دواییدا کارێکی گەورەی کردە سەر مێشکم. وام بە خەیاڵدا هات کە منیش دەمردم یا شێت دەبووم، ئەگەر دوای ئەم گاڵتە بێ مانایە گوللەکە بیئەنگاوتبایە. تا ئەمڕۆ کە ئەو ڕووداوەم دێتەوە یاد، تەزوویەکی ڕاستەقینە هەموو لەشم دەگرێتەوە.

کە بەهاری ۱۹۵۲ لە خانوویەکی چکۆلەی (کمب الصلیخ) لەگەڵ مادلیندا پێکەوە دەژیاین، چەند ساتێکی دژوارمان بەسەر برد. (محمد راضي شبر)م لەلا

دانیشتبوو، باسی چەند کێشەیەکی حیزبیمان دەکرد (نامە خوێندنەوەو وەڵامدانەوەیان ). کتو پڕ گوێمان لە لێدانی توندی دەرگای خانووەکە بوو. دوا بە دوای ئەوە مادلین بە پەلە خۆیی کرد بە ژووورداو چرپاندی:

- هەڤاڵ ! پۆلیس چواردەوری گرتین !

بەردەوامیی بە توندی دەرگا کوتانەکە جێی گومانو جەختکردن بوو لەسەر ڕاستیی قسەی ژنەکەم. وێڕای ئەوە بڕیارم دا خۆم ڕاستەوخۆ لێی دڵنیا ببم. چووم تا لە پەنجارەیەکی بچووکەوە کە یەکسەر بەسەر بەردەرگای دەرەوەی خانوەکەدا دەیڕوانی، تەماشا بکەم. بە چاوی خۆم ئەفسەرێکی پۆلیسم لەگەڵ چەند پۆلیسێکدا بە بەرگی ڕەسمی یەوە دی. ئیتر باوەڕم کرد کە چوار دەورمان گیراوە. بە ڕاکردن هاتمەوە ژوور، توورەکەی نامە حیزبییەکانم بردو لەگەڵ (محمد راضي شبر)و(مادلین)دا هەڵاتینو سەرکەوتینە سەربان، تا لەوێوە بچینە سەربانی خانوەکەی پیشتەوەمانو بە قادرمەکەدا دابەزینە نێو حەوشە چکۆلەکەیو لەوێشەوە بچینە دەر بۆ جادەی لاکۆڵانەکە. بەدەستو بردو خێرایی ئەوەمان کرد، وەك چۆن لە فیلمی کاوبۆیدا دەکرێت. بە پەلە پەل درێژەمان بەڕاکردن دا، تا لە مەترسیەکە دوور کەوتینەوە. مادلین لە بازدانو ڕاکردندا وەکوو ئێمەی پێ نەدەکرا. بەڵام دوا جار پێمان گەیشتەوەو هەرسی لێك جوێ بووینەوە، دڵشاد بووین کە لە چنگی دوژمنان قوتار بووین.

(صبیح سباهی ) مان پاش کەمتر لە سەعاتێك نارد تا لە نێزیکی خانووەکەمانەوە سۆراخێك بکات، بەڵکوو هەواڵێکی دەست بکەوێو بزانێ چی لەوێ قەوماوە. ئەوەندەی نەخایاند هاتەوە لامانو گوتی: هەموو شتێك ئاساییو هێمنەو هیچی وا لە گۆڕێدا نییە نیشانەی قەومانی شتێك بوو بێ. ئەو ڕۆژە چەند جارێك ڕۆیشتو سۆراخی کردەوە. هەموو کەرەتێك هەمان تێڕوانین یا زانیاریی بۆ دەهێنایەنەوە. منیش ئەم کەینو بەینە چەواشەی کرد بووم. تۆ بڵێی - بەهەر

شێوەیەك بووە ـ دەرگاکەیان کردبێتــەوەو بـەبێ ئـەوەی بـوو بنـە هـۆی هیـچ هـاتو هاوارێك بۆسەیان لە ماڵەکەدا نابێتەوە، یا دەبێ شتێکی دیکە لە ئارادا بێ؟ دەبـێ چـی ڕووی دابـێ ؟ ئـەی خـۆم ئەفسـەری پۆلیسـەکەم بـە چـاوی خـۆم نـەدی ؟ سـەر لەبەیانیی ڕۆژی دوایی(صبیح)م ناردلە دەرگـای مـاڵەکـەی دراوسـێمان بـدات. (أبـو ناصر)ی خاوەن مـاڵەکە کابرایەکی زەحمەتکێش بوو، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەسـەر ناسـنامە (هویـة)ی سیاسـیو چـالاکیی حیزبیمـان بزانـی، پێوەندییـەکی بـەتینی پێمانەوە هەبوو. (أبو ناصر) دەرگاکەی کردبووەوەو (صبیح) لێی پرسیبوو:

ـ زەحمەت نەبێ دەزانن دانیشتووی خانوەکەی دراوسـێتان لـە کوێـن ؟ دوێ شـەو ئەم بەیانییەیش هاتم، لە ماڵ نین ؟

ـ نازانم بۆ کوێ چوون. دوێنێ سێ جار هاتنە سـەریان لـە مـاڵ نـەبوون. شەویش هیچ گلۆپێکی ماڵەکەمان نەدی هەلکرا بێ.

ـ هیچیان لێ دەویستن ؟ پێدەچێ چوو بنە کەرکوك. ئەگەر پێویستی کرد دەچمـە لایان.

ـ خانوەکەیان داناوە بۆ فرۆشتن. دەلاڵەکە لەگەڵ ئەفسـەرێکی پۆلیسدا هـاتن تـا ببینن‌و مامەڵەی کڕینی بکەن.

کەواتە مەسەلەکە ئەمەیە ! شتی وا نەبوە پۆلیس چواردەوری مالەکـەی گرتبـێ، بەڵکوو سات‌و سەودای کڕیـن‌و فرۆشـتن هـەبوە. لەبـەر ئـەوەی کڕیارەکـە ئەفسـەری پۆلیسی ناوچەکە بوو، ژمارەیـەك پۆلیـس لـە پۆلیسـخانەوە بـۆ لوتـف نوانـدن لـە خزمەتیدا بوون تا ئەوێ. (صبیح ) بـە ڕوویـەکی گەشـەوە هاتـەوەو قسـەکانی (أبـو ناصر)ی بۆ گێڕامەوە. شەو لەگەڵ مادلیندا گەڕامەوە بۆ ماڵ. میزاجمان بەهۆی ئەو ڕووداوانەوە تێك چوو بوو. بەڵام دامەزراویی وەزعمان زۆر درێژەی نەکێشا. سێ چوار ڕۆژ لەوە بە دوا، ئێوارەی ڕۆژێکیان لە ماڵ نەبووم، دیسـان لـە دەرگایـان دابـووەوە. مادلین بە تەنیا بوو، وای بە خەیاڵدا هاتبوو پۆلیس چوار دەوریان گرتبێ بۆیە سەر

لەنوێو بەهەمان ڕێگەی پێشوو ڕایکردبوو. ئەوەی لێ قەوما بوو، چونکە بەبێ هۆ شلەژاو بە نارەوایش ترسا بوو. خێزانی ماڵە دراوسێکەی پشتەوە، لەکاتی ڕاکردنیدا دیبوویان. دیمەنەکە سەرنجڕاکێش بووە: ئافرەتێکی گەنج لە سەربانەوە باز بداتە حەوشەی خانوەکەو لەوێوە بە توندی تێبتەقێنێ. ئەمە لە نێو کۆمەڵگەیەکی جووتیار ڕەوشتی پاشکەوتووی وەك کۆمەڵگەی بەغدای ١٩٥٢ دا !

مادلین هەر دەستبەجێ پاش هەڵاتن پەیی بەوە برد بوو هەڵەی کردووە، بۆیە هەر لە هەمان سەعاتدا، سەعاتێك بەر لە هاتنەوەم، لە خۆوە گەڕا بوەوە بۆ ماڵ.

ئێوارە لە حەوشە ڕاوەستا بووم. کابرایەك لەسەربانەوە دەرکەوت، سڵاوی لێکردمو پێی گوتم:

- دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم.

ناسیمەوە، دراوسێکەی پشتەوەمان بوو؛ خاوەنی ئەو ماڵەی کە لەوێوە ڕامانکرد. چوومە لای بۆ سەربانو بە کەمێك سەخڵەتیو شەرمەوە کەوتە قسە کردن:

- کاك عەلی، هەموو خەڵکانی دەورو بەرتان دەزانن ئێوە چەندە چاکن ! هەموویان سوپاستان دەکەن. بەڵام زۆر جێی داخە ئافرەتێکی وا گلاو کە خوشکتانە یا شتێکی دیکەیە، لە ماڵەکەتاندا بێ.

لە هیچ شتێکدا لە ئێوە ناچێو ناخابن کە مایەی روو سووری نییە بۆتان.

دەمو دەست زانیم کابرای هاوسێ دەیەوێ چی بڵێت. وام پێشان دا بێ ئەندازە قسەکانی بە هەند وەرگرم. درێژەی پێدا:

- خۆزگە ئەم ئافرەتە بەد ڕەوشتو گلاوە قەرەتان نەدەکەوت. هەر کاتێك بە هەڵی بزانێ پیاو دەهێنێتە ماڵو لەشفرۆشی دەکات. دوو ڕۆژ لەمەو بەر دوو پیاوی لە تەکدا بوون، لەگەڵیدا ڕایاندە بوارد. کە هاتنەوە ماڵو لە دەرگاتان دا ترسا کارەکەی بکەوێتە ڕوو، هەرسێکیان هەڵاتن. بەڵێ، بە ماڵی ئێمەدا هەڵاتن. دوو ڕۆژ پاشتریش هەمان کاری بێ ئابڕوویی کرایەوەو سەر لە نوێ لە ماڵی ئێمەوە ڕایکرد.

تۆ دەزانی بۆچی کە ئێوە لە ماڵ نابن پیاو دەهێنێتە لای خۆی. تەنانەت ئێمەی دراوسێیش هەست بە شەرمو شوورەیی دەکەین.
سوپاسی کابرام کرد کە ئەم هەواڵە گرنگانەی داومیو وەهام تێگەیاند گوایە پێشتر ئاگام لە شتێکی لەم چەشنە نەبوە و؛ بە گەرمی تکام لێکرد لەبەر شانو شکۆی ئێمە کە هاوسێی ئەوین، ئەم هەواڵە پەردە پۆش بکات. نەمدەتوانی بەڕاستی پێی بڵێم چی ڕووی داوەو چی نێوە نێوی کچەی داوە ڕابکاتو من خۆیشم یەکێك بووم لە ڕاکردوەکان. کابرا گفتی دامێ ئەم نهێنیە نەدرکێنێ. بڕیارم دا سەری مانگ بگوێزمەوە بۆ خانوویەکی دیکە. بەڵام ڕووداوەکانی لەوە بە دوا تا سەری مانگ مۆڵەتیان نەدام. بەیانیی ڕۆژی دوایی شتێکی چاوەڕوان نەکراوی لەگەڵ خۆدا هێنا. دەرکەوت خەڵکانی دەوراندەورمان ڕووداوەکەیان بیستووە، زانیویانە ئافرەتێکی " قەحبە " لە ماڵەکەماندایە. " أبو ناصر"ی دراوسێ باشەکەمان کە خۆیی بەوەکیلی خانووەکە دادەنا، هاتە لامو گوتی:
ـ کاك عەلی ئێوە خەڵکێکی زۆر باشن ! بەڵام ئەم کچە نەفرەتیە لە ئێوە ناچێو ڕووی ڕەش کردوون. دەبێ بە زووترین کات بگوێزنەوە تا خەڵکەکەی دەوروبەرتان کارێك نەکەن با بە دەواری شڕی نەکرد بێ.
ـ باشە أبو ناصر ! ئەوەندەی بکرێت خێرا دەگوێزینەوە. ئێستا دەڕۆم بە دوای خانوویەکی دیکەی کرێدا دەگەڕێم.
ڕۆیشتم، بە پەلە خانوویەکی دیکەی دوو ژووریم لەوبەری گەڕەك بە کرێ گرت. هانام بۆ (صبیح) برد، تا یاریدەم بدات ناوماڵە هاکەزاییەکەمان بە عەرەبانەیەکی یەك ئەسپی بگوێزینەوە. کە ناوماڵەکەم ڕەوانە کرد، بە تەنیا مامەوە تا چەند قسەیەك لەگەڵ (أبو ناصر) دا بکەم. ڕەنگە هیچ پێویستی نەکرد بێ خۆ بخەمە داوی قسەو قسە لۆکێکی واوە کە بڕیارم دابوو لەگەل کابرادا بیانکەم. بەڵام هەرچی چۆنێك بوو تێکەوتم. دەستم بە پاسکیلەکەمەوە گرتبوو، لە دەرگام دا کابرا هاتە دەر.

- برادەرە باشەکەم وا ماڵەکەمان گواستەوە. هاتم خواحافیزیت لیٚ بکەمو شتیٚکت پیٚ بڵیٚم نەتزانیوە.

- أبو ناصر پرسیی: چیم پیٚ دەڵیٚی؟

- حەز دەکەم بزانی ئەو ئافرەتە کە بە داوێن پیستان لە قەڵەمدا وا نییە وەك ئێوە بۆی چوون. بەڵکوو ژنەو ئەو رۆژەی ئەفسەری پۆلیسەکە هاتو لە دەرگایدا، منو هەڤاڵێکی میوانمان لەگەڵیدا رامانکرد. ئێمە شیوعین، خۆمان شاردووەتەوەو پۆلیس راوەدوومان دەنیٚ. وامانزانی هاتوون پەلاماری ماڵەکە بدەن، بۆیە رامانکرد. ئەمە هەموو مەسەلەکەیە. داوای خیٚرو کامەرانیتان بۆ دەکەم. خوا حافیز براگیان !

(أبو ناصر) باوەشی پیٚدا کردم، بە گەرمی ماچی کردمو دەستەوداوێنم بوو لە خانوەکە بمێنمەوە. بەڵێنی دا هەر کەسێکی گەڕەك خراپەمان دەرهەق بکات ئەم لێی بە دەنگ بیٚ، بەڵاّم مانەوەمان مەحاڵ بوو. ماڵئاواییم لیٚکردو سواری پاسکیلەکەم بوومو رۆیشتم. ماڵە تازەکەی ئەویٚ خۆش بوو بە رێکەوت موڵکی ژنەکەی (عبدالستار القیسی)ی زیندانیی شیوعی بوو. بەوەم نەدەزانی، چەند حەفتەیەك لەوەو دوا پیرەژنێك سەری لیٚ داینو لیٚکدا لیٚکدا کەوتە قسە رستنو هەموو شتێکی باشو خراپی درکاند. پیٚش ئەوەی بەجیٚمان بهیٚلیٚ، گوتی:

- خوا یار بیٚ بەم نێزیکانە (ستار) حوکمەکەی دوایی پیٚدەهێنیٚ، دیٚتەوە لامان.

دوو مانگێك کەمتر لەوەو دوا، رۆژێکیان دوو لاو خۆیانیان کرد بە ماڵدا، یەکێکیان گوتی:

- من خاوەنی ئەم خانوەمو ناوم (ستار)ە. ئەم برایەیش ئەندازیارە، لەگەڵ خۆمدا هێناومە تا بیناکە ببینیٚ، لەوە بکۆڵیٚتەوە کە ئاخۆ دەکریٚت ژوورێکی زیادەی تیٚدا دروست بکەین. لە کاتێکدا ئەندازیارەکە تەماشای ژوورەکانی کرد چاوی بە ستێنسلێك کەوت بە تایپڕایتەر چاپکرابوو ئامادە بوو بخریٚتە سەر دەزگای رۆنیۆ. ئەوە هەستی خۆتیٚهەڵقورتاندنی لە لا وروووژاندو لیٚی پرسیم:

- تۆ چ کارەی ؟

دەرکم بەوە کرد ئەم پرسیارە پێوەندیی بەو ستێنسلەوە هەیە کە دیویە. سەیرم کرد لە قافدا گیراوم. (عبدالستار القیسی) دەستبەجێ، بە بێ مەبەستو بێ ئەوەی بزانێ من لە چ وەزعێکدام رزگاری کردم، پێش ئەوەی دەم هەڵبهێنمەوە وەڵامی دایەوە. پێم وابێ بۆچوونی شەخسی خۆی پێ گوت:

- پۆلیسە.

ئەندازیارەکە بێدەنگ بوو، هیچ پرسیارێکی دیکەی نەکرد. پێدەچوو بێدەنگبوونەکەی لەبەر ئەوە بووبێ کە یا ترسابێ لە قسە دابستن لەگەڵ پۆلیسدا یان بوونی ئەم جۆرە ستێنسلەی لە ماڵی کاتبێکی پۆلیسخانەدا بە کارێکی ئاسایی دانابێ. منیش لە لای خۆمەوە قڕو قەپم لێکرد، وەك بڵێی ستار دەمناسیو بە راستی قسەی کردووە.

* * *

پایزی ١٩٥٢ بڕیارم دا فێری ئۆتۆمبیل لێخوڕین ببم، چونکە - بە قسەی خۆم - گوایە ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو پاسکیلەکەم بگۆڕم بە ئۆتۆمبیلێکی چکۆلە. بووین بە خاوەنی ئۆتۆمبیلێکی کۆنەی (دۆج)و (کامل السامرائی)ش لە لێخوڕینیدا بوو بە مامۆستام. پێکەوە چووینە شوێنێکی چۆڵی قەراغی بەغدا (ئێستا ناوی - بغداد الجدیدة - یە)، تا لەوێ ترایی بکەم. تا ئەمڕۆش لە بیرمە کاتێك بۆ یەکەم جار ئۆتۆمبیلم لێ خوڕیو لە پردی قیتاری (العیواضیة)ی بەری کەرخەوە پەڕیمەوە بۆ بەری (رەسافە)، چەندە تەنگەتاوو نارەحەت بووم. پردەکە خۆی لە خۆیدا تەنگە بەر بووو پەڕینەوەش بۆ من سەرکێشییەکی ترسناك بوو. سەرباری ئەوە لێخوڕینەکە خۆیشی سەرکێشی بوو، چونکە من خۆمم لە پۆلیس شاردبووەوەو، ئەو رۆژانە نەك هەر مۆڵەتی لێخوڕینم نەبووو نەمدەتوانی دەری بکەم، بەڵکوو ناسنامە (الهویة الشخصیة)یەکی ساختەیشم پێ نەبوو. بەڵام ئەو رۆژانە پۆلیسو هەموو دەسەڵاتداران سڵیان لە خاوەنی ئۆتومبیلی تایبەت دەکردەوەو رێزیان لێ دەنا.

بیرمە رۆژێکیان ئۆتۆمبیلەکەمم لە شەقامی (غازي) (دواتر شـەقامی ـ الکفـاح ـ) لێدەخوڕی، بـە هـۆی لاوازی برێکەکـەوە لـە پشـتەوە سـووك خۆمـم کێشـا بـە ئۆتۆمبیلێکی کۆنی تەکسیدا. خۆپێداکێشانەکە سووك بوو. شۆفێری تەکسییەکە بە تووڕەییەوە دابەزیو بەرەو رووم هات، هاواری دەکردو ئاگری لیّ دەبوەوە، ئەگەر چی ئۆتۆمبیلەکەی تووشـی هیـچ زیـانێك نـەبوو بـوو، رەنگـە بـە تـەما بـوو بـێ زیـانی ئۆتۆمبیلەکەیی بۆ ببژێرمەوەو برێك پارەی بدەمیّ. بەر لـەوەی بدوێـمو داکۆکـی لـە خۆم بکەم یا دان بە گوناهمدا بنێم، پۆلیسێکی هاتوچوو لێمان هاتـە پێـش، تونـد شاوڵی بۆ شۆفێری تەکسییەکە بردو گوتی:

ئێوەی شۆفێرانی تەکسی نە رێکو پێکیو ئوسوولّ دەزاننو نە شایانی رێزگرتنن. هەرچی لە شەقامەکانی بەغدادا بقەومیّ بە تەنیا گوناهی ئێوەیە. ئێوە هەر قـابیلی زیندانکردنو پارەی سزا لیّ سەندنن.

دیار بوو پۆلیسەکە لایەنگری منی خاوەن ئۆتۆمبیلی تایبـەت بـوو. لێـم نـێزیك بووەوە وسلاّوی لێکردمو لێی پرسیم:

ـ بەگم ! خۆ هیچ نەبوو ؟ ئەو شۆفێرانە بە ئەدەب نینو، نەرمی نواندن لەگەڵیاندا کەلکی نییە.

گوتم: ئەو شۆفێرە گوناهبار نییە. خراپی برێکی ئۆتۆمبیلەکەم ئەوەی قەوماند. بەلاّم هیچیان زیانمان لیّ نەکەوت. لە پۆلیسـەکە پاڕامـەوە لەگـەڵ ئـەو شـوفێرەدا نەرم بیّ. شوفێرەکە دڵی خۆش بوو، بە تەواوی دەمو کاوێژی لەگەڵمدا گۆڕیو ، ئیـتر تاقە خەمی ئەوە بوو: بـە بـیّ بەرتیلدان لـە چنگـی ئـەم پۆلیسـەی دەربهێنم. لام وابیّ نـەمتوانی دەری بـهێنم، چونکـە دوای رۆیشـتنم پۆلیسـەکە ئـەوی هێشـتەوە. لەوانەیە ئەو پارە چاوەڕوانکراوەی لیّ سەندبیّ.

ئەو ئۆتۆمبیلـی دژەجەی کـە کڕیبوومـان کردمانـە تەکسـی تـا (حـافظ)ی بـرای (کامل السامرائي) لێی بخوڕیو بۆ گواستنەوەی پۆستەو هێندێك کاروباری حیزبی سـوودی لیّ وەربگریـن. بـەلاّم سـوودمان لیّ نـەبینی، چونکــە (حــافظ) وەك

ئۆتۆمبیلێکی شەخسی دەستی بەسەردا گرت. منیش ئۆتۆمبیلێکی بچووکی دیکەی فەڕەنسیم بە ١٢٠ دینار کڕیبوو، تا بۆ هاتوچووی خۆم بەکاری بهێنم. دەبێ دانی پێدا بنێم کە فێر بوونی ئۆتۆمبیل لێخوڕین بە زیان بەسەرمدا شکایەوە، چونکە ناچاری کردم جلەکانم لە هی کرێکارێکی سادەوە بۆ هی پیاوێکی رۆشنبیر بگۆڕم و ماڵەکەم لە گەڕەکە میللییە هەژارنشینەکانەوە بگوازمەوە بۆ گەڕەکێکی کەمێك پێشکەوتووتر ؛ مەبەستم نزیکی مزگەوتەکەی گەڕەکی (الاعظمیة)یە کە ساڵی ١٩٥٣ لەوێ دووچاری گیان بووم.

*　　*　　*

## ـ ٧ ـ
# ڕاپەڕینی تشرینی ١٩٥٢

کە باسی ڕاپـەڕینی تشـرینی ١٩٥٢ دەکـەم نایشـارمەوە شـانازیی پێوەدەکـەم، لەبـەر ئـەوە نـا کـە هەسـتانێکی جـەماوەری کـەم وێنـە بـوو لـە درێژاییـی سـاڵانی سەردەمی پاشایەتیداو بەس، بەڵکوو چونکە دەسەڵاتی (حشع)ی بە شـێوەیەك تێـدا دەرکەوت کە پێشتر نموونەی نەبوو بوو. لە کاتێکدا من پلـەی یەکـەم بەرپرسـیی ئـەو حیزبەم هەبوو.

ڕاپـەڕین وا بـەرپا بـوو ببێتـە لوتکـەی زنجیرەیـەکی درێـژ لـەو مـانگرتن‌و خۆپیشـاندان‌و خەباتانـە کـە کرێکـاران‌و قوتابیـان‌و سـنعاتکاران‌و ڕۆشـنبیران لـە هەردوو ساڵی ١٩٥١ ـ ١٩٥٢ دا هاوبەشییان تێدا کردن. هێنـدە بەسـە ئامـاژە بـۆ سێ ڕووداو بکەم : مانگرتنی کرێکارانی جگەرە (کۆمپانیای خۆماڵیی جگەرە) کە ماوەیەکی کەم بەر لە ڕاپەڕین بە سەرکردەییی چەند خـەباتکارێکی شـیوعی کـراو، سـەرباری دیـاریکردنی لانـی کـەمی کـرێ، بـۆ یەکـەمجار زیـادکردنی کرێـی لـەو دەزگایەدا بەدی هێنا. یاخیبوونی جووتیارانی (آل أزیـرج) کـە لـە باشـووری عـیراق چەکیان لە دەرەبەگ‌و ڕژێم بەرز کردەوە. مانگرتنی قوتابییانی کۆلێجی دەرمانسازی (الصیدلیة)و کیمیا کە گڕاڵکی داگیرساندنی ئاگری ئەم ڕاپەڕینە بوو.

دیارە نەوت خۆمـاڵیکردنی حکوومـەتی (مصـدق) لـە ئێران‌و ململانێکـانی لەوە بەدوای دژی دەوڵەتانی ئیمپریالی، کـارێکی بەرچاویان کـردە سـەر بـارودۆخی سیاسـیی عـێراق. ئـەویش دژ بـە بـەرژەوەندی ڕژێمـی حوکمـدارو کۆلۆنیـالیزمی بـەریتانیا بـوو. کـردەو کۆشـی خـۆراوا بـۆ دانـانی بنکەیـەکی پـەیمانی نـاتۆ لـە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بە ناوی پەیمانی بەرگریکردنەوە لە ناوچەکەدا، مایەی گـرژی‌و

بێزار کردنی جەماوەری عێراق بوو کە بوو بووە خاوەنی نەریتێکی کۆڵە پنجی خەباتگێڕانە دژی پەیماننامە داسەپاوەکانی دەوڵەتانی ئیمپریالی.

لە هەموو ئەوانەیش گرنگتر، گەلی عێراق دڵی پڕ لە کینەو ڕقێکی ئەستوور بوو بەرانبەر بە ئیمپریالیزمی بەریتانیا کە بە جۆرەها شێوەی سیاسیو ئابووری باڵی بەسەر عێراقدا کێشا بوو. هەر هەڵچوونێکی جووڵانەوەی شۆڕشگێرانەی جەماوەریش بەردەوام دەیکێشایەوە بۆ تەقینەوەی ئەم بێزارییە، وەك لە کانوونی دووەمی ١٩٤٨ دا ڕوویداو تشرینی دووەمی ١٩٥٢یش دووپات بووەوە.

ئەوی ڕاستی بێ ئێمە سەعاتی سفری ڕاپەڕینمان دیاری نەکردبوو. (حشع)یش نەیدەتوانی ئەوە بکات. بەڵام حیزب پاشکۆی ڕووداوو پێشهاتەکان نەبوو، بەڵکوو پێ بە پێی دەڕۆیشتو بە جۆرێکی شێلگیرانە کاری تێدەکرد وتاوی بە خەباتی جەماوەری دەسەندو ڕێنوێنیی دەکرد. بەواتایەکی دیکە، حیزب لەم ڕاپەڕینەدا سەرداری شەقامو سەرکردەی کەس لە عۆدە نەهاتوو بوو. من شەخسی خۆم وام چاوەڕوان دەکرد خەباتی جەماوەری بگاتە چڵەو پۆپەو گەل ڕاپەڕێت. ژمارە (١٣)ی (الانجاز)ی بڵاوکراوەی نێوخۆی حیزب ئەمەی تێداهاتووە :"جووڵانەوەی نیشتمانیو دیموکراتیمان، سەرباری تیرۆری فاشیانەو دیکتاتۆریی بێ پەردەی دژ بە گەل، پەرەی سەندووەو گەورەبووە. لە کاتێکدا جووڵانەوەی سیاسیی شۆڕشگێرانەی وڵاتمان هەردوو ساڵی ١٩٤٩و ١٩٥٠ لە قەیراندا بوو، دەبینین ئەمڕۆکە ئەم جووڵانەوەیە بەرز هەڵدەچێو کۆنە پەرستیش لە قەیرانێکی توندو تیژدایە. نیشانەکانی ڕاپەڕینێکی میللیش بۆ خستنی حوکمی دیکتاتۆریو پچڕینی ئازادییە دیموکرتیەکانو بە دەستهێنانی داواکاریەکانی گەل بە بەرجەستەیی بەدی دەکەین ".

ئەو ڕاستیانە ڕوونی دەکەنەوە کەڕاپەڕین بە لای ئێمەوە شتێکی نا خافڵ نەبوو ڕووداوەکانیش لە خۆوە نەهاتنە پێش ؛ ئەگەرچی هەم تەواو لە سیفەتی خۆبەخۆیی (العفویە) خالی نەبوونو، هەم سەعاتێکی سفری پێشتر دیاریکراویش لە گۆڕێدا

نەبوو. پێشەوایانی حیزبە بۆرجوازیە نیشتمانیەکانیش پەییان بەوە برد بوو کە دۆخی سیاسیی گرژی وڵات لە مەترسیدایەو ڕووداوەکان بەرەو تەقینەوە دەچن. (کامل الچادرچی و مهدي كبة وطه الهاشمي) لەچەند یاداشتنامەیەکی شێوەی زمان توندو تیژدا بەرپرسیی تا ئەم ڕادەیە ڕوو لە خراپی کردنی دۆخەکەیان دا بەسەر تەلاری پاشایی‌و شەخسی (عبدالالـه)ی سەروەسێتی ڕاستەوخۆی تەختی پاشایەتیداو لەسەرەنجامی درێژەدان بە فەرامۆشکردنی گێروگرفتە ئاڵۆزەکانی وڵات ئاگاداریان کردنەوە.

نازانم باڵوێزی ئینگلیزکە ئەوسا لای(عبدالالـه) وپیاوانی تاقمی حوکمدار قسەی دەبیستراً، بیری لە چی دەکردەوە. بەڵام دەکرێت جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە زۆر کەسی تاقمی حوکمدار ئاگایان لە ترسناکیی دۆخەکە بوور لە تەقینەوەیەکی میللی دەترسان. (عبدالالـه) بە پێداگریی ئەو کەسانەو، لەوانە (مصطفى العمري)ی سەرۆك وەزیران، قایل بوو کۆنگرەی - وەك ناویان نابوو - تەلاری پاشایی ببەستێ. پاش گرتنم کەریم ئەحمەد ناوی نابوو (کۆنگرەی زێراب )، چونکە گاڵتەی بەو قسەیەی (توفيق السويدي) هاتبوو کە لە دانیشتنێکی کۆنگرەدا گوتبووی: خەڵکی (الشواكە) بەرهەڵستیی ئەوە دەکەن پیسایی فڕێ بدرێتە زێرابەکانەوە.

پێم وابێ (عبدالالـه) لە هەموویان کەمتر هەستی بە مەترسی دەکرد. لە خۆبایی‌و روو قایم بوور بڕوایەکی تەواویشی بە تین‌و توانی ئینگلیز هەبوو بۆ رووبەروو بوونەوەو زاڵ بوون بەسەر هەر گێروگرفتێکدا. ڕەنگە لە ئەنجامی ئەوەوە هاتبێ کە بە هۆی هێزو لێزانیی ئینگلیزەوە چەندین مەینەتیی پێشووتری لە جوولانەوەی ڕەشید عالیی ساڵی ۱۹٤۱و ئەمجا هەڵمەتی کانوونی ۱۹٤۸دا تێپەڕاند بوو، هەر بەو لە خۆبایی بوون‌و روو قایمیەیشی بوو لەو کۆنگرەیەدا کە خۆی سازی کردبوو، سووکایەتیی بە (طه الهاشمي)ی سەرۆکی حیزبی بەرەی میللی (الجبهه الشعبيه)و گەورە پیاوێکی ئەوسای بەرهەڵستیی لیبراڵی کرد بوو. (طە

الهاشمي) سەرۆك وەزیرانێکی پێشوو بوو و ئەو ماوەیەی دواییش لە چینی حوکمدار جویٚ بوو بووەوەو هاتبوە ریزی بەرهەڵستانی رژیم. باس‌و خواسی زۆربەی سەرۆك وەزیرانی پێشووی وەك (نوری السعیدو توفیق السویدیو صالح جبرو حکمت سلیمان‌و .. تد) لە هیی کابرایەکی خەڵەفاو یا زۆر لە دواوەی کاروانی پەرەسەندن دەچوو.

ئەگەر چی ئەوکاتە کە من سەرکردەی حیزب بووم (حشع)بەهێزترین حیزبی سیاسیی ولاٚت بوو، بەلاٚم نەك هەر حوکمداران، بگرە ئێمەی شیوعیش بە دوورمان دەزانی نوێنەرێکی ئێمە لە گفتوگۆکانی تەلاری شادا بەشداری بکات. نەریت وا بوو لەم چەشنە بۆنانەدا چەپی عیراقی بە گشتی پشت گویٚ بخرێت. خەمتیٚ چەپیش ئەوە بوو نەبێتە قوربانیی چەند یاسایەکی ستەمکارانە، یا چەند فێل‌و دەهۆیەك (دسائس) کە ژێر بە ژێر لە دژی هەڵبەسترا بن.

دێمەوە سەر راپەڕین کە جەماوەری راپەڕیوی بەغدا دروستیان کردو شیوعیەکانیش بەبیٚ هیچ موناف‌سێك سەرکردایەتییان کرد. ئیتر ئەو تەقینەوە جەماوەریە قەوما کە یاداشتنامەی حیزبە بەرهەڵستە لیبراڵیەکان حکومەتیان لیٚ بە ئاگا هێنابووەوە. قوتابیانی کۆلێجی دەرمانسازیو کیمیا بەر لە راپەڕین مانیان گرت. دەبەنگیی عەمیدەکەیان دەستی لەوەدا هەبوو، کاتێك چەند دەستکارییەکی زیادەی پێڕەوی کۆلێجی کردبوو و قوتابیانی ئەم کۆلێجەی وروژاند بوو. ژمارەی شیوعیو چەپڕەوە رێکخراوەکانی ئەم کۆلێجە لە چاو هیی کۆلێجەکانی دیکەدا ـ وەك ئاداب‌و ماف‌و پەروەردە .. تد ـ زۆر کەم‌و سست بوون، بەلاٚم دەبەنگیی عەمیدەکەیان کارێکی کرد ببێتە پێشەنگی ئەو قۆناخەی جوولاٚنەوەی مانگرتنی سەندیکاییی نێو قوتابیان. بڕیاری مانگرتنیش ئەنجامی مشتومڕی بە کۆمەڵی نێوان قوتابیان بوو و ئارەزووی بەشی هەرە زۆریانی دەردەبڕی. تەنیا قوتابیانی پۆلی سێیەمی کیمیا لێی بە تاك کەوتن کە لەبەر هۆیەك ـ نایزانم چییە ـ رازی نەبوون

هاوبەشیی تێدا بکەن. پاشان لەم بیرە لایان داو، چەند رۆژێك دوای بەردەوامبوونی مانگرتنەکە بڕیاری بەشدارییان دا. قوتابییان خۆیان لیژنەیەکیان بۆ سەرکردایەتیی مانگرتنەکەیانو چاوپێکەوتنو گفتوگۆ لەگەڵ دائیرە حکوومەتیەکاندا هەڵبژارد. داواکاریی سەرەکییان هەڵوەشاندنەوەی پێڕەوە تازەکەو دوور خستنەوەی عەمیدە ملهوڕەکەیان بوو. کابرا بە بریکاری (وەکالەت)عەمید بووو، رەنگییێ بە ئومێد بوویێ بەهۆی ئەو دەستکاریانەوە وەك عەمیدێکی هەمیشەیی جێگیری بکەن.

نیگەرانیی رژێمی حوکمدار رووی لە زیادی کرد، کاتێك بۆی دەرکەوت مانگرتنەکە مەترسیی هەیە پەل بهاوێژێو گەلێك کۆلێجو ئامۆژگای دیکە بگرێتەوە، پاش ئەوەی یەکێتیی گشتیی قوتابیانیش بەیاننامەیەکی لەم بارەوە بەشییەوە. جەمال بابان کە ئەوسا وەزارەتی مەعاریفی بە بریکاری لە دەستدا بوو، کوڕە قوتابیەکەی خۆیی راسپارد تا دیدارێکی لەگەڵ وەفدێکی قوتابیە مانگرەکاندا بۆ رێك بخات لە ماڵی خۆیان. گوێی بۆ داواکاریەکانیان شل کردو داوای لێکردن بەرانبەر بە جێبەجێکردنی خواستی سەرەکییان ـ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەستکاریانەی کە لە پێڕەوی کۆلێجدا کراون ـ کۆتایی بە مانگرتنەکە بهێنن. بەڵام قوتابیان وەك مەرجی بڕاندنەوەی مانگرتنەکە، هەر سوور بوون لەسەر دوورخستنەوەی عەمیدی کۆلێج. توانرا چارەسەرێکی مام ناوەندی بدۆزرێتەوە : دوورخستنەوەی عەمید بە مۆڵەتێکی کاتیو ئەمجا گواستنەوەی. جەمال بابان نەقیبی پزیشکان (د. القیسی )ی کردە ناو بژیکەر، تا دەسەڵاتی خۆی بۆ قەناعەت پێکردنی قوتابیان بەکار بهێنێ. ئەوە بوو مانگرتنەکە بەکردەوە بەسەرکەوتنی قوتابیان لە ١٩/١١/١٩٥٢دا دوایی هات.

بەڵام هەر بە بڕاندنەوەی مانگرتنەکە دەستدرێژییەك کرایە سەر ژمارەیەك ئەندامی لیژنەی مانگرتن. ئەوە بە فیتی دەزگا سەرکوتکەرەکان رێك خرابوو. بریندارە دەست بۆ درێژ کراوەکان برانە نەخۆشخانە. قوتابیان وورووژان، دەستبەجێ

مانگرتن تازە بووەوەو کۆمەڵگای قوتابیان لە بەغدا سەرتا سەر بە توندی تاوی سەند، چەندین کۆبوونەوەو وردە خۆپیشاندان‌و هوڕا کێشانی تێهەڵکیش بوون. هێندی نەبرد لە ڕۆژی ۱۹۵۲/۱۱/۲۰ دا بوو بە خۆپیشاندانێکی سازو تەیاری قوتابیان‌و ڕژایە سەر شەقام‌و هێزێکی گەورەی ئامادەکراوو پڕ چەککراوو تێلا بە دەستی پۆلیسیش بەرەنگاری بووەوە. پۆلیس توانیی دوای پێکدا هەڵپژانێکی توندوتیژ خۆ پیشاندانەکە بڵاوە پێ بکات‌و ڕاوەدووی هێندێك تاقمی بەزیوی بنێ. بەڵام زۆری قوتابیان سەر لەنوێ لە کۆلێجی ئاداب کە قەڵایەکی جووڵانەوەی دیموکراتیی قوتابیان بوو، خڕبوونەوە. کۆمەڵی بەردەم کۆلێج بەڕە بەرە گەورە بوو. (حمدي ايوب العاني)ی قوتابیی شیوعی چالاك‌و سکرتێری ڕێکخستنی حیزبی لە کۆلێج‌و ئامۆژگاکاندا گوتارێکی بۆ خوێندنەوە. (سافرة جميل حافظ )ی قوتابیی چالاکی یەکێتی دەورێکی کاریگەری لە خۆپێشاندانی ئەو ڕۆژەو جموجوڵی قوتابیاندا بە گشتی گێڕا. یەکێك لە کۆی ئەو شتانە کە کۆمەڵانی قوتابیان ئەو ڕۆژە بڕیاریان لێ‌دا، ناردنی یاداشتنامەیەك بوو ناوی (یەکێتیی گشتیی قوتابیان)ی ڕێ پێنەدراوی لە پەراوێزدا دانرابووو وەفدێکی گەورەی قوتابیان بردیانە لای بارەگای حیزبە بەرهەڵستەکان‌و ڕۆژنامە نیشتمانیەکان‌و لایەنە حکوومەتیە بەرپرسەکان. ئەوە کاری کردە سەر گەشە کردنی گیانی بەرەنگار بوونەوەو بەرزبوونەوەی هەڵچوونی شۆڕشگێڕانەی نێو قوتابیان‌و هەموو جەماوەر.

کە کوبوونەوەی سازو تەیاری قوتابیان لە کۆلێجی ئاداب بڵاوەی لێکرد،(حمدی أیوب) هەموانی بانگ کرد تا سەر لەبەیانیی شەممە ۱۹۵۲/۱۱/۲۲ لە کات‌و شوێنی دیاریکراودا(بەردەم کۆلێجی ئاداب)ئامادە بن بۆ دەست پێکردنەوەی خۆپێشاندانە میللییەکە. هەواڵی‌خۆپێشاندانی داهاتووی ڕۆژی شەممە لە پێتەختدا بڵاوکرایەوە. لافیتە ودروشمان ئامادەو هوڕاکێشەکانمان دیاری کرد. کادێرانی بەشدار وناو بوێر کراویش دەست نیشان کران. لەلایەکی دیکەوە، دەسەڵاتداران،

پشت ئەستوور بەتایبەتی بە پۆلیس، کەوتنە خۆ بۆ بەرەو ڕوو بوونەوەی هەر ڕووداوێکی چاوەڕوانکراو.

دەوروبەری سەعات هەشتی بەیانیی ڕۆژە دیاریکراوەکە پتر لە سێ هەزار قوتابیو لاو لەبەردەم کۆلێجی ئادابدا لە (باب المعظم) کۆبوونەوە. (حمدي أيوب)ی سەرکردەی خۆپیشاندانەکە فەرمانی دا لافیتەکان لە ژوور سەریانەوە بەرزبکەنەوە. گەلێك پەچکە کاغەز بەشرانەوە، دروشمو هوڕای دووبارە کراوەی خۆپیشاندانەکەیان تێدا بوو.

خامی سپی بەرزکرانەوە، بەپیتی درشت لە سەریان نووسرا بوو :

بژی ئاشتیی جیهانی، داواکارانی جەنگی دوژمنکارانە بڕووخێن.

با پەیمانو بلۆکە (تکتل) کۆلۆنیالیو دوژمنکاریەکان بڕووخێن.

با کۆلۆنیالیزمو نۆکەرە ناوچەییە نا پاکەکانی بڕووخێن.

داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی ١٩٣٠ دەکەین.

داوای ڕێ پێدانی ئازادیە دیموکراتیەکان دەکەین.

داوای بەرەڵلاکردنی زیندانیو گیراوە سیاسیە ئازادەکان دەکەین.

با هەڵبژاردنە ساختەکان بڕووخێن، هەڵبژاردنی ئازاد نابێ، ئەگەر ئازادیخوازان لە زینداندا بن.

داوای هەڵبژاردنێکی ئازاد دەکەین بە پێی یاسای هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ.

داوای دابینکردنی نانو کار دەکەین بۆ زەحمەتکێشان.

کە خۆپیشاندانەکە دەستی پێکرد، زۆر کۆمەڵی گەورەی غەیرە قوتابیش چوونە پاڵیان، تا ژمارەیان لە هەزاران کەسی تێپەڕاند. ئیتر خۆپێشاندانەکە چ لە رووی مۆركو ئامانجەکانیەوەو چ لە رووی ژمارەی بەشدارەکانەوە بە هیی قوتابییان دانەدەنرا، بەڵکوو بوو بە خۆپێشاندانێکی سیاسیو جەماوەریی گشتی. لە (باب المعظم)ەوە روویکردە شەقامی (غازی)، هەموو بە جۆشو خرۆشێکی بێوێنەوە

هاواریان دەکرد : " یەڵڵا ئەی گەل راپەرین تازە بکەرەوە ! ". پۆلیس نەیتوانی بەدۆنکی بڵاوەی پێ بکات، بۆیە پەنای بردە بەر بۆمبی فرمێسک ڕژێن. یەکێك لە خۆپێشاندەران بۆمبێکی بە ئاسمانەوە گرتەوەو بە گورجی هاوێشتیەوە بۆ پۆلیسەکان، لەنێویاندا تەقییەوەو بەچاوی فرمێسکاویەوە هەڵاتن. پۆلیس لە گەڕەکی (الفضل)یش تەقەی لە خۆپێشاندەران کرد، یەکێکیان لیّ شەهید کراو ژمارەیەکیان بریندار بوون. خۆپێشاندانەکە بڵاوەی لێکرد، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند خۆپێشاندەران لەهەمان شەقامداو یەکگرتوو تر هێزەکانی خۆیانیان کۆکردەوە. نە بۆمبی فرمێسك ڕژێن کاری خۆی کردو نە پۆلیسیش توانیی بە تێلا خۆپێشاندانەکە بەربەست بکات. خۆپێشاندانەکە لە گۆڕەپانی (الأمين )ەوە ڕووبە بەری ( الكرخ ) وەرچەرخاو، خوتبە خوێنەکان لەسەر پردەکە بیری جەماوەریان هێنایەوە کە بەسەر پردی (الشهداء)و ڕەمزی ڕاپەڕینی کانوونی ١٩٤٨ دا ڕەت دەبن (حمدي أيوب )ی سەرکردەی خۆپێشاندان دیسانەوە خوتبەیەکی دا. هەر کە کۆمەڵانی خۆپێشاندەر گەیشتنە گەڕەکی (الشواكة)، بەڵویزخانەی بەریتانیا تووشی ترس‌و بیمێکی بێ ئەندازە بووو، پاسەوانیی چەکداری دەوری قایم کرا. بەڵام خۆپێشاندەران ئەوەیان پێ بەس بوو هوڕا دژی ئیمپریالیزمی بەریتانیاو پەیماننامەو نۆکەرانی‌و دژی پەیکەری جەنەراڵ مۆدی ڕەمزی داگیرکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە بکێشن.

خۆپێشاندان لە سەعات دووی پاش نیوەڕۆدا لەسەر داوای سەرکردەکەی بڵاوەی پێکرا، تا سەعات شەشی ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە بەردەم قوتابخانەی (الجعفرية )دا دەست پێ بکاتەوە. ئەوە بوو ڕاست لەوادەی دیاریکراودا دەستی پێکرایەوەو تا سەعات نۆی ئێوارە درێژەی کێشا، بۆ ئەوەی (حمدی) دوایی پێ هێنانی ڕابگەیێنیّ‌و بانگی هەموان بکات بەیانیی ڕۆژی دوایی لەبەردەم کۆلێجی ئادابدا ئامادە بن بۆ خۆپێشاندانێکی تازە.

شەوی ۲۲ ـ ۲۳ ی تشرینی دووەم دزییەکی کەم وێنە لە نەخۆشخانەی پاشایەتیی پەنا کۆلێجی پزیشکیی بەغدا کرد. قوتابیانی شیوعیی کۆلێج زانیبوویان تەرمێکی تازە لە نەخۆشخانەکەدایەو، لەوانەیە لاشەی خۆپێشاندەرێکی شەهید بێ. توانییان بیدزنو سەهۆڵیان بۆ کڕی تا لە سەری دایبنێن بۆ ئەوەی بۆن نەکاتو لە خۆپێشاندانی ڕۆژی دواییدا هەڵیبگرن. پۆلیس دوو ئۆتۆمبیلی پڕ لە خودەو تیلای کرد بۆ نێو کۆلێجدا. ڕەنگە بۆ ئەوە بوو بێ دژی قوتابیان بەکاریان بهێنێت. کە قوتابیان بەوەیان زانی بڕیاریان دا پەلاماری هەردوو ئۆتۆمبیلەکە بدەنو تیلاکان زەوت بکەن. پاشتر بڕیاریان دا تیلا زەوتکراوەکان بۆ ڕاوەدوونانی پۆلیس بەکاربهێننو هەردوو ئۆتۆمبیلەکە بسووتێنن. بەڵام پۆلیسەکان قەلقڕیان بۆ کردو، کۆلێجو تیلاکانیان پێکەوە بەجێ هێشت. عەمادەی کۆلێجیش نامەیەکی ناڕەزایی دایە دەسەڵاتداران.

سەر لە بەیانی ۲۳ی تشرینی دووەم خۆپێشاندانەکە زۆر ڕێکوپێکترو ورە بەرزترو بە ژمارەیەکی زیاترەوە دەستی پێکرد. (العمری)ی سەرۆك وەزیران یەکجار سوور نەبوو لەسەر تەقەکردن. بە لیس هێرشیان بردە سەر خۆپێشاندانو خۆپێشاندەرانیش بەرپەرچیان دانەوەو، چەندین بریندار لە پۆلیس کەوتنو ئەفسەرێکیان لێ مردو ئەوانی دیکەیش قووچاندیان. خۆپێشاندەران تاوێك لە پێش بارەگای حیزبی یەکگرتنی دەستووری (الاتحاد الدستووری ـ حیزبەکەی نوری السعید ) دا ڕاوەستان، تەختەی ناونیشانی سەر دەرگاکەییان بردو لە (الميدان) بە دەرگای قەحبەخانەیەکی گشتیدا هەڵیانواسی. قەحبەیەکیان ناڕەزاییی دەربڕیبوو ڕووی دەمی کردبووە ئەوانەی کە تەختەکەیان هەڵواسیبوو :

ـ ئێمە قەحبەینو ناپاکی گەلو نیشتمان نین. هیچ عەدالەتێك لەوەدا نییە کە ئێمەو نموونەی وەك (نوری السعید) بەیەك چاو تەماشابکەن.

خۆپێشاندانەکە پەلی هاوێشت، لە دەیان هەزار کەس تێپەڕی. خۆپێشاندەران لافیتەکانیان بە خوێنی هاوڕێ بریندارەکانیان ڕەنگین کردو لە ڕێکردن نەکەوتن.

لاوێك چووە لای بەرپرسێكی خۆپیشانداندو داوای لێكرد ڕێی بدات خۆیو تاقمەكەی لە پشت لافیتەیەكی تایبەتی خۆیانەوە بڕۆن. پێش ئەوەی بزانێ كێیە وەڵامی دابوەوە :

- بە سنگێكی فراوانەوە بەخێرهاتنتان دەكەین بۆ بەشداریكردن بە لافیتەیتایبەتی خۆتانەوە.

پاش قەدەرێك نێزیكەی سی خۆپیشاندەر لە پشت لافیتەی تایبەتیانەوە پەیدا بوون. بەلام ئەم حاڵەتە زۆر بەردەوام نەبوو، چونكە ئەوەندەی پێ نەچوو بەسەر كۆمەڵانی خۆپیشاندەردا بەش بەش بوون. خۆپیشاندەرە بەرپرسەكە حەزی بە خۆتێهەڵقورتاندن كرد بوو و ویستبووی بزانێ ئەم تاقمە كێن. بۆی دەركەوتبوو تاقمی (عزیز شریف) ن.

لە ٢٢ی تشریندا داوام لە (ناصر عبود)ی سكرتێری ڕێكخراوی پێتەخت كرد بەیانیی ڕۆژی دوایی كۆبوونەوەیەكی ناوەخت بۆ لیژنەكە ساز بكاتو ئاگادارم كردەوە كە منیش ئامادەی دەبم. گەیشتمە ماڵی كۆبوونەوەكەو، بەلای گەورەترین خۆپیشاندانی جەماوەریدا تێپەر بووم كە پێی نابووە ڕۆژی بیستو سێ یەمینی. هەموان (لەوانە : عزیز الشیخو محمد صالح العبللیو كامل السامرائیو حیدر حاتم) میزاجێكی شۆڕشگێڕانەی تاوسەندوویان هەبوو. دوای دەمەتەقێیەكی كورت پێمگوتن :

- تا دوێنێ بوو نەماندەهێشت كادێرانمان بەشداریی خۆپیشاندان بكەن، ئەوانەیان نەبێ كە ئێمە سەركردایەتیو ڕێنوێنی خۆپیشاندانمان پێ دەسپاردن. ئێمە لەوەدا لەسەر هەق بووین. مەبەست پاراستنی كادێر بوو. ئێستاكە پاش ڕژانە سەر شەقامی سەرپاكی جەماوەر، هەلو مەرج بە تەواوی گۆڕاوەو شەقامەكان خۆیشیان نەك هەر پێویستیەكی زیاترو زیاتریان بە كادێران هەیە، بەڵكوو بوونەتە زامنترین جێگە بۆ پاراستنی كادێران. كەواتە با هەموان بەشداری بكەنو، ڕیز پەركردن (استثناء) بۆ كەس نییە.

ئەم ڕێنوێنییەیان بە شادیو خۆشەوە وەرگرتو بە پەلە چوونـە دەرێ، وەك بلێـی بۆ چاوپێکەوتنێکی ئازیزترین شتیان دەچن. ئیتر سەرکردە بۆ خۆپیشاندانە میللییە فراوانەکان کلاّشەی دەکرد. خۆیشم لەسەر جادە مامـەوە، بـە شۆسـتەکانو نێـو ئـەو کۆمەڵە خۆپیشـاندەرانەدا کـە لـە شـەقام یا لـە گـەڕەکێکی دیـاریکراودا جێیـان نەدەبوەوە، دەهاتمو دەچووم. بەردەوام پێوەندیی راسـتەوخۆم بـە چـەند سـەرکردەیەکی سەر جادەوە هەبوو. بەواتایـەکی دیکـە، سـەرکردایەتیی (حشع) بـە تـەواوی لەگـەڵ جەماوەری خۆپیشاندەردا هاتبوە سەر جادە.

پۆلیـس لـە هەتاوکـەوتنناندا یەکـەمین دەسـتڕێژی لـە خۆپیشـاندەران کـرد لـە گۆڕەپانی (زبیدە). لەوێ چوار شەهید، جگە لە ژمارەیەکی زیاتری بریندار، کەوتن. تەقە لێکردن لە چەند شوێنێکی دیکە دووپـات بـووەوە. بـەلاّم کۆمـەلاّنی راپـەڕیو تووڕە لەوە فراوانترو بەهێزتر بوون بە ئاسانی سەرکوت بکرێن. خۆپیشـاندانەکان بـە خێراییەکی خەیاڵی گەورەترو فراوانتر دەبوون. گەلێك هـوڕا لـە ٢٢ی تشـرینەوە لـە شەقامەکاندا دەکێشران بـۆ رووخـانی رژێمـی پاشـایەتی. بـەلاّم کوشـتاری ئـەو رۆژە دروشمەکانی رووخـاندنی خـودی رژێمـی پاشـایەتیی خسـتە پێشـەوەو، کـارێکی کـرد دروشمەکانی دیکە لای هەموو خۆپیشـاندەران دابپۆشێ. ئەوە رەنگدانەوەی سروشتیی بڕگەیەك بـوو لـە سـەرەتاکانی (١٩٥٢)ەوە لـە بەرنامـەی دەسـتکاریکراوی حیـزبدا جێگیر کراو، بانگەوازی بۆ رووخاندنی پاشایەتیو دامەزراندنی حوکمێکی کۆماریی میللی دەکرد.

پێم وابێ (مصطفى العمري) بەش بە خۆی لەسەرسەختە دڕەکانی نێـو ئەندامـە سەرەکیەکانی چینی حوکمدار نەبوو. رەنگە ئەوەی پێ باشتر بووبێ پۆلیس لـە بریـی چەکی ئاگردار تێلاّ لە دژی خۆپیشـاندەران بەکاربـهێنێ. کـاتێك بـۆی روون بـووەوە کار لە کار تـرازاوەو وەزارەتەکـەی نـاتوانێ ـ بـەبێ زێـدە خوێنڕشـتن دەسـت بەسـەر وەزعەکەدا بگرێ، نیوەڕۆی ٢٣ی تشرین ئیستیقالەی خۆیـی پێشـکەش کـرد. بـەلاّم

ئەم دەست لـە كاركێشانەوەیە، سەرشۆڕكردنێكی راستەقینەی تـەلاری پاشـایەتیی لەگەڵدا نەبوو. هەر لەگەڵ بلاوكردنەوەی دەست لـە كاركێشـانەوەكەدا، هـەواڵێك لـە رادیۆی بەغداوە بلاوكرایەوە دەیگوت : (جميل المدفعي ) راسپێردراوە وەزارەتی تازە پێك بهێنێ. (جمیل)یش هەر یەكێك بوو لە سەرگەورەكانی توێژی حوكمدار كە بـەوە ناسرابوون بە تەواوی پیـاوی ئینگلیز بوون. دیـارە دەبـوو ئـەم هەواڵـە پـێ بـە پـێ دروشمێكی تازەی لەگەڵدا بێ ئەمەمان دەستبەجێ دابەزاندە سەر جـادە : " بڕووخـێ وەزارەتی (جمیـل المدفعـی )ی نۆكـەر". خوتبـە خوێنـەكان لـــە خۆپێشـاندانەكاندا گوتیان: (جمیل ) لە (مـصطفی) خراپترە وگەل بۆ ئەوە قوربانیی نەدا ئەمیان بخزێتـە بریی ئەویان. لە كاتێكدا هوراكێشان بۆ ڕووخانی پاشـایەتیو دامـەزراندنی كۆمـار هەر لە پەستا فراوانتر دەبوو.

لەسەر شۆستە ڕاوەستا بووم كـە (احمد راضـی شبر)ی سـەركردەی یـەكێك لـەو گەورەترین خۆپێشاندانانە هاتە لامو گوتی :

ـ هەڤاڵ ! با ئەڵتەرناتیڤێك لە باتیی وەزارەتی (جمیل المدفعی ) بخەینە مـەیدان، هەر ئەوە بەس نییە هاواری ڕووخاندنی بكەین.

سەیرم كرد بیرێكی تەواو دروستە. ناهێڵین وەزارەتێـكی تـازە بـە سـەرۆكایەتیی (جميل المدفعي) دابمەزرێت، ئەی لەوە بـە دوا چـی ؟ كەواتـە دەبـێ ئەڵتـەرناتیڤێكی بەرجەسـتە بخەینـە ڕوو. پێشـنیازەكەی (احمـد راضـي شـبر)م خسـتە قــالبی فۆرموولەیـەكی بەرجەســتە : پێكـهێنانی وەزارەتێكـی نیشـتمانیی ئیئیتیلافـی بەسەرۆكایەتی(كامل الچادرچی )ی سەرۆكی‌حیزبی‌نیشتمانیی دیموكراتـی(الوطـني الديمقراطي ) ، ئەندامەكانیشی نوێنەری حیزبە نیشتمانیەكانو كەسـانی سـەربەخۆی بەرهەڵستی نیشـتمانیی وەك (الجواهري و عبدالـرزاق الشـيخلي) بــن. هـەردوو كورسیی وەزارەتم بۆ خۆمـان هێشـتەوە، بـەلام دوو كورسـیە هـەرە گرنگەكـە بـوون: وەزارەتی بەرگری بۆ (سـلیم الفخري )ی ئەفسـەری شـیوعیی دەركراوو، وەزارەتـی

ناوخۆ بۆ (توفیق منیر )ی پارێزەری شیوعیی جێگری سەرۆکی سەندیکای پارێزەران. لیستەی ناوی کابینەی تازەی وەزارەتم نووسی‌و ناوی هەر وەزیرێك‌و وەزارەتەکەیم هێناو، چەندین دانەمان لێ بەشییەوە. (محمد صالح العبللی ) یەکەم بەرپرسی خۆپێشاندەر بوو لیستەکەی وەرگرت‌و بۆ جەماوەری خوێندەوە. ئیتر دانەکانی لیستەکە لە ماوەی چارەکە سەعاتێکدا بەڕێ کران بۆ بەرپرسی بەشە جیاجیاکانی خۆپێشاندان‌و بۆ کۆمەڵانی خۆپێشاندەر خوێندرانەوەو، هەموان پێشوازییەکی بەجۆشیان لێکرد.

لە هەمان کاتدا بانگی (عزیز الشیخ )ی سەرکردەی کۆمەڵێك خۆپێشاندەرم کرد تا قسەی لەتەکدا بکەم‌و بینێرمە لای (کامل الچادرچی ). سەری لێداو پێی گوتبوو لەلایەن (حشع)ەوە نێردراوە تا پێی بڵێت : جەماوەری ڕاپەڕیوی سەر جادەکان داوا دەکەن پلەی سەرۆکایەتیی وەزارەت بەو بسپێرن. ئێمەی شیوعیش پشگیریی ئەم داوایە دەکەین‌و، بە ئومێدین حیزبی (الوطني الديمراطي)و حیزبە نیشتمانیەکانی دیکە پشتیوانیی لێ بکەن، تا بەهەوڵی هاوبەشمان بەسەر تەلاری شادا بسەپێنین. (کامل الچادرچی) بە بایەخ پێدانەوە گوێی بۆ قسەکانی نێردراوەکەمان شل کرد بوو، شەخسی خۆی هیچ قسەیەکی تێدا نەکرد بوو. بەڵام (عبدالله عباس )ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (الاهالی ) قسەی لەسەر کردبوو. لام وابێ بەوردی بیروڕاکانی (کامل الچادرچی) ی دەربڕیبوو :

- دەبێ سەرۆك وەزیران لە هەڵبژاردنی وەزیرەکانیدا ڕای خۆیی هەبێ، نەك بە زۆر بەسەریدا بسەپێنن.

ئەوە دووەم چاوپێکەوتنی (عزیز الشیخ )بوو لەگەڵ (کامل الچادرچی )دا لە جەنگەی خۆپێشاندانە پڕ خرۆشەکاندا، چونکە لە ۲۲ی تشرینیشدا (غضبان السعد)ی ئەفسەری شیوعیی دەرکراوم ناردە لای‌و داوای هاوکاریم لێکرد بۆ هێنانە دیی داواکاریەکانی گەل یا ئەو داوایانەی کە لە یاداشتنامەی حیزبە

بەرهەڵستەکاندا بۆتەلاری شا هاتبوون. کەسمان نە نارده لای ڕێبەری هەردووحیزبی سەربەخۆیی (الاستقلال )و بەرەی میللی (الجبهة الشعبية )، چونکە (کامل الچادرچی)مان بە ئەلقەی گونجاوی پێوەندیی نێوان خۆمان‌و ئەوان دانا بوو. لە ڕاستیدا ئەم خۆ لادانە لە پێوەندیکردن بەو دوو حیزبەوە چەشنە سەرپەڕگریەکی من بووو کاری ڕاست ئەوە بوو نوێنەرەکانمان ڕاستەوخۆ بنێرینە لای هەموان.

خۆش ئەوە بوو(غضبان السعد) ئێوارەی ۲۳ ی تشرین، واتە چەند سەعاتێکی کەم بەر لە چاوکەوتنی (عزیز الشیخ ) بە (کامل الچادرچی)، گوتی: (کامل الچادرچی) قایل نابێ (عبدالرزاق الشیخلی) وەزیری دەرەوەی بێ، هەتا ئەگەر بە نەعلیش بەسەریدا بکێشرێت.(عبدالرزاق) لە لیستەکەی ئێمەدا بەوەزیری دەرەوە دانرا بوو. ڕێبەرانی حیزبە لیبرالیە بەرهەڵستەکان ۲۳ ی تشرین لە کاتێکدا هەستانی جەماوەر لە چڵەپۆپەیدا بوو، لەسەر داوای (کامل الچادرچی)و لەبارەگاکەی ئەو کۆبوونەوە. دەیانگوت : پێشنیازی کردبوو بەیاننامەیەك بەناوی حیزبە نیشتمانیەکانەوە دەربکرێت، داوا ئاماژە بۆکراوەکانی نێو یاداشتنامەی ئەم حیزبانەی تێدا بیر بخرێنەوە کە ڕژێم فەرامۆشی کردبوون‌و، ئەنجامەکەیشی ئەم تەقینەوەیە بوو. ئەمجا بانگهێشتن بکرێت هەم ڕژێم وەڵامی داواکاریەکانی گەل بداتەوەو، هەم جەماوەریش هێمن بن‌و دان بە خۆدا بگرن. (فائق السامرائي)ی سەرکردەیەکی حیزبی سەربەخۆیی (الاستقلال)، یەکەم کەس بوو بوو بە توندی‌و ئاشکرا وەڵامی دابوەوە:

- (أبو رەفعەت) چی دەڵێی ؟ ئێمەی دانیشتووی ئێرە چین تا بەیاننامە بۆ گەل دەربکەین. دەبێ واقیعبین بین‌و، بزانین ئێمەو کسانی دیکەیش دەتوانین چ دەورێك بگێڕین. ئێوە دەبینن جەماوەر بە تەنیا دوای(حشع) کەوتووە. ئەگەر ئارەزووی شتێکمان هەبێ دەبێ یەکەم جار پێوەندی بە شیوعیەکانەوە بکەین.

چەند کەسێکی دیکەیش لایەنگریی ئەم رایەیان کرد بوو. کۆبوونەوەکە بەبێ هیچ بەیاننامەیەك لەو دانیشتنەدا کۆتاییی هات. ڕووداوەکانیش بە جۆرێکی وا پەرەیان سەند بواری ئەوانەیان نەدا جارێکی دیکە دابنیشنەوە یا شتێك دەربکەن.

هێزەکانی پۆلیس نیوەڕۆی ٢٣ی تشرینو دوابەدوای چەند پێکدادانێکی توندوتیژ لەگەڵ خۆپیشاندەراندا لە چەند ناوچەیەکی پێتەختدا کشانەوە بۆ نێو پۆلیسخانەکانو، بەوە پێیان لێنا کە بەزیونو لەوە کەوتوون سەرکوتی یاخیبوونی ئاشتییانەی گەل بکەن. جەماوەری راپەڕیویش بۆ چەند سەعاتێک بە تەنیا لەسەر شەقامەکان مایەوە. بەغدا بە چەشنێکی وا دەکولا کە پێشتر نموونەی وا نەبوە. بەغدادییەکان کە زۆربەیان رۆژێك لە رۆژان بیریان لە کاروباری سیاسی یا بەشداری لە هیچ خۆپیشاندانێکدا نەکردبوەوە، هەموو کۆبووبوونەوەو هاتبوونە جۆشو پڕ بە دەم دروشمەکانی (حشع)یان دەگوتەوە. هەرشیوعیەکان بوون بە تەنیاو بێ مونافیس سەرکردایەتیی بێ بەرهەڵستی ئەو جەماوەرەیان دەکرد. خۆپیشاندانەکان بە باشی رێکخرابوون. بۆ بەڵگەیش هێندە بەسە مرۆڤ بزانێ : لەو هەموو خۆپیشاندانە گەورە گەورانەی ئەو رۆژانەدا هیچ کارێکی تێکدەرانە یا خراپەکاری بەرانبەر بە پیرۆزیی خەباتی نیشتمانیی دیموکراتی نەکران، نەئوتومبیلێك یا بینایەك سووتێندراو نە شووشەی ئوتومبیلێك یا باڵەخانەیەك شکێندراو نە تەنانەت دەرزییەك یا گرامێك شتومەك لە بازاڕە فراوانو پاسنەکراوەکان بە تالان برابێ. پێتەخت تەنیا دوو ئاگر کەوتنەوەی بە خۆوە دی ، هەردوکیان بە فەرمانو سەرپەرشتیی شیوعیەکان خۆیان کران : سووتاندنی مەڵبەندی رۆشنبیریی ئەمریکاییو، سووتاندنی پۆلیسخانەی (باب الشیخ)، وەك دێینە سەر باسیان.

مەڵبەندی رۆشنبیریی ئەمریکایی لە بینایەکی سێ نهۆمیی شەقامی (الرشید)دا بوو. دوو رۆژ بوو داخرا بوو. پێشنیازی سووتاندنیمان لە کەسێکی نەناس یا یەکێکی جەماوەرەوە بۆ هات. بەڵام هەر پێشنیاز بووو بەجێهێنانی کەوتە سەر رەزامەندیی (حشع)، یا راستتر بڵێم : رەزامەندیی من. منیش بە مەرج قایل بووم : "مەڵبەندەکە، بە بێ دەست دان لە بیناکە، دەسووتێندرێت". لە ماوەی چەند

دەقەیەکدا دەرگاکانیان شکاندو دەستیان کرد بە دەرهێنانی کەل‌و پەلی مەڵبەندەکە، یا فڕێدانیان لە باڵکونەکانەوە بۆ ناو چەقی جادەکە. پاش تاوێك، لە گەرمەی هوڕای پڕ هات‌و هاواردا بۆ رووخانی ئیمپریالیزمی ئەمریکا، شەقامی (الرشید)بڵێسەی ئاگری لێ بەرزبووەوە. ئەوسا خۆپیشاندەران بە گشتی‌و لاوانی شۆڕشگێر بە تایبەتی گەلێك بەهاو بنەمای پیاوانەی بەرزیان لە نێودا هەبوو، کە پیرۆزیی خەباتی شۆڕشگێڕانەیان لە شێواندن دەپاراست. قەت گوێم لێ نەبوە یەکێك شتێکی لەو کەل‌و پەلانە یا کەل‌و پەلی دیکەی دزیبێ. بە چاوی خۆم خۆپیشاندەرێکم بینی قەڵەمێکی پارکەر(ئەوکاتە نرخەکەی٥ دینار بوو)و، یەکێکی دیکە سەعاتێکی دەستیی پێشانی تەماشەکەرانی دەوروپشتی خۆی داو تووڕی دایە نێو ئاگرێکی بە کڵپە. ئەو گیانە راپەڕیوانە نەیاندەکرد پەنا ببەنە بەر تالانکاری‌و دزی.

بەرنامەی خۆپیشاندانەکان‌و نەخشەکەی (حشع) پەنا بردنە بەر زەبروزەنگ‌و سووتاندنی هیچ پۆلیسخانەیەکی تێدا نەبوو. ئەو خۆپێشاندانانە ئاشتییانە بوون‌و خۆپێشاندەران کە تووشی پەلاماری پۆلیس دەبوون، ئەو پەڕەکەی دەستیان بۆ لیس یا بەرد دەبرد. کەچی پۆلیسی پۆلیسخانەی (باب الشیخ)، سا یا لە ترساندا یان رقێکی بێ ئەندازەیان لە خۆپێشاندەران بوو، بۆیە لە زەبرۆزەنگ نواندندا بەرانبەر بە جەماوەر پێیان لێ هەڵبڕی‌و بە دەستدرێژیی تازەکردن‌و کوشتن‌و بریندارکردنی ژمارەیەکی دیکەی لاوان بەرەنگاری هەموو هەوڵێکی بە شەقامی (غازی)دا بردنی خۆپێشاندانەکە بوونەوە. ئەوە یەکجار قینی جەماوەری هەستاند، چەند خۆپێشاندەرێك دووتەنەکە نەوتیان هەڵگرت‌و بە چەند بینایەکی نێزیکدا گەیاندیاننە بینای پۆلیسخانەو ئاگریان تێبەردا. تەنانەت دوای ئەم هەموو تاوانانەی پۆلیسەکان‌و دوای سەرکەوتنی یەکجارەکیی خۆپێشاندەران، یەك پۆلیسیان بە هۆی گێژی‌و دەبەنگیی خۆیەوە کوژرا. لە کاتێکدا شیوعیەکان خۆیان پەرژینێکیان بۆ

پاراستن‌و بە سەلامەتی تێپەڕو رزگارکردنی پۆلیسەکانی دیکە لە غەزەبی جەماوەری تووڕە دروست کرد. ئەگەر ئەوەی کە لە جەنگەی راپەڕینی تشرینی ۱۹٥۲دا لە بەغدا قەوما، لەگەڵ رووداوەکانی (القاهرە)دا کە سەرەتاکانی ساڵانی پەنجا شار بە دەستی خۆپیشاندەران سووتێندرا، یا لەگەڵ رووداوی چەندین جارەی پاکستان‌و هیندستان‌و وڵاتانی دیکەدا بەراورد بکەین، بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەو خۆپیشاندانانە چەندە رێکخراو بوون‌و شیوعیەکانیش چ دەورێکیان گێڕاوە بۆ سەرکردایەتی‌و رێنوێنی‌و پاراستنی گێچەڵ.

وەدەرنانی پۆلیس لە شەقامەکانی پێتەخت لە لایەکەوە، سەرنەگرتنی هەوڵەکانی بۆ ئارامکردنەوەی بارودۆخەکە بە راسپاردنی (جميل المدفعی) بۆ پێکهێنانی وەزارەتێکی تازە لە لایەکی دیکەوە، تەلاری شاو باڵوێزی بەریتانیاو سەرگەورەکانی رژێمی پاشایەتییان خستە هەڵەکە سەما. ئیتر دەبوو پەنا ببەنە بەر سوپای دوا رێگە چارەی ژێر دەستیان وەك تاکە رێگە بۆ قوتارکردنی رژێم لە هەرەسهێنان. بەم چەشنە چەند پەلێکی زرێپۆشی سوپا دابەزێندرانە سەرشەقام‌و گۆڕەپانە گشتیەکانی پێتەخت‌و، ئیدارەی عورفیی سەربازی راگەیێندراو، جەنەراڵ (نورالدين محمود)ی سەرۆکی ئەرکانی سوپا بە سەرۆك وەزیران دانراو، (عبد المطلب الامين)ی عەمیدیش کرا بە حاکمی سەربازیی وڵات‌و هاتوچوو لە ئێوارەوە تا بەیانی قەدەغە کراو حەڤدە رۆژنامەو گۆڤار لە کارخران‌و خۆپێشاندان‌و کۆبوونەوە یاساخ کران‌و مۆڵەتنامەی حیزب‌و سەندیکاکان راکێشرانەوەو خوێندن لە کۆلێج‌و ئامۆژگاکان پەك خراو، هێرشی راوەدوونان‌و گرتنیش دەستی پێکرد.

پێویستە دان بەوەدا بنێم کە من پێشتر بیرم لە ئەگەری روودانی شتێکی وا نەکردبووەوەو خۆمم بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئامادەنەکردبوو. ئەو نیوچە کودەتایەو کارو کردەوەکانیم بەلاوە چاوەڕوان نەکراو بوون. لە پڕێکدا خۆمم لەوەزعێکی تەواو جیاوازدا بینییەوە. سەرەتا نەمدەزانی ئاخۆ بەرانبەر بە هێزی چەکدار هێنانە سەر

شەقام چی بکەین. بەڵام ئەو چەند سەعاتە کەمانە یا دەقانەی سەرەتا شتێکی تازەیان فێر کردم : دەبێ دەست پێشخەریی نواندنی هەڵوێستێکی دۆستانەو نێوە نێو دەرانی بکەین بەرانبەر بە سەربازەکانی سەر جادە. ئەگەر شانەی حیزبیمان بە تایبەت لە نێو ئەفسەراندا هەبوایە، پێمان دەکرا بە شێوەیەکی دیکە لەگەڵ بارودۆخەکەدا بجووڵێینەوە. بەڵام شتێکمان لەم شانانە شك نەدەبردو، لە هەوڵدان بۆ بێلایەنکردن یا راکێشانی سوپا بۆ لای جەماوەر زیاتر هیچ رێگە چارەیەکمان لە بەردەمدا نەبوو. بۆ ئەم مەبەستە دەست پێشخەریمان کرد چەند دروشم‌و هوراپەکی تازە لە شەقامەکاندا بگوترێنەوە : بژی برایەتیی سوپاو گەل، بژی هاوکاریی سوپاو گەل دژی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستی. هێندەی نەبرد ئەم دروشمانە لە نێو خۆپێشاندەراندا تەنینەوەو بوون بە هوڕای سەرەکییان.

لە هەمان کاتدا خێرا چوومە ماڵی چاپخانە نهێنیەکەمان. (صبیح سباهی) لەوێ ئامادەو لە ئینزاردا بوو. دەرفەتی ئەوەم نەبوو پێشتر شتێك بنووسم، بۆیە دانیشتم سەر زارەکی قسە بکەم، تا ئەویش پێ بە پێ من چی دەڵێم چاپی بکات. بە خێراییەکی پێوانەیی ئەو بانگەوازەمان چاپکرد کە (حشع) بۆ سەربازان‌و ئەفسەرە بەشەرەفەکانی دەرکرد. (صبیح )م بەجێ هێشت، تا پاشان هەزاران دانەی لێ بخاتە سنووقی تەختەی پاسکیلەکەی‌و هەڵیانبگرێ بۆ وێستگەی بەشینەوەو لەوێیشەوە بۆ سەر شەقامەکان. چەند دانەیەکی ڕاستەوخۆ درانە سەربازو ئەفسەرەکان بەسەر تانك‌و ئوتومبیلەکانیانەوە. چەند هەڤاڵێکی ژن‌و پیاو سەرکەوتنە سەر لۆریە سەربازیەکان، تا لەوێوە دەقی بانگەوازەکە بۆ جەماوەر بخوێننەوە. لەو باوەڕەدام ئەگەر بانگەوازەکە جێی پێخۆشحاڵی‌و پێشوازی لێکردنی هەموویان نەبوو بێ، ئەوا هیی زۆربەی هەرە زۆریان بووە. گەلێك لە عەسکەریەکان لەگەڵ خۆپێشاندەراندا چەپڵەیان لێ دا، هەم بۆ وشە پڕ خرۆشەکانی بانگەوازەکەو هەم بۆ بانگهێشتنی بۆ هاوکاریی سوپاو گەل دژی ئیمپریالیزم‌و نۆکەرانی ناوخۆ.

خۆپێشاندانەکان بە درێژاییی پاشنیوەڕۆو تا شەوێکی درەنگ درێژەیان کێشا، بەبێ ئەوەی سەربازی سەر شەقامەکان خۆ لە قەرەیان بدەن. ئەوە مانای وابوو ئێمە توانیومانە سوپا بێلایەن بکەین، بانەیشمانتوانیبێ ڕایبکێشینە نێو ڕیزی جەماوەری ڕاپەڕیو. ئەوە مایەی نیگەرانیەکی لە ڕادەبەدەر بوو بۆ دوژمنانو هەرەشەیەکی شێلگیرانەیش بوو لە ڕژێمو بەرژەوەندە ئیمپریالیەکان لە عێراقدا. دەبوو ئەوانە بەڕاستی بیر لە پلانێکی نوێ بکەنەوە، زامنی ئەوە بکات کە سوپا بە کردەوە بخرێتە گەڕ لە دژی جەماوەری یاخی. دوژمن، وەك پێشهاتەکان ڕوونیان کردەوە، پەنای بردە بەر ئەم کردەوانەی خوارەوە :

١ـ فراوانترین هێرش بۆ دەستگیر کردنو هەڵکوتانە سەر ماڵان لە شەوی ٢٣/٢٤ ی تشریندا، نەك هەر بۆ شیوعیەکان، بەڵکە بۆ هەموو لایەنە جیاجیاکانی بەرهەڵستانی ڕژێم. دوا بە دوای ئەوە، هێرشەکە ڕۆژی ٢٤ و ڕۆژانی دواییش بەردەوام بوو.

٢ـ جوێکردنەوەو ئامادەکردنی چەند پەل یا کۆمەڵێکی عسکەری، بەتایبەت لە ئەفسەرانی دڵسۆزو لەسەر پێ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ڕژێم، تا ئەرکی ئەوەیان پێ بسپێرن بە زەبرو زەنگی خوێناوی ـ واتە لە خوێن هەڵکێشانی خۆپیشاندانەکان لە کاتی تازە بوونەوەیاندا ڕۆژی ٢٤ی تشرین ـ ئاژاوەو پشێوی سەرکوت بکەن.

ئەو شەوە زۆر کەس گیرا. بەڵام کادێرانی حیزبمان ئاگادارکرانەوە قایمکاری بکەنو ماڵەکانیان بەجێ بهێڵن تا هیچ یەکێکیان نەکەوێتە دەست پۆلیس. سەر لە بەیانیی ٢٤ی تشرین خۆپیشاندان تازەکرایەوەو کەمو زۆر وەك ڕۆژی پێشوو فراوان بوو. سەربازەکان، بەسەرپەرشتیی ڕاستەوخۆی (عبدالمطلب الامین)ی حاکمی عەسکەری، یەکەم جار نێزیك بەوەزارەتی بەرگری تەقەیان لە خۆپیشاندانەکە کردو، گەلێك کوژراو بریندار کەوتنو، لافیتەکان بە خوێنی ئەوانە ڕەنگین بوون. بەڵام جەماوەری

بێ چەك خۆیی بەدەستەوە نەدا، بەڵكوو بەرەنگاری دوژمنی پڕ چەك بووەوە. جەماوەر، سەرباری دووبارە بوونەوەی تەقە لێكردنو بەردەوامیی دەستگیركردن لە شەقامەكاندا، بە درێژاییی رۆژو تا ئێوارەیەكی درەنگ هەر لە جۆشو خرۆشدا بوو. بەڵام نیشانەكانی ورە رووخان بە خەڵكەوە دەركەوتن، كوشتنو گرتنی لێرەو لەوێ كاری خۆیانیان كردە سەر بارودۆخەكەو لە بەرژەوەندی رژێمدا بوون. چەند پەلێكی سەربازیش بە پێچەوانەی دوێنێوە، بێلایەن نەمانەوەو دایانە پاڵ سیاسەتی سەركوتكردنو تۆقاندنی جەماوەر. رۆژی ٢٥ی تشرین نەدەكرا خۆپیشاندان تازە بكرێتەوە.

وەزارەتی سەربازیی (نورالدین محمود) دەیان هەزار خەڵكی گرت، لەوانە : سەرجەم رێبەرانی حیزبە بۆرجوازیە نیشتمانیەكانی بەرهەڵستی رژێم. ژمارەیەك كادێری حیزبیی وەك (عزیز الشیخ و محمد راضي شبرو حمدي أیوب و غضبان السعد و حیدر حاتم)و زۆری دیكە لە نێو گیراوەكاندا بوون. (كامل الچادرجی) لە گەرتووخانەی (أبو غریب) بە (عزیز الشیخ) گەیشتبوو، یەكێكیان لەسەر پێشاو گەڕابووەوە بۆ زیندانەكەیو ئەوی دیكەیان بە پێچەوانەوە. (عزیز) دەست پێشخەریی كرد بوو سڵاو لەو پێشەوا نیشتمانیە بكات. ئەویش وا وەڵامیدابوەوە:

ـ عەزیز ئێستا واز لە سڵاو بێنە ! پێم بڵێ رژێم توانیویە سەركردایەتیتان بگرێ؟

ـ نەخێر، نەیتوانیوە. سەركردایەتیمان باشو سەلامەتە.

ـ ئەمە مایەی شادمانیمە. مادامێكی سەركردایەتیتان سەلامەتە هەموو لە زیندان دەردەچین.

ئەم قسانەی (كامل الچادرجی) دانان بوون بە راستیی دەوری (حشع)دا لە ژیانی سیاسیی ئەو قۆناخانەی مێژووی عیراقدا بە تایبەت لە بەرەی بەرهەڵستی نیشتمانیدا دژی ئیمپریالیزمو رژێمی پاشایەتی گێڕای.

شێوازی زەبرو زەنگی دژ بە جەماوەر ئەو شتە سەرەکیە بوو کە رژێم پشتی پێ ئەستوور بوو. وێڕای ئەوە، رژێم ـ وەزارەتی تازە ـ بۆ رازیکردنی خەڵك کەمێك مانۆڕو ساختەکاریی کرد. گرنگترین شت لەم بارەوە دەرکردنی رێو رەسمێك بوو کە یاسای کۆنی هەڵبژاردنی پارلەمانی پێ هەڵوەشێندرایەوەو، لە بریی هەڵبژاردن بە دوو قۆناخ بڕیار لەسەر مافی هەڵبژاردنی راستەوخۆ درا. سەرۆك وەزیران هەوڵی دەدا وا خۆ دەربخات کە بایەخ بە گیروگرفتی هەژاران دەدات، بۆیە لیستێکی دەرکرد بۆ دیاریکردنی نرخی چەند سەوزەو کەرەستەیەکی خواردەمەنی. هاوولاتیەکی ناسریەیی گاڵتەی پێ هاتبوو، ئەم برووسکەیەی خوارەوەی بۆ ناردبوو (پێم وابێ رۆژنامەیەك بلاوی کردبوەوە).

ـ نرخ دانانتان بۆ شێلم دڵی خۆش کردین. دەست لە دەستو قەوەت لە خوا بڕۆن، ئێمەش لە دواتانەوەین.

خەڵك سەرەڕای حوکمی عورفیو گرتنو تیرۆر بڕێك گیانی بەرەنگاربوونەوەو ورە بەرزیی تێدا مابووەوەو، رژێمیش هەستی بە بێ هێزیو تەریککەوتن دەکرد. بەردەوامبوونی بلاوکردنەوەی حیزبیی چڕوپڕمان دەوری لەوەدا هەبوو. چەند رۆژێك دوای راپەڕین نامیلکەیەکی بچووکم نووسی، بۆ باسی راپەڕین تەرخان کرابوو. ئێستاکە ناتوانم ئەو نامیلکەیە هەڵبسەنگێنمو بیخەمە بەرچاو، لە پاش دەرچوونیەوە لە ١٩٥٢دا تا ئەمڕۆکە نەمدیوەتەوە. بەلام بیرمە هێندێك زیندانیی بەندیخانەی بەغدا چەند گلەییەکیان لێ هەبوو یا لە چەند خاڵێکی هەبوو. ئەو کاتە من لە شیکردنەوەی بارودۆخەکەدا یا هیچ نەبێ لە چەند مەسەلەیەکدا، بە زۆری پشتم بە تێکەڵێك لە مەسەلە واقیعیەکانو بیروڕای دۆگماتییو شکلی لە کتێبەوە وەرگیراو بەستبوو.

داخوازیی بنەڕەتی راپەڕین بوو بە دامەزراندنی وەزارەتێکی نیشتمانیی ئیئتیلافی بە سەرۆکایەتیی (کامل الچادرجی). ئەوە مانای وابوو ئێمە دروشمی

سۆشیالیزمان وەك ئامانجێكی راستەوخۆ نەخستبوە روو، داوایشمان نەكرد بوو (حشع) بە تاقی تەنیا حوكم بكات. كە راپەڕین بۆی نەچوە سەر ئەم ئامانجە بەدی بهێنێ، هەر پێبەندی هەمان سیاسەتی پێڕەو كراوی بەر لە راپەڕین بووین‌و، دروشمی رووخاندنی وەزارەتی سەربازی‌و دیكتاتۆریی (نورالدین محمود)مان بەرز كردەوە.
ئێمە بە شێوەیەكی تایبەتیش پێمان لەسەر داوای بەردانی گیراوە سیاسیەكانی قوربانیی راپەڕین‌و تیرۆر داگرت. دەسەڵاتداران، وەك نەریتی پێشوویان، رازی نەبوون لە بەرپرسانی حیزبە بۆرجوازیە نیشتمانیەكان بەدەر ئەوانە بە گیراوی سیاسی لەبەر چاو بگرن. بەڵام ناڕەزاییی بەربڵاو‌و هەڕەشەی مانگرتن لە خواردن تەنگی پێ هەڵچنین‌و ناچار بوون لە كەلی شەیتان بێنە خوارێ‌و وەك گیراوی سیاسی لەگەڵ شیوعیەكاندا بجوولێنەوە.
تیرۆر لەهەلومەرجی ئیدارەی عورفیدا گیانی بەرەنگاری‌و خۆگرتنی لای جەماوەر خەفە نەكرد. قوتابیان بڕێكی زۆریان لە ئامادەیی بۆ تێكۆشانی دژ بە رژیم تێدا مابووەوە. وەفدێكی قوتابیان بە دەست پێشخەریی سەركردایەتیی یەكێتیی گشتیی قوتابیان لە ١٥٠ قوتابیی كۆلێج‌و ئامۆژگا جیاجیاكان پێكهات، تا لە نیوچە خۆپیشاندانێكدا سەر لەوەزارەتەكان بدەن‌و داوای بەرەڵڵاكردنی هاوڕێ گیراوەكانیان بكەن. هێندێك قوتابیی شیوعی پێشنیازی خۆپیشاندانیان كرد، بەڵام من دژی ئەوە وەستام، بە ڕێبازێكی گۆشەگیرانەو سەر پەرگرتنێكی چەپڕەوانەی مایەی زەبری تازە گەیاندن بە ڕێكخستنەكانمم دانا.
ئاداری ١٩٥٣، (مادلین)ی ژنم، لە كاتی چوونە وادەیەكی حیزبیدا لە لایەن پۆلیسەوە گیرا. هەتا لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا تەواو بووو حوكمی زیندانكردنی بەسەردا دراو گەیشتە بەندیخانەی ژنانی بەغدا، ئەو ماڵە كە تێیدا دەژیاین چۆڵم كرد. مادلین خۆڕاگربووو لە لێكۆڵینەوەدا هیچ بێ هیزییەكی پێشان نەدابوو. حوكمی حەوت ساڵ بەندیی بۆ بڕایەوە. سكی پڕ بوو. كە گەڕامەوە بۆ ماڵ، ناچار

بووم پیرەژنە باشەکەی دایکی (عوسمان خۆشناو) ببەم تا لەگەڵماندا بژیو چێشتمان بۆ لێبنێ. (سوعاد)ی چوار ساڵەی کچی کەریم ئەحمەدو کچەزای خۆیی لەگەڵدا بوو.

* * *

دوا بە دوای سەرنەگرتنی ڕاپەڕینو، پاش ڕوونبوونەوەی باری سەرنجم سەبارەت بە ڕووداوەکان، یەکەمین ناکۆکیی فیکریی نێوان منو هێندێك لە زیندانییە شیوعیەکانی بەندیخانەی بەغدا دەرکەوتو، ئەوەیش لە چەندین نامەی ئاڵوگۆڕ پێکراودا ڕەنگی دایەوە. ئەم ناکۆکیانە هیچ دەنگدانەوەیەکی جێی باسیان لە بەندیخانەی (نوگرە سەلمان )و (کووت) دا نەبوو. بەشی هەرە زۆریان لە بەندیخانەی بەغدایشدا دوور لە هەر ناکۆکیەکی فیکری لەگەڵماندا بوون. (عەزیز محمد )ی زیندانیی شیوعی سەرۆکی شیوعیە ناکۆکەکان بوو لە بەندیخانە. بە قسەی (سلیم الچلبی)و(صادق الفلاحی) کە ئەوسا هەردوو لەبەندیخانە بوون، پێم وابێ (ابراهیم شاؤول )ی زیندانیی شیوعی جوولەکە ئەندازیاری فیکریو ڕێنوێنی تیۆریی ناکۆکیە فیکرییەکە بوو. (جەمال حەیدەری)ش، سەر باری جیاوازیی بۆ چوونە فیکرییەکانی لە هیی (عەزیز محمد)و(ابراهیم شاؤول )، ڕاکێشرابووە ڕیزی ناکۆکەکان.

شتی حاشا هەڵنەگری جێی ناکۆکی دروشمی ڕووخاندنی پاشایەتیو دامەزراندنی ڕژێمی کۆماریی میللی بوو کە لە نێو بەرنامە تازەکەماندا بوو لەخۆپێشاندانەکانی تشرینی ١٩٥٢ دا خۆیی خستە ڕوو. دووەم مەسەلەیش کە ئەوانە پەلپیان لێ گرت، سیاسەتی ئێمە بوو لە مەیدانی پەیمان بەستندا. سیاسەتی ئێمەیان بەرانبەر بە حیزبە بۆرجوازیە نیشتمانیەکان بە سیاسەتێکی چەپڕەویی سەر پەرگرانە دادەنا. (مخلص ) (ناوی خوازراوی ئەو کاتەی عەزیز محمد بوو) نامەیەکی درێژی بۆمان نووسی، تەواوی پەلپو ناکۆکیەکانیانی تێدا بوو. بە

نامەیەك وەلامم دایەوە (پاشتر لە نێوخۆی حیزبدا بەشرایەوە)، بۆ چوونەکانیم ڕەتکردەوەو بە هەلپەرستیەکی ڕاستڕەوانەم دانان، بەتایبەت لە هەلوێستیدا بەرانبەر بە دروشمی کۆماری میللی‌و کێشەی پەیمان بەستن لەگەل حیزبە بۆرجوازیە نیشتمانیەکاندا. ئێستا پێم وایە هەلوێستی ئەو بەرانبەر بە پاشایەتی هەلە بووو من لەسەر هەق بووم. سەبارەت بە پەیمان بەستنیش، ڕاستی لە نێوان چەپڕەویی من‌و ڕاستڕەویی ئەودا ون بوو بوو. هەر چۆنێك بێ، من حالی حازر پێم ناکرێت بەوردی نامەکەی ئەوو وەلامە نامەکەی خۆیشم هەلبسەنگێنم، بەتایبەت چونکە من هەر لە گیرانمەوە لە ١٩٥٣ دا هیچ یەکێکیانیم بەرچاو نەکەوتووەتەوە.

بەندیخانەکانی عێراق پێشتر گەلێك دوکەرتبوون‌و کودەتای ناوخۆی ڕێکخستنەکانیان لە نێوان زیندانیەکان خۆیاندا بەخۆوە دیبوو. ئێمەی دەرەوەی بەندیخانەکان نەبووینە لایەکی هیچ یەکێکیان. بۆ ئەوە نەدەچووم ناکۆکیی نێوان ئێمەو ئەوان بگاتە ڕادەی دوکەرتبوون، بەتایبەت کە ئەوان لە نێو بەندیخانەی بەغدایشدا کەمایەتیەکی بچووك بوون‌و لایەنگریان لە بەندیخانەکانی دیکە نەبوو. بەپێی ئاستی تێگەیشتنی ئەوسای خۆم‌و ئەوان کەوتمە نامە گۆڕینەوەو مشتومڕێکی دوورو درێژم لەگەلدا کردن. لام وابێ من بە کردەوە بڕێك نەرمیم بەرانبەر نواندن. بەلگەیشم ئەوەیە کە من نامەیەکم بۆ ناردن، بەرپرسیی ڕێکخستنی حیزبیم لە بەندیخانەی بەغدادا خستە سەر شانی (عەزیز محەمەد)، ئەگەرچی ناکۆکیی فیکریی نێوانمان توندو تیژ بووو (سلیم الچلبی)و (صادق الفلاحی ) لە بەندیخانەدا بوون‌و هەردوو ئەندامی ئەو لیژنەی ناوەندی یەیش بوون کە خۆم پێکم هێنا. بەلام عەزیز محەمەد ئەم بەرپرسیەی قبوول نەکردو پێی باشتر بوو لە ڕیزی زیندانیە بەرهەلستەکاندا بمێنێتەوە.

ناتوانم داکۆکی لە هەلوێستی سەلیم‌و صادق بکەم، وەك چۆن هیچی وام بەدەستەوە نییە تا لەئالۆز کردنی مەسەلەکان‌و بەرەو دوکەرتبوون بردنیدا ئەوانی

پێ تۆمەتدار بکەم. بەڵام تاکە ڕووداوێك سێبەری گومانی خستە سەر مەسەلەکەو دەریخست تاقمە بەرهەڵستەکەی زیندانیەکان پێشتر نەخشەیان بۆ دوکەرتبوون دەکێشا، چونکە (عبدالامیر الخیاط )ی بەرپرسی ڕێکخراوی حیزب لە نەجەف کە ئەو ڕۆژانە بۆ ماوەیەك خرایە بەندیخانەوە، بەر لە دوکەرتبوونەکە لە بەندیخانە دەرچوو. هەموو شتێکی لە شارەکەیدا بۆ بەدەنگەوە چوون‌و پاڵپشتکردنی دوکەرتبوون ساز کرد بوو. پێم وابێ پێش دەرچوونی لە بەندیخانە، لەسەر ئەوە لەگەڵیاندا پێکهاتبوو. ڕەنگە هەڵوێستی لایەنگریی ئەوان هۆیەکی ڕێگە خۆشکردن بوو بێ بۆ دوکەرتبوونەکە.

ناکۆکیەکان لە ئاداری ۱۹۵۳دا وا پەرەیان سەند، کێشایانەوە بۆ دووکەرتبوونی ڕێکخستن. ژمارەیەکی کەم دایانە پاڵ تاقمی حیزب دووکەرتکەر، لە کاتێکدا بەشی هەرە زۆریان لەگەڵ (سەلیم وصادق )دا مانەوە. پێویستە پێ لەوە بنێم کە دوکەرتبوونەکە ـ بە لای منەوە ـ شتێکی تا ڕادەیەك چاوەڕوان نەکراو بوو، بۆیە هەڵوێستێکی پەلەو چەوتم بەرانبەری دیاری کرد. دەبوو لە مەسەلەکە ورد ببمەوەو هەوڵی پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنە بدەم‌و لایەنگریی هەر لایەکیان دوا بخەم. دیارە لەو هەل‌و مەرجەدا ئەوە دەکرا. بەڵام پەنام بردە بەر چەقۆی نەشتەرگەری‌و بڕینەوە، واتە دەرکردنی دەستبەجێی ئەو تاقمە لە ڕیزەکانی حیزب.

شتێکی سروشتی بوو ئێمەو ئەو تاقمە لەبەر نزمیی ئاستی هۆشیاری‌و ئەزموونمان، بە چەند ڕێ‌و شوێنێکی ـ لانی کەم لە هێندێك ڕووەوە ـ چەوت‌و چەوێڵ ململانێ بکەین. گیروگرفتی سەرەکی، ئەگەر نەڵێم تاکە گیروگرفت، ئەوە بوو کە ڕێکخراوی نەجەف چووە پاڵ ئەو تاقمە. (محمد أبو کالە )و (غازی شریف )ی جووتە شیوعیی نەجەفی دژیان بوون. لە نەجەف بەدەر، هیچ ڕێکخراوێکی دیکەی دەرەوەی بەندیخانەی بەغدا نەچووە پاڵیان. لە نیسانی۱۹۵۳دا کەوتینە کۆشش بۆ گێڕانەوەی ڕێکخراوی نەجەف. بۆیە بانگەوازێکمان بۆ شیوعیەکانی نەجەف ـ شاری حسین

الشبيبي - دەركردو داوامـان لێكـردن بێنـەوە ریزەكـانی حیزب. (نـاصر عبـود)ی ئەندامی كۆمیتەی ناوەندیی حیزب چەند دانەیەكی لەم بانگـەوازە بـردو بەورەیـەكی بەرزەوە روویكردە نەجەف، تا لە ماڵی (محمد أبو كاله)دابنیشیێو، بكەوێتە ململانێ لە دژی ئەو تاقمە. دوو رۆژ دوای سەفەری ئەو، من لـە بـەغدا گیرامو ئیـتر نـەمزانی (ناصر) تا چ رادەیەك لەو ئیشەیدا سەركەوتوو بوو.

من گیرا بووم كە (جەمال حەیدەری)ی هاوڕێی نێو تاقمی حیزب دووكەرتكەر، توانیی كاتێك لە بەندیخانەوە دەیانگواستەوە بۆ نەخۆشخانەیەك رابكات. لەوە دەچـێ پاش هەڵاتنی رووی كردبێتە نەجەفو سوودی لەوە وەرگرتبـێ كـە رێكخـراوی ئـەوێ لەگەڵ ئەواندایە. بوو بە یەكەم بەرپرسی رێكخستنی تاقمەكە لـە دەرەوەی بەندیخانـە. لام وابێ تەباییی فیكری هاندەری (جەمال حـەیدەری) نـەبوو هـەتا لەگـەڵ (عـەزیز محەمەد)و (ابراهیم شاؤول) دابیێو شوێن ئەو تاقمە بكەوێ. بەڵكـە دەكرێـت بڵێـین : دانـووی لەگـەڵیاندا نـەدەكولا. پێدەچـێ لەبـەر كـەم ئـەزموونی یـان هـەر هۆیـەكی شەخسی پێی هەڵخلیسكابێ. ئەم راستیە وەختێك دەركەوت كـە بـوو بـە سـەركردەی رێكخستنەكەیان لە دەرەوەی بەندیخانەو ، پاش ئـەوەی لـە دوای سانسـۆری فیكریـی (عەزیز محەمەد) رزگار بوو و بڵاوكراوەی ئاڵای‌كارگـەران (رایـە الشـغیلە)ی زمـانی حاڵی رێكخراوەكەیی دەركردو خولیای سەرپەرگریی چەپڕەوانـەی خسـتە روو. دواتـر نەیارە شیوعیەكانیی (حشع)بـەوە تاوانبـار كـرد كـە تووشـی لادانێكـی راسـتڕەوانە بـوونو ناپاكییـان دەرهـەق بـە كێشـەی كۆمۆنـیزم كـردووە ، لەبـەر ئـەوەی بـەرەی هەڵبژاردنیان لەگەڵ حیزبە بۆرجوازیە بەرهەڵستەكاندا پێكـهێناوەو ، سـاڵی ١٩٥٤ قایل بوون هاوكاری لەگەڵ حیزبی سەربەخۆیی (الاستقلال)دا بكەن.

هەر لەو كاتەوەی گیرام (نیسانی ١٩٥٣) لە ململانێی راستەوخۆ لەگەڵ تاقمـە دوو كەرتەكەی حیزبدا دوور كەوتمەوە. پاشان لە بەندیخانەی (نوگرە سلمان) هێندێـك بڵاوكراوەی حیزبم لە دژیان خوێندەوە. سەیرم كرد كەریم ئەحمـەد وەك ئاماژەیـەك بـۆ

راوەستانیان دژ بە دروشمی رووخاندنی پاشایەتی، بە ئالاْی تەلاری شا (راية البلاط) ناودێری کردوون.

*　*　*

سکرتێری رێکخراوی بەسرە نامەیەکی بۆ ناردبووین، ئاگاداری کردبووینەوە کەوا کەوتووەتە خۆ بۆ راگەیاندنی مانگرتنێکی سەرتاسەری لە نێو کرێکارانی بەندەر (یا نەوت)داو، داوای لێکردبووین پێی بڵێین چی بکات. لەبەر بایەخی مەسەلەکە کەریم ئەحمەدم ناردە ئەوێ، تا راستەوخۆ بارودۆخەکە بەسەربکاتەوەو لەوە بکۆڵێتەوە کە دەبێ چی بکەین بۆ بڕیار لێدان و پشتگیریکردن یا دەست هەڵگرتن لە مانگرتنەکە. پێش هاتنەوەی بۆ بەغدا گیرا. لەبەر ئەوە نەمزانی ئەنجامی سەردانەکەی و هەڵسەنگاندنەکانی چی بوون.

*　*　*

شتێکی سەیری نیسانی ١٩٥٣ ئەو راکردنە بوو کە بۆ سێ هەڤاڵی زیندانیی بەندیخانەی بەغدامان رێکخست. ئەوانیش (صادق الفلاحی و سلیم الچلبی و حمدی أیوب) بوون. ئەوە ماوەیەکی کەم دوای دوکەرتبوونی حیزب پلانی فراندنیان بەم شێوەیە بوو :

سێ لاوی بڕوا پێکراوی خۆمانمان، بە (ابراهیم الحریری) شەوە، لە کاتی چاوپێکەوتنی حەفتانەی زیندانیە شیوعیەکاندا هێنایە نێو بەندیخانەو رامانسپاردن بەوریایی و بێدارییەوە بۆ ماوەی حەفتەیەك لە بەندیخانەدا بمێننەوە. ئەوەمان بە هاودەنگیی هەڤالانی بەندیخانە کرد. هەر سێ زیندانیەکە کە بڕیار وابوو پاش گۆڕینی شێوەیان بە جۆرێکی گونجاو لە هەمان چاوپێکەوتندا رابکەن، چوونە دەرێ. ئەو سێ لاوە بە دڵگەرمی و بە بێ هیچ پەڵپگرتنێك ئەو ئەرکە پێ سپێردراوەیان راپەڕاند. پێشوازیی زیندانیە راکردوەکان کراو برانە حەشارگەکان. لە چاوپێکەوتنی حەفتەی دواییدا هەر سێ لاوەکە لە زیندانییەوە بوون بە دیدەنیکەر ، کاتی کۆتایی هاتنی چاوپێکەوتنەکە تێکەڵ بە خێزانەکانیان بوون بۆ چوونە دەرەوە. نەریت وا بوو

بەر لە چوونــە دەرەوەی دیدەنیکەران سەر ژمێریی زیندانییــان بکرێت. مەسـەلەی هەلاتنی ئەو سێ کەسە کــەوتە روو. بۆیــە پێش ئـەوەی رێــی دیدەنیکـەران بـدەن برۆن، یەك بەیــەکیان وناسنامەکانیان تێکرا بەوردی پشــکندران. راپۆرتــی پۆلیس وای تۆمار کرد بوو کە زیندانیەکان شەوی رابـردوو بـە رێگەیـەك کـە دەسـەلاتداران پێیـان نـەزانیوە، هـەلاتوون. بـە خـەیالی هیـچ یـەکێکیاندا نــەدەهات کــە ئەوانــە حەفتەیەکی تەواو لەوەو بەر، بەو رێگەیەیش کە پێشتر باسمان کرد، هەلاتوون.

هەڤالە راکردوەکانمان جوێکردەوە تا هەریەکەیان لە مالێکدا بـژی. پـاش چـەند رۆژێك هەوالێکم پێ گەیشت دەیگوت: ئەو مالــەی کـە (صـادق الفلاحـی)ی تێـدا دادەنیشــێ، خراوەتـە بـەر چـاودێریو لەســەر پێیــە هەلبکوتنــە سـەری. لەبـەر ئـــەوە رامسپارد دەمو دەست لەوێ بچێتە دەرێو، پێشدەستیم کرد بیهێننە مالەکەی خۆم. لەبەر ئەوەی ئەندامێکی بروا پێکراوی کۆمیتەی ناوەندیش بوو، نـەمزانی دەیـهێنمو ماوەیەکی کەمی لەوە بەدوایشو، پێش ئەوەی تـامی راکـردن بکـات، لەگـەلێ منـدا دەگیرێ.

* * *

# ـ ٨ ـ

# نێـو زیـنـدان

شوباتی ١٩٥٣ گواستبوومەوە بۆ خانوویەکی نـێزیکی نزرگـەی (أبـی حنیفـە)و مـانگی سێیەمم تێدا تەواو نەکرد بوو. ئەوە بوو دوای مـانگێك ژنەکەم دەستگیر کرا. پـاش ئـەویش بـە چـەند حەفتەیـەك، بەسـەر خانوەکـەیاندا داو مـن‌و (صـادق جعفـر الفلاحی)و (باقر جعفر)یان دەسگیر کرد. باقر کرێکـاریکی لاوی نـەخوێندەوار بـوو، ئیشی هەر کڕینـی ڕۆژنامـەو پێداویسـتی ڕۆژانـە لـە بـازاڕو کردنـەوەی دەرگـا بـوو لەکاتی لەدەرگاداندا. نەکادێرێکی حیزبی‌و نـە ڕوخسـارێکی شیوعی ناسـراو بـوو. پیرەژنەکەی دایکـی عوسـمـان خۆشـناوو کچەزا چکۆلـە چـوار ساڵانەکەیشـی لەگـەڵ ئێمەدا گیران.

ئەو ڕۆژە ـ ١٣ی نیسانی ١٩٥٣ ـ ڕێك سەعات یازدەی پێشنیوەڕۆدا ژوانم لەگەڵ (هادی صالح)دا هەبوو، یـەکێك بـوو لـەو چـوار هەڤاڵـەی کـە شـوێنی ماڵەکـەمیان دەزانـی‌و دەبـوو نامەیـەکم لـە (رشـید العـارف)ی سـکرتێری ئەوسـای ڕێکخـراوی بەغداوە بۆ بێنێ. شەخسی خۆم بڕوایەکی بەتینم بەڕەشید نـەبوو. ئـەو پێوەندیـی بـە (ناصر عبود)ەوە هەبوو. کە ناصر چووە نەجەف لە ڕێگەی نامە گۆڕکێوە پێوەندیـی پێمەوە هەبوو. لە دالانی خـانوە بچووکەکـەدا دەهـاتم‌و دەچـووم یـەك تەقـەی دەرگـام هاتە گوێ. کردمەوە، چونکە وا مزانی هادی لە دەرگـای داوە. کـت‌و پـڕ کۆمـەڵێك سەرو سەکوتی نامۆو جێی گومانم لێ قوت بوونەوە. یـەك ئەفسـەری پۆلیسـی جلـی عەسکەری لەبەرو کابرایەکی بـە سـاڵدا چوویـان لـەنێودا بـوو. کابراکـە عەبایـەکی بەسەر کەواو سەڵتە کۆنـە بەغدایـیەکـەیدا دابـوو و کەشـییەکی لەسـەری پێچـابوو و نیشانەی ئەوە بوو زیارەتی کەعبەی کردووەو (حـاجی)یە. بـاش ناسـیمەوە، چونکـە موختاری گەڕەك‌و ـ لە هەمان کاتیشدا ـ دەلالی زەوی‌و زار بـوو. ئـەوانی دیکـەیش

هەموو لاوو بە جلە مەدەنەكانیانەوە ئەفەندی بوون. هەر لە یەكەم بینینەوە بۆم دەركەوت هاتوون هەڵبكوتنە سەر خانوەكەو خانە بگیرمان بكەن. دەستەو برد كەوتمە جووڵەو ویستم دەرگاكەیان لە روودا دابخەم، بۆ ئەوەی دەرفەتێكی كەم بقۆزمەوەو لەگەڵ صادق و باقری هاورێمدا رابكەم. بەلاّم هێندێكیان لەسەر پێ بوون هەوڵی دەرگا داخستنم لیّ تێك بدەن. بۆیە پاڵیان پێوە ناو خۆیانیان بە ژووردا كرد. بە دالاّن و راڕەوەكەی ناوەوەدا هەلاّتم، بەڵكوو لە دەرگای پشتەوە دەربچم و بگەمە پانتاییەكی بچووك كە دیوارێكی نێزیكەی مەترێك یا مەترو نیوێك بەرز لە باخچەی خانوەكەی دراوسێمان جوێی دەكردەوە. ئەگەر بكرابایە لەم دیوارە ئاودیو ببم، هەلیێكی لە بارم بۆ دەرەخسا تا هەڵبێم. كە لە نێو خانوەكەدا رامكرد، تەقەیان لێكردم و بەرم نەكەوت. بە دیوارەكەدا هەڵگەڕام و خەریك بوو باز بدەمە باخچەی دراوسێكەمان. بەلاّم یەكێك لەو دوا ساتە چارەنووسسازەدا قاچی گرتم و پاشەو پاش رایكێشام. بەربوومەوەو كەوتمە دەستیان. پەلكێشیان كردمە نێو ئەو ژوورەی كە صادق و باقری تێدا دادەنیشتن. بە شەپازلەو شەق وەشاندنەوە كەوتنە جنێو بارانكردن و لێدانمان. ئەوان چەكدارو ئێمە سێ كەسی بێ چەك بووین. لە پەستاو بە پێداگرتنەوە دەیانپرسی:

- كوڕە تۆ كێی؟ كوڕە تۆ خەڵكی كوێی؟

شەڕەكە نابەرانبەر بوو، چونكە لە نێو ژوورێكی بچووكداو لە نێوان ١٠ دەمانچە بە دەستی نوێنەری رژێمی حوكمدار لە لایەك و سێ زەلامی بێ چەك و لە دەست رژێم هەلاّتوودا لەلایەكی دیكەوە دەكرا. هەر ئەوەمان پێدەكرا بەدەم و بەقسەی سووك و جنێو وەلاّمیان بدەینەوە. بەسەریاندا دەمانقیژاند:

- هیچ و پووچینە ! تاوانبارینە ! فاشیستینە !

پێش ئەوەی دەست لە لێدانمان هەڵبگرن، خوێنی لووتمان بەربوو و خوێناویی كردین. بۆ زیاتر لە ١٠ دەقە درێژەیان بە لێدانمان داو، بەردەوام پرسیاریان دەكرد. تا یەكێكیان بەشێوە زمانێكی فەرماندەرانە گوتی:

- بەس ! تەواو ! دەست لە لێدان هەڵبگرن !

دڵنیا نەبوون ئەو خانوە کەبەسەریاندا داوە، لانەیەکی حیزبیی نهێنییە، بەڵکو تەنیا گومانیان هەبوو. پاش ڕاگرتنی لێدان، یەکێکیان جانتایەکی قوژبنی ژوورەکەی کردەوەو چاوی بە هێندێك بڵاوکراوەی کۆمۆنیستی کەوت. بۆیە لە خۆشییاندا هاواری کرد:

- ئێستا دڵنیا بووین ئێرە ماڵێکی شیوعییە.

بەڵام ئێمەیان نەناسیو لەوە نەکەوتن هەمان پرسیارمان لێ بکەن: " کوڕە تۆ کێی؟". یەکێکیان بۆ ماوەیەکی کەم چاوی بڕیە دەموچاوی(صادق الفلاحی).

ئەمجا قیژاندی:

- کوڕە ئەمە (صادق الفلاحی)ی کۆنە مەعمیلمانە ! تەماشا بکەن قژیی بۆیە کردووە تا نەیناسینەوە.

فەرماندەری مەفرەزەکە یەکێکیانی ڕاسپارد بچێ تەلەفون بۆ (نایل عیسی)ی دووەم بەرپرسی ئاسایشی گشتی بکاتو لەم ڕووداوە ئاگاداری بکاتەوە. فەرمانی بەوانی دیکەی ژوورەکەیش دا:

- دەی ماڵەکە سەنگو سووژن بنێن !

یەکەم شت کە بەخەیاڵمدا هات، ترسام لە ماڵەکەدا بۆسە بنێنەوە بۆ گرتنی ئەو هەڤاڵانەی کە دێنو، ئەوانیش (هادی صالح)و(کامل السامرائی)و(ناصر عبود)و (کریم احمد) بوون. بڕیارم دا هەوڵ بدەم ماوەی پشکنینەکە درێژ ببێتەوە، سا بەڵکە ئەوە دەرفەتمان بداتێ تا هەواڵی ڕووداوەکە بڵاو ببێتەوەو هەموان بیبیستنو هەڤاڵان توخنی خانوەکە نەکەون. بەناوی یاساوە داوام کرد ماڵەکە بە پێی ڕێو شوێنی یاسایی بپشکنن. دەمزانی موختاری گەڕەکیان لەگەڵدایە. بۆیە بەو بەهانەیەوە کە وڵات لە هەلومەرجی حوکمی عورفیدا دەژی، داوای ئامادەکردنی نوێنەری ئیدارەی عورفیم کرد. پەڵپیان لە داواکە نەگرت، بەڵکو فەرمان بە یەکێکیان درا بچێ

نوێنەری ئیدارەی عورفی بهێنێ. لەکاتێکدا چاوەڕوانیمان دەکرد، ئەفسەرە جلی پۆلیسی لەبەرەکە لێم نیزیك بووەوەو وێنەیەکی کۆنی پێش موو لێ هاتنی منی لە گیرفانی دەرهێناو لێی پرسیم:

- ئەمە وێنەی تۆ نییە؟ تۆ خاوەنی ئەم وێنەیە نیت؟

نە گوتم ئاو نەگوتم نا. بەلاّم لەوەلاّمدا گوتم: من لەبەر دەم حاکمی لێکۆڵینەوەدا هەموو شتێك روون دەکەمەوە. بۆیە گوتی:

- ئەگەر خاوەنی ئەم وێنەیەی ناوی خۆت بلێ تا رێزت لێ بگرن.

بەر لەوەی وەلاّم بدەمەوە، ئەفسەرێك بە پلەی موقەدەم هاتە ژوورێو رایگەیاند:

- من نوێنەری ئیدارەی عورفیم، هاتووم سەرپەرشتیی پشکنین بکەم.

سەر لە نوێ پەلّپم گرتەوەو گوتم:

- ئەگەر دەتانەوێ پشکنینێکی یاسایی بکەن، پێویستە حاکمی لێکۆڵینەوەیش ئامادە ببێ. داواتان لێ دەکەم پێبەندی یاسا بن.

- باشە. بڕۆن حاکمی لێکۆڵینەوەیش بانگ بکەن.

یەکێکیان چووە دەرەوەو، پاش چارەکە سەعاتێك کەمتر لەگەڵ پیاوێکی رەشتاڵەی سپۆرتی چوار شانەو مرچو مۆندا هاتەوە. گوتی: ئەمە (محمد أحمد العمر)ی حاکمە (جاروبار لە نێو بەرهەڵستە لیبرالەکانی رژێمدا ناوی دەبرا).

- لێم پرسی: دەتوانم دڵنیا ببم کە جەنابت بە راستی حاکمی؟ دەکرێت ناسنامەکەت ببینم؟

کابرا دەستبەجێ کەللەیی بوو، چونکە پرسیارەکەمی بە سووکایەتیەکی گەورە دانا بۆ خۆی. بەبێزارییەوە وەلاّمی دایەوە:

- هەتیو دەمت دابخە.

نەکەوتمە دەمە قڕە کردن لەگەڵ ئەم حاکمە دەبەنگەدا کە بیروکراسیو کەللە رەقیی توێژێکی فراوانی لە فەرمانبەرە زلەکانی دەزگای حوکمی بەرجەستە دەکرد.

بەڵکە داوام کرد نووسراوو بڵاوکراوەو بەڵگەکان پارچە پارچە جویّ بکەنەوەو بیانژمێرنو ئەوە لە کۆ نووس (محضر)ێکدا جێگیر بکەن، تا دواتر هێندیّ کەس بە دڵی خۆیان شتی دیکەیان لە نێودا نەشارنەوەو بییاندەنە پاڵ ئێمە. یەکەم جار داواکەمیان بە جیّ هێنا. بەڵام دوای چارەکە سەعاتێك بۆیان دەرکەوت پشکنین بەم شێوەیە دوو ڕۆژی تەواو دەخایانیّ. وازیان لەو کارە هێناو کورتیان کردەوە: جانتایەك بڵاوکراوەو بەڵگەی کۆمۆنیستیی لە نێودایە. پاش تێپەڕ بوونی نێزیکەی دوو سەعات بەسەر ڕووداوەکەدا، هەریەکەمانیان بە ئۆتۆمبیلێك گواستەوە بۆ دائیرەی ئاسایشی گشتی. هەر کە لە ماڵ هاتمە دەریّ، نەیانهێشت هیچ یەکێك لەو دوو هەڤاڵەم ببینم. پیرەژنەکەی دایکی عوسمانو کچەزا چکۆلەکەیشی گیران.

لە دائیرەی ئاسایشی گشتی ئاشکرام کرد کە من (بەهادین نووری)مو تێکۆشێکی شیوعیمو ، ئەو دوو کەسەش کە لە خانووەکەدا لەگەڵمدا گیراون هەر شیوعین. سەرەتا برامە نووسینگەی (بهجت العطية)ی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کە پیاوێکی ڕەشتاڵەی دەستەی کەمێك هێمن بوو. لەویّ دانیشتمو، دەبوو یەکەم گێمی مشتومڕ دەست پیّ بکەم . بەر لە هەموو شتێك بایەخی بە مەسەلەی سیفەتی حیزبیم دەدا. پێش گیرانم گومانێکی زۆری هەبوو کە من سکرتێری حیزب بم. بەڵام ڕەنگە باوەڕێکی بیّ ئەملاو ئەولای نەبوویێ. بۆیە لێی پرسیم:

- تۆ سکرتێری (حشع) نیت کە ناسناوی (باسم) ە؟

- نەخێر سکرتێری حیزب نیم. من ئەندامێکی حیزبیمو سکرتێر نیم.

بڕیارم دا تا سەر لە سەر ئەم ڕایە بمێنمەوەو بە ڕاشکاویو شێلگیرانە داکۆکی لە کۆمۆنیزمو حیزب بکەم. سەیرم کرد بەڕێوەبەری گشتی لە قسەدا کەوتە بڕو بیانوو هێناوەو هەوڵی دا مەنتیقی بیّ. وشەی سووكو هەڕەشەی بەکار هێنا. گوتی: لە قوتابخانەی سەرەتایی هاوڕێی فەهد بووم. پاش گیرانی لە ١٩٤٧دا، ئامۆژگاریم کرد بیر بکاتەوەو پەشیمان ببێتەوە لەوەی کە کردوویە تا دووچاری سزای یاسایی

توندوتیژ نەبێ    فەهد ئامۆژگاریەکانی منی بە گوێدا نەچوون، تا ئەوە قەوما کە قەوما. دیار بوو ئەم قسانەی دەگرتە من بۆ ئەوەی بمترسێنیو کولە پێچم بکات دان بە هەموو شتێکدا بنێم تا ملم لە پەتی سێدارە ڕزگار بکەم. ئەم پەتە نەیدەترساندم.

کە لە ژووری بەڕێوەبەری گشتی هاتمە دەر، بردیانمە ژووری (نایل عیسی)ی ورگ زلی یاریدەدەری کە سەرو سیمای چەشنە گەمژەییەکی جووتیارانەی پێشان دەدا. لەوێیش کەمو زۆر هەمان پرسیارو هەمان مشتومڕ دووپات بوونەوە. کەلە نووسینگەکەی نایل هاتمە دەر، لە ڕاڕەوێکدا بە تەنیشت دۆلابێکەوە کە لە خانوەکەمانەوە هێنا بوویان ڕایانوەستاندمو، پێش ئەوەی بمپەستنە نێو زیندانە شێدارەکەم یەکەمین وێنەیان گرتم. لەوێ کەلەپچەیان خستە دەستمو بەزنجیرێکی چەسپکراوی ناوەڕاستی زیندانەکەیانەوە بەست. هێندەی پێ نەچوو، جارێکی دیکە هێنایانمە دەر بۆ ژوورێکی دیکە کە ئەفسەرێکی بە پلەی موقەددەم تێدا دانیشتبوو. خۆیی پێ ناساندمو گوتی:

- من موقەددەم (صالح مهدی السامرائی) ی یاریدەدەری سیاسیی ڕێبەری ئیدارەی عورفیم.

پێم وایە یەکێك بوو لە ئەفسەرە سەرەکیەکانی دەزگای ئیستیخباراتی عەسکەری کە پێوەندیەکی پتەوی بە موخابەراتی بەریتانیاوە هەبوو. ئەویش حەزی دەکرد وتووێژم لە تەکدا بکاتو گوێم لێ بگرێ. هەمان باسو خواس دووپات بوونەوە. ئەم ئەفسەرە لەسەرخۆ بوو و پەنای نەبردە بەر هەڕەشەو گوڕەشەو جنێو. دوای ئەوە، هێنرامەوە بۆ زیندانەکەم تا وەك پێشان کەلەپچە بکرێم، بەبێ ئەوەی هیچ ڕاخەر یا پەتوویەکم بدەنێ. پێیشیان گوتم قۆمیسەرێکی پۆلیس بەردەوام لەبەردەم دەرگای زیندانەکەمدا دەبێو، دەتوانم پێوەندیی پێوە بکەمو چیم بوێ داوای لێ بکەم. پێم وابوو مەبەستی ئەم کارە قایمکردنی پاسەوانییە لەسەرمو ڕێگرتنە لەهەر هەوڵێکی هەڵاتنم. ئەوان لە تینو توانی فراوانی (حشع) دەترسان، چونکە پێوەندیەکی لە پچڕان نەهاتووی بەگەلەوە هەبوو.

که دەرگای زیندانەکەم کرایەوەو دوو پۆلیسی جلی ڕەسمی لەبەر هاتنە ژوورو گوتیان فەرمانیان پێدراوە شەو لەهەمان ژوور بخەون، شەو بەسەر بەغدادا هاتبوو. یەکیان ـ سەعید ـ پیاوێکی کامڵی دەستەی گۆشتن بوو، سەرو سیمای بە ڕواڵەت وای دەردەخست پیاوێکی کەمتەرخەمو دەبەنگەو هەر بۆ ئەوە بووە بە پۆلیس تا بژی. دووەمیان ـ کاسب یا چاسب ـ لاوێکی کەڵەگەتی بەلە باریکەی ڕووخۆشو وەك جووتیاری عێراقی سادەبوو و هێشتاکە ڕەوشتی بۆرجوازیانە گەندەڵی نەکرد بوو. ڕێ نەدەکەوت سەعید هەوڵی دوواندنم بدات. بە پێچەوانەی (کاسب)ەوە کەپەیجۆری هەر بۆنەیەکی دەکرد پێکەوە قسە بکەین. ئێوارەی ڕۆژی دوایی، کاسب سەعاتێکی تەواو بەر لەبرادەرەکەی هات. دیار بوو بۆ هەلێك دەگەڕا تا قسەم بۆ بکات. بۆی باس کردم کە ئەو کوڕی جووتیارێکی دێهاتی (عەمارەیە)یەو لەگەڵ کەسو کارەکەیدا لە قۆختەیەکدا دەژی. پێم ڕاگەیاند منیش لە بنەڕەتدا خەڵکی دێمو، منداڵ بووم کە ماڵەکەمان هاتە شارو، کە گەورە بوومو زۆرداریو چەوساندنەوەم بینی بووم بە شیوعی. گوتی لەم دائیرەیەدا زۆر تاڵیو ئەشکەنجەی دیوەو، شیوعیی وای دیوە خۆیی ڕانەگرتووە ومایەی روو سووری نەبوە، بەڵکوو رووخاوەو برادەرەکانیی تێوە گلاندووە. هیی دیکەیشی دیوە سەرباری سەختیی ئەشکەنجەدان خۆڕاگر بوون. بە شێوەیەکی تایبەت ستایشی (حەمید عوسمان)ی کرد کە حوزەیرانی ١٩٤٩ گیراو پاڵەوانانە خۆڕاگریی کرد. وەڵامم دایەوە:

ـ دەبێ ئەو کەسەی بە خواستی تەواوی خۆی ببێ بە شیوعی، ناڕەحەتی دەربباتو خۆ ڕابگرێ.

ـ دەتوانی تا سەر خۆ رابگری؟

ـ لە ژێر ئەشکەنجەدا تیکە تیکەم بکەن نا پاکی لە هەڤالانم ناکەمو نهێنیەکانی حیزب نادرکێنم.

کاسب روانیە روخسارم، وەك بڵێی هەر ئێستا دیومیو هیچی نەگوت. لە گۆشەی زیندانەکەوە لە جێی خۆی هەستاو لێم نێزیك بووەوەو بۆ خۆشەویستیو

ڕێزگرتن تەوێڵی ماچکردم. ئەمجا بە بێ ئـەوەی دەم هەڵبهێنێتـەوە چووەوە بـۆ جێـی خۆی. ڕوخساری کاسب پیاو چاکیو ڕاستیی هـاو سـۆزیی ئـەوی دەردەخسـت. ئـەوە قەناعەتی پێکردم کە من لەبەردەم مرۆڤێکی پیـاو چاکدامو دووره لـەوەی بـە فێـڵ خرابێتە تەکمو ڕاسپێردرابێ هەواڵم لەسەر کۆبکاتەوە. لێی پرسیم:

- چیت پێویستە سبەی ئێوارە بۆتی بهێنم؟

- کاسب هەر پێویستیم بە ڕۆژنامەیە !

- ئەمە یەکجار ترسناکە. ئەگـەر بـەوە بزانـن حوکمـی دوو سـاڵ بـەندیم بەسـەردا دەدەن.

- کەواتە پێویست ناکاتو هیچم ناوێ، لەگەڵ ڕێزو سوپاسمدا.

که ئێوارەی ڕۆژی دوایی هـات، ڕۆژنامەیـەکی لەگـەڵ مۆزێـکو پرتـەقاڵێکدا لـە گیرفانی دەرهێناو، بێهوودە هەوڵم دا قەناعـەتی پـێ بکـەم پارەکـەیم لێ وەربگـرێ. کەچی هەر لێی وەرنـەگرتم. ڕۆژانـی دواتریـش ئـەوەی بـە خۆڕایـی دوو پـاتکردەوە ، ئەگەر چی کەم دەرامەت بوو. یەکەم کەس بوو باسی گـیرانی (کـامل السـامرائی)ی بۆ کردم.

کامـل ئـەندامی لیژنـەی حیزبیی بـەغداو هـاوڕێو لـە ئوتومبیـل لێخوڕینـدا مـامۆستام بوو. دایکیو خوشـکەکانی ئـافرەتی بـاشو هـاندەری بـوون بـۆ خـەبات. سـەعاتێك بــەر لــەوەی بەســەر ماڵەکــەمدا بــدەن هاتــە لام، کۆنــە ئوتومبیلــە چکۆلەکـەمی وا بـرد بـۆ چاککردن لـە لای فیتـەر کـە نیـوەڕۆ یـا کـەمێك پاشــتر بیگێڕێتەوە بۆم. لەوە دەچێ ئوتومبیلەکەی هێنابێتەوەو کەوتبێتە ئەو بۆسەیەوە کـە لە نێو خانوەکەدا بۆیان نابووەوە. گیرا بە ئوتومبیلەکەیشەوە کە چـوار مـانگ دەبـوو بە سەدو بیست دینار کڕیبووم.

لە (کاسب)ی هاوڕێ پۆلیسەکەمم پرسی:

-چ زانیاریەکت لایە لە بارەی سێ هاوڕێ گیراوەکەمەوە؟ ئایا ئەشکەنجە دەدرێـن؟ هیچ یەکێکیان دانیان بە نهێنیەکاندا ناوە؟

- من هیچیانم راستەوخۆ نەدیوەو ئەوەم پێ ناکرێت. بەڵام بیستم لێیان دەدرێتو ئەشکەنجە دەدرێن. نەمبیستووە کەسیان نهێنیی درکاند بێ. هەموویان خۆڕاگرن. ئەگەر نهێنییان بدرکاندبایە لێرە ـ وەك بووە بە نەریت ـ هەموو دەیانبیست.

لە سێیەم رۆژی گیرانمدا بە (کاظم)ی قۆمیسەرە یاساوڵەکەم گوت: دەمەوێ چاوم بە بەڕێوەبەری گشتی بکەوێ. لەوەڵامدا گوتی: هەر ئێستا دەچم پێی بڵێم. لە ماوەی دوو دەقە کەمتردا بە پەلە گەڕایەوەو دەرگای زیندانەکەی کردەوەو کەلەپچەکانی دەستمی کردنەوەو گوتی:

- مامۆستا فەرموو ! جەنابی بەڕێوەبەری گشتی چاوەڕێت دەکات.

لە زیندان هاتمە دەر، سەیرم کرد ژمارەیەکی زۆری پیاوانی ئاسایشی گشتی لە هەردوو لای ڕاڕەوی روو بە نووسینگەی (بهجت العطیة)دا ریز بوونو، هەموویان بە خۆتێهەڵقورتاندنێکی سەیرەوە تەماشام دەکەن. گوێم لە چرپەی هێندێکیان بوو. وایان چاوەڕوان دەکرد کە داوای چاوپێکەوتنی سەرۆکەکەیان دەکەم، شان دادەخەمو نهێنی دەدرکێنم. یەکیان گوتی: "واز بێنە با لێرە سەری بئێشێنین، وەك چۆن ساڵەها سەری ئێشاندبووین". بهجت لە نووسنگەکەیدا بە گەرمی پێشوازیی کردم. دانیشتمو دەستم بە باسێکی ـ بەلای ئەوەوە ـ چاوەڕوان نەکراو کرد:

- هاتم نارەزایی دەربڕم بەرانبەر بە مامەڵەی نا یاسایی ـ نا مرۆڤانەتان لەگەڵمانداو، ئەم ئەشکەنجە دڕندانەیە ریسوا دەکەم.

- کەس هات لێت بدات؟

- نەخێر لە منیان نەداوە. بەڵام ئەوەتی خراومە زیندان کەلەپچە کراومو، وەك چۆن حەیوانێك دەبەسترێتەوە ئاوا بە سنگێکی ئاسنی ناوەڕاستی ژوورەکەوە بەستراومو ، بەبێ ئەوەی راخەر یا پەتوویەکم بدەنێ لەسەر ئەرزێکی ساردو شێدار فڕێتان داومو ، رۆژنامەو رادیۆو چاوپێکەوتنو هەموو پێوەندییەکتان بە جیهانی

دەرەوەی زیندانەکەمەوە لێ قەدەغە کـردووم‌و، چـەند پیاوێکتـان جنێـوم پـێ دەدەن‌و هەڕەشەم لێ دەکەن    ئایا ئەمە مامەڵەی مرۆڤانەیە؟ یاسای ئێوە رێ بەوە دەدات؟

- ئەگـەر ئێـوە ببونایـە بـە حوکمـدارو ئێمـەتان بگرتبایـە چـۆن لەگـەڵماندا دەجوولانەوە؟ ئاخۆ بەزەییتان پێماندا دەهاتەوە؟

- دەمانگرتن‌و دەماندان بە دادگای گەل تا چارەنووسـتان دیـاری بکـات. (ئـەوەم پێ گوت‌و، ئەو کاتە بـە خـەیاڵمدا نـەدەهات کـە دوای پێنـج سـاڵ لـەم قسـانە ئـەم کابرایە راست دەگیرێت‌و دەدرێتە دادگای گەل - کە المهداوی سەرۆکایەتیی دەکـرد -و مەسەلەکە بە جێبەجێکردنی حوکمی لە سێدارەدانی کۆتاییی دێت).

- ئێمەش گرتمانن‌و دەتاندەین بە دادگا تا حوکمی بە دادانەی خۆی دەربکات.

- نەهاتووم داوا بکەم نەمدەن بە دادگا، بەڵکوو داوا بـکەم دائیرەکـەتان لـە بریـی ئەم مـامـەڵە دڕندانەو فاشیانەیەی ئێستا بە شێوەیەکی مرۆڤانەو یاسایی رەفتارمـان لەگەڵدا بکات. من تاوانێکم نـەکردووەو، شەخسـی خـۆم دوژمنایـەتیم لەگـەڵ هیـچ کەسێکدا نییە. من گیراوێکی سیاسیم چونکە خەباتم لە دژی کۆلۆنیـالیزم‌و نۆکـەرە ناوخۆییەکانی کردووە.

- تۆ نازانی دروشمی رووخاندنی رژێمی پاشایەتی‌و دامەزراندنی رژێمـی کۆمـاریت بەرزکردووەتەوە. ئەمەیش تاوانێکە سزاکەی بە پێی یاساکانی عیراق لە سێدارەدانە؟

- جەنابی بەڕێوەبەر ئەم مـەسەلەیە ئیشی دادگایـەو دائیرەکـەتان هـەقی بەسـەرەوە نییـە. مـن بـە نـاوی مرۆڤایـەتی‌و یاسـاوە داواتـان لێ دەکـەم وەك گیـراوی سیاسـی مـامـەڵەمان لەگەڵدا بکەن.

- باشە کاك بەهادین. بچۆرەوە بۆ ژوورەکەت، لەمەودوا مامەڵەیەکی مرۆڤانـەتان لەگەڵدا دەکەین.

دوای ئەوەی دڵنیا بوو کە من نەهاتوومە لای بە چۆکـدا بێـم‌و نـهێنی بدرکێنـم، ئەوەی گوت تا پوولم پێوە بنێ‌و قسە رەقەکانم ببڕێتەوە.

گەڕامەوە بۆ زیندانەکەم. مامەڵە کردنیان لەگەڵمدا هیچ نەگۆڕا ، ئەوە نەبێ کە یەك بەتانیی کۆنیان دامێ. (کاسب)ی برادەرم پێی گوتم ئەشکەنجەدانی دوان لە هاوڕێکانم هەر بەردەوامە. وای بۆ چووم ئەو دوانە کامل‌و باقر بن، چونکە (صادق الفلاحی)ی "کۆنە مەعمیلیان" ناسراو بوو لە لایان‌و دەستیان لێ شتبوو، پێشتر پتر لە جارێك گیرا بووو ئەشکەنجە درابووو خۆیی راگرتبوو.

حەوتەم یا هەشتەم رۆژی گیرانم. کاسب بە نهێنی قەڵەم‌و قاقەزی بۆ هێنام‌و. نامەیەکم بۆ لیژنەی ناوەندی یا بۆ کەریم ئەحمەد نووسی‌و ، لەگەڵ ناونیشانی هەڤاڵێکدا دامە پۆلیسەکە بۆ ئەوەی بیگەیەنێ. لە نامەکەدا ئاماژەم بۆ ئەوە کردبوو کە من دانم پێدا ناوە خۆم‌و صادق‌و باقر تەنیا وەك ئەندام سەر بە حیزبین. باسی ئەوەیشم کرد کە کامل حیزبی نییەو نازانم چۆن دەستگیر کراوە. هەروەها گوتیشم ئەگەر نەگوێزرێمەوە بۆ دەرەوەی ئاسایشی گشتی ، ئەوا بۆ ناڕەزایی دەربڕین دژی مامەڵەی خراپتان مان لە خواردن دەگرم. پاشتر زانیم کاسب بە ئەمانەتەوە نامەکەی گەیاند بووو کەریم ئەحمەد چاوی پێ کەوتبوو.

هەمان رۆژ هەڕەشەم لە ئاسایشی گشتی کرد کە ئەگەر بە باشی لەگەڵمدا نەجووڵێنەوەو لێم نەکۆڵنەوە تا پاشان بگوێزرێمەوە بۆ گرتوو خانەیەکی ئاسایی، دەم ودەست مان لە خواردن دەگرم. بەرپرسێکی دائیرەکە بە پرتاو ئاگاداری کردمەوە کە سبەی لێکۆڵینەوە دەکرێت‌و پێویست بە هیچ مانگرتنێك ناکات. لێکۆڵینەوەکە رۆژی دوایی بەڕاستی دەستی پێکرد. لێکۆڵەرەوەکە (عبداللطیف الوتار)ی ئەفسەری پۆلیس بوو کە بە سێیەم بەرپرسی ئاسایشی گشتی دادەنرا. رێك کەوتین قسەکانم بە دەستی خۆم بنووسمەوەو، ئەو بپرسێ‌و من وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە. لە نووسینگەکەیدا دانیشتم. کابرایەکی هێمن بووو بە درێژاییی دوو رۆژی لێکۆڵینەوە گرژ نەبوو، جارێك نەبێ چونکە سوور بووم لەسەر ئەوەی کە من سکرتێری حیزب نیم ناسناوم (باسم)نییە. گوتی:

- هەزار بەڵگەمان لە لایە کە تۆ (باسم)ی. ئیتر نکوولی لێکردنی بۆچی‌یە؟ پێویستە دان بەوەدا بنێی کە تۆ سکرتێری حیزبی.
- من شیوعیم‌و ئەندامی حیزبم، سکرتێر نیم.
- کەواتە نابێ بڵێی من شیوعیم.
- دەیڵێم وپێ دادەگرم کە من شیوعیم.
- لەسەر ئەم پێداگرتنە زمانت دەبڕم.
- بۆت هەیە زمانم ببڕی. بەڵام پێت ناکرێت کۆڵم پێ بدەی‌و ناچارم بکەی نهێنی بدرکێنم.

ئەفسەرە لێکۆڵەرەوەکە مات بوو، کەمێ تێی روانیم. نەمزانی ئاخۆ رق یا بەزەییی لە دڵدا بوو. ئەمجا گوتی:

- تکای لێبوردن دەکەم. با بەردەوام بین‌و چۆنت دەوێ وا وەڵامەکانت بنووسە.

پرسیارێك سەرنجی راکێشام لەو بارەوە بوو کە ئایا (محمد مهدی الجواهري)ئەندامی (حشع)بوو. وەڵامم دایەوە: خۆزگە شیوعی بووایە ! من هیچ رۆژێك نەمبیستووە شیوعی بوو بێ. لەوەڵامی ئەو پرسیارەیشدا کە کێ بۆ ئەندامەتیی حیزبی پاڵاوتم‌و ئیشم لەگەڵ کێدا کردووەو لە شیوعیەکان کێیان دەناسم.. من هەر کلێشەیەکی نەگۆڕم دەنووسی: " وەڵامی ئەم پرسیارە نادەمەوە " یا: " نهێنی یەك نادرکێنم بە من سپێردرابێ ". لێکۆڵینەوە هەردوو ڕۆژی ٢٢و ٢٣/٤ بەردەوام بووو چەندین دەمەتەقێی تێهەڵکێش بوو. پاش ئەوە ڕاستەوخۆ گواسترامەوە بۆ بەندیخانەی ژمارە(١) لە ئوردووگای (الرشید). لەوێ بۆم ڕوون بووەوە کە هەر چوار گیراوەکە لە ژووری تاکە کسیی یەك لەتەنیشت یەکدا گل دراونەوەو پاسەوانییەکی عەسکەریی توندوتیژیان لەسەرەو، بەواتایەکی دیاریکراو کەوتوونە بەر ڕەحمەتی (عبدالمهیمن)ی ئەفسەری دڕی فەرماندەری گرتووخانەکە.

گرتووخانەکە ژمارەیەکی زۆر گیراوی شیوعیی تێدا بوو، لەوانە: ئەوانەی کە بەهۆی کێشەکەی ئێمەوە گیرا بوون، سا یا لەبەر بەشداریکردنیان لەو وەفدانەدا کە

چوونە لای دەسەڵاتداران و داوای بەردانمانیان کرد، یان چونکە دەسەڵاتداران نووسراوی وایان لە ماڵەکەمدا بەردەست کەوت یارمەتیی دان ئەوانە بناسن، یا لەبەر هۆی دیکەی لەم چەشنە. بەتایبەت بۆ ئەوە توندوتیژییان نواند تا ڕێی بەیەکگەیشتنی نێوان خۆمان و گیراوەکانی ترمان لێ بگرن. جا کە یەکێکمان لێ دەبرایە ئاودەستخانەی نێزیکەی حەفتا مەترێك لە زیندانەکەمانەوە دوور، زیندانیەکانی دیکە لە ژوورەکان گل دەدرانەوەو ڕێگەکە تەواو چۆڵ دەکرا، لەترسی ئەوەی نەبادا یەکێك بمانبینێ یا قسەمان بۆ بکات. فەرماندەری گرتووخانەکە سەرباری کەڵەوە کێشیو دڕیی لەگەڵ گیراوەکانی دیکەدا، لێمان دەترساو خۆیی لە قەرەمان نەدەدا.

ئەو تاکە مرۆڤەی بۆم دەکرا قسەی بۆ بکەم سەربازە یاساوڵەکە بوو کە بەردەوام لەبەردەم ژوورەکەماندا هەڵوەستا بوو. یاساوڵەکە هەردوو سەعات جارێك دەگۆڕدرا. ئەوە دەرفەتی قسەکردنی بۆ یەکێکی دیکە بۆ خۆش دەکردین. زەحمەت نەبوو، بەتایبەت لەگەڵ هێندێك یاساوڵیاندا لێك حاڵی ببین. جار لە دوای جار لەگەڵ (ئەکبەر)ی سەربازی یەك خەتی فەرماندەری کەرتی پاسەوانیدا کە تورکمانێکی شیعە مەزەبی خەڵکی دووز بوو، لە کونی دەرگای ئاسنی زیندانەکەمەوە بەیەك دەگەیشتین وقسە گۆڕکێمان دەکرد. ئەم سەربازە خۆیی بە شیوعی دادەنا. هەرکاتێك بیزانیبایە پاسەوانەکە ئەمین و بڕوا پێکراوە دەهاتە لام. ڕۆژێکیان باسی دانانی ڕێی هەڵاتنمی لا کردمەوە، گوتی: خۆیشم لەگەڵتدا هەڵدێم. بەراستی بوو. بەڵام مرۆڤێکی سادەی کەم ئەزموون بوو. هەڵاتنم ڕەت نەکردەوە. داوای ڕوونکردنەوەم کردو زۆرم لێ پرسی. لام وایە ئەوە هەلێکی ڕاستەقینە بوو بۆ هەڵاتن و، زۆر سەربازی دیکەیش هەبوون ئامادە بوون هاوکاریمان بکەن. بەڵام هەوڵەکە دوا بە دوای گواستنەوەی ئەکبەر سەری نەگرت. ڕەنگە لەبەر زۆربلێیەتیی خۆی یا گومان لێکردنی بوو بێ.

برادەرایەتیم لەگەڵ هێندێکی ئەو سەربازانەدا پەیدا کرد کە بۆم هەڵدەکەوت لە سەعاتی پاسەوانییاندا قسەیان لە تەکدا بکەم. ڕۆژێکیان یەکێکی لادێییو نەخوێندەواریان لێی پرسیم:

- بۆچی گیرای؟

- بە تاوانی شیوعی بوون.

- ئیشی ئەم حکوومەتە سەیرە. جا بۆچی خەڵك بەم تاوانەوە دەگیرێن؟ بۆچی نیوەی ئۆمەتی محەمەد شیوعی نین؟

لەو ڕۆژەوە کە گیرام شازدە دینارم پێ بوو، لە ئاسایشی گشتی هیچیم لێ خەرج نەکرد. لەبەندیخانەی ژمارە یەك یاساوڵێکم ڕاسپارد دوو کیلۆ گرام خورمام بۆ بکڕێ. دەمزانی (صادق الفلاحی) تەنانەت فلسێك شك نابات. دوو دینارم لە برە خورمایەکدا شاردەوەو دامە سەربازە یاساوڵەکە، تکام لێکرد بیگەیەنێ بە صادق. پاش چەند دەقەیەك فەرماندەری گرتووخانە خورماکەی بەدەستەوە بوو و هاتە لام. دوو دینارو خورماکەی بەسەرمدا فڕێ داو ڕوو بەدیواری زیندانەکە پاڵی پێوە نامو هەڕەشەی لێکردم:

- چۆن پارە بۆ گیراوێکی دیکە دەنێری؟

- من تاوانم نەکردووەو شتێکی قەدەغەم نەناردووە. مافی ئەوەم هەیە خواردنو پارە بۆ هەڤاڵم یا بۆ هەر مرۆڤێکی دیکە بنێرم.

ئەفسەرەکە بەجێی هێشتمو، ڕووداوەکە لە نێو سەربازەکاندا بڵاوبووەوە. بۆیە هەموو بەقسەی ناشیرین شاوڵیان بۆ پاسەوانەکە بردو بە "ناپاك "یان داناو جنێویان پێ دا. ئەویش پتر لە جارێك هاتە لامو عوزر خواییی بۆ هێنامەوە. بەڵام من وەڵامم نەدایەوە.

سێ مانگ دوای گیرانم باوکم توانیی بەیاریدەی هێندێك دەسترۆی بنەماڵەی بابان لەبەغدا ڕەزامەندیی دەسەڵاتداران وەربگرێ بۆ سەردانم لە گرتووخانە.ئەوە بە

درێژاییی زیاتر لە سێ ساڵ یەکەم چاوپێکەوتن بوو. (محەمەد بابان)ی پارێزەری نیشتمانپەروەرو پیاوێکی ئاینیی دیکەی " مەلا محەمەدە شەلە " ناوی لەگەڵدا بوون. لەنووسینگەی (عبدالمهیمن)ی فەرماندەری گرتووخانەو بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی ئەو بۆ ماوەی ١٠ دەقە چاوم بە باوکم کەوت. پێی گوتم:

- لە١٣ی نیساندا گرتیانی‌و، من لە١٤ی نیساندا هاتمە بەغداو تا ئێستا لێرە نەبزووتووم. بەشوێن هەواڵی تۆدا یا بۆ دەست سووککردن لەسەرت چوومەتە لای ئەمو ئەو.

- بابە گیان پێویستی نەدەکرد تا ئەم ڕادەیە خۆت بڕەتێنی. تۆ ناتوانی هیچم بۆ بکەی‌و ئەو پارەیەیشت نییە ئەم هەموو ماوەیە بۆ مانەوەتی خەرج بکەی لە بەغدا.

- کوڕم ئەوە دەزانم. بەڵام من باوکم‌و تۆیش جەرگی منی ! ناتوانم لێت دوور بکەومەوە.

چاوپێکەوتنەکە لە مانگی ڕەمەزاندا بوو. مەلا شەلە لێی پرسیم:

- بەهادین بەڕۆژوویت؟

- نەخێر مامۆستا بەڕۆژوو نیم. ژیانی بەندیخانە لێرە ڕێ بەڕۆژوو گرتن نادات.

- درۆ دەکەی، ئەوی بیەوێ بۆ خوا بەڕۆژوو بێ، دەتوانێ لە گشت هەل‌و مەرجێکدا ئەوە بکات.

پێش ئەوەی داکۆکی لە خۆم بکەم، باوکم وەڵامدانەوەی برادەرەکەیی گرتە ئەستۆو گوتی:

- مەلا محەمەد لەوە دەچێ تۆ ئەو دەرسانەی حوکمەکانی شەریعەتت بیر چووبنەوە کە خوێندووتن ! چونکە شەریعەتی ئیسلامی کەسانی وەك ئەو پێمل ناکات ڕۆژوو بگرن تا لەوەزعێکی وەك هیی ئێرەدا بژین.

شەلە بێ دەنگ بووو، عبدالمهیمن گوتی:

- وەختی چاوپێکەوتن تەواو بوو، با هەریەکە بچێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

ڕۆژی دوایی لەسەر بەتانیەکەم هەلاژا بووم کە سەربازە یاساوڵەکە بانگی کردو گوتی:

- پرسیارێکی شەرعیم هەیەو، وەلامەکەیم لە تۆ دەوێ.

- جا کێ پێی گوتووی من دەتوانم وەلامت بدەمەوە؟

- دوێنێ کە باوکت هات بۆ چاوپێکەوتننت بینیم. پیاوێکی مێزەر بەسەر بوو. ئەمە مانای وایە تۆ دەتوانی وەلام بدەیتەوە.

- (خضر) پرسیارەکەت چییە؟

- ئەگەر ڕۆژووگر بە ڕۆژ نوستبێ و لە خەویدا شەیتانی ببێ ڕۆژوەکەی دەشکێ؟

خۆمم لەوەلامدانەوە دزییەوە، چونکە نەمدەزانی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی چی دەڵێن. دوا جار کە زۆر پێی لێ کردمە کەوش گوتم: بەڕای هێندێکیان دەشکێ و، بەڕای هێندێکی دیکەیش ناشکێ.

ڕۆژێکیان دەرگای زیندانەکە کرایەوەو عبد المهیمن بانگی کردم لەگەڵیدا بچمە نووسینگەکەی. لاوێکی بالا بەرزی هێمنم لەوێ بینی و ناسیمەوە، ئەگەر چی جووتە سمێڵەکەی خەریك بوون سەرم لێ تێك بدەن. (مجید عبدالرزاق) بوو کە لە زستانی ١٩٥٠ وە نەمدیبوو. فەرماندەری گرتووخانە لێی پرسیم:

- ئەم لاوە دانیشتوەی ئێرە دەناسی؟

- نەخێر نایناسم.

- ئەو باش تۆ دەناسێ و تۆیش دەیناسی.

- گوتم من نایناسم و پێشتر نەمدیوە.

لە مەجیدی نەپرسیی ئاخۆ دەمناسێ و، ئەویش لە خۆوە هیچی نەگوت. بەوەدا وام مەزەندە کرد نکوولیی لە ناسینم کردووە، گەر چی کاتی خۆی بەشداریی وەفدێکی سلێمانیی کردبوو عەریزەیەکی بۆ دەربارەی پاشایەتی پێ بوو داوای بەردانمی کرد بوو.

دوو رۆژ لەوە بەدوا جارێکی دیکە بانگ کرامەوە بۆ ژووری بەڕێوەبەر. لاوێکی کوڵە بنە لەوێ بوو. یەکەم جار بوو بیبینم. چاوی بڕیبووە من لەبەر هۆیەك کە سەرەتا نەمزانی چییە. ئەو لێکۆڵەرەوەیەی کە لەگەڵیدا هاتبووە ئەوێ لێی پرسیم:

- ئەم زەلامە دەناسی؟

- نەخێر نایناسمو لە ژیانمدا نەمدیوە.

- ئەو دەتناسێو تۆیش دەیناسی.. ئەوە حەسەنی شێخ سەعیدە، تەتەری حیزبیی نێوان تۆو (مجید عبدالرزاق)بووە. حەسەن وا نییە؟

- بەڵێ دەیناسمو دەمناسێ. تەتەری نێوان ئەوو (مجید عبدالرزاق) بووم.

لێکۆڵینەوە تازە ساختەکە دواییی هات‌و، گەڕامەوە بۆ زیندانەکەمو بیرم لە ڕووداوەکە دەکردەوە. ئەمە چ تەپکەیەکە دەینێنەوە؟ مەبەستیان لە هێنانی ئەم لاوە چییە کە بە ڕاستی نایناسمو ئەویش نامناسێ، کەچی ئەو بە پێچەوانەوە دەڵێت دەیناسم؟ دوا جار ئەوەم بە ئەنجام هێنا کە ئەوان پێویستییان بە شایەت هەیە دژی من. جا کە بەختم یار بوو و شیوعیەکی ڕووخاوی نێو گیراوەکانیان پەیدا نەکرد ئامادە بێ شایەتی لە دژم بدات، ئەم زەلامەیان هێنا (دواتر زانیم کۆنە شیوعیش بووە) تا بیکەن بە شایەت‌و بیسەلمێنن من (باسم)ی سکرتێری حیزبم.

لە گرتووخانەی ئوردووگای (الرشید)تووشی گیروگرفتی جل‌و بەرگ بووم. بیجامە کۆنەکەم کە ڕۆژی هەڵکوتانە سەر خانوەکەم لە (الاعظمیة) لە بەرمدا بووو نەیانهێشت جلی دیکەی لە باتی لەبەر بکەم، دادر دادر بوو. پتر لە جارێك پینەم کردو سەر لە نوێ درایەوە. هەر بەم شێوەیەو هەتا لە یەکەمین دانیشتنەکانی ڕۆژانی دادگاییکردنیشدا لەبەرم دەکرد. دوا جار هەڤاڵە گیراوەکان بە نهێنی شەرواڵێك‌و کراسێکیان بە پۆلیسێکدا بۆ ناردم‌و، بیجامە دڕاوەکەم تووڕداو جلە تازەکانم لەبەر کرد.

پێشتر لەوادەی دادگاییکردنەکە ئاگاداریان نەکردمەوەو، بیرم نایە چ ڕۆژێکی حوزەیرانی ١٩٥٣ دەستی پێکرد. هەر ئەوەم لە بیرە کە حوکمی عورفی لە کاردا

بوو و ناخافڵ بردیانمە دادگا. لە زیندانەکەم دەریانهێنام، پاش تاوێك سەیرم کرد لە زیندانێکی بچووکی نێو ئۆتومبێلی بەندیخانەدام کە رووی کردبووە شوێنێکی نێو ئۆردووگا. دوای کەمێك یاساوڵەکانم بەدی کرد لە ئۆتومبیلەکە دابەزین و بە کێشیان کردمە هۆڵی دادگا.

یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا بچمە نێو هۆڵی دادگا. دادگایەکی عەسکەری بوو، سەرۆکەکەی ئەفسەر (عمید)ێکی (جمیل عبدالمجید) ناو بوو. ئەفسەرێك و قازییەکی مەدەنی لە ملاو ئەو لایەوە دانیشتبوون. حوکمەکانی دادگا قابیلی تەمیز کردن نەبوون. کاتبی دادگا لە بەرگێکی مەدەنیدا بوو. هەموو یاساوڵەکانیش عەسکەری بوون. کە چوومە نێو هۆڵەکە هەستم بە تۆزقاڵێك ترس یا سەخڵەتی نەکرد. خۆمم بۆ خراپترین چارەنووس ئامادە کرد بوو، واتە حوکمی لە قەنارەدان. وام هەست نەدەکرد ببەزێم، حوکمەکەم هەرچی بووایە. زیاتر بووژامەوە کە سەیرم کرد دەستەیەکی فراوانی لە ٢٦ پارێزەر پێکهاتووی داکۆکیکردن جێی خۆیانیان لە هۆڵەکەدا گرتووە بۆ داکۆکیکردن لە هەر چوارمان. پارێزەرەکان نوێنەری پەرلەمان و کەسانێکی لیبراڵ و بەرپرسی حیزبە بۆرجوازیە بەرهەڵستەکانی وەك (عبدالرزاق الشیخلی) و ( حسین جمیل) و (نجیب الصائع) تد و پارێزەری شیوعی و چەپڕەویشیان تێدا بوو. سەرجەم خۆیانیان تەرخانکردبوو بۆ داکۆکیکردن لە ئێمەی گیراوی شیوعی. کەس فلسێکی نەدا بە هیچ یەکێکیان. تەنانەت لە هۆڵەکەدا نەبێ نەمزانی ئەوانە ئەرکی داکۆکی لێکردنی ئێمەیان خستووەتە سەر شانی خۆیان. کێشەکە کێشەیەکی سیاسیی جێی بایەخی هەموو ئەوانە بوو. ئەم دیاردەیە هاوشانی فراوانیی دەسترۆیی و لایەنگریی (حشع) بوو لەنێو جەماوەردا. جێگری دادخوازی گشتیش لەوێ بوو. (عبداللطیف الوتار)ی نوێنەری ئاسایشی گشتیش کە پێشتر خۆی لێکۆڵینەوەی لەتەکدا کردم، لە پەنایەوە دانیشتبوو. هەرە قسە ڕۆیشتووی دادگا ئەفسەرێکی لاوی دڵسۆزی ڕژێم و لە پاشا خۆی پاشایی ترو بوغرا بوو.

ئێمە هەر چوار لاوەکەو پیرەژنەکەی دایکی عوسمان۔ سوعادی کچەزا چکۆلەکەی لە قەفەزی تاوانبار کردندا ڕاوەستاین. سەرەتا کەوتنە بەقسە هێنانی من:

- ناوی خۆتو ناوی باوکت؟

- بەهادین نووری.

- تەمەنت؟

- ٢٦ ساڵ.

- پیشەت؟

- خەباتکارێکی دژی ئیستیعمار.

- مەبەستم ئیشتە.. چ ئیشێك دەکەی؟

- خەباتکارێکی دژی ئیستیعمار.. ئەوە پیشەی منە.

سەرۆکی دادگا برۆی تێکپەراندو گرژ بوو تاوێك بە تووڕەییەوە ڕوانیە دەمو چاومو پرسیارەکەی دوو پات کردەوە. هەمان وەڵامی درایەوە. ئەوانی دیکەیشیان دوواند، (کامل السامرائی) نەبێ کە دانی بەوەدا نەنا ئەندامی حیزبە، ئەوانی دیکە لەوەڵامدا لاساییان کردمەوە. کاتێك پیرەژنەکەی دایکی (عوسمان )یان هێنایە قسە، حاکم لێی پرسیی:

- ئایا تۆ شیوعیی و ئەندامی لە حیزبدا؟

- نەخێر ئەندامی حیزب نیم.

- بەڵام بەهادین دەڵێت تۆ ئەندامی حیزبی.

- نەخێر بەهادین شتی وای نەگوتووە.

دیارە ڕاستگۆ بوو. دەستبەجێ پشتگیریی قسەکەیم کردو حاکمی درۆ هەڵبەستم بە درۆ خستەوە. ئەوی ڕاستی بێ ئێمە هەر چوار لاوەکە لە نێو خۆماندا یەککەوتبووین چی بڵێین. بەڵام پیرەژنەکە کە دوور لە ئێمەو لە بەندیخانەی ژنان بوو، هیچ لەگەڵیدا ڕێك نەکەوتبووین.

ڕۆژی دوایی هێشتا هەر لە نێو ئوتومبیلەکەی بەندیخانەدا بووم کە لەبەردەم بینای دادگادا وەستا بوو، ڕووداوێکی سەیرم بینی. لە کونێکی بچووکەوە دەمڕوانیو بەشی ئەوەی دەکرد تەماشای دەرەوەی ئوتومبیلەکە بکەمو بزانم چی ڕوو دەدات. (عبداللطیف الوتار)ی ئەفسەری ئاسایشم بینی لە ژێر دارێکی نێو باخچە فراوانەکەدا ڕاوەستا بوو. دیم دەستی بۆ یەکێك ڕادەکێشیو داوای لیّ دەکات بێت چاوی پێ بکەوێ. قەدەرێك لەوە بەدوا، ئەو لاوە گردەڵەیە هاتە لای کە لە ژووری بەڕێوەبەری گرتووخانە بینیمو لافی لیّ دەدا گوایە تەتەری نێوان منو (مجید عبدالرزاق) بووە. گوێم لیّ نەبوو لەگەڵ ئەفسەرەکەدا باسی چییان کرد. بەڵام (عبداللطیف)م بینی جزدانی پارەکەیی لەگیرفانی دەرهێناو چەند گەڵایەك (بانك نۆت)ی دا بە حەسەنی شێخ سەعید. پێم نەکرا بزانم چەند بوو ئیمزای وەرگرتنی لە دەفتەرێکی بچووکیشدا پێ کردو خستیەوە گیرفانی. (حەسەن)یش پارەکەی نایە گیرفانی چەپی پانتۆڵەکەیو، لەیەکتر جویّ بوونەوە. وا دانرا بوو حەسەن ئەم ڕۆژە لەبەردەم دادگادا شایەتی لە دژی من بدات.

دانیشتنی دادگا دەستی پێکردو عادەتی کردیانینە نێو قەفەزی تاوانبارکردن.

ئیبراهیم ڕەشید ناوی شایەتی خەڵکی سلێمانی بانگ کرا تا شایەتیەکەی بداتو بڵێت ـ گوایە ـ تەتەری نێوان منو چەند شیوعیەکی دیکە بووە. ئەویش شایەتێکی کرێگرتە بووو، دوور لە ڕاستی قسەی کرد، چونکە لەوەو پێش بە درێژایی ڕۆژانی ژیانم هیچ ڕۆژێك نەمدیبوو. دوا جار(حەسەن)یش ڕاوەستا تا ئەویش شایەتیە درۆزنانەکەی بدات. وازم لیّ هێنا تا قسەکانیی تەواو کردو چی لە هەگبەکەیدا بوو خاڵیی کردەوە. ئەجا لە ناکاودا دادگاو پارێزەرانم بەو شتە خافڵگیر کرد کە پێشتر دیبووم:

ـ ئەم زەلامە هەرگیز نامناسێ. وەکوو نۆکەرێکی بەکرێگیراو ئەم شایەتیەی بەرانبەر بە بڕە پارەیەك داوەو سەعاتێك لەمەو بەر لە (عبداللطیف الوتار)ی نوێنەری ئاسایشی گشتیی وەرگرت کە ئێستە وا لێرە لەبەردەمتاندا دانیشتووە.

ڕووداوەکەم گێڕایەوەو داوام کرد گیرفانی چەپی حەسەن بپشکنن تا دەست بگرن بەسەر ئەو بڕە پارەیەدا کە ئەم ئەفسەرە داویەتیو، دەفتەری بچووکی تێبینیی نێو گیرفانی (عبداللطیف) یش بپشکنن تا ئیمزای حەسەن بدۆزنەوە کە بۆ وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیە کردوویە. حەسەنو عبداللطیف پێکەوە زەرد هەڵگەرانو زارە ترەك بوون.چەند پارێزەریك کردیان بە هەراو زەناو داوای پشکنینی ئەو دوو زەلامەیان کرد. سەرۆکی دادگا خۆیشی بۆ ماوەیەکی کەم شڵەژا، پاشان ئاهی بە بەردا هاتەوەو فەرمانی بە شایەتەکە دا بچێتە دەر، بەبێ ئەوەی بواری پارێزەرەکان بدات مشتومڕی لەگەڵدا بکەن.

سەرۆکی دادگا لێی پرسیم ئاخۆ پشتگیری لە هەموو نووسراوەکانی نێو بەرنامەی حیزب دەکەم، وەڵامم دایەوە: بێ گومان لەبەر ئەوەی ئەندامێکی حیزبم، پشتگیری لە هەموو ئامانجە جێگیر کراوەکانی نێو بەرنامەکەی دەکەم. تەنانەت لەوەیش دڕدۆنگ بوو هیچ نەبێ بەدەم دروشمی ڕووخاندنی پاشایەتیو دامەزراندنی ڕژێمی کۆماریی ئێمە بڵێت. بۆیە پرسیارەکەیی بەشێوەیەکی دیکە داڕشتو گوتی داخۆ دەمەوێ ـ وەك لەبەرنامەکەدا هاتووە ـ ڕژێمی کۆمەڵایەتی بگۆڕم. وەڵامم دایەوە:

ـ دانەیەکم لە بەرنامەی (حشع ) بدەرێ تا ئامانجەکانی نێویتان بۆ لێك بدەمەوە.

ـ ئایا پشتگیریی ئەو ئامانجە دەکەی کە لەسەر ژێرو ژوور کردنی ڕژێمی خاوەن شکۆتێیدا هاتووە؟ پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە سەرنجی شڵەژانی هێندێك پارێزەرم دا. یەکێکیان ئاماژەی بۆ کردم کە پشتگیریی ئەم ئامانجە بەهانەی ئەوەیان دەداتێ سزای لە سێدارەدانم بۆ دەربکەن. دەبوو یەکێك لەو دوو وەڵامە هەڵبژێرم: بەڵێ یا نا. بەڵام ئایا دەبێ پاکانە لە ئامانجێك بکەم کە خۆم بەر لە ساڵێك دامڕشتووەو هەڤاڵەکانم لە حیزبدا پێ ڕۆشنبیر کردووە؟ نەخێر. بۆیە گوتم:

ـ بێ گومان پشتگیری لەوەو لە هەر ئامانجێکی نووسراوی نێو بەڵگەنامەی بەرنامەی حیزب دەکەم.

دادگاییکردنەکە چەند ڕۆژێك درێژەی کێشا. زۆر جار هەڵماندەگێڕایەوە بۆ دادگاییکردنی ڕژێمی حوکمدارو ئیمپریالیزم. صادق‌و باقر لە دادگادا جەرگ کون تێ نەبوو بوون. (کامل السامرائی )یش هەر لەسەر هەڵوێستی خۆی مایەوە: واتە نکوولیکردن لە ئەندامەتیی حیزب. هێندێك پارێزەری وەك (خالد عیسی طە)و (توفیق منیر)و هیی دیکە لە هیچ دانیشتنێك دوا نەکەوتن. (داود الصائغ) لە نێو دەستەی داکۆکیکردندا بوو و، ئەوسا ئەوە مایەی بێزاریی من بوو. ئەگەرچی پێشتر بەدەم وچاو نەمدیبوو و، هەتا لە دادگایشدا قسەم لەگەڵدا نەکردبوو. ڕقم لێی بوو وەك هەلپەرستێکی دابڕاو لە حشعو وەك تێکدەرێك چونکە لە کاتی خۆیدا دژی فەهد ڕاوەستا بوو.

دادگا کەمێك بەر لە کۆتایی پێ هاتنی ئەوەی خستە روو کە قەڵەم‌و قاقەز وەربگرین تا ئەگەر حەز بکەین خۆمان داکۆکی بنووسین. دەم‌و دەست وەرمگرت‌و دەستم کرد بە نووسینی داکۆکیەکەم بە هەردوو بەشی یاسایی‌و سیاسییەوە. بڕیارمدا خۆم بەشە سیاسیەکەی لەبەردەم دادگادا بخوێنمەوە، بەس بەشەکەی دیکەی بدەمە دادگا. (توفیق منیر)ی پارێزەری شیوعیی بە جەرگ لە کۆتاییی دادگاییەکەدا جبە ڕەشە عادەتیەکەیی لەبەر کردو لەبەردەم دادگادا راوەستا بۆ خوێندنەوەی داکۆکیکردن بە ناوی (دەستەی داکۆکیکردن)ەوە. خوتبە خوێنێکی زمان پاراوو ئازا بوو ، ئەگەر چی بە تەواوی خەریکی لایەنە یاساییەکانی کێشەکە بوو بوو کە لە گەوهەردا کێشەیەکی سیاسی بوو. بەلاّم کاتێك داکۆکیە نووسراوەکەی خۆمم خوێندەوە، چاوم لەو نەکرد. داکۆکیم لەو شتانە کرد کە باوەڕم پێیان هەبوو و ، بە ڕاشکاوی وتوندوتیژی هێرشم کردە سەر رژێمی نۆکەری عیراق‌و سەر (نوری السعید)ی سەر گەورەی کۆنە پەرستی‌و تێکڕای رژێمە کۆنە پەرستەکانی جیهانی عەرەب. هەتا (محمد نجیب )و تاقمەکەیشیم نەپەڕاند کە بە ری‌و شوێنێکی عەسکەریی دیکتاتۆرانە حوکمی میسریان دەکردو مانگرتنی کرێکارانی چنینیان لە میسر خەڵتانی خوێن کرد بوو.

دوو ڕۆژ دوای دادگا له بەندیخانەی ئۆردووگاوه هێنراینەوه بـۆ هۆڵی دادگـا، تـا گوێمان له بڕیاری حوکمەکه بێ. وام چاوەڕوان دەکرد حوکمی له سێدارەدان بۆ مـن‌و صادق‌و باقرو بەندیی هەمیشەیی بۆ (کـامل السـامرائی ) دەربچـێ. دوو سـەعات زیاتر چاوەڕێمان کرد، دانیشتنەکه هەر نەکرا. ڕۆژی دووەم‌و سێیەم‌و چـوارەم‌و.. ئـەوه دووپات بووەوه. دەردەچووین‌و بەبێ حوکم دەگەڕاینـەوه. دیـار بـوو حاکمـەکانی نـەك هـەر دادگـای عەسـکەری، بـەڵکوو هیـی سـەرجەم دەسـەڵاتی حوکمداریش لـه نێـو خۆیاندا لەسەر جۆری سزاکه ناکۆك بوون. ئەگەر کێشەکەی ئێمه لەگەڵ هیی فەهدو (زکی بسیم) و (محمد حسین الشبیبی)دا بەراوردی بکەی، کـه لـه ١٩٤٧دا حوکمـی لـه سـێدارەدان بـۆ ئـەو دوانـەی یەکـەمیان دەرچـووو لـه ١٩٤٩یشـدا حوکمـی لــه سێدارەدانی هەرسێکیان جێبەجێ‌کرا، ئەوا چاوەڕوان دەکرا دەسـتبەجێ حوکمـی لـه سێدارەدانمان دەربچێ‌و جێبەجێ بکرێت. لەبەر ئـەوەی ئێمـەیش وەك ئـەوان شـیوعی بووین‌و، وێـڕای ئـەوه دروشمـی ڕووخـاندنی پاشـایەتی‌و دامـەزراندنی کۆمارمـان بەرزکردبووەوه. بەڵام ئەو هەڵمەته جەماوەرییەی که حیزب لـه نێـو عـیراق‌و وڵاتـانی عەرەب‌و جیهاندا بۆ ڕزگـارکردنی ئێمـەی ڕێکخسـت، بەرهـەمی هـەبوو و ڕاڕایـی‌و ناکۆکیی خسته نێو حوکمداران.

(خالد عیسی طه) ئەو پـارێزەره بـوو کـه بـه درێژاییـی ڕۆژانـی دادگـاییکردن‌و تەنانەت لەو ڕۆژانەیشدا که دەبراینه هۆڵی دادگا تا گوێ له حوکمەکه بگرین‌و ئەمجا هیچمان نەدەبیست‌و دەهێنراینەوه، هەرگیزو هەتا بۆ دەقەیەکیش لـه هۆڵـی دادگـا دوا نەکەوت. دوازدەی تەمووز لەگەڵ ئێمـەدا گوێـی لـه دەرچوونـی حوکمەکـه بـوو: بەندیی هەمیشەیی بۆ من‌و صادق‌و باقرو، ١٥ ساڵ بەندی بۆ (کامل السامرائی)، لەگەڵ زەوتکردنی هـەموو کەل‌و پەلـەکانی ماڵەوەدا، جلـەکانی خۆمـان نـەبێ کـه دادگـا فـەرمانی‌دا بۆمـان بگێڕدرێنـەوه، کـەچی سـەرباری کـەمی‌و سـادەییان ئەوانیشمان هەر لەوه بەتر بۆ نەهێنرانەوه.

داوام له برادەرەکانم کرد ئەگەرحوکمی لە سێدارەدانمان بۆدەرچوو، نەك حوکمی بەندکردن، هورا بۆ ژیانی (حشع)بکێشن. بەلاّم باقر جیاوازیی نێوان لە سێدارەو بەندکردنی بیر چووەوەو، بە دەنگێکی بەرز هورای بۆ ژیانی (حشع) کێشا. سەربازەکان لەبەردەم حاکمەکاندا پەلاماریان داو تێیانهەڵداو کەس رێی لیّ نەگرتن.

دوای حوکمدرانمان لە بریی ئەوەی راستەوخۆ بمبەن بۆ ئوتومبیلی بەندیخانەکە، بە تەنیا برامە ژوورێکی بیناکە. یەکەم جار هەتا (جمیل عبدالمجید)ی عەمید نەهات، پەیم بەوە نەبرد ئەوەیان کردووە تا ناوبراو بێتە سەردانم و ئامۆژگاری یا دوا ئاگادارکردنەوەی خۆیم بە گوێدا بدات. لەسەر پاردەیەك دانیشتبووم. کە گەیشتە جیّ هەڵنەستام. ئەوەی بە چەشنە سووکایەتی پێکردنێك داناو، بە کەللە رەقیە عەسکەریانەکەی خۆی فەرمانی دا: "هەستە". ئەمجا رووی تێکردم و گوتی:

- ئەمجارە هەلی ژیانمان پیّ بەخشین. بەلاّم ئەگەر هەر چالاکیەکی حیزبی لە نێو زیندانیەکانی بەندیخانەدا بکەن، لەوێوە دەتانهێنین و یەکەو راست لە قەنارەتان دەدەین.

بە هێمنی و لە روودا وەستانێکی چاوەڕوان نەکراوەوە وەلاّمم دایەوە:

- من پێویستیم بە ئامۆژگاریی ئێوە نییە.

- پێویستیت پێی نییە؟

- نەخێر.

برۆی هێنایەوە یەك و بە رووگرژی بە جێی هێشتم. وام مەزەندە کرد ئەویش لەو کەسانە بوویّ کە سوور بوون حوکمی لە سێدارەدانمان بدەن. بەلاّم دەسەلاّتدارانی بالاّ هاودەنگیان نەبوون و حوکمەکەیان گۆڕی بە بەندیی هەمیشەیی.

دوو رۆژ پاش حوکمدرانم رێیان بە باوکم دا سەر لە نویّ سەرم لیّ بدات، بەلاّم بە راوەستان لە دەرەوەی تەلبەندی بەرزی گرتووخانە. روو بە روو راوەستاین، بە بیّ ئەوەی بتوانین دەست بە یەکتر بگەیەنین. باوکم بە کەف و کوڵ و قووڵ گریا. پێمگوت:

ـ بابه به تەما بووم لە خۆشییاندا پێ بکەنێ، چونکه لە سێدارە قوتار بووم.
ـ کورم لە خۆشییاندا دەگریم ! گرنگ ئەوەیە تۆ لەو شتە رزگارت بوو کە من لێی دەترسام. هەر لە بەندیخانە دەردەچی. ئومێدم زۆرە زۆر لە بەندیخانە نەمێنیتەوە.

کە پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ گەڕامەوە بۆ ماڵی باوکم، ئەوە ئازاری دام نەمبینی تا هاوبەشیی شادیی لە بەندیخانە دەرچوون و بەیەکگەیشتنەوەی گەرمم لەگەڵ کەس و کارو برادەراندا بکات. چاوپێکەوتنەکە لە پێنج دەقە زیاتری نەخایاند، چونکە عبدالمهیمن رایکێشام بۆ زیندانەکەم و باوکیشم بە دڵێکی خۆشەوە بە جێی هێشتم و گوتی: ئێستاکە بە شانازی و دڵنیاییەوە دەچمەوە سلێمانی.

دوای حوکمدانمان گوێزراینەوە بۆ گرتووخانە (سجن الموقف) لە بەغدا، تا بە شێوەیەکی کاتی و لە ژێر چاودێریی (عبدالجبار أيوب)ی بەڕێوەبەری بەندیخانەدا بمێنینەوە کەوا ناسرا بوو فەرمانبەرێکی دڕندەو جەللادی زیندانیە سیاسیەکان و بە تایبەت شیوعیەکانە. هەر چوارمان ئەوەتی گیرابووین، بۆ یەکەم جار بەیەک گەیشتین. چەند رۆژێك لەوە بەدوا داوامان کرد بمانگوازنەوە بۆ نێو شیوعیەکانی بەندیخانەیەکی ئاسایی، تا لە (عبدالجبار أيوب)ی جەللاد رزگارمان ببێ. کە داواکەمان رەت کرایەوە مانگرتنمان لە خواردن راگەیاند. ئەوە یەکەم مانگرتنم بوو لە خواردن بە درێژاییی ژیانم. بەڕێوەبەر لەگەڵ چەند وەردیانێکیدا هاتە لامان و، بە لێدانی تێرو پڕو قسەی دزێوی تەرزی خۆرەڵاتیە پاشکەوتووەکان دەست درێژییان کردە سەرمان و تێکۆشان ناچارمان بکەن مانگرتنەکە بشکێنین. بەڵام ئێمە بەرەو روویان وەستاینەوەو سوور بووین لەسەر داوای گواستنەوەو دانەبڕینمان لە هەڤاڵە زیندانیەکانی دیکەمان، تا دەسەڵاتدارانمان هەڵپێچا مل بۆ داواکانمان بدەن و وادەی گواستنەوەمان بۆ یەکێك لە بەندیخانەکان دیاری بکەن.

خراینە چەند ئوتومبیلێکی پۆلیسیی پڕ چەکەوە بە یاوەریی مەفرەزەیەکی گەورەی پۆلیس. فەرماندەری مەفرەزەکە ئەو ئەفسەری پۆلیسە بوو کە لە نیسانی

١٩٥٣دا لەگەڵ مەفرەزەی رەسمی هەڵیکوتابووە سەر ماڵەکەم‌و ناوی (شاکر العانی) بوو. پۆلیسێکی لەسەر خۆ و قسە بیست‌و نەرم‌و نیان بوو. تا نەگەیشتینە (سەماوە)و شەوێکی تێدا نەماینەوە، نەمانزانی ئێمە دەگوێزرێینەوە بۆ بەندیخانەی نوگرە سەلمان. رۆژی دوایی بە رێگەیەکی خۆڵینی پڕ تەپ‌و تۆزی بیاباندا روو بە بەندیخانە دوورە دەستەکەمان لە قووڵاییی بیابانی باشووردا درێژەمان بە سەفەردا.

* * *

کە گەیشتینە بەندیخانەی نوگرە سەلمان لاپەڕەیەکی تازەی ژیانم دەستی پێکرد. من ئێستاکە زیندانیەکی نێو زیندانیە سیاسیەکانم، چوار دیوارو چەند یاساوڵێك کە شەو و رۆژ گەمارۆی بیناکەیان داوە دەوریان داوم. بەندیخانەکەیش قەڵایەکی عەسکەریی سەرەتاییە، کاتی خۆی کلوپ‌و پاشای ناسناو "أبو حنیك"ی ئەفسەری ئینگلیزوەك بینایەك نەك پاسگە (مەخفەر)یەکی عەسکەریی سەر سنوور دروستی کرد بوو بۆ بەربەستکردنی هێرشی‌خێڵاتی بە دوو لە خاکی سعوودیەو بیابانی باشوورەوە. دواتر دەسەڵاتدارانی رژێمی پاشایەتی کردیان بە بەندیخانەیەك بۆ بەرهەڵستە بیرو ڕا جیاوازەکانی رژێم‌و بە تایبەت شیوعیەکان. هەتا ئەو زیندانیە ئاساییانەیش کە بە ترسناك دادەنران، دەگوێزرانەوە بۆ ئێرە. بەندیخانەکە نە روناکیی کارەباو نە ئاوی رەوان‌و نەهیچ شتێکی لە پێداویستەکانی ژیانی هاوچەرخی تێدا نەبوو.

کە پێمان نایە نێو بەندیخانە هەڤاڵە زیندانیەکانمان بە ئەوپەڕی جۆش‌و خرۆش‌و گەرمییەوە پێشوازییان لێکردین‌و، وەك چۆن مرۆڤ لە نێو کەس‌وکارو خۆشەویستە ڕاستەقینەکانیدا دەژی ئاوا لە نێویاندا ژیاین. دیارترین شتی سەرنجڕاکێش ئەوە بوو ژیانی ڕۆژانەی نێوانیان پڕ کەیف‌و خۆشی بوو و. پێوەندیی هەڤاڵانەیان بەگیان بەیەکترەوەی گرێ دەدان. ژیانیشیان لە ڕووی خواردەمەنی ودابەشکردنی ئیش‌و کاری ڕۆژانەوە بەباشی ڕێکخرابوو.

بیرێکی ئاوی تاڵی بۆ خواردنەوە یا جل شتن دەست نەداو لە حەوشە چکۆلەکەی بەندیخانەدا بوو. ئاوی سازگار بە ئوتومبیلی تەنکەر دەهێنراو، زیندانیەکان ڕۆژانە بەشە ئاوی خۆیانیان بە تێکڕاییی ۹ـ ۱۸ لیتر بۆ هەر یەکێك لیْ وەردەگرت. ئاوەکەیان بە تەنەکە لە ئوتومبیلەکەوە دەگواستەوە بۆ تەنکیی ئاوی نێو بەندیخانە بۆ خواردنەوەو چێشت لێنانو جل شتن تد. عومەر ئەلیاس (أبو باسم ) لەبەر ئەوەی بەرپرسی ڕێکخستنی نۆرە گرتنی ئاو گواستنەوە بوو لە ئوتومبیلەکەوە بۆ بەندیخانە، ناویان نابوو وەزیری ئاودێری. ئاو بەکارهێنان بۆ هەموان ڕێکخرابوو، ئەندازەکەییان دەزانی. نۆرە گری سەر شۆرك (حەمام ) لەکاتی حەفتانە گەرمکردنیسەرشۆرك وجل شتندا بەرپرسی ئاو دابەشکردن بوو.

بەندیخانەکە لەو بیابانە چەپە کەقا قرەدا بوو دەستە بەری هەڵنەهاتنی زیندانیەکانی دەکرد، چونکە ئەوەی هەڵبهاتبایە ژیانی خۆیی دەخستە مەترسییەوە ، جا مەگەر لە بەدوەکانی ئەو ناوچەیە بووایە. ئەم دووریە ڕێگری بەردەم خێزانی زیندانیەکان بوو، نەیاندەتوانی زۆر بێن بۆ چاوپێکەوتنیان. هیچ خێزانیك پێی نەدەکرا مانگانە سەر لە کوڕە زیندانیەکەی بدات. ڕەنگە ئەو خسڵەتە لەو ماوەیەدا کرد بێتی بە باشترین بەندیخانە لەلای دەسەڵاتداران.

چوومە نێو بەندیخانە تا کتو پڕ شتێکی وا ببینم کە هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکردو بیرم لیْ نەدەکردەوە. سەیرم کرد ئەو زیندانیە شیوعیانەی کە کەوتینە نێویان، لە ئیدارەی بەندیخانەو بەگشتی لە دەسەڵاتداران یاخی بوو بوونو لەقەلاکەی (أبی حنیك ) ـ یا ڕاستتر بڵێین ـ لە نیوەی باکووریدا کۆماریکی میللییان بۆ خۆیان پێکهێنا بوو. چەندین تیپی بە شمشێر پرچەکیان هەبوو، لەو شمشێرە ڕاستەقینانە دەچوون کە چەکی سوپا جەنگاوەرەکانی زەمانی زوو بوون. ئەم شمشێرانە لە بەرمیلی ئاسنی نێو بەندیخانە دروست کرابوون.(هادی هاشم الاعظمي)ی زیندانیی شیوعی ئەندازیارو سنعاتکاری سەرەکیی دروستکردنی شمشێر بوو وزیندانیەکانی پیْ پڕ چەك دەکرد.

ئالآیەکی سووری بلند بە بۆریەکی ئاسنی درێژەوە بوو، زیندانیان بەیانیان بە سروودی کۆمار گوتنەوە بەرزیان دەکردەوە. گوتیان (حسین احمد الرضي)ی زیندانیی شیوعی سروودەکەی ڕێکخستو لەوێ بۆی بەجی هێشتن. ئێوارانیش بە هەمان سروود دایانده گرت. سروودەکە بەم بڕگەیە دەستی پێدەکرد:

" ئەی کۆمەلانی گەل، ئەی کۆمەلانی برسی

لە گوزەرانی سایەی زۆرداران وەڕەس بووین

ئەمە دوا ڕۆژانی ململا نێیە چۆك بە مردن دابدەن تا ژیان بگەشێتەوە

بۆ خەبات، بۆ پێشەوە، بۆ چەك، بۆ تۆلە سەندنەوە "

بە قسە پلانێکیش هەبوو بۆ هێرشکردنە سەر دوژمنو بۆ کشانەوەیش لەکاتی شەڕ کردن لەگەلّ دوژمنداو، ئەرکە عەسکەریەکانیش دابەش کرابوون. بۆ یەکەم جار لەو بەندیخانەیەدا چاوم بە (زکی خیری )و(عزیز الحاج) کەوت. ئەو ئەرکەی کە پێیان سپێردرا بوو پاسکردنی سەرەوە بوو، واتە چاودێریی جموجوولی دوژمن لەڕێی چەندکونێکی بەشی باکووری قەلاوە. هەردوکیان وا دانرابوو بەکەلکی شمشێر هەلگرتن نایێن، بۆیە دارێکی کورت درابوو بە هەریەکەیان.

ئەم کۆمارە میللییە بە هەموو سوپاو دائیرەو جەماوەریەوە لە نێو ژوورێکدا دامەزرا بوو ڕووبەرەکەی لەدەیان مەتری چوار گۆشە زیاتر نەبوو. حەمید عوسمان یەکەم بەرپرسی حیزبیو سەرۆکی کۆمارە میللییەکەو دامەزرێنو تیۆری داڕێژی بوو و، ئەوەی بە بنچینەی کۆماری میللیی داهاتووی سەرا سەری عێراق دادەنا. یاساولانی بەندیخانە بە چەکە ئاگردارەکانیانەوە لە چوار دەورو سەر سەربانەکەی بوون ، بەبیّ ئەوەی هەولّ بدەن پێی تیّ بنێن یا توخنی ئەو ڕژێمە کۆماریە میللییە دامەزراوەی نێوی بکەون. ئیدارەی بەندیخانەیش هەموو ڕۆژێك پێشوازیی ( مەهدی حمید)ی ئەفسەری شیوعیی زیندانیی نوێنەری شیوعیەکانی دەکرد تا بەشە ئازووقەی خۆیانیان بداتیّ. ئوتومبیلی تەنکەرەکەیش ڕۆژانە بە بەردەوامی ئاوی دەدانیّ. کورتو پەتی، ئاو لیّ بڕینیان بۆ دوو ڕۆژ یا ئازووقە لیّ بڕینیان بۆ

حەفتەیەك بەس بوو بۆ رووخاندن و خنكاندنی ئەم كۆمارە میللییە بە بێ پەنا بردنە بەر هیچ زەبرو زەنگێك. بەڵام ئیدارەی بەندیخانە، یا راستتر بڵێین پۆلیسی بادیە (بیابان)، پەنای نەبردە بەر ئابڵووقەی ئابووری دژ بە كۆماری زیندانیان.

هۆڵەكەی خوارووی قەڵا ژمارەیەكی دیكە زیندانیی شیوعیی تێدا بوو، بە ئەندامی رێكخستنی ئاڵای رەنجدەران (رایە الشغیلە)ی عەزیز محەمەدو نافیع یوونس و یووسف حننای حیزب دوكەرتكەرانی نێوانیان لە قەڵەم درابوون. بۆ یەكەم جار لەوێ بینیمن. چەند زیندانیەكی ئاساییی خاوەن حوكمی قورسیش لەوێ بوون، لەبەر بەشداریی پشێوی نانەوەی نێو بەندیخانەو سەر ئێشە دروستكردن بۆ بەندیخانەكانی دیكە گواسترابوونەوە بۆ ئەم بەندیخانەیە. زۆربەیان پاڵپشتی شۆڕش و كۆمارە دامەزراوەكە بوون.

من خۆم بەر لەوەی بەند بكرێم و هەتا دواتریش بە میزاج چەپڕەو بووم. بەڵام ئەو سەرپەڕگریی منداڵانە جێی پێكەنینەی كە لە بەندیخانەدا بە دیم كرد، بە عەقڵمدا نەدەچوو. پاش ئەوەی گەیشتمە ئەوێ حەمید عوسمان ـ بەبێ ئەوەی بە حەماسەوە بكشێتەوە ـ دەستی لەبەر بەرپرسیی رێكخراوی حیزبیی بەندیخانە هەڵگرت و، بووم بە بەرپرسی یەكەم. هەستم كرد پێویستە لەسەرم سەردەمی بەرپرسیەكەم لە بەندیخانەدا بە شتێك رەنگرێژ بكەم چارەسەری ئەم سەر پەڕگریە منداڵانەیە بكات. بۆیە لیژنەی حیزبیی بەرپرسی بەندیخانەم بە(هادی هاشم)و (زكی خیری)و(حمید عثمان)و (عومەری مامە شێخە)و هیی ترەوە كۆكردەوەو ، ئەمەم خستە بەر دەستیان كە پوختەكەیەتی:

ـ دەسەڵاتی حوكمدار لە بەندیخانەی بەغداو كووت دوو قسابخانەی ترسناكی كردووە، ژمارەیەكی زۆر لە هەڤاڵانمان شەهید یا بریندار كراون. هێشتاكەیش حوكمی عورفی لەوڵاتدا بەردەوامە. ئەگەر بە شێوەیەكی مەنتیقی نەرم و نیان نەجووڵێینەوە، ئەوا بەبێ چەندو چوون سێیەم قسابخانە دەكەوێتە نێومان. ئێمە لە

نێو ئەم چوار دیوارەدا بنەماکانی یاخی بوون لە دەسەڵاتداران شك نابەین‌و، وای نابینم هیچ شتێك هەبێ پاساوی راگەیاندنی عاسیبوون‌و کۆمار بداتەوە. بە تەنیا ئاو یا ئازووقە لێ بڕینمان بسە بۆ تێکشکاندنمان. هیچ دەروویەکمان نییە، دەبێ ناچار نەرم‌و نیانی پیشان بدەین‌و ئامادە ببین بۆ لێك حاڵی بوون لەگەڵ ئیدارەی بەندیخانەدا تا کوشتارمان لێ نەکرێ. خەوش لەوەدا نییە شۆڕشگێڕان پاشە کشە بکەن، کاتێك هەل‌و مەرج پاشەکشەیەکی وا پێویست بکات.

مشتومڕی زۆری نەبرد، یا مشتومڕیان لەسەر قسەکانم نەکرد، چونکە هەموان قەناعەتیان بە قسەکانم هەبوو، (حەمید عوسمان)ی بەرپرسی پێشوویان نەبێ کە بەبێ دەنگیەکی قینابییەوە دانی بە خۆدا گرت‌و داخی بۆ کۆمارە میللییەکەی خوارد. پێم وابێ زۆربەی ئەندامانی لیژنە لە سەرەتاوە لەگەڵ بیری یاخیبوون‌و کۆماردا نەبوون. بەڵام لە ترسی تاوانبارکردنیان بە ترسنۆکی‌و سەرشۆڕی، زاتی ئەوەیان نەکرد بێ پەردە بەرهەڵستیی بکەن. ئەگەر بەر لەوەی ئێمەیش بگەینە بەندیخانەی نوگرە سەلمان کوشتاری تێدا نەکرابێ، ئەوازۆربەی پیاوەتیەکەی ـ بە بۆچوونی من ـ هیی (جواد حسن)ی بەڕێوەبەری پۆلیسی بادیە بوو کە بالاترین سەرچاوەی رەسمی‌و بارەگاکەی‌لە بەندیخانەوە نیزیك بوو. پیاوێکی بە ساڵدا چوو و پۆلیسێکی ئەزموارەو بە تەبیعەت هێمن بوو، بە ڕاستی دەیویست گیروگرفت نەهێڵێ‌و خوێن نەڕێژرێ.

دوای ئەوەی رەزامەندیی دەستەی حیزبیم وەرگرت، لەگەڵ (مهدی حميد)ی نوێنەرمان لای ئیدارەی بەندیخانە دانیشتم. مەهدی بە میزاج سەرپەرگربوو. هەوڵمدا قەناعەتی پێ بکەم نەرم‌و نیانی ناچارییەو، دەبێ ئیدارەی بەندیخانە تێ بگەیێندرێت کە ئێمە یاخیبوونمان ناوێ، بەڵکوو لێك تێگەیشتن‌و چارەسەری گیروگرفتمان دەوێ‌و، دەمانەوێ لە داواکاریی زیندانیە سیاسیەکان گوێ بگرێ.

هەر بە ڕێکەوت چوونە دەرەوەی (مهدي حميد) بۆ ئازووقە وەرگرتن‌و جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە کە پێم سپاردبوو، هاوکاتی هاتنی ئەفسەرێکی

موقەددەمی (جلال أسعد)ناو و یاریدەدەرێکی (عبدالمطلب الامین)ی حاکمی عەسکەری بوو. مەهدی برایە نووسینگەی بەڕێوەبەری پۆلیسی بیابان، ئەفسەرەکەیش کە بۆ مەسەلەیەکی بەتایبەت پێوەند بەزیندانیەکان نێردرابوو، لەوێ بوو ئاماغجی دەسەلاتدارانی ناوخۆ لەم چاوپێکەوتنەی نێوان مەهدیو (جلال أسعد) بەرقەرار کردنی لێك حالّی بوون بوو، دوای ئەوەی زیندانیەکان ئالاّو شمشێریان پێمایەوە.

بەلاّم بەیەکگەیشتنی هەردوو ئەفسەری حکومەتی وشیوعی نەیکێشایەوە بۆ لێك حالّی بوون، بەلّکوو بەشەڕێکی گەرم دوایی هاتو هەردوو لا کەوتنە لێدانو داپلۆسینی یەکتر. مەهدی دوای گەڕانەوەی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. دۆخێکی سەخت بوو بۆ من. زۆرم ڕەخنە لە مەهدی گرت لەسەر ئەو کارەیو، داوام لێکرد بچێتەوە بۆ لای ئیدارەی بەندیخانەو هەولّ بدات لێك حالّی ببین. جەختی ئەوەم بۆ کرد کە بەڕێوەبەری پۆلیسی بیابان سوورە لەسەر گێوگرفت نەهێشتنو، ئەگەر ئەو نەبوایە ئەوا گلیان دەدایەوەو تیروپرپیان لێ دەدا و پەل بەستیان دەکرد.

داواکاریی سەرەکیی ئیدارەی بەندیخانە یا دەسەلاّتداران ئەوە بوو: کێیان دەوێ لە زیندانیە سیاسیو ئاساییەکان بیگوێزنەوەو، تەنیا ئەوانەیش بهێلّنەوە کە دەیانەوێ بمێننەوە. حەمید عوسمان سەر سەخت بوو، بەهیچ گواستنەوەیەك ڕازی نەبوو ئەگەر بەندیخانەی نوگرە سەلمان بە تەواوی هەلّنەوەشایەتەوە. من ئەم چارەسەرەم لەڕێگەی (مهدی حمید)ەوە خستە بەردەست: ئێمە گواستنەوە ڕەت ناکەینەوە، بەلاّم تکا دەکەین لەدیاریکردنی پۆستەی زیندانیەکاندا بۆ گواستنەوە گوێ لەبیرو ڕامان بگرن، چونکە حەز دەکەین پێشەکی خاوەن حوکمە قورسەکان بگوێزرێتەوە. ئیدارە بە داواکاریەکەمان قایل بوو و فێلّێکی کرد. ساختەی لە نووسراوێکی ڕەسمیی بە تایپڕایتەر چاپکراودا کرد کە پێداگریی کرد بوو لەسەر هەلّوەشاندنەوەی بەندیخانەو پێکەوە گواستنەوەی زیندانیە سیاسی وئاساییەکانو سەر پشك بوونی زیندانیەکان لەناردنی هەر یەکێکیاندا بۆ بەندیخانەکانی دیکە لەیەکەمین پوستەدا. ئەم فێلّەمان

لیٚ شاردرایەوە. لام وابیٚ (جواد حسن )تەگبیری بۆ کردبوو. لیستەیەکمان بۆ ناوی ئەوانە سازکرد کەدەمانویست وەك یەکەم پۆستە بگویٚزریٚنەوە، خاوەن حوکمە قورسەکانی تیٚدا بوو لە هەڤالانمانو تاقمی ئالای ڕەنجدەرانو زیندانیە ئاساییەکانیش.ئیٚمە هەر چوار زیندانیە تازەکە لەنیٚو ئەم لیستەیەدا بووین، چونکە حوکمەکانمان قورس بوون. دوو لۆرییان هیٚنا تا پیٚداویستەکانمانی تیٚ بکەینو لەسەریان دابنیشین. چەند ئوتومبیلیٚکی پڕ چەکی سەر بە پۆلیسی بیابان لەگەلٚماندا هاتن. کاتیٚك دوو لۆریەکە لەناوەندی مالٚئاواییی گەرمی هەڤالانماندا کە بەتەما بوون دوای ڕۆژیٚك یا دوو ڕۆژ لەبەندیخانەیەکی تازە چاویان پیٚمان بکەویٚتەوە، بەندیخانەکەیان بەجیٚ هیٚشتو گەیشتنە سەرای بیابان، قۆمیسەرەکە هاتە لامانو بەشیٚوەیەکی لەسەرخۆو بە ئەدەبانە داوای کرد کیٚ زیندانیی ئاساییە - هەموویشیان حوکمەکانیان قورس بوو - لەدوو ئوتومبیلەکە بیٚتە خواریٚ بۆ ئەوەی دەستبەندو پیٚوەنی بکەن نەوەکا لەڕیٚگە هەلٚبیٚت. حەمید عوسمان کە لەگەلٚ منداو لەهەمان لۆریدا بوو، پەلٚپی گرت. لەوانەیە ویستبیٚتی وا خۆی دەربخات کە لەهەموان شۆڕشگیٚڕترە. گوتی:

- کەس دانابەزیٚو ڕازی نابین دەستبەند وپیٚوەن بخریٚنە دەست وپیٚی هیچ زیندانیەکی ئیٚرە.

- ئیٚمە دەستبەند وپیٚوەن ناخەینە دەست وپیٚی ئیٚوەی سیاسی، بەلٚکوو دەستبەند دەخەینە دەستی ئەو زیندانیە ئاساییانە.

- نەخیٚر قەت ڕیٚ نادەین.

حەمید بەبیٚ ئەوەی ڕای منی بەرپرسی یەکەم وەربگریٚ، جەختی کردەوە. من قرو قەپم لیٚکردو خۆمم تیٚهەلٚکیٚشی ئەو بیٚنەو بەرەیەی بەردەمم نەکرد. لەسەر ئەمە گلەیی وبنا شت هەلٚدەگرم. کابرای قۆمیسەر بەشیٚوازە دۆستانەکەی داواکەی دووپات کردەوە بۆ پیٚوەن خستنە پیٚی زیندانیە ئاساییەکانو، هەڕەشەی کرد ئەگەر پیٚ لەسەر ڕەتکردنەوەی دابگرین ئەوان بەزۆر دەیکەن. بۆیە حەمید وەلامی دایەوە:

- ئێمە نە لەزەبرو زەنگ‌و نە لە هەڕەشـەکانتان دەترسـین.گـەلی عـیراق‌و سـەرجەم ئوردووگای سۆشیالیستیمان لە پشتە.

قۆمیسەر فەرمانی بە پۆلیسە ڕیز بەستووەکانی دەورمـان یـا هیـی سـەربـانی سەرای تەنیشتمان دا:

- دەی تێیان هەڵدەن !

هیچ پۆلیسێکیان هەوڵی نەدا سەر لۆریەکە بکەوێ کە لە سـەری دانیشـتبووین، بەڵکە پلوورکە بەردی وەك چەقۆ تیژو زۆری ئەوناوەیان بـەکارهێنا. ئێمـەی زیندانیـی بێ چەکی هەردوو لۆرییەکە وامان لێ هات بووینە نیشانەی بەردبارانێکی توند، لـە کاتێکدا پیاوانی ڕاوەستاوی سەر بانەکـە بـە تفەنگـەکانیان روو بـە ئاسمـان تەقـەیان بەسەرماندا کرد. ئیـتر تەنگـە تـاو بوویـن، کـەچی نـە گـەل خۆپیشـاندانی کـردو نـە ئوردووگای سۆشیالیستی فریامان کەوت. کەممان هەبوو سەری یا دەم‌و چاوی بریندار نـەبوو بـێ. هێندێکیـان بەردەکـەیان بـە دەسـت دەگرتـەوەو پـێ بـە پـێ دەیانگرتـە پۆلیسەکان. ئارا خجدور)یش کووپەیەکی پەنا خۆیی هەڵدایە سەر پۆلیسەکان. بـاش دیمەنی (عومەری مامە شێخە)م لە بیرە خوێن بێ ئەندازە لە روخسـاری دەڕێشـت‌و سـروودی بەندیخانـەمانی دەگـوت: "عـیراق ئـازاد بکـەن‌و زۆرداران بشـکێنن‌و تەبایی‌بلاوبکەنەوە بە رزگاری دەگەن". شـەڕەکە نابەرانبـەر بـووو، بووینـە قوربـانیی سەر پەرگریی منداڵانەی حەمید عوسمان.

(زکی خیری) کە لەسەر هەمان لۆری بوو دەست پێشخەریی کردو بانگی کردم:

- بارکی سەلام بەسە ! با دابەزین.

دەم‌و دەست قایل بووم ودابەزین. لـە خـوارەوە زەبـری تێلاّمـان بەسـەردا دابـاری. حـەمید بەشە تێهـەڵدانێکی تایبـەتی تونـدو دڕندانـەی خـواردو دەم‌و چـاوی پـەلاو خوێنی لەبەر رۆی. بە ڕقێکی تایبەتەوە تێیان دەسرەواند. بـەبێ مـەرج یـا بەربەسـت شانمان داخست. ئیتر پۆلیس پێی دەکرا چۆنی پێ خۆش بێ ئاوا رەفتارمان دەرهـەق

بکات. پێوەن خرایە پێی هەموان بە ئاسایی‌و سیاسی‌یەوە. ئەمجا لێك جوێ کراینەوەو هەر چوارمان براینە ژوورێکی دابڕاوی پشتەوەی سەراکەی‌بادیە. لەو ساتەوە نەمزانی هەڤاڵەکانی دیکە چییان لێ بەسەر هاتووە.

دوو ڕۆژ لەوە بە دوا ئێمە هەر چوارمان هێنراینەوە بۆ قەلاکەی (أبی حنیك). لەوێ زانیمان، جگە لە ئێمەو زیندانیە جوولەکە شیوعی‌و ئاساییەکان‌و زایۆنیەکان، هەموو زیندانیە سیاسی‌و ئاساییەکان پێکەوە براونەتە چەند بەندیخانەیەکی دیکە. کەواتە ئامانجی گواستنەوە لە لێکدا بڕینی هەر چوارمان‌و لێکدا بڕینی زیندانیە جوولەکەکان بوو لەم بەندیخانە کلایەی بیاباندا. مانەوەمان لە قەلای کلۆپ پاشا درێژەی نەکێشا، چونکە بینا تازەکەی بەندیخانە کە دیواری بە دیواری قەلاوە بوو، تەواو بوو و ئامادەکرا بۆ ئێمەو بڕیار درا بمێنینەوە.

بینا تازەکەی بەندیخانە لە (١٠) هۆڵی کۆنکریتیی فراوان پێکهاتبوو، بەدوو کۆمەڵی بەرانبەر بەیەك دروست کرابوو دوورییەکی حەفتا مەتری لێکی جوێ دەکردنەوە. شوورایەکی درێژی پتر لە ٥٠٠ مەتری دەوری هۆڵەکانی دابوو. درێژ هەر هۆڵێك دەگەیشتە ٣٥ مەترو پانیشی پێنج مەتر. دەسەلاتداران لە بەندیخانە تازەکەیشدا بیریان لە دابینکردنی نە ئاوی ڕەوان‌و نە کارەبا نەکردبووەوە، بەڵکوو بەردەوام چاوەڕوانی ئۆتومبیلی تەنکەرە ئاو هەلگرەکەمان دەکرد. تاکە شتی ـ لە ڕووی تەندروستی‌یەوە ـ پاك‌و باش هەوای بێگەردی وشك‌و دڵ بووژێنەوەی سەعاتەکانی شەو و بەتایبەت دوای نیوە شەو بوو.

لە بەندیخانە تازەکەدا هەر بەرپرسی ئەو ڕێکخراوە شیوعی‌یە بووم کە لە٢٧ هەڤاڵ پێکهاتبوو لەوانە ٢٣ یان شیوعیی جوولەکە بوون. ژمارەی زیندانیە زایۆنیەکان چوارهێندەی ژمارەی ئێمە بوو. ژیانیان وەك هیی ئێمە ڕێکخراوو هاوبەش نەبوو. دوو بەرپرسی بزاڤی زایۆنییان لە عێراقدا لەنێودا بوو، ئەوانیش (رودنی و صالحون ) بوون. رودنی جوولەکەیەك بوو لەبەریتانیاوە هاتبوو،

کابرایەکی قووچی کەتەی سوورفلو بەشێوە تەواو ئەورووپایی بوو. (صالحون) یش وەك کادێرێکی زایۆنی لە فەلەستینەوە نێردرابوو بۆ بەغدا.

(عزرە) جوولەکەیەکی نەبووی بەتاوانی دزی بەندکراو بوو، لەنێو زیندانیە جوولەکە ئاساییەکاندا بوو. بە تەمەن بوو میوانێکی هەمیشەیی بەندیخانە بوو. بەقسەی خۆی هەر بۆ ئەوە خولقێندرابوو دزی بکاتو بەند بکرێت. لە بنەڕەتدا دزیی لەجوولەکەکان دەکرد نەك موسڵمانان. زۆر جار هێندێك چیرۆکی دزیی خۆیی دەگێڕایەوە. جارێکیان ویستبووی مریشکێك بدزێ، بەبێ ئەوەی ڕاوی بنێو بهێڵێ قرتە قرت بکات. ڕیخۆڵەیەکی هێنا بوو و جەمسەرێکیی گرتبوو و ئەوی دیکەیی فڕێ دابوو تا مریشکەکە قووتی بدات، پاش ئەوەی بستێکی لێ قووت دابوو، کابرا کەوتبووە فووتێکردنی تا لە گەرووی مریشکەکەدا هەڵئاوسابوو و نەیتوانیبوو قرتە قرت بکات یا بجووڵێتەوە، بوو بووبە نێچیرێکی حازر بەدەست.(عزرە) ئیشی ئەوە بوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی ئیدارەی بەندیخانە پیسایی ئاودەستخانەکان هەڵبکێشێ. نیوە ناوی (نوری السعید) پاشای لە ئاودەستخانە نابوو و، لەکاتی پیسایی هەڵکێشاندا قسەی لەگەڵدا دەکردو دەیگوت: نووری پاشا دەمت بکەرەوە.

زیندانیەکی دیکەی جوولەکە لەوێ بوو، شێت بوو یا خۆیی کردبوو بەشێتو بە (اسحق )ناویان دەبرد. لە ڕابردوودا خەباتگێڕێکی شیوعی بوو و بەهۆی چالاکیی سیاسیەوە زیندانی کرابوو. لە بەندیخانە پەکی کەوت. بەتەنیاو بەڕێگەی تایبەتی خۆی دەژیا. هەر یەکجار چلکن بوو، جلوبەرگێکی کۆنەی دڕاوی لەبەردا بوو و بەمەبەستەوە جلو ڕوخسارو دەستەکانیی بەڕەشاییی بنی مەنجەڵ ڕەش دەکردو بۆ چەند سەعاتێکی درێژ لەسەر هێندێك پارچە پەڕۆی چلکن دادەنیشت، وەك بڵێی مرۆڤی پێش هەزاران ساڵە. هێندێك دەیانگوت: بەقەستی وا لەخۆی دەکات بەڵکوو بەشێتی دابنێنو بەرەڵای بکەن.

بەڵام (شلومو کرادی) سەیرترین زیندانی بوو لەسەر تاسەری بەندیخانەدا، جیهانێکی تایبەتی خۆبەخۆ دامەزراو بوو. جۆرە شێتێکی ڕاستەقینەی تایبەتو زۆر

دەگمەن بوو. پیشەی وابوو جلی کۆنی دڕاوو چڵکن بپۆشێ بە تاقی تەنیا لە قوژبنی هۆڵێکدا بژیو جاروبار بەتەنیاو جاری وایش هەبوو لەگەڵ کەسانی دیکەدا پیاسە بکات. جگەرە خۆرێکی نابووت بوو، پوولێکی شك نەدەبردو هەرگیز نەیدەتوانی بەگیرفانی خۆی جگەرەیەك بکرێ. ئەگەر ئارەزووی جگەرەی بکردبایە دەچوە لای زیندانییەکی جگەرە کێشی شیوعی یا زایۆنی یا غەیری ئەوانەوەو داوای جگەرەی لێ دەکرد. ئەگەر داواکەی ڕەت بکرایەتەوە پەنجەکانیی بۆ لووتی دەبردو تەواو وەك ئاژێری شەمەندەفەر دەیفیکاند. دەیتوانی ئاژێرەکە درێژ بکاتەوەو بۆ مەودایەکی زۆر لەسەری بەردەوام بێ، تا کابراکە بێزار دەبوو و ناچاری دەکرد داواکەی بەجێ بهێنێو جگەرەکەی بداتێ. ئەگەر لێت بپرسیبایە بۆچی حوکمی بەندیی هەمیشەیی ـ واتە بیست ساڵ ـ ت بەسەردا دراوە؟ یەکەو ڕاست وەڵامی دەدایتەوە:

ـ حاکم وردەی نەبوو.

ـ باشە شلومو ئەی بۆچی بەندیان کردی؟

ـ شەپقەیەکم لەسەر کرد بوو و لەسەر پردەکە پیاسەم دەکرد.

شلومو هەموو ساڵێك دەبرایە شێتخانە ـ الشماعية ـ بۆ ئەوەی دوو تا سێ مانگی تێدا بمێنێتەوەو پاشتر بە گوشارو پێداگریی زۆری خۆی بهێنرێتەوە بۆ بەندیخانە.

ژمارەی زیندانیە زایۆنیەکان گەلێك لەهیی ئێمە زیاتر بوو. هیچ پێوەندیەك لە نێوان ئێمەو ئەواندا نەبوو، ڕاستتر بڵێین، هەر پێوەندیی دوژمنایەتی هەبوو و بەس. ڕۆژێکیان خەریك بوو بکەوینە شەڕە چنگ لەگەڵیاندا، چونکە هەر لایەو هەوڵی دەدا لە پێشەوە خۆی لە حەمامەکاندا بشوات.

ژیانمان هەر وەکوو جاران ڕێکخراو بوو، ئەمە نانەوایەو ئەوە چێشت پەزەو ئەویان قاپو قاچاخ دەشوات یا چا ساز دەکات یان جل شتنی بەسەردا دراوە.. چێشتخانەکەمان یەکەو هەر خێزانێك چی بهێنێ دەخرێتە بەر دەستی بەرپرسی ئیداریو هەموان دەیخۆن. هێندێك ئێوارە موحازەرەیان لەبارەی چەند کێشەیەکی تیۆریو سیاسییەوە تێدا هەیەو، بەیانیانیش بە کۆمەڵ یا تاکە تاکە وەرزش

دەکەین‌و، لەکاتی دەست بەتاڵیدا کتێب دەخوێنینەوە یا دەمە تەقێ یان یاریی شەترەنج دەکەین.

هەڤاڵە جوولەکەکانمان پیاوی چاك بوون. تا ئێستایش هیچی وا شك نابەم ئەوانی پێ جوێ بکەمەوە لەشیوعیە موسڵمان یا دیانەکان. لە بەندیخانە خێزانێك هاتە پاڵمان، کە لە(بنیامین )ی‌جوولەکەی بەساڵداچووو (حسقیل و اسحق )ی جووتە کوڕە لاوەکەی پێکهاتبوو و، بەو پەڕی باشی‌و دڵسۆزییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردین‌و بوون بە دوژمنێکی سەرسەختی زایۆنیزم. ڕۆژێکیان بنیامین زانیی ئێمە پێویستیمان بەبڕە پارەیەك هەیە بۆ هەڵسووراندنی کارێك. بۆیە هاتە لام‌و گوتی:

ـ هەڤاڵ ! سەد دینارم هەیە. پێش بەندکرانم لەپاژنەی پێڵاوەکەمدا شاردبوومەوەو تا ئێستا پاراستوومە. ئەگەر ئیشەکەتان بۆ مەیسەر دەکات، حەز دەکەم ئێستا پێشکەشی ئێوەی بکەم.

ـ باوکی حسقیل سوپاس. پارەکە بۆ خۆت بهێڵەوە، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان پێویستت پێیە بێ.

* * *

لە ١٩٥٤دا ڕۆژێکیان خافلگیر بووم کەزانیم کەسانێك هاتوون بۆ چاوپێکەوتنم. دەمزانی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی دەسەڵاتداران بۆ چاوپێکەوتنم کارێکی ئەوپەڕی دژوارە. کە لە بەندیخانە هاتمە دەرێ، سەیرم کرد باوکم‌و دایکم چاوەڕێم دەکەن. چەند سەعاتێکی کەم لەگەڵیاندا دانیشتم‌و، باوکم پێی گوتم: ماوەی ساڵێکی تەواوە دەرگا نەماوە لێی نەدەم، تا توانیم ئیزنی چاوپێکەوتنت وەربگرم. ئەوە تاکە چاوپێکەوتنی باوکم بوو لە بەندیخانەدا، چونکە لەوە بەدوا بەیەکجارەکی نەمدییەوەو شەش مانگی بەسەردا تێپەڕ بوو ئەمجا هەواڵی مردنیم لە١٩٥٦ دا بیست.

دووره پەرێزیمان مایەی بێزاری بوو. دەمانویست بمانگوێزنەوە بۆ بەندیخانەیەکی دیکە کە هەڤاڵانمانی تێدا کۆبووبوونەوە. بۆ ئەم مەبەستە پتر لە جارێك مانمان لە

خواردن گرت. ئەو ماوەیە مانم گرت، درێژترین مانگرتن بوو لەتەمەنمدا، چونکە مانگرتنەکەمان بیستو حەوت ڕۆژی خایاندو ئەو ڕۆژانە هەر چامان دەخواردەوە. هەموو لاواز بووینو بووین بە تارمایی یا بە پەیکەری ئێسکی بێ گۆشت. سەرەنجام بەژێر کەوتوویی دواییمان بە مانگرتنەکە هێنا، لەبەر ئەوەی داواکاریەکانمان بەدی نەهێنا. پێم وابێ ئێمە لە بنچینەوە هەڵە بووین، چونکە مانگرتنەکە لە کاتی خۆیدا نەبوو و نەماندەتوانی خەڵکی پێتەخت بجوولێنین بۆ پشتگیریکردنمان بەوەفدو خۆپیشاندان. دوای کۆتایی پێ هێنانی مانگرتنەکە ماوەی حەفتەیەکی تەواو یا زیاتر تێر خواردنمان نەدەزانی. هەریەکێکیمان پێی دەکرا هەموو ژەمێک خواردنی چەند ژەمێکی پێش مانگرتن هەڵلووشێ.

ئێمە لە جۆرەها بۆنەی نیشتمانیو نێو نەتەوەییدا ئاهەنگمان دەگێڕاو باشترین خواردنمان تێدا ئامادە دەکردو گوتاری تێدا دەخوێندرایەوەو سروودو گۆرانیی شۆڕشگێڕانەی بە کۆمەڵۆ تاکەتاکەی تێدا دەگوترا. حسقیل قووچمان عوودەکەیی لێدەدا کە ـ وەك بیرم بێ ـ زیندانیەکی نێو خۆمان دروستی کرد بوو. لە ئاهەنگێکیاندا شێوە مێزێکیان پێکەوە نا تا خوتبە خوێن ـ وەك لە هێندێك هۆڵی نوێدا هەیە ـ لە پشتیەوە رابوەستێ. بەلاّم من کە یەکەم کەس بووم خوتبە بخوێنمەوە، لە پشت مێزەکەوە رانەوەستامو چوومە سەری تا گوتارەکەم بخوێنمەوە. بەوە ساخ بووەوە کە من لە ژیانمداو تا ئەو ڕۆژە ئاهەنگێکی ئسوولیم لە هۆڵێکدا نەدیبوو. گەلێك جار خوتبەم خوێندبووەوە، بەلاّم بۆکۆمەڵە خەڵکانێکی میللیو لە نێو گۆڕەپانو شەقامی شاراندا و لەسەر کورسییەك یا هەر جێیەکی بەرز شوێنێکم بۆ خۆم دەگرت. بەلاّم راوەستانم لەسەر نیوچە مێزێك مایەی پێکەنینی هاوڕێیانمو گاڵتەجاڕیی هێندێکیان بوو. ئەگەر چی لە کاتی گوتار خوێندنەوەمدا بۆ رێزگرتنم پێ نەکەنین.

گەمژەیی وای لیّ کردم لە بۆنەی نیشتمانی یا نەتەوەییدا هاوبەشیی ڕیّو ڕۆیشتنی نێو بەندیخانەی هەڤالانمان بکەم‌و سروودێکیان لەگەڵدا بڵێمەوە کە منی تێدا ستایش‌و پیرۆز دەکراو بڕگەیەکی ئەمە بوو: " ئەو باسمەی کە ڕێبەریی کردین". ئەمە لە بریی ئەوەی ڕێی ئەوەیان لیّ بگرم. ئەمڕۆ کە ئەوەم بیر دەکەوێتەوە بە خۆم پێدەکەنم‌و، بەرانبەر بەو ئاکارە منداڵانە دوور لە بیّ هەواو فیزییە هەست بە چەشنە شەرمەزارییەك دەکەم. ئەو دەمە تاکپەرستی‌و پیرۆزکردنی سەرکردە زاڵترین شێوازی جووڵانەوەی کۆمۆنیستی‌بوو. عادەتی بوو من ئەو ڕۆژانە لە سەرکردە پەرستراوەکان یا لە خوایە ناوچەییەکانی جووڵانەوەی کۆمۆنیستی بم.

بە درێژاییی ساڵانی بەندیخانە چەند نامەیەکی کەمی (أم سلام)ی ژنە زیندانیەکەم نەبیّ نامەیەکی شەخسیم لە هیچ یەکێکەوە بە دەست نەگەیشت. جارێکیان پۆستە نامەیەکی لە محەممەدی هاوڕێی منداڵی‌و پوورزامەوە پیّ گەیاندم. کە خوێندمەوە زانیم بە هۆی ناوەڕۆکەکەیەوە پێم گەیشتووە. لەو تاکە نامەیەدا داوای لێکردبووم واز لە کۆمۆنیزم‌و چالاکیی سیاسی بهێنم. لەوەڵامیدا داواکەیم بە گلەییەکی زۆرەوە ڕەتکردەوە.

ژیانمان نەگۆڕو هێمن‌و لەو هەنگامەیە خاڵی بوو کە لە ژیانی هیچ کۆمەڵێکی گەورەی مرۆڤ جویّ نابێتەوە. بۆیە هەلی ئەوەم بۆ ڕەخسا چەردەیەکی باش لە زمانی ئینگلیزی فێربیم. بەڵام نە لە بەندیخانەو نە پاش بەندیخانە بۆم هەڵنەکەوت قسەی پیّ بکەم‌و ئاسایی بەکاری بهێنم. ئەم شتە بە تێپەڕبوونی ساڵگار بوو بە گیروگرفت‌و گرییەکی دەروونی لە لام.

لە ١٩٥٥دا گەڕانەوەی ئەو هەڤاڵە زیندانیانەمان پیّ سەیر بوو کە دوای هەرەسهێنانی کۆمارەکەی حەمید عوسمان لە ١٩٥٣دا لە نوگرە سەلمان گواسترابوونەوە. دیارە زیندانیی تازەیشیان لەگەڵدا بوو. کادیرە کۆنەکانیشیان لە نێودا بوو، جگە لە حەمید عوسمان کە بۆی ڕێکەوت ساڵی ١٩٥٤ هەڵبێت‌و دوابەدوای گەیشتنە بەغدای کەریم ئەحمەد جڵەوی سەرکردایەتیی دایێ. بەندیخانە بە

هاتنەوەی ئەو هەڤالانە قەرەباڵغ بوو و گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر ژیانی ڕۆژانەماندا هات‌و ، ئیدی چاوپێکەوتنی مانگانە لە بەندیخانەدا زیاترجەمەی هات‌و ژیانی ڕۆژانەیش پتر پڕ لە هەراو زەناو شادی بوو. یەکەم پێشبڕکێی شەترەنجم لە بەندیخانە کرد ، هەر لەوێ فێری بوو بووم‌و بەیەکەم دەرچووم. لە کاتێکدا (عزیز الحاج) بە دووەم دەرچوو. لە دابەشکردنی سەر لە نوێی ئیش‌و کاردا بوومە یەکێك لەو دوو زیندانییەی ڕۆژانە چا سازکردنیان پێ سپێردرابوو. چامان لە مەنجەلێکی زلدا ساز دەکردو دەمانکردە پەرداخ بۆ بەشینەوەی بەسەر هەڤالاندا. (زکی خیری)ش یەکێك بوو لەو جووتە زیندانییەی کە چایان دەبەشیەوەو پەرداخە خاڵیەکانیان کۆ دەکردەوەو دەیانشتن. کەرەتێکیان سینیەکی پرلە پیاڵەی بە دەستەوە بوو، پێی هەڵنووتاو بەشی هەرە زۆریان شکان.

زیندانیەکان ژمارەیەکی زۆر ئەدیب‌و ڕۆشنبیرو هونەرمەندو وەرزشکارو غەیری ئەوانەیان لە نێودا بوو. (محمد صالح بحر العلوم)ی شاعیری ناسراوی نەجەفیی خەباتکاری شۆڕشگێر، پێش بەند کرانی‌و کاتێك سەرکردایەتیی حیزبم دەکرد بەر لە گیرانم، پێوەندیی بە حیزبەوە هەبوو. بەڵام لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان نەبێ ڕاستەوخۆ چاوم پێی نەکەوت. سادەو ڕووخۆش‌و ورە بەرز بوو، پێوەندییەکی باشی بە هەموانەوە هەبوو. هەروەها هەمیشە سوور بوو ڕیشە سپی تێکەوتوەکەی بتاشێ‌و سمێڵی بۆ شاردنەوەی تەمەنە گەورەکەی بۆیە بکات. پەرۆشی ئەوە بوو لەوەخت‌و ناوەختدا چەند چامەو دێڕە شیعرێکی خۆی بخوێنێتەوە. لە لایەنی سیاسی‌و پێشکەوتخوازانەی بەرهەمی شیعری بەدەر، شیعرەکانی لە ڕووی هونەری‌و جوانی ناسییەوە بەردەوام بێ دارو بار بوون. لە شاعیرێکی لاوێتی دەچوو ، نەك شاعیرێکی هونەرمەند.

لە نوگرە سەلمان بۆ یەکەم جار چاوم بە (عەبدوڵلا گۆران)ی شاعیری ناسراوی کوردی کوڕی شارەکەم کەوت. بە هۆی چالاکیی کۆمۆنیستییەوە زیندانی کرابوو. برادەرایەتیی خۆش‌و لە ڕەفتارو ژیانی ڕۆژانەیدا سادە بووو، ورەی بە تین‌و

پێداگریش بوو لەسەر چەسپاندنی گیانی بەرەنگاربوونەوە لە لای خەڵکانی دیکە. بۆ دامە کردن دادەنیشتین‌و جاروبار لێم دەبردەوەو جاری وایش هەبوو دەمدۆڕاند. کاتی یاریکردن دەمەتەقێمان لە بارەی جۆرەها مەسەلەوە دەکرد. وا ناسرا بوو ژمارەیەکی زۆر نوکتەی هەمە چەشنەی لەبەرە، بەو نوکتانەیشەوە کەدەدرێنە پاڵ بابە عەلیی باپیرم.

لەوێ چاویشم بە (هادی عباس) ی زیندانیی شیوعیی بەغدایی‌و پەسەندترین یاریکەری تۆپی پێی ئەوسای عێراق کەوت. ئەوە بەهانایەوە نەهات کە باشترین یاریکەر بوو لە دیار ترین یاریداو، لەبەندیخانە قوتار نەبوو. تەنانەت لە بەندیخانەیشدا وازی لە ئارەزووی وەرزشکاریی خۆی نەهێناو یاریی تۆپی پێی ڕێکدەخست. پانیی گۆڕەپانەکە لە پانیی پێوانەیی کەمتر بوو. بەڵام درێژیی نێزیکەی ١٣٠ مەتر بوو. دوو تیپی پێك هێنا، ئێوارەی زۆربەی ڕۆژەکان یارییان دەکرد، (مهدی حميد)و(سليم اسماعيل)و(خضير عباس السماوي)و(أسعد خضر)و هیی دیکە لە ئەندامەکانی بوون.

(عومەری مامە شێخە)ی ئەندازیار کە هەرگیز ئەندازیاریی نەکرد بوو و بە جل‌و بەرگ لە ئەندازیار نەدەچوو، لە نێو ئەوانەدا بوو کە گێڕدرانەوە بۆ لامان. ساڵی ١٩٤٨ پاش تەواو کردنی خوێندنی کۆلێج خرایە زیندان. مرۆڤێکی سادەی بێ هەواو برادەرایەتیی خۆش بوو، ئەگەر چی حەزی بە گۆشە گیریی‌و کەم دوویی دەکرد. زۆربەی کاتی بەندیخانەی بوو بووە چێشتپەزی هەڤاڵە زیندانیەکانی. ڕۆژێك لە ڕۆژان نەمبیستووە لەگەڵ زیندانیەکی دیکەدا خۆیی تووشی هیچ گیروگرفتێك کرد بێ.

(عزيز الشيخ العاني)ی ئەندامی لیژنەی حیزبیی بەغدایش لە ١٩٥٢دا لەوێ بوو. پاشان زانیم لە پاڵ (مهدی حميد)و (عومەری مامەشێخە)و (زكي خيري)و کەسانێکی دیکەدا بوو بە ئەندامی لیژنەی حیزبیی بەندیخانە. (مهدی حميد)کە

(حەمید عوسمان ) لە بەندیخانەی بەعقووبە کردبووی بە سکرتێری لیژنە، مرۆڤێکی خۆبەختکەری سادەو پیاو چاك بوو و قەت خاوەنی لانی کەمی لێوەشاوەیی و ئەزموونی سیاسی یا ڕێکخراوەیی نەبوو تا ڕێبەریی ڕێکخراوی بەندیخانە بکات. پێدەچێ لێهاتوو بووبێ بۆ سەرکردایەتیی فەوجێك یا لیوایەك لە سەرباز، بەلاّم لێهاتوو نەبوو بۆ سەرکردایەتیی چالاکیی سیاسیو ڕێکخراوەیی.

بەرپرسیی حیزبی لەسەرەوە دەستنیشان دەکراو دەبەشرایەوەو هیچ هەلّبژاردنێك لە ئارادا نەبوو و کەس بیریلە هەلّبژاردن نەدەکردەوە. بەر لە گیرانیشم بە تەواوی هەروا بوو. زیندانیەکان (طالب عبدالجبار)یان لە نێودا بوو کە لەڕووی درێژییەوە یەکەم یا دووەم پیاوی نێو بەندیخانەو مرۆڤێکی بێ فیزو کوڕی خێزانێکی هەژاری بەغدایی بوو و خۆیی سەر لەبەر بەکێشەی شۆڕشو کۆمۆنیزم بەخشیبوو. بیرمە ئێمە ڕۆژێکیان مشتومڕمان لەسەرزیانەکانیلادانی چەپڕەوانەو ناچاریی خۆ ڕزگار کردن لە پاشماوەو سەرەنجامەکانی دەکرد، یەکێکیان پرسیی:

- ئەگەر لە لادانی چەپڕەوانە ڕزگارمان بوو، کێ زامنی ئەوە دەکات نەکەوینە نێو داوی لادانێکی ڕاستڕەوانە؟

- طالب وەلاّمی دایەوە: ئێمە زامنی دەکەین. ئێمە بە چەپڕەوی خولقاوینو بە ئاسانی بەرەو ڕاستڕەوی ڕاپێچ ناکرێین.

بەلاّم پێشهاتەکانی سالاّنی دوایی ڕوونیان کردەوە کە دەکرێت حیزب بکەوێتە دوای لادانی ڕاستڕەوانە. ئەگەر چی طالب و هاو چەشنەکانی ببڕای ببڕ ڕاستڕەو نەبوون.

کۆمەلێکی بچووکی زیندانیە شیوعیە دابڕاوەکان - تاقمی ئالاّی ڕەنجدەران - کە هێشتا هەر عەزیز محەمەد بەرپرسیان بوو، لەیەکێك لە هۆلّەکاندا نیشتەجێ بوو بوون. ژمارەیەکی زۆر مریشکیان هەبوو و کولانەیەك یا چەند کولانەیەکیان لە پەنا هۆلّەکەیانەوە بۆ کرد بوون. زیندانیەکان ئەو کولانانەیان ناو نابوو پێتەختی مریشك لە نوگرە سەلمان.

(حسين روضة )ی لاوی نەجەفی لە شتە سەیرەکانی بەندیخانە بوو. کاتی خۆی بە تاوانی کوشتنی قۆمیسەرێکی پۆلیس لە خۆپیشاندانێکدا زیندانی کرابوو. لەوێ دووچاری جۆرە شێتییەك بوو یا خۆیی کردبوو بە شێت. بەتەنیا دەژیا. بەیانیان عەبا لادێییانەکەیی لەبەر دەکرد، گەرچی خۆی کوڕی شاریش بوو. یاشماخو عەگاڵەکەیی دەکردە سەرو تفەنگەکەیی هەڵدەگرت کە تەختەیەکی ئاسایی لە مەترێك درێژتر بوو و قایشێکی لەدەزوو کراوی لەهەردووسەری دەبەستو لەناوەڕاستی گۆڕەپانی بەندیخانەدا مەشقی سەربازی جوندی (مکلف)ی جێبەجێ دەکرد، وەك بڵێی ئەوە بۆ هەموو زیندانیەکان دەکات. ئەجا تفەنگەکەیی دەخستە لاوەو کۆلارە منداڵانەکەیی دەهێناو سەرێکی دەزوە باریکەکەی دەگرتو سەرەکەی دیکەی بە کۆلارەکەوە گرێ درابوو. دەستی بە پەردەیەکی تازەی یاری دەکرد.

بەندیخانەکەمان ناو بەناو پێشوازیی لە پۆستەی نوێی زیندانیی سیاسی تازەی شارو ناوچە جیاجیاکان دەکرد. یەکێك لەو پۆستانە کە بۆمان هاتن سەرباز بوون، بەهۆی چالاکیی کۆمۆنیستییانەوە گیرابوونو حوکم درابوون، بەڕێز لێگیراوی لە نێوماندا ژیان. تا پاش ماوەیەك شتێکی وا لەبەندیخانەدا ڕووی دا کە پێشتر - هیچ نەبێ کاتێك من لەوێ بووم - نموونەی نەبوو بوو. دەرکەوت یەکێکیان شیوعی نەبوو، بەڵکوو برادەری هێندێکیانو دوو دەکی بوو و هەر کەسێك داوای ئەوەی لێ بکردبایە ملی بۆ دەدا. هێندێکیان بەرێگەیەك کە نازانم چییە کاری کوڕەیان بۆ کەوتە ڕوو. بەشبڕاویی جنسیی درێژ خایان چەند خەباتگێڕێکی باشی تاو کرد لەگەڵیدا خۆ تووشی پێوەندیی‌جنسی بکەن. کە(کسار)ی " ضابط صف "ی زیندانی بەوەی زانی، سا بە دڵ لێ پیسکردن بوو بێ یان هەر هۆیەکی دیکە، پەردەی لە ڕووی مەسەلەی ئەو کوڕە هەڵماڵی بۆ ڕێکخستن. لەوە دەچێ بەر لە بەند کرانیانو هەتا پاش بەندکرانیشیان پێوەندیی جنسیی لەگەڵدا هەبوو بێ. دانی بەوەدا نا کە خۆیشی کاری جنسیی لەگەڵدا کردووە. جا کاتێك تووشبووەکانی

دیکەیش ڕووبەڕووی دان پێدانانەکەی (کسار)و خودی (نووری)یە دوودەکی کرانەوە، تەنگەتاو بوون. بەتەنیا (صادق الفلاحی) دانی بە گوناحی خۆیدا نا. کەچی (منصور عزیز)و (جاسم یحیی) ڕازی نەبوون دان بەهیچدا بنێن‌و قوشقی بوون‌و تەنانەت دواتر دەستیان لە چالاکیی سیاسیش هەلگرت.

* * *

دوا بە دوای گەڕانەوەی زیندانیەکان بۆ نوگرە سەلمان، یەخە گیری یەکەمین لێپرسینەوەو یەکەمین سزای حیزبی بووم لە ژیانمدا، بەلای منەوە شتێکی ئاسایی بوو یەکێکی دیکە بەرپرس بێ‌و، من بەشێوەیەکی ئاسایی‌و بەبێ حیساب لە دەرەوەی دەستەی بەرپرسی بەندیخانە بم. بەلام ئەوەی کە قەوما شتێکی دیکە بوو. بۆم ڕوون بووەوە دەبوو من باجی ڕابردوو بدەم، بەتایبەت لەسەر ئەو ڕەفتارانەم کە هەر گەیشتمە بەندیخانە بەدڵی حەمید عوسمان نەبوون. ئەو لیژنە حیزبییە بەرپرسەی کە گەڕایەوە نوگرە سەلمان‌و (مهدی حمید) سەرکردەی بوو، کەوتە لێپێچانەوەم لەسەر تاکڕەوی‌و بیرۆکراسی‌و چەپڕەوی‌و ڕاستڕەوی‌و جاروباریش لەسەر شتێك کە نەمدەزانی چییە. لەواقعیدا ڕابردووی حیزبیم لە تاکڕەوی‌و بیرۆکراسی‌و هێندێك هەلەی سیاسی خالی نەبوو. بەلام ئەوانەی کەلێیان دەپرسیمەوە، لەڕابردوودا پەلێیان لە هیچ هەلەیەکم نەگرتبوو هەر خۆیشیان بەشێکی ئەو هەلانە بوون. هۆی ڕاستەقینەی لێپێچانەوەو سزادانم هەلوێستی من بوو بەرانبەر بە کۆماری بەندیخانەو خودی حەمید عوسمان. حەمید بوو بوو بە یەکەم بەرپرسی حیزب‌و، ئارەزووی دەکرد تۆلەم لێ بستێنێتەوە. کەسانی نێو لیژنەی حیزبی ئەو ڕۆژەی کە حەمید عوسمان کۆمارەکەیی لە بەندیخانە دامەزراندو بەشمشێر یاخیبوونێکی چەکداریی ڕاگەیاند پشتگیرییان کردو، ئەمجا کەمنیش بووم بە بەرپرس‌و کۆمارەکەم هەلوەشاندەوە پشتگیرییان کردم، هەر ئەوان خۆیان کاتێك حەمید عوسمان بووەوە بە یەکەم بەرپرسی حیزب جارێکی دیکە پشتگیریی

حەمیدیان کردەوەو لێم هەڵگەڕانەوە. ئەوانە (زکی خیری)و ( مهدی حمید)و (عومەری مامە شێخە)و (هادی هاشم)و چەند کەسێکی دیکە. (عزیز الشیخ) نەبێ کە لە ڕۆژانی پێش بەندیخانە لە ڕێگەی کاری حیزبییەوە دەیناسیم، ئەوانەی لێیان پێچامەوەو سزایان دام شتێکی بەر دەستیان لەسەر وەزعو چالاکیی حیزبیی سالانی پێش بەندیخانەم نەدەزانیو، دواتر نەیاندەتوانی بیروڕایەکی بابەتیانە لە بارەمەوە گەڵاڵە بکەن. ئەوانە هەمیشە لەسەر پێ بوون پاڵپشتی ئەو کەسە بکەن کە دەبوە بەرپرسی حیزبی بەسەریانەوە. هەموان لە لێپرسینەوەو سزادانمدا بە لای توندی نواندندا دایاندەشکاند، جگە لە (زکی خیری)و ( عزیز الشیخ) کە دەیانویست سزایەکی سووکترم بدەن.

یەکێک لەو تومەتانە ئەوە بوو کە من گەیشتوومەتە رادەی دوژمنایەتیی یەکێتیی سۆڤێت. ئەم تاوانەیش ئەوسا بەس بوو بۆ دەرکردن لە حیزبو بڕینی خراپترین ناو بەسەر مرۆڤدا. شایەتی سەر ئەم تاوانەیش (صادق الفلاحی) بوو کە ئەمەی خوارەوەی بۆ ئەوانە گێڕایەوە: ـ ساڵی ۱۹۵۳ سەرو بەندی شەڕی کۆریا، کە وەفدی سۆڤێتی لە دەستەی نەتەوە یەکگرتوەکاندا کۆتاییی بە دوورە پەرێزی لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی ئاسایش هێنا، لە (بەهادین)م بیست دەیگوت: ئێستاکە سۆڤێت هەستیان بەوە کردووە بەشداری نەکردنیان هەڵە بووە، بۆیە لێی پاشگەز بوونەتەوەو هاتوونەتەوە بەشداریی دانیشتنەکان بکەن.

ئەوی راستی بێ من لە ۱۹۵۳دا ئەم رایەو چەند رایەکی دیکەم لەبەردەم (صادق الفلاحی)دا دەربڕیبوو. بەلام بە هیچ شێوەیەك دژی سۆڤێت نەبووم، بەڵکو دۆستی بوومو قەناعەتم بەوە هەبوو کە قەلای ئاشتیو دیموکراسیو سۆشیالیزمە. ئەوسا دەربڕینی ئەم چەشنە رایە بە دوژمنایەتیی ئینتەرناسیونالیزمو بە تاوانێك دادەنرا لێخۆشبوونی بۆ نەبوو. بەرپرسەکان نەرمییان بەرانبەر نواندمو را دەربڕینەکەمیان بەوە لێك دایەوە کە هەر ئەوەندە بەد گومانییە لە سیاسەتی یەکێتیی سۆڤێت !

هەرچی چۆنێك بێ لێپرسینەوە بەوە دواییی هات لە گشت پلەو پایەو بەرپرسییەکی حیزبی دوور خرامەوەو هەر بە ئەندامێکی حیزب هێڵرامەوە. لەوە دەترسام مەسەلەکان بکێشنەوە بۆ تەنانەت دەرکردنیشم لە ریزەکانی رێکخستنی حیزبیی بەندیخانە. لافی ئەوە لێ نادەم کە من گوێم بەوە نەدابێ‌و پێی دڵگران نەبوو بم. بەڵام بایەخێکی زۆرم بە مەسەلەکە نەداو تێنەکۆشام ژاوە ژاوو سەر ئێشە بۆ لیژنەکە بنێمەوە، بەڵکوو ئاسایی‌و هێمن مامەوەو وا رەفتارم کرد وەك بڵێی هیچ شتێك رووی نەداوە. پێوەندیی دۆستانەو هەڤالانەم لەگەڵ هەمواندا هێشتەوە، بە ئەندامانی لیژنەکەیشەوە کە لێپرسینەوەو سزادانمیان لە ئەستۆ گرتبوو. لەوە بە دوا نامەیەکم لە چەند لاوێکی شیوعیی بەغداو شارەکانی باشوورەوە ـ لەوانە علی الشیخ حسین الساعدی ـ بۆ هات، نارەزاییان بەرانبەر بەو کارە دەردەبڕی‌و ئامادەییی خۆیانیان پیشان دا بۆ داکۆکی لێکردنم‌و رێنوێنی وەرگرتن لە منی هەڤاڵ باسمی سکرتێری حیزب. لەوەڵامەکەمدا ئامۆژگاریم کردن واز لەهەر چالاکییەکی لەم چەشنە بهێنن‌و لەدەوری حیزب کۆببنەوە.

* * *

هێشتا لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان بووین کە هەواڵمان پێ گەیشت لە دەرەوەی بەندیخانە گفتوگۆ لە نێوان سەرکردایەتیی (حشع)و تاقمی ئاڵای رەنجدەران هەیە بۆ دووبارە یەکگرتنەوە. هەر ئاماژە بەم هەواڵەیش، مشتومڕ لە نێوان کادێرانی بەندیخانەدا کراو منیش هاوبەشیم تێدا کرد. چەندین بیرو رای جیاواز لە گۆڕێدا بوون، هەیانبوو سەرپەڕ گرو هەیشیان بوو ناوەند گر (معتدل) بوو. رای (عزیز الحاج)، وەك پیشەی زۆربەی کاتی، سەرپەڕگرانەو لە بەرژەوەندی تاقمی رەنجدەراندا بوو. لافی ئەوەی لێدەدا کە تاقمی رەنجدەران حیزبی شیوعین‌و پێویستە لەسەرمان بچینە ناریانەوە. لەکاتێکدا تاقمی رەنجدەران خۆیان دانیان بەوەدا دەناکەئەوان لەحیزب هەڵبڕاون. هیی وایش هەبوولەهەردوو لا بەرهەڵستیی هەر یەکگرتنەوەیەکی

ئەو دوو ڕێکخستنەی دەکرد. بڕیارم دا بیرو ڕام ناو ئاخنی نامەیەکی تایبەت بکەم بۆ سەرکردایەتیی حیزب.(حسين احمد الرضى ) لەو ڕۆژانەدا بوو بوو بە سکرتێری حیزب‌و (حەمید عوسمان)یش دوور خرابووەوە. لەنامەکەمدا باسی ئەوەم کرد کە هەر لایەك لە هەڵەو ڕەفتارەکانی خۆی بەرپرسەو ڕاست نییە کۆتارو ڕۆتای هەڵەی لایەکیان بدرێت بەسەر لایەکەی دیکەدا. گوتیشم هەڵەی هەرە گەورەی ئەوان ئەوەیە لە حیزب هەڵبراون.

هەر ئەو ڕۆژانە نامەیەك لەسەر هەڵەو کردەوەی تاکڕەوی‌و ڕەفتارەکانی (حەمید عوسمان)ی سکرتێری پێشوو (ص.) لەسەرکردایەتیی حیزبەوە هات. نەمدەزانی ئەو کەسە کێیە کە جێی حەمیدی گرتووەتەوە، بەڵام قەناعەتم هەبوو کە حەمید دەست نادات ببێتە یەکەم بەرپرس.

* * *

دەکرێت بڵێین: من بیرم لە هەموو شتێك دەکردەوە، ئەوە نەبێ کە ڕەگەزنامە (جنسیه )ی عێراقیم لێ بستێننەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا هەر لێم سەندرایەوە. چۆن‌و بۆچی؟ لەوانەیە نوێترین شێواز بوو بێ بۆ ترساندنی شیوعیەکان‌و کزکردنی ورەیان‌و دواتر بۆ بێهێزکردنی کۆمۆنیزم. دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان ڕەگەزنامە بە تەنیا لە من نەستێندرایەوە. بە من‌و (زکی خیری)و (صادق الفلاحی)و(اکرم حسين) یان ڕاگەیاند کە دەسەڵاتدارانی عیراق بڕیاریان داوە ڕەگەزنامە لە ئێمەی زیندانی بستێننەوەو سوورن لەسەر ناردنمان بۆ وڵاتێکی دەرەوەی عێراق. سەر لەبەیانیی ڕۆژی دوایی فەرمانیان پێ داین بە خۆ بکەوین بۆ سەفەری بەغدا. تا ئێستایش بە پەژارەوە دێتە بیرم کە هەڤاڵانی زیندانیم تەنانەت لەبەیانیی ڕۆژی دیاریکراوی سەفەرەکەیشماندا نۆرەی چا ساز کردنیان پێ گرتم‌و لێم خۆش نەبوون. لە نۆرەی چا بوومەوەو یەکسەر لەگەڵ هەڤاڵاندا کەوتینە ماڵئاوایی کردن‌و بە چاودێریی پۆلیس چووینە گرتووخانە (سجن الموقف )ی بەغدا.

بەختمان یاربوو (جبار أيوب)ی بەڕێوەبەری پێشوو لەوێ نەبوو. یەکە یەکە قسەمان لێ وەرگیرا، بەڵام ئێمە لە پێشەوە ڕێککەوتبووین چی بڵێین. پوختەی قسەکانمان ئەوە بوو: ئێمە هاونیشتمانی عێراقین‌و پێبەندی هاونیشتمانەتیمانین‌و پێداگرین لەسەر ئەوە کە لەوڵاتی خۆمان بژین‌و تێیدا بمرین‌و لە نێوان گۆڕی باپیرانماندا بنێژرێین‌و، ئێمە قایل نین بچینە هەر وڵاتێکی دیکەو ناڕازین دەسەڵاتداران ڕەگەزنامەمان لێ بستێننەوەو بە بڕیارێکی دژ بە هەموو شەریعەتە زەمینی‌و ئاسمانیەکانی دادەنێین.

بڕیاری ڕەگەزنامە لێ سەندنەوە هەریەکە لە(توفيق منير)ی پارێزەری‌شیوعی‌و (كامل القازانچي)ی پارێزەری دیموکراتیشی دەگرتەوە. لەبەر ئەوەی زیندانی نەبوون، گیران‌و خرانە گرتووخانەیەکی دوور لە ئێمە تا قسەیان لێ وەرگیرا. ئەمجا هێنرانە لامان. پرسیمان چییان گوتووە، (كامل القازانچي ) گوتی:

- من لە قسەکانمدا پێبەندی ئەوە بووم کە هاونیشتمانێکی عێراقیم‌و دەربخست حەز ناکەم عێراق بەجێ بهێڵم‌و بچمە هەر وڵاتێکی دیکە. ئەگەر بەزۆرو بە پێچەوانەی خواستی خۆیشمەوە بمنێرنە دەرێ، ئەوا پێم باشترە بچمە هەر وڵاتێکی عەرەبی. ئەگەر ڕێی ئەوەیشم نەدەن، وڵاتێکی بێلایەنم پێ باشترە.

هەرچی (توفيق منير) یش بوو مەسەلەکەی بە جۆرێکی جیاواز یەکلایی کردبووەوە، چونکە - وەك گوتی - ڕازی نەبوو بوو هیچ بڵێت‌و ئەمەی لەو کاغەزەدا نووسیبوو کە بۆ قسە تێدا نووسین پێی درابوو:

- من لە بنەڕەتەوە قایل نیم دان بەم حکوومەتەدا بنێم‌و، دواتر بەهیچ بڕیارێك قایل نابم لەوەوە دەربچێ.

- لێمان پرسی: (أبو موفق ) بۆچی قسەکانتت بە شێوەیەکی باشتر نەخستە ڕوو؟

- نەمزانی هەڵوێستی حیزب چۆنەو ئێوە چی دەڵێن. بۆیە هەر ئەم قسە کورتەم کرد، چونکە ترسام ئەگەر قسەکانم بە جۆرێکی دیکە بن لەگەڵ هیی ئێوەدا ناکۆك بکەونەوە.

بەڕێوەبەری بەندیخانەی بەغدا ڕایسپارد بوو ڕۆژانە گۆشتێکی زۆرمان بدەنێ، بۆ ئەوەی ڕازیمان بکات‌و تا ئێمە لەوێ بمێنینەوە مانگرتن لە خواردن ڕوو نەدات. (توفیق منیر) بەهۆی زیادە گۆشتخۆرییەوە تووشی سکچوون بوو. ئەو پزیشك (الطبیب)ە ی کە ئەم سەری لێ دا، ١٦ حەپی سلفاگوانۆدینی بۆ نووسی تا لە دوو ڕۆژدا بە چەند ژەمێك بیخوات، بەڵام کابرا بەیەك ژەم هەموو حەبەکانی خستە دەمیەوەو قومێك ئاوی بەسەردا کرد. هێندێکمان بۆ ئەوە چووین کە (أبو موفق) بڕیاری خۆ کوشتنی داوە. بەڵام سەرەنجام ڕەوانیەکەی بەخێرایی گیرسایەوە، کابرا گوتی: ئەوە یەکەم جار نییە بەم چەشنە حەب بخۆم.

دوای چەند ڕۆژێك هێنراینەوە بۆ بەندیخانەی نوگرە سەلمان. لەوە بەدوا هیچم لە بارەی لێ سەندنەوەی ڕەگەز نامەکەوە بەر گوێ نەکەوت، وەك بڵێی ئەم بڕیارە هەر لە بنچینەوە نەبوو بێ. جا نازانم ئایا سەرجەمی کارەکە شانۆگەری بوو بۆ ترساندنمان، یان دەسەڵاتداران لە بڕیاری خۆیان پاشگەزبوونەوە؟

گۆرانی‌و سروودی شۆڕشگێرانە گوتن لە بەندیخانەدا لە شتە قەدەغە کراوەکان بوون. حوکمە زیندانیە شیوعیەکان لە سزای سروود خوێندنەوەدا دەیان یا سەدان ساڵ زیاد کرا. لەو زیندانیانە، ناوی (د. حسین الوردی ) دەهێنم کە سەرەتا حوکمی یەك یا دوو ساڵ بەندکردنیان دا. ئەنجا بە چەند دادگاییکردنێك کە هەمووی بەهۆی سروودی شۆڕشگێڕانە خوێندنیەوە کران، ساڵانی حوکمی کرانە ١٢ ساڵ.

ساڵێك بەسەر بەند کرانمدا تێپەڕیبوو، لەبەردەم قازییەکدا ڕاوەستام، هێنرابوو بۆ دادگاییکردنم لەسەر تاوانی سروود خوێندنەوەم دژی ڕژێمی حوکمدار. دانم بە سروود خوێندنەوەدا ناو، سەر کۆنەم کردن کە بەم بەهانەیەوە دادگاییم دەکەن. دوا جار قازی حوکمی یەك ساڵ بەند کردنی دام، تا بەناوکێش لەگەڵ حوکمەکەی دیکەمدا ـ بەندیی هەمیشەیی ـ تەواوی بکەم.

دەسەڵاتداران هەوڵیان دەدا شیوعیە زیندانی کراوەکان تەنگە تاو بکەن بۆ پاکانە کردن‌و وازهێنان لە باوەڕی کۆمۆنیستی‌و ڕاگەیاندنی دڵسۆزی لەسەر پەچکە

قاقەزێك بۆ شای مەزن‌و ڕژێمی حوکمدار. دەسەڵاتداران بۆ بەدەست هێنانی ئەم پاکانەیە زیندانیە شیوعیەکانیان بە درێژاییی ساڵانێکی یەك لەدوای یەك دوو چاری ئەشکەنجەدان‌و چەوسانەوە دەکرد. لە بەرپوەبەرانی زیندانە سیاسیەکان سێیان هەم بە دڕندەیی‌و ملهوڕی لە مامەڵەیاندا لەگەڵ شیوعیەکانداو هەم بە کردەوکۆشیان بۆ ـ لە ڕووی سیاسی یەوە ـ ڕووخاندنیان‌و پاکانە لێ پچڕینیان ناوبانگیان دەرکرد، ئەوانیش (جبار أیوب )و(علی زین العابدین )و (محمد سعید شهاب ) بوون. ئەمەی دواییان کرابوو بە بەرێوەبەری بەندیخانەی نوگرە سەلمان‌و، هێنانی بۆ لای ئێمە پێوەندیی بە پرۆژەی هێرشێکی تازەوە هەبوو کە دەسەڵاتی حوکمدار نەخشەی بۆ کێشاو دائیرەی ئاسایشی گشتیش تان‌و پۆی چنی.

ڕۆژێکیان لە١٩٥٦دا (محمد سعید شهاب)ی بەرێوەبەری بەندیخانە بەناو داوای هەشت زیندانیی کرد، بە بیانووی ئەوەکە گوایە پزیشك هاتووە چاوەڕێیان دەکات. پزیشك مانگی جارێك سەری لە بەندیخانە دەدا. باش دەمانزانی بەرپوەبەر خۆی ئێمەی دەوێ نەك پزیشك کە قەت داوای کەسی نەکردووە، بەڵکوو نەریت وابوو زیندانی داوای چاوپێکەوتنی ئەو بکات. بەڵام چار پی بوو؟ دەبوو زیندانیە داواکراوەکان بچن‌و، منیش یەکێکیان بووم. هەر کە گەیشتینە لای بەرێوەبەر فەرمانی دا پێوەن‌و شیش (الخطام)بکەنە پێی هەمووومان، کە شیشێکی ئاسنی بەدوو ئەڵقەوە بەستراوە لە هەردوو قاچی زیندانی توند دەکرێن‌و ئیتر پێی ناکرێت هەردوو قاچی لە درێژیی شیشەکە زیاتر لێك دوور یا نیزیك بکاتەوە، ئەمە سەرباری پێوەنی ژمارە (٢)ـ واتە پێوەنی دوو کیلۆگرامی ـ کە هەردەم لە پێی خاوەن حوکمە قورسەکاندا بوو.(زکی) لەبەر تەمەنی زۆری بە (کۆت) پێوەن نەکرا، بەڵکوو تەنیا زنجیری ژمارە (٨) ـ واتە ٨ کیلۆ گرامی ـ خرایە پێی. ئەنجا کەلەپچە خرایە دەستی گشتمان‌و براینە ژووری گلدانەوە (المحجز)کەوا باو بوو ناو ببرێ بە (ژووری وەرزش ). کەلەپچەکانی دەستمان بە چەند قفڵێکی زیادە بە زنجیرێکی ئاسنەوە بەسترا کە بە سنگێکی ناوەڕاستی ژوورەکەوە چەسپ کرابوو و درێژیی

نێزیکەی مەترێك بوو. پاش ئەوە بەڕێوەبەر هاتە ژوورەوە بۆ لامان،وەردیانێکی تەنەکەی خاڵی بەدەستی بەدواوە بوو. پێی گوتین:

- ئەم تەنەکەیە لێرە ئاودەستخانەتانە میزو گووی تێدەکەن. ڕێ بەهیچتان نادرێت لەم ژوورە بێنە دەرێ تا هەمووتان دەمرن.

ناڕەزاییەکی توندمان دەربڕیو بەسەر بەڕێوەبەری دڕندەدا قیژاندمانو داوای مامەڵەی یاساییمان لیٚ کرد. بەڵام وەرچەرخاو وەك نە بای دیبێو نە باران چووە دەرێ. ئەمجا کەوتینە پێکەنین بە حاڵی خۆمانو لەنێو خۆماندا یەك کەوتین بەڕێوەبەر ناو بنێین " تەنەکە"و ملمان بۆ هەلو مەرجە تازەکە درێژ کردو خۆمان ڕاهێناو تەنەکەکەمان بەڕاستی وەك ئاودەستخانە بەکارهێنا. بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی ئەم ئاودەستخانە نەفرەتییەیش هەر ئەوەندەمان لە دەست هات بە جامەدانەی یەکێکمان داپۆشین. سەر لەبەیانیی سێیەم ڕۆژ بەڕێوەبەر بەشوێن منو (مهدی حمید)و (کامل السامرائی )یدا نارد. لەبەردەم ژووری گلدانەوەدا فەرمانی دا ٢٥ جەڵدەی فەلاقە لەبەری پێم بدەن. کە وەردیانە کە لە لێدان بووەوە، هێشتا لەسەر ئەرز کەوتبووم. بەڕێوەبەر لێی پرسیم:

- بۆچی هاوار ناکەی ئاخ؟

- بە هەڵشاخانەوە وەڵامم دایەوە: قەت هاوار ناکەم.

- کەواتە ١٠ جەڵدەی دیکەی لیٚ بدەن.

دوای من نۆرەی (مهدی حمید) هات، ٢٥ جەڵدەی فەلاقەیان لیٚ داو ئەمجا ١٠ جەڵدەی دیکەیش چونکە هاواری نەکرد " ئاخ ". بەڕێوەبەر هەر ٢٥ جەڵدەی بۆ (کامل السامرائی ) بڕییەوە. پاشان ئێمەیان بۆ ژوورێکی دیکەی گلدانەوە گواستەوەو تەنەکەیەکی ئاودەستخانەیان بۆ تێدا دانایین.کامل ڕۆژانی دوایی لەوەزعێکی دژواری دەروونیو تەندروستیدا بوو. بە ڕواڵەت نەخۆش بوو. بەڵام منو مەهدی باوەڕمان وابوو کە هۆیە ڕاستەقینەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەم ورە نزمیی خۆیو

هەم ڕاڕا بوونی لە نێوان خۆڕاگرتن یا پاکانە کردنو دەرچووندا لە بەندیخانە. پەیمان بەوە دەبرد کە گێڕانەوەی بۆ بەندیخانە زۆر لەوەزعی دەگۆڕێ. ئیتر تاکە خەمان ( یا گرفتی سەرەکیمان ) ئەوە بوو لە ڕووخان ڕزگاری بکەین. پەنامان بردە بەر نەخۆشیەکەی تا تەنگ بە ئیدارە هەڵبچنین بیبەنەوە بۆ بەندیخانە. ڕۆژێکیان زانیمان پزیشك سەردانی مانگانەیەتیو هاتووە. کردمان بە هەراو هوریاو ئیدارەمان ناچار کرد (کامل)ی نەخۆشو خۆیشمان پێشانی پزیشك بدەین. دەردە دڵی خۆمانمان بۆ پزیشك کرد کە پیاوێکی باش بوو و، پرسیمان ئاخۆ ئەوە مرۆ دۆستییەو لەبەر چاوگرتنی مەرجی تەندروستییە لە بەندیخانەکاندا تەنەکە وەك ئاودەستخانە بخرێتە نێوژوورێکی بچووك بۆ زیندانیان. پزیشکەکە بەتوندی ناڕەزاییی دەربڕیو داوای لە بەڕێوەبەر کرد تەنەکە لابەنو وەزعەکە ئاسایی بکەنەوە، ئەگەرنا لە دائیرە تەندروستیو یاساییەکاندا کاری یاسایی بەرانبەر دەکات. هەروەها دەرمانی بۆ چارەسەرو حەوانەوەی کامل نووسی. بەوە گیروگرفتی کامل چارەسەر کراو برایەوە بۆ بەندیخانە. تەنەکەکە لابراو منو (مهدی حمید)و هەڤاڵانی دیکەمان لە ژوورەکەی دیکە " دەسکەوتێکی مەزن " مان دەستگیر بوو! ڕۆژی دووجار دەبراینە ئاودەستخانە.

لە ژوورێکی دەرەکیی گلدانەوەدا دایانبرین. ئەمە سەرەتای هێرشێکی پۆلیسیی هەموو لایەنە بوو بۆ سەر تێکڕای بەندیخانە بەهەر ١٠ هۆڵەکانیەوە. کۆمەڵێکی گەورە لەوەردیانی بە دوو و پۆلیسی بیابان سازو تەیارکرانو بەڕێوەبەر خۆیشی لە چالاکیەکی هەڵکوتانە سەر وداگیرکردندا ڕێبەریی کردنو کەلوپەلی هاکەزاییی خودی سەرجەم زیندانیەکانی لەگەڵدا تالان کرا. زیندانیەکان پەرەوازە کرانو گەلێکیان لێ برانە ژووری لێرەو لەوێی گلدانەوەو، زۆربەیشیان کەلەپچە خرایە دەستیانو لەنێو هۆڵەکاندا بەشیشی پەنجەرەکانەوە بەستران. وەردیانو پۆلیسە داگیر کەرەکان لەسەر دزینو تاڵانکردنی جانتاو جلو بەرگو تاقمی ڕیش تاشینو هەر شتێك بکەوتبایە دەستیان، پێشبڕکێو منمنایەتییان دەکرد.

بەڵام پەردەی پێکەنیناویی تراژیدیا چالاکیی تاڵانکردنی کەڵە مریشکی بەندیخانەدا بوو. گەورەیی ڕووبەری بەندیخانەکە لەبار بوو بۆ مریشک بەخێو کردن. ئەم " پیشە "یە دەرەتانی لەبەردەم هێندێک زیندانیی بەتایبەت پەڕاگەندەی دوور لەهەر ڕێکخستنێك دەخوڵقاند تا کاتەکە بەسەر ببەن و خۆ بە مریشکەوە خەریك بکەن و هێلکە بەدەست بخەن وەك پێشتر گوتم پێتەختی مریشك لەلای تاقمی ئالای ڕەنجدەران بوو. پاش تاڵانکردنی هەر دە هۆڵەکە، چالاکیی تاڵانکردن ـ واتە مریشك فڕاندن ـ دەستی پێکرد. هەموو مریشکەکان لەو پانتاییە فراوانەدا بەڕەڵا کرابوون و زیتەڵەو لە جۆری خۆماڵی بوون، نەك مریشکی مەسلەحە. ڕاونانێکی دەستە جەمعی، یا ڕاستتر بڵێین پێشبڕکێیەکی دەستەجەمعی لەئارادا بوو لە نێوان پۆلیس و وەردیانەکانداو بەهاوبەشیی ژمارەیەك لەو زیندانییە شیوعیانەی کە بۆ چێشت و نان سازکردن و خزمەتی زیندانیە گلدراوەکان بە دەرەوە بوون. ئەگەر مریشکێکت بگرتبایە دەبوو بە هیی خۆت. دەبوو هەوڵ بدەی زۆرترین ژمارەیان لێ بگری و پەلەی تێدا بکەی و بەخێرایی ڕابکەی، چونکە کەسانێکی دیکەیش پەلیان بۆ دەکوتان. ژمارەیەکی زۆر وەردیان و پۆلیس و زیندانی بە گورگەلۆقە بەدووی ژمارەیەك مریشك و کەڵەشێردا ڕایاندەکرد. کەڵەشێرەکان ڕازی نەدەبوون بە ئاسانی دەستگیر بکرێن و سوور بوون لەسەر ڕاکردن و چەند بیانتوانیبایە هەڵدەفڕین و بۆ داوای فریاکەوتن قرتە قرتیان پێکەوتبوو. جا ئەم دیمەنە پێکەنیناوییە مایەی خەفەتە بهێنە پێش چاوت.

هەڤاڵە زیندانیەکانی دەرەوەمان سەرجەمی ئەو مریشکانەیان سەربڕی کە توانییان دەستگیریان بکەن. دەبوو بخورێن تا خراپ نەبن. ئێوارەی ئەو ڕۆژە ئێمەی دەستەی زیندانییە گلدراوەکانی دەرەوەی بینای بەندیخانە تێکڕایەکی یەك مریشکیسوورەوە کراومان وەرگرت. خواردنێکی بەتام بوو.

کە ئەم چالاکیەی " ئەنفال " لە نێو بەندیخانەدا کرا، (شلومۆکرادی)ی زیندانیی جوولەکەی شێت لەوێ نەبوو، لە شێتخانە بوو. کە گەڕایەوەو بینی وەزعەکە سەر

لەبەر گۆڕاوە، چونکە زیندانیەکان بڕبڕو گەلێکیان کەلەپچە کرابوونو بەشیشی پەنجەرەکانەوە بەسترا بوونو شتێکی ئەوتۆ لە دیمەنی جارانی بەر لە ڕۆیشتنی نەکەوتنەوە بەرچاویو نەمابوون: واتە دیمەنی یاریی تۆپی پێو بالەو پیاسەی ئاساییی زیندانیان لە گۆڕەپانەکەداو مەشقەکانی (حسین روضة)بە تفەنگو کۆلارەکەیەوە تد، هەلێدایێو گوتی:

- نازانم بەڕێوەبەر شێت بووە یا جەماعەت؟

کە بەڕێوەبەری بەندیخانە هێرشی کردە سەرمان، ئەندامانی (حشع )ی لە ئەندامانی ئالای ڕەنجدەرانو هەتا لەو زیندانیانەیش جویێ نەکردەوە کە هیچ پێوەندییەکیان بە کۆمۆنیزم یا سیاسەتەوە نەبوو.. هەموان تالان کرانو یەکجار بەرەقی مامەڵەیان لەگەڵدا کرا. لە ژوورەکانی گلدانەوەو ئەشکەنجەدا بە ئەندامانی ئالای ڕەنجدەران گەیشتین. ئەم کاتە لە دەرەوەی بەندیخانەکاندا گفتوگۆ بۆ یەکێتیی ڕێکخستن بەردەوام بوو و ، ئەم مەسەلەیەیش لەمپەری دەروونیی شکاندو یارمەتیی زەمینە خۆشکردنێکی باشتریدا بۆ یەکگرتنی ڕاستەقینە لە بەندیخانەدا. ئەو ڕۆژانەی هێرش کرایە سەرمان، بۆ یەکەم جار لەگەڵ عەزیز محەمەدو چەند هاوڕێیەکیدا دانیشتم بۆ ئەوەی یەکتر بناسینو باسو خواسو نوکتە بگۆڕینەوە. زۆربەیان بە باشی لە دڵمدا جێیان بۆ خۆیان کردەوەو، وام لێ هات وەك هەڤاڵی خۆم یا وەك دەستە شیوعییەك تێم دەڕوانین کە هەلومەرج بەو هەڵوێستەی گەیاندبوون.

هێرشکردنە سەر زیندانیەکان سەری نەگرتو نەیتوانی ئامانجی ناچار کردنیان یا ناچارکردنی هێندێکیان بۆ چۆکدادانو پاکانە کردن بۆ دەسەڵاتداران بهێنێتە دی. ئیتر وەزعمان لە رووی چەردەیەك ئارامیو ئەنجامدانی چالاکیی رۆشنبیریو وەرزشیی رۆژانەوە وەك جاران نەمایەوە. بەڵام گفتیان داینێ لە (نوگرە سەلمان)ەوە بۆ بەندیخانەیەکی دیکەمان بگوێزنەوە. دوای چەند رۆژێك بە ڕاستی گوێزراینەوە. بردیانین بۆ بەندیخانەی بەعقووبە کە بەشێکی ٣٢ ژووریی لەسەر تەرزی نوێ تێدا

بینا کرا بووو رووبەری هەر ژوورێکی نۆمە تری چوار گۆشە بووو ئاودەستخانەیەك‌و دەستشۆرێك‌و پەنجەرەیەکی هاکەزاییی بەسەر ڕاڕەوێکی نێوان هەردوو بەشی بیناکەدا کراوەی تێدا بوون. ئەم بەشە ئەگەر قەرەوێڵەو پێداویستی ئاساییی ژیانی لە کتێب‌و ڕۆژنامەو رادیۆو کەرەستەی خۆ خافڵاندنی پەتیی بۆ دابین بکرابایەو دەرگای ژوورەکان شەوو ڕۆژ لەسەر پشت بوونایەو زیندانیەکانیش لە جموجوڵی نێو بەندیخانەو سەر لە یەکتر دان‌و پێشوازیکردنی کەس‌و کاریاندالە چاوپێکەوتنی ئاساییدا ئازاد بوونایە. بەواتایەکی دیکە ئەگەر عێراق ئەندازەیەکی باش دیموکراسی‌و ژیارو لەبەر چاوگرتنی مافەکانی مرۆڤی تێدا بووایە، ئەوا بە بەندیخانەیەکی نوێ‌و ڕەحەت دادەنرا. بەڵام (علی زین العابدین)ی بەڕێوەبەری بەندیخانە کە کاتی خۆی، بەر لە گواستنەوەی خزمەتی بۆ ئێرە، ئەفسەری مولازمی بەرپرسی تەویلەی ئەسپ‌و ئێستران بوو ، ئەم ژوورانەی لە زیندانیە سیاسیەکان کردبوو بە دۆزەخێکی ڕاستەقینەو بە زیندانی تاکە کەسیی شەوو ڕۆژ دەرگا داخراوی بۆ ئەشکەنجە دانی جەستەیی‌و دەروونی تەرخانکراو.

کە گەیشتینە بەندیخانەکە، ئێمەی زۆربەی کادێرو بەرپرسانیان لە هۆڵێکی مامناوەندیی بەندیخانە کۆنەکەدا خڕ کردەوە. چەند ڕۆژێك تا ڕادەیەك بە ئارامی ژیاین، چونکە لێدان‌و ئەشکەنجەدانی جەستەمان نەبوو. ئەگەر چی بێبەشکردنمان لە بینینی ڕۆژنامەو کتێب‌و رادیۆو یاریی شەترەنج‌و هەموو شێوە خۆ خافڵاندنێکی بێ غەل‌و غەش درێژەی کێشاو هەر لە جل‌و بەرگی پەڕپووتی بەندیخانەدا بە زنجیری ئاسن بەسترابووینەوە..تد. مشتومڕمان لەسەر وەزعی خۆمان کردو هێندێك داواکاریمان گەڵاڵە کرد کە تەنانەت بۆ ژیانی زیندانیی ئاساییش پێویستن‌و بەشێکی پچووکی ئەو شتانەیش پێکدەهێنن کە دەچنە نێو چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ. ڕێك کەوتین ـ وەك لە بەندیخانەکانی دیکەیشدا کرا بوو بە پیشە ـ تێبکۆشین بەرە بەرە (عومەری مامە شێخە) وەك نوێنەری خۆمان بەسەر ئیدارەی بەندیخانەدا

بسەپێنین. ئەوە بوو عومەر چوو بۆ چاوپێکەوتنی بەڕێوەبەرو بە هێمنیە ناسراوەکەی خۆی ئەم داواکاریە بچووکانەی خستە بەردەمی‌و گوێی لێگرت‌و هیچ ئەنجامێکمان چنگ نەکەوت.

چەند رۆژێك لەوە بە دوا کت‌و پڕ (علی زین العابدین) بانگی کردم‌و وەردیانێك بۆ ژوورەکەیی بردم. بە لووتبەرزییەکی سەیرەوە لە پشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو. داوای لێکردم بەرانبەری رابوەستم لە ترسی ئەوە نەوەکا لە خۆمەوە دابنیشم. ماوەیەکی کەم چاوی بڕیە دەم‌و چاوم ، وەك بڵێی شتێك دەخوێنێتەوە. پاشان گوتی:

- داواکاریەکانتان چین؟

- خۆت دەیانزانی، چونکە چەند رۆژێك لەمەو پێش (عومەری مامە شێخە) خستنیە بەردەمت. من هیچی وام نییە بیخەمە سەریان.

- دەمەوێ لە شەخسی تۆوە بیانبیستم.

- سید! دەتوانم هەر ئەوە دووپات بکەمەوە کە (عومەری مامە شێخە ) گوتوویە.

بەڕێوەبەر لە جێی خۆی هەستاو خۆیی تووڕە کردو ورگی دەلەریەوە. دوو هەنگاو لێم هاتە پێشەوەو گوتی:

- سەرت دای لەبەرد ، من جەنابی بەڕێوەبەری بەندیخانەی بەعقووبەم نەك (سید)ی بەڕێوەبەر.

- باشە ! تۆ جەنابی بەڕێوەبەری بەندیخانەی. بەڵام وشەی (سید) نە خراپەکاریی تێدایەو نە لەگەڵ ئەوەدا ناکۆکە.

- ناهێڵم قوش لەبەردەمدا بێ ئەدەب بێ.. تێ گەیشتی؟

لەگەڵ ئەم قسەیەی دواییاندا، چاوی لە (أبو کمال) ی (رئیس عرفاء)ی بەندیخانە داگرت کە جووتێك سمێڵی بابڕی سپیی هەبوو و جلێکی خاوێن‌و ڕێکوپێکی لەبەردا بوو، وەك جەنەڕاڵێکی سوپا بوو بێ لە ئیمپڕاتۆریی تورکیدا. (أبو کمال) باش لە فەرمانی بەڕێوەبەر حاڵی بوو بوو، لەگەڵ وەردیانێکدا کەلەسەر

پێ لە پشتیەوە ڕاوەستا بوو، فەرمانەکەی جێبەجێ کرد. هەردوو دڕندەکە بۆ چەند دەقەیەك لە نێو نووسینگەی بەڕێوەبەری جەللاد خۆیدا کەوتنە داپلۆسینم. ئەمجا برامە جێیەك لەسەر زنجیرە ئاساییە دوو کیلۆ گرامیەکەی پێمەوە شیشیان لە قاچم بەستو کەلەپچەیان خستە هەردوو دەستمو بۆ ژوورێکی بەندیخانەی تاکە کەسی گوێزرامەوەو لەوێ لەسەر زەمینە کۆنکرێتیەکەی بەجێیان هێشتمو دەرگایان لێ کلۆم کردم. دوای نێزیکەی بیست دەقەیەك دەرگاکە کرایەوەو (أبو غانم )ی عەریفی وەردیانی یەکجار دڕی مووسڵی خۆیی بەژووردا کرد. بەبێ ئەوەی بزانم بۆچی پرسیارم لێ دەکات، لێی پرسیم:

- کوڕم بۆچی لێیان دایو بۆچی هێنایانی بۆ ئێرە؟ لەوێ چیت کرد؟
- هیچم نەکردو نازانم بۆچی هێنامیانو بۆچی دەسدرێژییان کردە سەرم.
- کەواتە لێرە بمێنەوەو هەرگیز نەجوولێی.
- باش (زین ).

هەر کە گوتم " زین " کابرای عەریف دڕندانەو بەهەمان ڕێگەی لێدانەکەی ژووری بەڕێوەبەر تێم بەربوو. لێی دەدامو دەیگوت:"سەگی سەگباب مەڵێ - زین -ڕ بڵێ - ملیح - (واتە: باش )". لەوێ لە ژووری بەڕێوەبەر لێیان دام چونکە لەبریی سەعادەتی بەڕێوەبەر گوتم (سید)ی بەڕێوەبەر. لێرەیش لێیان دام چونکە لەبریی (ملیح) گوتم (زین)، مەسەلەکە ڕۆشنە. بەڕێوەبەر بڕیاری لێدانو ئەشکەنجەی جەستەییی دا. عەریفە مووسڵیەکەیش نێردرابوو تا سەر لەنوێ لەمنی کەلەپچەو پێوەن کراوی ژووری بەندیخانەی تاکە کەسی بدات. گرنگ نییە هۆیەکی ماقووڵ لە ئارادا بێ، چونکە بەهانە دروست دەکرێتو تاوانیش بەجێ دەهێنرێت. لای ئەوانیش ئەمە گرنگە.

بەدەستو پێ بەستراوی لەم ژوورە تاکە کەسیەدا بەتەنیا مامەوە، چوار مانگی ڕەبەق شەوو ڕۆژ دەرگام لەسەر کلۆم بوو. ئەوێ هەموو شتێکی قەدەغە بوو. هەتا

سەعاتەکەی دەستیشمم بۆ نێزیکەی مانگێك لێ براو دەستم لێ شت، بەلاّم ڕۆژێکیان بۆم هێنرایەوەو گەلێك پێی دلّخۆش بووم. دەستە سرِێکم هەبوو قوماشەکەی خالدار بوو. زۆر جار چەند بارە خالّە پچووکەکانیم دەژمارد، هەر لەبەر ئەوەی کە هیچ نەبوو خۆمی پێوە سەرقالّ بکەم. بەدرێژاییی حەفتەکانی دوایی تەنیا یەك جار دەرگام لێ کرایەوە. زەلاّمیك خۆیی بە ژووردا کرد، چاوەڕوانم نەدەکرد ئەو بێ. (جمیل عبدالمجید)ی سەرۆکی دادگای عەسکەری بوو کە لە ١٩٥٣ دا حوکمی زیندانکردنمی دا. ئەم زەلامە وەك چۆن من دەیناسم، ئەویش باش دەمناسێ. ڕقی لێمەو دەمبوغزێنێ بەناوی حکوومەتی خاوەن شکۆوە داگایی دەکردمو، ئەمڕۆیش بەو پێیە کە بەڕێوەبەری گشتیی بەندیخانەکانە لێرە ئەشکەنجەم دەدات.

پێم وابێ بەڕێوەبەری گشتی ئەم بەیەکگەیشتنە چاوەڕوان نەکراوەی لە ژووری بەندیخانەی تاکە کەسیدا بەلاوە شتێکی کتو پڕ بوو. تاوێك تەماشای کردم بەبێ ئەوەی دەم هەڵبهێنێتەوە. هەربەدانیشتنانەوە دەستپێشخەریم کردقسە بکەم وگوتم:

- من نارەزایی بەرانبەر بەم مامەڵە نامرۆڤانەیە دەردەبڕمو بەناوی یاساو بەناوی مرۆڤایەتییەوە داواکارم مرۆدوستانە لەگەڵماندا بجوولێنەوەو ئەشکەنجەدانی درندانەمان لەسەر هەڵبگرن.

بەڕێوەبەری گشتی ڕووی دەمی کردە (علی زین العابدین )ولە وەلاّمدا گوتی:

- لێرە بە کەلەپچە کراوی بیهێڵنەوە، با هەر بمێنێتەوە.. ئەمە گۆڕی بێ. شایانی ئەوەیە لێرە بمرێ، چونکە دەیەوێ ڕژێمی خاوەن شکۆی مەزن ژێرو ژوور بکات.. کۆماری دەوێ .

بەڕێوەبەری گشتی دوای ئەم قسانە چووە دەرێو دیسان دەرگام لێ داخرایەوە. چوار مانگی تەواو لە ژووری بەندیخانەی تاکە کەسیدا مامەوە، ئەوە کاری کردە سەر باری تەندروستیم، بەتایبەت بەهۆی کەلەپچەو پێوەنی دەستو پێمەوە. پاش ئەوە دەرووی ڕەحمەتمان لێ کرایەوە، چونکە کۆتو کەلەپچەیان لەسەر لابردمو، منو

(زکی خیری )و(آرا خچدور ) و(مهدی حمید)یان لەیەك ژووری هەمان تەرزدا کۆکردەوە. ئەوە گۆڕانکارییەکی گرنگ بوو لە ژیانی ڕۆژانەمدا، لەبەر ئەوەی لە جیهانی بێدەنگیی هەمیشەیی هاتمە دەریّو کەوتمە نێو خەڵکانێك دەیانناسمو دەتوانم لەگەڵیاندا بدوێمو پێکەنینو نوکتەو قسە گۆڕکێیان لەتەکدا بکەم. شتێکیان لە بنیادەمیم بۆ گێڕامەوە کە تەنیایی لەو چوار مانگەی ڕابردوودا پێی لەدەست دابووم. ئیتر کات خێراترو ڕۆژگاریش کورتتر بوون. وای لیّ هات زیندانە نۆمەتری چوارگۆشەییەکە بوو بە هۆڵێك بۆ مشتومڕی سیاسیو تیۆریو بۆ خستنە ڕووی ڕووداوی مێژوویی یا بەسەر هاتی بەندیخانەو زۆر وەختیش بۆ پێکەنینو نوکتە. دەوری ساڵێك پێکەوە لەم زیندانەدا ماینەوە، هەر شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ لەویّ ڕزگاری کردین. ئیدارەی بەندیخانە هێندێك ڕۆژی تاكو تەرا دەیهێشت بۆ ماوەی تەنیا ٤٥ دەقە بێینە دەریّ بۆ بەر خۆرو لە گۆڕەپانێکی بچووکی نێوان دوو بەشی بیناکاندا خۆ هەڵبخەین. (أبو اسماعیل)ی سەر عەریفانی وەردیان کە کابرایەکی لەسەرخۆ و سوور بوو لەسەر خۆلادان لە هەر سووکایەتی یا خراپە کردنێك دەرهەق بەئێمە بەسەرمانەوە رادەوەستا. ڕۆژێکیان (أبو اسماعیل) دەردە دڵی حاڵی خۆیی لە لا کردین. گوتی: ئەوان لە مێژە بەڵێنمان دەدەنیّ مافی خانەنشینکردنمان بدەنیّو جاریّ دەستمان لیّ گیر نەبوە. (مەهدی حمید)یش وەڵامی دایەوە:

- (أبو اسماعیل) دڵنیابە ئەوان مافیخانەنشینیتان نادەنیّ.

کابرا لەوە قەڵس بوو. ئاماژەم بۆ مەهدی کرد کە پێویست بەم چەشنە بێزار کردنە ناکات. بۆیە دەستبەجیّ گوتی:

- (أبو اسماعیل) دڵنیا بە مافی خانەنشین کردنتان دەدەنیّ.

ئەم وەڵامەیشم بە دڵ نەبوو. پرسیم ئایا مەهدی سەرۆکی دەوڵەتە تا جەخت بکات مووچەی خانەنشینی بەوەردیانەکان دەدرێت. ئەویش بە پەلە گوتی:

- (أبو اسماعيل) يا دەتاندەنێ یان ناتاندەنێ.

کابرای وەردیان پێکەنی‌و ئێمە بە درێژاییی مانگەکانی دوایی لەگەڵیدا پێکەنین.

رۆژێکیان (زکی خیری) چیرۆکی (خەڵەفی کوڕی ئەمین)ی بۆ گێڕامەوە کە کابرایەکی بەغداییی سادە بووەو حەزی کردووە لە هیچە خۆ دەربخات‌و کاری نائاساییی وەك شەڕو شۆڕو دزی‌و هیی لەم جۆرەی بدرێتە پاڵ بەبێ ئەوەی شتێکی کردبێ. لەوە بەدوا (مهدی حمید)مان بە (أبوأمین) بانگ دەکرد. ئەمجا ناوەکەمان بۆ گاڵتە بەسەر هەموماندا بڕی. هەڵبژاردنیشمان کرد بۆ دیاریکردنی خەڵەفی ژمارە یەك ، مەهدی‌و زەکی بە پلەی یەکەم دەرچوون.

ژوورەکانی بەندیخانەی تاکە کەسی دەورو پشتمان پڕ بوون لە زیندانی‌و، هەر زیندانێك تێکرا چوار کەسی تێدا بوو. یەك ژوور نەبێ کە چوار لاوی بەسرەییی تێدا بوو و لەوانە (شاکر محمود)و (هشام البعاج) ، گشت ژوورەکان شانۆی ململانێ‌و گیروگرفتی رۆژانەی نێوان دانیشتوەکانیان بوون. گەلێك لە هەڤاڵان لەسەر هیچ‌و پووچترین هۆو ، جاروباریش بە بێ هۆ، لەگەڵ یەکتردا دەکەوتنە قرەقرو گیروگرفتانەوە. شەکەتیی مێشك‌و نیگەرانیی بەردەوام لە مەترسیی دەستدرێژیکردن‌و بێبەشبوون لە نیعمەتی تێکەڵ بە خەڵك بوون‌و خۆشی وەرگرتن لە ئامرازی خۆ خافڵاندنی بێ غەل‌و غەش‌و بگرە بەشبڕاوبوون لە خۆرو لە هەوای پاك.. هەموو ئەمانە لاوی زیندانیی دەمارگرش دەکردو لەوانە بوو بۆ هۆیەکی پووچ هەڵبچێ. ئیتر ئەرکێکی سەرەکیمان چاککردنی بارودۆخی نێوانیان بوو بە هاوبەشیکردن لە چارەسەر یا هێور کردنەوەی ئەو گیروگرفتانەی کە لە ژوورەکانی دیکە پەیدا دەبوون. زەحمەت نەبوو ئەم گیروگرفتانە بزانین. وای لێ هات بتوانین بەنامەکاری یان راستەوخۆ باسکردنی بەدەم لە نۆرە پاسەوانیی نێوان دوو وەردیاندا کە لە جێی دوو هەڤاڵی راستەقینەی شایەنی پشت پێ بەستن بوون بۆ ئێمە بیانزانین.

ئالۆزترین گیروگرفت کە بەدرێژاییی چەند حەفتە یا چەند مـانگێك زیـاد لەهـەر گیروگرفتێکی دیکە جەنجالّی کردین، گیروگرفتی (عزیز الحاج )ی زیندانیی شیوعی بوو کە لەگەلّ (عدنان البراك)دا دانیشتووی ژوورێکی بەندیخانەی تاکە کەسـی بـوو. گیروگرفتەکە لەوەدا بوو کە عزیز ئەوپەڕی بـێ هـێز بـوو بـوو و توشـی ورە رووخـان بوو، بە رادەیەك پێی نەدەکرا هیچ شتێك بشارێتەوە. لەوانە بوو لە هەر ساتێکدا بـێ پاکانە بکات. ئێمـەیش لـەوە دەترسـاین‌و تێدەکۆشـاین ئـەوە روو ئـەدات‌و ئـەوەمـان لەبەرچاوگرتبوو کە عەزیز کـادێرێکی حـیزبیی ناسـراوە. چـەندین سـەعاتی درێـژی رۆژو شەو دەگریا. ڕاڕاو دوو دلّ بوولە نێوان خۆڕاگرتن‌و بە زیندانی مانەوە یا پاکانە کردندا بەرانبەر بە بەردانی. خۆی نامەیەکی بۆ ناردین، هەموو کادێرانی بەندیخانـەو لەوانـە عـەزیز محـمـەدو عومـەری مامـە شـێخە، سـەرباری ئێمـە هـەر چوارمـان، خوێندمانەوە. نامەکەی وای دەگەیاند کە گوایە ئەو پێی ناکرێت خۆ راگری بکـات‌و لـە بەندیخانەدابمێنێتـەوە، دەتوانـێ ئـەدیبێکی دیموکراتـی بـێ نـەك شـیوعییەك. (عدنـان البـراك) بـە دوورو درێـژی لـەوەزعی روو لـە خۆڕایـی ئـەو ئاگـاداری دەکردینەوەو چالاکانە بەشداریی هاندانیی دەکرد بۆ خۆڕاگرتن. دوا جار توانرا هـەم بەسەر قەیرانی دەروونیی (عزیـز الحـاج) دا زالّ ببـین‌و، هـەم یارمـەتیی بدەیـن ئـەو قۆناخە دژوارە تێبپەڕێنێ. بەلاّم ـ بەبۆچوونی من ـ ئێمە بە هەلّـەدا چوویـن، چونکـە هەلّمانپێچا بارێکی لەوزەی خـۆی زیـاتر هـەلّبگرێ. باشـترو راسـتتر وابـوو وازی لێ بهێنرێت بە پاکانە کردن لە بەندیخانە بچێتـە دەرێ‌و ببـێ بـە ئـەدیبێکی دیموکراتـی وەك خۆی حەزی پێدەکرد.

زیندانیەکانی بەندیخانەی تاکە کەسی (حسن عوينە النجفي)یان لە نێـودا بـوو. سێ لاوی دیکە لە ژوورەکەیدا بوون، لەوانە لاو (سعید موسی)کە لاوێکـی دلّپـاك‌و دەبەنگێکی گێژو وێژ بوو. ژەمێکیان مەعکەرۆنی بەسەر زیندانیەکاندا بەشرایەوە، حەسەن توانیی چاو بەست لـە سـەعیدی بـرادەری بکـات کـە پێشـتر ئـەم خواردنـەی

نەخوارد بوو، بەوە کە ئەوە ریخۆڵەی وشککراوی مریشکە دەیخوات. ڕۆژی دوایی سەعیدلە دەرەوەی ژوورەکە بە برادەرێکی گەیشت و لێی پرسی نیوەڕۆی دوێنێ چیی خواردووە. زیندانیەکە وەڵامی دابووەوە:

- پێم وابێ ئێمە مەعکەرۆنیمان خوارد.

- مەعکەرۆنی چییە؟

- مەعکەرۆنی مەعکەرۆنییە.

- حەقتە نەزانی دوێنێ چیت خواردووە، چونکە ئەوە خواردنی گەورە پیاوانەو گیای دەمی کەسێکی وەك تۆ نییە.

- ئەم خواردنە چییە؟ ئێوە چیتان خوارد؟

- گشتمان ریخۆڵەی وشککراوی مریشکمان خوارد.

بەم جۆرە سەعید ئەو تەڕنەی کە (حسن عوینە) پێی کرد، ئەم بە یەکێکی دیکەی کردەوە.

* * *

(عەبدوڵڵا گۆران)ی شاعیر دانیشتووی ژوورێکی بەندیخانەی تاکە کەسی بوو. ڕۆژێکیان ئاگادار کرامەوە کە لیژنەی حیزبیی بەندیخانە سزای ڕاگرتنی ئەندامەتیی ئەوی لە حیزبدا داوە. ئەو کاتە ئەندامی لیژنەی حیزبی نەبووم و پێم نەدەکرا شتێك بکەم. بەڵام کێشەکەم لەبیر نەچووە. دوابەدوای لەبەندیخانە دەرچوونم لە تەمووزی ١٩٥٨دا یەکەم ڕۆژی چاوکەوتنم بە (سلام عادل) مەسەلەکەی (گۆران)م لەلا باس کردو ناڕازیبوونی خۆم و ناڕاستیی ئەو کارەم دەرهەق بەو پێشان دا. ئەوە بوو سلام عادل گوتی:

- کەواتە پێی بڵێ حیزب بەبڕیاری سزادانی قایل نەبووە و بڕیار دراوە هەڵبوەشێتەوە، گۆران وەك جاری جاران ئەندامی حیزبە.

ڕۆژی دوایی کە چاوم پێی کەوت ئەوەم پێگوت و هەڵوێستی خودی سکرتێرم بۆ ڕوونکردەوە، بەوە یەکجار دڵخۆش بوو.

* * *

لە بەندیخانەی بەعقووبە هەر یەك سەردانی ماڵەوەمانم پێ بڕا. دایکم و چەند خوشك و برایەکم، دوای ئەوەی بە زەحمەتێکی زۆر ڕەزامەندیی ڕەسمیی سەردانیان وەرگرت، پێکەوە لە سلێمانییەوە هاتنە لام. بەڕێوەبەر خۆی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتیی چاوپێکەوتنەکەی کرد و چەند پیاوێکیی ڕاسپارد لەگەڵماندا دابنیشن و گوێ لە قسەکانمان بگرن. چاوپێکەوتنەکە بەلای منەوە شتێکی لە ناکاوی چاوەڕوان نەکراو بوو. تا پێیان نەگوتم چەند برایەکمم نەناسییەوە. کاتی خۆی کە من بەجێم هێشتن، ئەوان ساوا و چکۆلە بوون. کەچی کە لە بەندیخانە دیمن، لاوی سمێڵ زل بوون.

بەڕێوەبەر نەیهێشت منداڵێکی بچووکی خوشکەزام بێتە نێو بەندیخانە تا خاڵی ببینێ. هەر بەوەندە دانەکەوت، ئەو کامێرا سادەیەیشی لێ سەند کە پێی بوو بە بیانووی ئەوەی گوایە هەوڵی داوە چەند وێنەیەکی بەندیخانە یا زیندانییەکان بگرێ. چاوپێکەوتنەکە لە بیست دەقە زیاتری نەبرد. بەڕێوەبەر دواییی پێ هێنا، ئەوانی گێڕایەوە و منیشی ناردەوە بۆ بەندیخانەی تاکە کەسی.

کاتێك باسی بەندیخانەی بەعقووبە دەکەم. ناتوانم باسی (کاظم والسید)ی جووتە هاوڕێ یا هەڤاڵی وەردیان نەکەم کە هەردوکیان کوڕە جووتیاری هەژاری دێهات بوون، یەکەمیان هیی دێهاتی (العمارة) و دووەمیان هیی (دیالی) بوو. لە بەندیخانە لەکاتی پاسەوانی کردنیاندا ناسیمانن. دوو پیاوی لە بنەڕەتدا چاك بوون. بەهۆی هۆشیار کردنەوەیان و پێوەندی بەستنیانەوە پێمان زیاتر چاك بوون. دەرەبەگ بوغزاندنی هەردوکیان و بەتایبەت کاظم، زەمینەیەکی لەباری بۆ لێکحاڵی بوونیان لەگەڵماندا و نێزیکبوونەوەیان لێمان خۆش کرد.

لە کاتی پاسەوانی کردنیاندا لە ژوورەکانی بەندیخانەی تاکە کەسیدا قسەمان لەتەك یەکتردا دەکرد، لە پشت دەرگا ئاسنینەکانەوە ڕادەوەستاین دەممان لە کونی دەرگا نێزیك دەکردەوە و خۆمان لە دەنگ هەڵبڕین و ژاوە ژاو لادەدا و پشتمان بەوریاییی هاوڕێ پاسەوانەکەمان دەبەست کە لەوەختی دەرکەوتنی مەترسیدا

ئیشارەتێکی زانراوی بۆ دەکردین. (السید)ی وەردیان بەرێکوپێکی نامەو چاپکراوی حیزبیی لە دەرەوەی بەندیخانە بۆ دەهێناین. لە یەکێك لەو نامانەدا شارەزاییەکی زیاترم لەسەر ڕەفتاری منداڵانەی حەمید عوسمان، دوا بەدوای لابرانی لەپلەی سکرتێری، پەیدا کرد. لە نامەیەکی دیکەدا، کەپێم وابێ دوادواییەکانی ۱۹٥۷ بۆمان نێردرا، سەرکردایەتی بۆی نووسیوین‌و دەڵێت: بە ئومێدین زۆر لە بەندیخانەدا نەمێننەوەو بەم نزیکانە ئازادیتان بەدەست بێننەوە. ئەمە ئاماژە بوو بۆ ئەوە کە (حشع) ڕووی کردووەتە سازدانی کودەتایەکی عسکەری یان شۆڕشێك کە سوپای تێدا بەکاربهێنرێت بۆ خستنی ڕژێمی پاشایەتی‌و بەڕەڵاکردنی زیندانیەکان..تد.

ڕۆژێکیان زانیمان (فرحان طعمة)ی کادێری حیزبی هێنراوەتە ژوورێکی بەندیخانەی تاکە کەسیی لای ئێمەو ڕووخاوەو هەموو شتێکی درکاندووە، بە پێویست‌و شتێکی گرنگمان بینی ئەم هەواڵە بە پەلە بەسەرکردایەتیی حیزب لە بەغدا بگەیەنین، تا بەرانبەر هەر بەڵایەکی ژێر سەری ئەم شیوعیە ڕووخاوە قایمکاریی خۆی بکات، بەڵام چۆن دەکرا هەواڵەکە بەخێرایی بگەیەنین؟ تەکبیرمان کرد بانگی (کاظم)ی هاوڕێی وەردیانمان بکەین، ئەگەر چی لە نۆرە پاسەوانیی خۆیدا نەبوو. پێمگوت:

- (أبو جواد) نامەیەکی زۆر پەلەمان هەیە دەمانەوێ بەبێ دواکەوتن بیگەیەنین بە بەغدا. پێم وایە تۆ دەتوانی ئەم کارە هەڵبسووڕێنی‌و بەخێرایی بیگەیەنی.

- گیروگرفتەکە لەوەدایە پاش دوو سەعات ونیوی دیکە ئەنجا نۆرە پاسەوانیم دێت‌و، پاسەوانیەکە خۆیشی دوو سەعاتی پێ دەچێ. دوای ئەوە پێم دەکرێت نامەکە بیەمە هەرکوێیەك بتانەوێ.

- (أبو جواد) کێشەکە پەلەیە، هەوڵ بدە لەگەڵ یەکێکیاندا ڕێك بکەوی لەبریی تۆ پاسەوانی بکات تا خێرا بڕۆی.

نیو سەعات لەوە بەدوا (کاظم)ی وەردیان نامەیەکی بچووکی لەگیرفاندا بوو لەپاسێکی ڕوو بە بەغدادا جێیەکی بۆ خۆی گرتبوو. پاش نێزیکەی دوو سەعاتێك گەڕایەوە بۆ لامان تا پێمان بڵێت نامەکەی گەیاندووەتە ناونیشانە دیاریکراوەکەی بەغدا.

زیاتر لەسێ مانگ دوای لە بەندیخانە دەرچوونمان، ئەو کاتە لە بارەگا نیوچە ئاشکراکەمان بووم، یەکێك ئاگاداری کردمەوە کە پۆلیسێکی (کاظم) ناو هاتووە دەیەوێ چاوی پێم بکەوێ. گوتم با بفەرمووێ. هاتو بەگەرمی باوەشمان بەیەکتردا کرد. (کاظم)ی هاوڕێی وەردیانمان بوو. ئامادەیی خۆمم پێشان دا بۆ هەر یارمەتییەکی سنووری دەسەڵاتی حیزبیم یا هیی خۆم. سوپاسی کردمو بەقبووڵ نەکردنو نەفس بەرزییەوە گوتی:

- سوپاس ! هەر وەك هاوڕێیەك هاتم دیدەنیتان بکەم.

سەردانی (سامی فتاح)ی وەزیری ناوخۆ لەو دیمەنانەی بەندیخانەی بەعقووبە بوون کە ناکرێت لەیاد بکرێن، نەکەس لەم سەردانە ئاگاداری کردینەوەو نە چاوەڕوانمان دەکرد. هەر ئەوەندەمان زانی بەڕێوەبەری بەندیخانە شپرزە بوو بوو و بەدەست وبردی بەنێو بەندیخانەدا گەڕا وخێرایش چووە دەرێ. دوای ئەوە، یەکێك هاتو چەند کەسێکی لە ئێمەی زیندانیانی بەرپرسی هێنایە دەر بۆ ئەو ڕاڕەوەی کە دەوری بیناکەی دابوو و، لە شوێنێکدا ڕایانگرتین بەبێ ئەوەی هۆیەکەی بزانین. ئەم کارە سەر سامی کردبووینو، دەمانڕوانییە دەم وچاوی هەم یەکتریو هەم وەردیانە ڕاوەستاوەکەی تەنیشتمان. پاش کەمێك بردیانین بەنێو ڕاڕەوی دەوری بیناکەدا دەوراندەور گێڕایانین. ئەمجا براینە نێو هۆڵێکی بیناکەو لەوێوە بۆ شوێنێکی دیکە. دەرکەوت ئەو عەریفە وەردیانەی کە جێبەجێکردنی ئەم گەمەیەی پێ سپێردرا بوو باش فێری نەبوو بوو. دواجار پێوە بوو. خۆمانمان لەبەردەم وەزیری دیدەنیکەردا بینییەوە کەبەڕێوەبەر ویستی ئێمەی لێ بشارێتەوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا سکاڵای

حاڵی خۆمانی بۆ بکەین. کەبەڕێوەبەر کت وپڕ ئەمەی بەسەردا هات شڵەژا، بەڵام هیچی پێ نەدەکرا. وەزیر لەلامان ڕاوەستاو، ئێمەیش ناڕەزایی‌و سکاڵای ئاسایی خۆمانمان پێشکەش کرد، بەڵام زۆر گوێی پێ نەدان. دەیزانی ئێمە لە چ وەزعێکداین. پیاوێکی پشت پێ بەستراوی باڵوێزخانەی بەریتانیا بوو. هاتە لامان‌و تەماشای کردین، بەبێ ئەوەی هیچ کارێك بکاتە سەر بەندیخانە چووە دەرێ، وەك بڵێی هیچ نەبوو بێ. ئیتر ئەفسەرە دڕندە و- بەقسەی هێندێك کەس - دوو دەکیەکەی ئێستران هەروەکوو جاران زیندانیانی ئازار دەداو گاڵەی پێ دەکردن. شۆڕشی ١٤ی تەمووز نەبێ هیچ شتێك لە سنووری خۆیدا ڕاینەگرت.

## - ٩ -

# شۆڕشی ١٤ ی تەممووزی ١٩٥٨

ئێمە لەزیندانەکەی نێو بەندیخانەی تاکە کەسیدا هەر لەبەیانی زووەوە هەستمان بەوە کرد شتێکی نا ئاسایی لە گۆڕێدایە، لەبەر ئەوەی جموجوولێکی نا ئاسایی کەوتە ڕاڕەوەکانی بەندیخانەو بەڕێوەبەر گەڕاو وەزعی بەندیخانەی بەسەر کردەوە. پەشۆکاو دەردەکەوت. ئەم گەڕانەی لە گەڕانی جارانی نەدەچوو. لەڕابردوودا ڕووی نەدەدا ئەو لەم کاتانەدا بگەڕێ، بەڵکوو دەورووبەری نیوەی شەو یا کەمێك لەوە بەدوا پاش هاتنە دەرەوەی لە یانەیەکی خواردنەوەو قومارکردن ئەمجا دەگەڕاو دەرگاکانی دەکردەوە. بەشاتە شات و جنێوو لێدانەوە خۆیی بەهۆدە تاکە کەسیەکاندا دەکرد، بەڵام گەڕانی ئەمڕۆی هیچ پۆزلێدان و دەستدرێژییەکی لەگەڵدا نەبوو. دەبێ نهێنیی ئەوە لەچیدا بێ؟

زیندانیەکانیش جوولە جوولیان تێکەوت. هێندێك لە گوێ سووکەکان لافی ئەوەیان لێدا کە گوێیان لە هەنگامەو هوڕاکێشانی دەرەوەی بەندیخانەیە لەشاری بەعقووبە خۆیدا. بەلای ئێمەوە مەتەڵێك لە ئارادا بوو. (السید)ی هاوڕێی وەردیانمان نەبێ کەس بۆی هەڵنەهێنایین. کابرا گەیشتە لامان و لە کونی دەرگای زیندانەکەمانەوە چرپاندی و گوتی :

- شۆڕش بەرپا بوو و مەلیك فڕی ! کۆمار دامەزرا !

کەواتە ئەوە شۆڕشە. شادییەکی بێ ئەندازە دڵ پڕاو پڕ دەکات و، مرۆڤ وشەیەکی وا نادۆزێتەوە بیرو ڕای خۆیی لەم بارەوە پێ دەربڕێ.. هەست و نستێکی لەباسکردن نەهاتوو هەن. ئەمە ئەو شۆڕشەیە کە گۆرانیمان پێدا هەڵگوت و خەباتمان بۆ کردو قوربانیمان بۆ دا.. لە پێناویدا چووینە نێو بەندیخانەو، لەبەردەم تیرۆرو ڕاونانا خۆمان ڕاگرت و، لەنێو دۆزەخەکەی (جبار أیوب و محمد سعید شهاب و علي زین

العابدین)دا ژیانمان دەبرد.. ئای کە مزگێنییەکی مەزنە. ئێستاکە زیندانیی سیاسی لەم ساتە مێژووییە پیرۆزانەدا هەست بە شتێکی وا دەکات کە رۆژێك لە رۆژان هەستی پێ نەکردووە. هەست بە گەشانەوەیەکی بێ وێنە دەکات. وا هەولۆ تەقەلای خۆیو ئەو هەڤاڵانەی بەدی هاتن کە مژدەی شۆڕشیان داو پێشبینیی حەتمەیەتی رووداننییان کردو بە جەرگانەو لەخۆبوردووانە لە پێناوی سەرکەوتنیدا تێکۆشان. پێدەچێ رۆژێکی بەر لەم رۆژە مەزنە بە هۆی بەندکرانو ئەشکەنجەوە هەستی بە ڕەتاندنو بێزاریو تۆقاندن کرد بێ. لەبەر ئەوەی لە پشت ئەم شیشە ئاسنینە نەفرەتیانەوە بەند کرا، ئیتر لە ژیانی ئاسایی بێبەش بوو. بەڵام ئێستا هەموو هەستێکی لەم چەشنە ڕەویونەوە. شادمانەو شانازی بەخۆوە دەکات. خۆڕاگریی کردو پێبەندی کێشەی گەلەکەی بوو بە ئومێدی ئەوەی کە ڕۆژێك سەربەرزو ڕێزلێ گیراو لە بەندیخانە دەربچێ.

هەواڵەکان وردەوردە بەدووی یەکتردا هاتنو زانیاری زۆر بوون تا تابلۆیەکی ڕووداوەکەی بەغدامان لە لا دروست بوو: سوپا شۆڕشێکی کردووەو سەرلەبەیانیی هەمان ڕۆژ کۆمارێك دامەزراوە. ئەی ڕژێمی پاشایەتیی بەکرێگیراو بۆ دۆزەخ بچیو با ڕەشترین چارە نووست هەبێ ! شانازیی ئەوەمان پێ دەبڕێ کە لە (١٩٥٢)ەوە داوای ڕووخاندنی تۆمان خستە بەردەم گەلو خەباتمان بۆ دامەزراندنی کۆمار کرد. سلاوت لێ بێ ئەی کۆمارە ساواکەی لە خواستی گەلو سەرکەوتنی ئاشکرایەوە سەر دەرهێناو.

هێندەی ئێمە دڵمان بە شۆڕش خۆش بوو، بەڕێوەبەری بەندیخانەو هاوچەشنەکانی لە نۆکەرە بستە بالاکانی ڕژێم ئەوەندە پێی خەمبار بوون، ئەوان لە یەکەمین سەعاتەکاندا لە ئێمە زیاتریان دەزانی، دەیانزانی پاشاو (عبدالالە)ی (الوصي) کوژراون. بەڵام بەهیوا بوون (نوري السعید) کە لە چنگی شۆڕشگێڕان دەرباز بوو بوو، بێتەوە سەر حوکمو هەموو شتێك وەك خۆیی لێ بێتەوە. بەڕێوەبەر بەیانی هات

شپرزەو تۆقاو بوو، بە ژوورەکانماندا گەڕا. بە شێوە زمانی یەکێك قسەی کرد کە بەڵایەکی بەسەردا داباریبێ‌و هەڕەشەی لێ بکات :

ـ زۆر دڵخۆش مەبن .. هێشتا مەسەلەکە کۆتایی پێ نەهاتووە. سبەی (نوري السعید) سەرکردەیی هێزێکی سەربازی دەکات‌و دەگەڕێتەوەو جارێکی دیکە دەسەڵات دەگرێتەوە دەست.

وەڵامان نەدایەوەو دەمان نەختە دەمی، چونکە بەوردی نەماندەزانی چی لە پێتەخت‌و سەرتاسەری وڵاتدا ڕووی داوەو ڕوودەدات. تەنیا داوای ئەوەمان لێ کرد دەرگای ژوورەکان بکاتەوەو ڕێی چاو بەیەك کەوتن‌و تێکەڵی یەکترمان پێ بدات، داواکەمانی بەبیانووی ئەوە ڕەتکردەوە کە ـ گوایە ـ بەندیخانە پێڕەوێکی خۆیی هەیە دەبێ ڕەچاو بکرێت.

وا سەرجەمی سەعاتەکانی ڕۆژگار ڕابوردن‌و، ئێمەیش لە ئەوپەڕی شادیداین‌و دەمانەوێ شتی زیاتر لەسەر ڕووداوەکان بزانین. شەو وەك دزێکی شارەزا بوو بێ، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەین داهات. باوەڕم پێ بکەن ئەو شەوە بۆ تاکە چرکەیەکیش نەخەوتم. من‌و زەکی‌و ئاراو مەهدی تا سەعات دووی پاش نیوەشەو بەردەوام مشتومڕمان لەسەرڕووداوەکان دەکردو شیمان دەکردنەوەو قسەمان تێدا دەکردن. ئەنجا بە بەهانەی خەوتنەوە ڕاکشاین. بەڵام ئەو شەوە خەوتن بەلای زۆربەمانەوە کارێکی مەحاڵ بوو. ئەم شۆڕشە سەرکەوتووە مێشکمانی حەساندەوەو جێی ئەو پشووەی بۆ گرتینەوە کە مرۆڤ پێویستیی پێیەتی‌و بەهۆی سڕ بوونی خانەکانی مێشکیەوە ـ واتە بە خەوتن ـ پەیدای دەکات، پێم وابێ ئەو شەوە حاڵی من وەك حاڵی هەر سێ هەڤاڵەکەی زیندانم‌و بەشی هەرە زۆری زیندانیە شیوعیەکان بوو.

لێتانی ناشارمەوە ئێمە لەوەیش نیگەران بووین کە (نوري السعید) بەزیندوویی ماوەتەوەو بەرەڵایەو لە چنگی شۆڕشگێڕاندا نییە. ئەو سەر گەورەی لە ناوەوەو لە

دەرەوە دان پێدانراوی کۆنە پەرستان بوو. بەڵام ڕۆژی دوایی کەبیستمان (نوري السعيد) بەدەستی جەماوەری خۆپیشاندەر لە شەقامەکانی پێتەختی ڕاپەڕیودا کوژراوە، بە تەواوی شادمان بووین.

شۆڕش بەرپا بوو و ڕژێمی پاشایەتی بەمزەبرێکی دەستو بردانە ڕووخاو،(عبدالاله)ی سەر هەڵۆێستی پاشایەتیو (نوري السعيد)ی سەرگەورەی کۆنەپەرستان بەبێ ئەوەی بنێژرێنو گۆڕیان هەبێ دوایی یان هات. هەردوکیان بەشەقامەکاندا ڕاکێشرانو پارچە پارچە کرانو ئەوەیان لێ نەمایەوە کەقابیلی ناشتن بێ. دیارە ئەمە شتێکی نا ئاساییو نامۆو پێچەوانەی دابونەریتی باوی درێژاییی چەندین سەدەی بەرودوا بوو. بەڵام هەر قەوما. ئەم مەسەلەیە لەلایەن گەلێك عێراقیو عەرەبو ئەورووپاییەوە لەسەری نووسراوەو، هەموان نارەزایییان بەرانبەر بە ڕاکێشان دەربڕیوەو بۆ ئەوانە گریاونو کۆتاو ڕۆتاکەییان بەسەر شیوعیەکانو جاروباریش بەسەر نامەردەکانو" ئاژاوە گێڕە دڕندەکان " دا داوە. بەڵام کەس بەچاوێکی دادپەروەرانەوە نەیڕوانیوەتە گەلو شیوعیەکان. وا ڕوانیویانەتە ئەم ڕووداوە وەك بلێی لەوڵاتێکدا قەوماوە کە ژیارو حوکمی یاسای تێدا سەر دەستەنو تێکڕای هاونیشتمانان پێملی یاسا دەبن. بیریان چووەوە کە ئەو ڕاکێشانو لاشە پارچە پارچەکردنە بڕیاری هیچ حیزبێکی سیاسی یا بەرپرسێکی حیزبی نەبوون، بەڵکوو خۆبەخۆ کران وەك بەرپەرچدانەوەیەکی میللیی ئەو کردەوانەی کە ئەم دوو کەسە بەدرێژاییی دەیانساڵ دەرهەق بەگەلو وڵاتەکەیان کردیان. ئەوە تەقینەوەی ڕقی هەزاران خەڵك بوو لەوڵاتێکی پاشکەوتووی لە مافی یاساییو ئازادیی دیموکراتی بێ بەشدا، وڵاتێك حوکمدارانی ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕێزی یاسایان نەگرتووە. ئەگەر ئەم دوو حوکم بەدەستە بەپێی یاسا حوکمیان بکردبایەو، ئەگەر دەوڵەتی یاسا لە گۆڕێدا بووایە، دەکرا نەهێلرێت تەقینەوەی جەماوەری بەم توندوتیژییە بکرێتو، دەشیا گلەییی زۆر لەوانە بکرێت کە ئەوانەیان ڕاکێشاو تیکە تیکەیان کردن. دیارە

ناوەندە حوکمدارەکانی خۆراوا لە ئاستی پێ لێ هەڵبڕینی حوکمی پاشایەتیدا بەرانبەر بە گەلی عێراق هەمیشە قڕو قەپیان کرد بووو، کە نۆکەرەکانیان دووچاری ڕاکیشان بوون ئەمجا بیریان کەوتەوە ڕاکێشان کارێکی دڕندانەیە. من هیچ ڕۆژێك لایەنگری ڕاکیشان نەبووم، بەڵام لەو ڕووداوانە حاڵی دەبم کە عیراق لەو ماوەیەدا بەخۆوەی دینو دەیانبەستەوە بە هەلو مەرجی واقیعیی بەردەست، هەلومەرجی پاشکەوتنی کۆمەڵایەتیی گشتی لەوڵاتێکدا کە ئەوانە جۆرەها شێوە زۆرداریو تیرۆریان تێدا دەرهەق بەگەل کردبوو. داوا لە کسانی دیکەیش دەکەم وا لێی حاڵی بن. ئیتر مرۆڤ چۆن چاوەڕوان ناکات ڕەشە خەڵکەکە تۆڵەی خۆیانو ڕۆڵەو کەسو کارەکانیان بستێننەوە؟ ئەگەر ئەمڕۆ حوکمدارێکی وەك صەددامی تکریتی، ئەو دیکتاتۆرەی کە ئەم هەموو تاوانانەی بەرانبەربە ڕۆڵەکانی عێراق کردووە، بەهۆی ڕاپەرینێکی میللی یا شتێکی لەم بابەتەوە ڕووخا، دەبێ لە ڕاکێشانو پارچە پارچە کردنی لاشەکەی بەدەر چاوەڕوانی چی بکەین؟

دوای سەرکەوتنی شۆڕش دوو حەفتەی تەواو لە بەندیخانە مامەوە. لەو ماوەیەدا گەلێك هەڤاڵو برادەر سەریان لێ دام، لەوانە کوڕانی دێهاتی ناوچەی قەرەداخ کە سەرپاکیان شیوعی بوون یا لەگەڵ (حشع)دا هاوسۆز بوون. لیژنەیەك هەبوو بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی زیندانیە سیاسیەکانو بەرودوا بە پۆستە بەردانیان. بۆم بڕایەوە لە نێو پۆستەی ٢٨ی تەمووزی ١٩٥٨ دا بم. لەگەڵ (عەبدوڵڵا گوران)ی هاوڕێی شاعیرمدا دەرچوومو ئوتومبیلی هەڤاڵێك لە دەرگای بەندیخانەوە بردینی بۆ بەغدای پێتەختی شۆڕشو گەورەترین هەستانی جەماوەری. کابرایەك کە تادوێنێ بوو حوکمی بەندیی هەمیشەییی بەسەردا درابووو، لەپشت شیشەکانی زیندانی بەندیخانەی تاکە کەسییەوە شوێنە ون کرابووو، ئەوەتا ئەمڕۆ بە تەواوی ئازادیی خۆیەوە لە بەغدا، ئەو شارەی کە تەنانەت بەر لەبەندکرانیشی خۆیی تێدا شاردبووەوەو بەوریایی پێیدا دەڕۆیشت، هاتوچوو دەکات، دەبێ سنگی چ هەستێکی تێدا پەیدا ببێو چ سۆزێکی تێدا بێتە جۆشو خرۆش؟

له بەغدا سلام عادل (حسين احمد الرضي) چاوەڕێی دەکردم، بردمی بۆ ماڵێکی حیزبی لە گەڕەکی (الصليخ) کە بنەماڵەی (الصفار)ی‌پێکهاتوو لە(کاظم الصفار)ی لاوی شیوعی‌و برا منداڵەکەی‌و سێ خوشکەکەی‌و پیرەژنە باشەکەی دایکیان تێیدا دادەنیشتن. ئەم بنەماڵە شیوعیە قوربانیی داو دەردە سەریی بینی‌و(عواد)ی کوڕیان لە خۆپێشاندانێکی لەمەوبەردا شەهید بوو. ئەو ڕۆژە کە جەمال حەیدەری بەرپرسی ڕێکخراوی حیزبی کەرتکەری ئاڵای ڕەنجدەران بوو لە نەجەف، لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا دادەنیشت.

ئەو چوار ڕۆژە کە لە بەغدا بەسەرم بردن چاوم بەگەلێك هەڤاڵو برادەر کەوت، لەوانە هێندێك کەس‌وکارو برادەری خەڵکی سلێمانی. مستەفا قەرەداخیی خاڵە مێزەر بەسەرەکەم بەدەستێك جلی کوردییەوە هاتە لام. ڕۆژانە چاوم بە (سلام عادل)ی سکرتێر دەکەوت، لەیەکەم بەیەکگەیشتنەوە پێی ڕاگەیاندەم کە من بووم بەئەندام لە مەکتەبی سیاسیدا. لە هەمان چاوپێکەوتنندا گوتی :

- پێوەندیتان بە هەڤاڵانی زیندانکراوی ڕێکخستنی (ئاڵای ڕەنجدەران)ەوە چۆن بوو؟

- پێش ئەوەی خۆمان بڕیاری چوونە نێو یەکتر بدەین، ئیدارەی بەندیخانە یەکی خستین.

- کاتی خۆی‌کە مشتومڕمان لەسەرکێشەی یەکگرتن دەکردهەڵوێستی‌تۆئاهی بەبەردا دەهێنامەوە، تۆ لەوێ لەنێو زیندانیەکاندا بەتاقی تەنیا هەڵوێستی ڕاستت بەرانبەر بەکێشەی دوکەرتبوون‌و ڕێگەکانی چارەسەرکردنی دیاری کرد.

لە یەکەمین کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسیدا ئامادە بووم، خۆم بەرانبەر بە پێکهاتەیە بینی‌یەوە کە - بەلای منەوە - لە سەیرو سەمەرە بەدەر نەبوو. لە (سلام عادل)و جەمال حەیدەری‌و (عامر عبدالله) پێکهاتبوو. ئەمەی دواییان تا پێنج ساڵ لەمەوپێش، واتەتا کاتی‌گیرانم لە ١٩٥٣دا، تەنیا دۆست یان لایەنگرێکی

چالاکی حیزب بوو، نەئەندام بووو نە لە هیچ شانەیەکی حیزبیدا ڕێکخرابووو نەهیچ لە کاروباری نێوخۆی حیزب فێربوو بوو. جەمال حەیدەری تا ١٩٥٦ لە (ئالآی ڕەنجدەران)دا سەرکردەی ئەو تاقمە بوو. سەرباری ئەوە، ١٩٤٥ـ ١٩٤٦ لە تاقمی شۆڕش ـ حیزبی شیوعیی کوردی ـ ش بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، بێدەنگیم لێکردو هیچم نەورووژاند، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ئەندازەیەکی گونجاوم تەبایی لە نێو دەستەی ئەو ڕۆژانەدا بەدی کرد. سێلاوی هەڵچووی شۆڕشگێڕی هەموانی خستە نێو جەرگەی چالاکییەکی چڕوپڕی ڕۆژانەوە تا ڕادەی نوقم بوون.

پاش چەند ڕۆژێك گەڕامەوە بۆ (سلێمانی)ی شارە خۆشەویستەکەم کە یەکەمین هەنگاوی چالاکیی سیاسیم تێدا هەڵهێنایەوە. لە ئوتومبیلێکدا بووم‌و ژمارەیەك ئوتومبیلی دیکەیشم لەگەڵدا بوو کە چەند هەڤاڵ‌و خزمێکیان تێدا بوون. هیچم لەسەر ئەو پێشوازی لێکردنە نەدەزانی کە بە نسیبی من‌و ئەو هەڤاڵە زیندانیانە دەبوو تا گەیشتینە دووز. لەوێ ژمارەیەکی زۆرم ئوتومبیل بینی، لە کەرکووك‌و سلێمانی‌و گەلێك شارۆچکەوە بۆ پێشوازی لێکردنمان هاتبوون. لە کەرکووك شێخ عەلیی تاڵەبانی زۆری لێکردین تا کەمێك بحەوێینەوەو چاو نانی لە لا بخۆین. ملم داو بۆ تەکیەکەی چووین. پێشتر لە ڕۆژانی خۆشاردنەوەی کەرکووکمدا، لە ١٩٤٩دا، جارێك پێم تێ نابوو. کە کەرکووکمان بەجێ هێشت سەرنجم دا بە نێزیکبوونەوەمان لە سلێمانی ژمارەی ئوتومبیلی پێشوازیکەران لە ڕادەبەدەر زیاد دەکات، تا وای لێ هات بەسەدان ئوتومبیل حسێب دەکرا. لە ڕێگە کۆلۆنێل (عەقید) (نووری مەعرووف)ی فەرماندەری (حامیە)ی سلێمانی‌و کۆنە دراوسێی گەڕەکمان ڕایگرتم‌و پێی لێکردمە کەوش بگوێزمەوە بۆ ئوتومبیلە عەسکەریە سەر بەتاڵەکەی ئەو، لەو مەودایەدا کە ڕوو بە شارما بوومان لە پەنایەوە ڕابوەستم. کە لە شار نێزیك بووینەوەو دوای چوونە ناوی، دیسان شتێکی وا سەیرم بینی کە پێشان چاوەڕوانم نەکردبوو. ژمارەی پێشوازیکەرانی ڕیز بەستووی هەردوو بەری ڕێگەکە زۆر لە

ژمارەی دانیشتوانی شار خۆی زیاتر بوو. رووبارێکی مەزنو بە شڵپو هوورِو سەر رێژ لە ئادەمیزادان لەو ناوەدا بوو، وەك لافاوی چەمێکی داوێنی چیای قەندیل لە کاتی بەفر توانەوەی وەرزی بەهاردا. پێشوازییەکی کەم وێنە بوو لە مێژووی سلێمانیدا، لە پاڵ دانیشتوانی شاردا جەماوەرێکی لە ژمارە نەهاتووی دانیشتووی شارو شارۆچکەو دێهاتەکانی دیکەی پارێزگا بەشدارییان تێدا کردبوو، ئەندامانو دۆستانی پارتیو ئەو خەڵکانەیش کە رۆژێك لە رۆژان پێوەندییان بەهیچ چالاکییەکی سیاسییەوە نەبوو بوو تێیدا بەشدار بوون. دەمزانی ئەم پێشوازییە گەورەو بەجۆشە، بەر لە هەر شتێك، دەربڕینی هەم دەستڕۆیی بەربڵاوی ئەو حیزبەیە لە نێو گەلدا کە من بە ئەندامەتیی شەرەفمەند بوومو، هەم رێزنانی جەماوەریشە لە شەخسی من بەو پێیە کە تێکۆشێکی شیوعیی نەگۆڕو خۆڕاگرو پێبەندی ئامانجو نموونە باڵاکانی جەماوەر خۆیم.

بە پێداگرتنی هەڤاڵانو جەماوەری کۆمەڵی بەستوو لە پاساری ئوتێلێکی ناوەڕاستی شارەوە چەند قسەیەکی کورتم کرد، تێیدا گوتم :

- من کوڕی ئەم شارەتانم، شانازی بەوەوە دەکەم کە ئەندامی (حشع)م. لە پێشوازیکردنتاندا لە من بەم شێوە پڕ خرۆشە، دەربڕینی خۆشەویستیو رێزتان بەدی دەکەم بۆ ئەو حیزبە کە ئەندامیمو دڵسۆزی بووم. ئەو بەڵێنەی کە بتوانم لەبەردەمتاندا بیدەم ئەوەیە: من هەر دڵسووتەی ئەم گەلەو چینی کرێکارو هەموو زەحمەتکێشانو ئەمینداری ئامانجەکانی حیزبو گەل دەبم.

هێندێك هەڤاڵ پێشنیازیان کرد ماڵێکی گەورەی گونجاوم بۆ رێك بخەن تا چەند رۆژێك تێیدا بمێنمەوەو پێشوازیی ئەو میوانانە بکەم کە بۆ پیرۆزبایی بەربوونم دێن. بەڵام من ئامۆژگاریەکەی (ئەحمەد غەفوور)م گرتە گوێ کەپێی گوتم باشتر وایە لەو نیوچە کۆختەیەدا بمێنمەوە کە بەر لە خۆشاردنەوەم لەگەڵ خێزانەکەمدا تێیدا دادەنیشتمو تا ئێستایش ئەوان لەوێن. ئەوەو لە حەوشەی فراوانی مزگەوتەکەی پەنا خۆیشماندا پێشوازی لە میوانەکان بکەم.

لەو چواریا پێنج ڕۆژەدا کەلە سلێمانی بەسەرم بردن، ژمارەیەکی زۆر دۆستوکەسو کاری شارو لادێو لەوانە ئەو ناسیارانەی کە دەساڵ زیاتر بوو لێیان دوور کەوتبوومەوە، سەریان لێ دام. بەڵام سەیرترین سەردان سەردانی (حەمید عوسمان)ی ڕێکخەری حیزبیی جارانم بوو. بەرپرسێکی ڕێکخراوی شیوعیمان لە سلێمانی هاتە لام پێم بڵێت:

- بەرپرسێکی پارتی حەز دەکات بەتایبەتی بێتە دیدەنیتو، لە چاوپێکەوتنێکی دوو قوڵیی نێوانتاندا قسەت لەگەڵدا بکات.

- با پاشنیوەڕۆ سەر سەرو سەر چاو بفەرموێ، یەکەو ڕاست بیهێنە بۆ ماڵەوە.

کابرا لە ژوانی دیاریکراودا هاتە لام، کەچی دەرکەوت باوکی خسرەو(حەمید عوسمان) خۆی بوو. ئەم چەشنە دەرکەوتنەی نا خافڵ بوو بۆ من. هیچ شتێکی شێلگیرانەو بەشێوە پەلەی وای پێ نەبوو گفتوگۆی لەبارەوە بکەین. لەوانەیە هەر ئەوەندە ئارەزووی کردبێ وەك سەرکردەیەکی پارتی خۆیم پێ بناسێنێ. سەبارەت بە من ئەوە سێیەم چاوپێکەوتن یا سێیەم قۆناخی چاوپێکەوتن بوو لەگەڵ (حەمید عوسمان)دا. قۆناخی یەکەم سەرەتاکانی ١٩٤٩ بوو، ئەو سکرتێری ڕێکخراوی سلێمانیو من یەکێك بووم لە کادێرە کاراکانی. لە قۆناخی دووەمدا ساڵی ١٩٥٣ لە بەندیخانەی نوگرە سەلمان بەیەك گەیشتین، ئەو ڕۆژە کە کۆمارە میللییەکەیی دامەزراندو کاکڵەی هێزە چەکدارەکانیی لە شمشێر بەدەستانی زیندانی بنیات نا. ئەوەتا ئەمڕۆیش سەرلەنوێ پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز بەیەك دەگەینەوە، من بەرپرسێکی (حشع)مو ئەویش وەك سەرکردەیەکی پارتییە دیدەنیم دەکات.

پێش ئەوەی لە نێزیکەوە ناسیاری لەگەڵ بارودۆخی شارو خەڵکدا پەیدا بکەم، بەر لەوەی هورووژمی سەردانی لەپەستای دۆستان لە من کەم ببێتەوە، برووسکەیەکی (سلام عادل)م پێ گەیشت کە داوای لێکردم دەستبەجێ بگەڕێمەوە بۆ بەغدا. بەپێر فەرمانەکەوە چووم‌و(سلێمانی)م ڕوو بە پێتەخت بەجێ هێشت.

* * *

دوا به دوای له بەندیخانه دەرچوونم‌و لەو کاتەوەی دەستم بە چالاکیی حیزبیم کردەوە، سەرکردایەتیی کاری ڕێکخستنم لە حیزبدا پێ سپێردرا. دواتر هەر بە پێشنیازی سلام عادل (لیژنەی ناوەندیی ڕێکخستن)مان پێکهێنا کە لە ئەیلوولی (١٩٥٨)ەوە تا تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ - واتە تا کاتی عێراق بەجێ هێشتنم - من بەرپرسی بووم. لە کاری ڕێکخستندا گەلێکم لە ئەزموونی پێشووم وەرگرت. بەڵام شتە تازە بابەتەکانی دۆخەکە گەلێك ئاڵۆزییان پێوە بوو. لەو هەلومەرجە تازەیەی وەستانی - لانی کەم بەشێوەیەکی کاتیی - ڕاوەدوونانداا چالاکیمان نیوچە ئاشکرا بوو. لە ڕابردوودا دەبوو دەیان یا سەدان کەس لە شاری بەغدادا ڕێك بخەین. لەم هەلو مەرجە تازە بابەتەدا کەوتینە بەردەم ئەرکی ڕێکخستنی هەزاران‌و دەیان هەزار کەس. چین‌و توێژە کۆمەڵایەتیە جۆربەجۆرەکان زۆر بە بەربڵاوی ڕوویان دەکردە ڕیزەکانی حیزب. کارێکی هەروا ئاسان نەبوو ئەم ژمارە زۆرە بەپێی بنچینەیەکی ڕاست جێ بکرێتەوە. یەکێك لەو گیروگرفتە شێلگیرانەی بەردەممان کە هەلومەرجی ڕاپەڕینی کانوونی ١٩٤٨و هەڵچوونی شۆڕشگێڕانەی لەوە بەدوا پەردەیان لە ڕوو هەڵماڵی، مامەڵە کردن بوو لەگەڵ ژمارەیەکی بێ ئەندازەی کەسانی بەرژەوەند پەرست‌و گیرفان پڕکەری خاوەن تەماحی شەخسی کە لە دەرگای حیزبیان دەداو پێداگرییان لەسەر هاتنە ڕیزەکانی دەکرد، چونکە پێیان وا بوو بووە بە حیزبێکی حوکم بەدەست یا خەریکە حوکم بگرێتە دەست‌و چوونە پاڵی ڕێگەیەکە بۆ بەدیهێنانی مەرامە تایبەتەکانیان بۆ وەرگرتنی پلەو پایەو ئیمتیازی شەخسی. ئەوانە لە شیوعیە کۆنەکان زیاتر شیوعی بوون!

ئێمە گەلە کادێرێکی ژمارە دیاریکراوو کەم ئەزموونمان هەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە سەرکەوتنی شۆڕش دەرفەتێکی مێژوویی دەگمەنی بۆ حیزب مسۆگەر کرد بۆ کۆکردنەوەی کادێرانی، بۆ یەکەم جار لە مێژوویدا، بەوانەیشەوە کە لە بەندیخانەو تاراوگە (المنفی)کانی دەرەوەو ناوەوەدا بوون. کادێرانمان لەوە کەمتر بوون بتوانن ئەو

هەڵچوونە باڵا کردووەو ئەرکە سیاسیو ڕێکخراوەییەکانی سەرشانیان لە خۆیاندا جێ بکەنەوە، لە کاتێکدا حیزب بوو بەسەرکردەیەکی سیاسیی لەلایەن زۆربەی گەلەوە دان پێدانراو. کەواتە دەبێ چی بکەین بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی کادێری حیزبی؟

هەوڵم دا بەپێی تینو توانی خۆم کاری ڕێکخستن بەرنامە ڕێژ بکەمو، زامنی ئەوە بکەم ڕێکخستن لە ڕووی چەندایەتیو چۆنایەتییەوە بەشێوەیەکی هاو ئاهەنگ پەرە بستێنێ. جا هەر لەم نوختە نیگایەوە بڕیار درا :

١ـ ئەندامەتی بەهەمرو ئەو کەسانە ببەخشرێت کە پێش شۆڕش پاڵێوراو بوون بۆ حیزب، بەبێ ئەوەی چاوەڕێی بڕانەوەی ماوەی پاڵاوتن بکەین.

٢ـ ڕێژەی ڕێ پێدراو بۆ پاڵاوتنو وەرگرتن لە حیزبدا دیاری بکرێت بە جورێك کە هەم دەستەبەری ڕێژەیەکی سەدیی پەسەند بکات بۆ کرێکارانو جووتیارانو، هەم حیزب لە تێوە ئاڵانی کەسانی بەڕیشە ڕۆشنبیرو هێندێك توێژی کۆمەڵایەتیی دیکە لابدات.

٣ـ چەند کارێکی گونجاو بکرێن بۆ گەشە پێدانی تۆڕی کادێری حیزبی بە گوێرەی داواکاریەکانی بارودۆخی تازە. گەلێك نامەو بڵاوکراوەی ناوخۆمان بۆ خزمەت کردنی ئەم لایەنە دەرکرد. هەروەها چەندین خولی کورتی ڕۆشنبیر کردن یا کۆبوونەوەی درێژ خایانمان دەکردو بانگی بەرپرسە ناوچەییەکانی شارو پارێزگا جیاجیاکانمان بۆ دەکردن بۆ ڕۆشنبیر کردن وڕوونکردنەوەی سیاسەتەکانمان. جگە لەوە، زۆر دیدەنیی فراوانی سەرپەرشتیمان دەکرد. لەو دیدەنیانەدا کەمو زۆر بۆ یەکەم جار سەرم لە گشت مەڵبەندی پارێزگاکانو چەند قەزاو شارۆچکەیەك دا.

بەم بۆنەیەوە باسی یەکەم دیدەنیم دەکەم بۆ نەجەف بۆ سەرپەرشتیی حیزبی. کاتێك گەیشتمە ئەو ماڵە کە لیژنەی قەزای تێدا کۆبوو بووەوەو ئامادەبوانم ژمارد، بۆم دەرکەوت یەکێکیان نەهاتووە بۆ کۆبوونەوەکە. لە هۆی نەهاتنەکەم پرسی، سکرتێری لیژنە وەڵامی دامەوە:

ـ بانگ نەکرا بۆ کۆبوونەوە چونکە سزا دراوە.

ـ ئەی بۆچی سزا دراوە؟

ـ سەرپێچییەکی کردووە.

ـ بۆم هەیە بزانم جۆری سەرپێچیکردنەکەی چییە؟

ـ بەڵێ بێگومان، خواردوویەتیەوەو سەرخۆش بووە.

ـ ئەی چیی خواردووەتەوە؟

ـ بیرە.

ـ بەبیرە سەرخۆش بووە؟

ـ نەخێر ئەوی ڕاستی بێ سەرخۆش نەبوە، بەڵام دیاربووە کە خواردوویەتیەوە.

ناخۆشحاڵیی خۆمم بۆ ئەم سزایە پێشان داو تێکەوتم بۆی تا سزاکەی هەڵبوەشێننەوەو گوتم: ئەگەر هەر کەسێك ڕێ بە خۆی بدات بیرە بخواتەوە سزا بدرێت، ئەوا من یەکێك دەبم لە سزا دراوان، چونکە ڕۆژانی دوای لە بەندیخانە دەرچوونم نەك هەر بیرە بەڵکوو لە بیرە زیاتریشم خواردووەتەوە. ئەگەر چی پێش ئەوەی بچمە نێو بەندیخانە، هەرگیز تامی نە بیرەو نەعارەقم نەکردبوو. ساڵی ١٩٥١ کە تووشی کەم خوێنیو بێ هێزی بووبووم بە هۆی نەخۆشیی دیزانترییەوە، بە ڕاسپێریی پزیشك دوو یا سێ جار کەمێك مەیم خواردەوە. بەڵام نەمتوانی درێژەی پێ بدەمو بە ڕاستی دەستم لە خواردنەوەی هەڵگرت. جاران کۆمەڵگە ڕایەکی خراپی دەرهەق بە بادەخۆر هەبوو. بەڵام بارودۆخەکە گۆڕاو، دەکرا لەم هەلو مەرجە تازەیەدا لە گەلێك ماڵدا ـ بە ماڵە شیوعیەکانی بەشێکی دانیشتووی شارەکانیشەوە ـ بخورێتەوەو پێك هەڵبدرێت.

ئەو ڕۆژانە لە ڕووی ڕێکخستنەوە چالاکییەکی نیوچە ئاشکرامان کردو، نووسینگەی هێندێك هەڤاڵی پارێزەرو پزیشكو کەسانی دیکەی خۆمانمان کرد بە شێوە بارەگایەك بۆ ڕاییکردنی کاروباری حیزبیی ڕەسمیمان هەبێ. بەردەوام ماڵە حیزبییەکانمان بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ هەڤاڵانی میوانی دەرەوەی بەغداو بۆ شەو تێدا

مانەوەو نان خواردنیان بە کاردەهێنا. چالاکییەکی چڕو پڕی حیزبی ـ سیاسیمان دەکرد. ڕۆژی ئیشکردن لەلای من ـ وەك گەلێك هەڤاڵی دیکە ـ بۆ شازدە سەعات پتر درێژ دەبووەوە. نە ناخواردنێکی باش‌و نە هەل‌و مەرجێکی تەندروستیی لە بارمان هەبوو. بەلاّم لە بارێکی دەروونیی زۆر باشدا بووین. بیرمە هەستم بە شەکەتی‌و بێ هێزی کردو، بە پێویستم زانی سەر لە پزیشك بدەم. چووم بۆ عەیادەی (مهدی مرتضی)ی پزیشکی شیوعی‌و بۆ یەکەم جار ناسیم. تووشی کۆنی دیزانتری بوو بووم. لە کاتی تەماشا کردندا دەرکەوت قورساییم لە ٥٣ کگم زیاتر نەبوو، ئەگەر چی درێژیم لە ١٧٥سم بوو.

بەردانی "مادلین"ی ژنم کەمێك دواکەوت. کە بەرەلاّ کرا خانوویەکی گونجاوم بە مانگی ١٥ دینار لە (الكرادة الشرقية) بە کرێ گرت‌و، لەبەر خۆپاراستن ـ بۆ ئەوەی چەتەکانی خافلکوژ دەستیان نەیگاتێ ـ لە دۆخێکی نیوچە نهێنیدا هێشتمەوە. ئیتر (سەلام)ی کوڕم پاش ئەوەی جاران لەگەلّ دایکیدا لە بەندیخانەدا بوو، وای لێهات بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا لەگەلّ باوانیدا بێ. سەلام ، ئەو منداڵەی کە لە بەندیخانە لە دایك بووو پەروەردە بوو، بەسەرهاتی وای هەن مەگەرلە منداڵێك بقەومێن کە لە هەمان هەل‌و مەرجی ئەودا بوویێ. ئەو پێنج ساڵی یەکەمی لە بەندیخانەی ژنان ژیا، ئەو ماوەیە پێی وابوو جیهان سەرتاسەر بریتییە لەو بینا بچووکەی بەندیخانەو دیوارەکانی چوار دەوری، چونکە هیچی دیکەی لەم دنیا بەرینە نەدیبوو. لە بەندیخانە ژنە زیندانی‌و ژنە بەڕێوەبەری بەندیخانەو ژنە وەردیان‌و ڕەنگە لە هێندێك کاتداپیاوی وەردیانیشی دیبێ. هەروەها کۆترو پشیلەیشی دیبووو هیچی تر نا. ڕۆژێکیان کەرێکی چاو کردبوو دێتە نێو بەندیخانەو هێندێك لەو شتانەی بەسەرەوەن کە ئیدارەی بەندیخانە کڕیبوونی، حەپسا بووو قیژاندبووی :

ـ تەماشا، تەماشا دایە ! چۆن پشیلەیەکی زلە !

ـ ژنە زیندانیەکان بە پێکەنینەوە وەلاّمیان دابوەوە : سەلام گیان ئەوە پشیلە نییە !

ـ ئەی چییە؟ کۆترە؟

سەلام بۆ یەکەم جار لەگەڵ ئافرەتێکی هاوڕێدا بەندیخانەی بەجێ هێشت کە بۆ چاوپێکەوتن چوو بوو، بردبووی بۆ ماڵی خۆیان. کە چوو بووە ماڵی ئافرەتەکە وای زانیبوو لە بەندیخانەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە گوێزراوەتەوە. بۆیە بە ژوورەکاندا گەڕا بوو ، پێی سەیر بوو بوو هەمویان بەتاڵن. هەر ئەوەی پێ کرابوو بپرسێ :

- پووری ! ژنە زیندانیەکان کوان؟ بۆچی هەموو قاوشەکان چۆڵن؟

بەو ژنە نەکرابوو تێی بگەیەنێ ئەمە ماڵەو بەندیخانە نییە. دەبوو چاوەڕێ بکەین تا رۆژگار فێری بکات. کە ئێوارە داهاتبوو ژنە بردبووی بۆ هۆڵی سینەمایەك. لەوێ قەرەباڵغیی دیبوو هەڵیدابوویی و گوتبووی :

- ئای چاوپێکەوتن (مواجهە)یکی چەند قەرەباڵغە !

کە لە دانیشتنی نێو سینەما وەڕەس بوو بوو و وێنە یەك لە دوای یەکەکانی سەر شاشەکەی بە دڵ نەبوو بوو، گوتبووی :

- بە ڕێوەبەرەکەی‌بەندیخانە لە کوێیە؟ با بێت چاوپێکەوتنەکە بلاوە پێ بکات.

دنیا لەبەر چاوی (سەلام)ی منداڵدا گشتی زیندانی‌و وەردیان بوو، تاقمێکی سێیەم لە ئارادا نەبوو.

* * *

وێرای بەرتەنگکردنەوەی قبوولکردنی داواکاریی هاتنە ریزی حیزب، کەچی ڕێکخستنەکان بەخێراییەکی پێوانەیی گەشەیان دەکردو پەلیان دەهاوێشت‌و هەموو شارو شارۆچکەکان‌و ژمارەیەکی زۆریان لەناوچە دێهاتیەکانیش دەگرتەوە. حیزب سەرگەورەی کەس لە عۆدە نەهاتووی شەقام بوو. دەمانتوانی لە ماوەی یەك یا دوو سەعاتدا گەورەترین خۆپێشاندانی جەماوەری ساز بدەین بەبەغدادا ڕێ بکات‌و ژمارەی بەشدارەکانی لەسەد هەزار خۆپێشاندەر زیاتر بێ. هێندە بەس بوو بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ بەرپرسی هێڵەکانی ڕێکخستنماندا بکەین تا جەماوەرێکی بێ ئەژمار کۆبکەینەوە.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی تەمووز (عبدالکریم قاسم) وەزارەتێکی تازەی پێکهیناو، (حشع) نەبێ، نوێنەرانی سەرجەم حیزبە هاوبەشەکانی نێو بەرەی یەکگرتنی نیشتمانی (الاتحاد الوطني)ی تێدا بەشدار کرد. دیارە ئەم ناوبوێر کردنە هەڵوێستێکی پڕ مەبەستی عبدالکریم بوو. بەڵام ئەم کردەوە چەوتە لە لایەنگریی جەماوەریی حیزبەکانی کەم نەکردەوە، بەڵکە حیزب جێی بەخیلی پێ بردنی حیزبە بۆرجوازیەکان بوو کەبۆیان نەدەچوە سەر جەماوەر بۆ لای خۆیان بەکێش بکەن. هەریەکە لەحیزبی سەربەخۆیی (الاستقلال)و حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی (الوطني الدیمقراطي) ئەوەیان پێ بەس بوو بەم یان بەو شێوەیە ڕەخنەی توند لە شیوعیەکان بگرن‌و، جاروباریش بکەونە نێوەنێودانی دەسەڵاتداران لە دژیان‌و بۆ کەمکردنەوەی چالاکییان. نێزیکەی شەش مانگێك پاش سەرکەوتنی شۆڕش، کە ئیمتیازی یەکەم ڕۆژنامەی یاساییمان پێ دراو یەکەمین ژمارەکانی دەرچوو (مەبەستم ڕۆژنامەی یەکگرتنی گەل ـ اتحاد الشعب ـ ە)، (حسین جمیل)ی وەزیری ڕاگەیاندن ـ کەئەوسا سکرتێری حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی بوو ـ بەبێ هیچ پاساو دانەوەیەکی مەنتیقی‌و، دژ بەو هەموو بەهاو چەمکە دیموکراتیانەی کەحیزبەکەی ئاڵا هەڵگریان بوو، بڕیاری داخستنی دا. بڕیارەکە بەدەست تێوەردانی ڕاستەوخۆی خودی عبدالکریم قاسم هەڵوەشێندرایەوە.

هەرچی حیزبی بەعس (البعث)یش بوو کە هەر لە دامەزراندنی بەرەی یەکگرتنی نیشتمانییەوە لەشوباتی ١٩٥٧دا ئەندامی بووو تا شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨یش هاوپەیمانی شیوعیەکان بوو، لەمامەڵە کردنیدا لەگەڵ (حشع)دا ڕێگەیەکی جیاوازی گرتەبەر، واتە ڕێگەی تیرۆروخافلکوژیی تاکەکەسی. پێم وایە ئەگەر باوەڕی بەدیموکراسی هەبوایە یا دڵنیا بوایە دەتوانێ بە بەربەرەکانێی ئاشتییانە بۆ جەماوەر کۆکردنەوە بەسەر شیوعیەکاندا سەربکەوێ ئەوا لەم ڕێگەیە لایدەدا. سیاسەتی خافلکوژیی تاکە تاکەی شیوعیەکان سیاسەتی ڕەسمیی حیزبی

بەعس بوو. (الحاج سعدون)ی کادێری شیوعیی تکریتی لەیەکەمین قوربانیەکانی ئەم سیاسەتە بوو کەبەدەستی (صدام حسین)ی پوورزا بەعسیەکەی خۆی خافڵکوژ کرا. گەلێك کسی بەگیانی دوژمنایەتیکردنی کۆمۆنیزم پەروەردە بووی سەر بەدەزگا میراتیەکانی حوکمی سەردەمی پاشایەتی لایەنی بەعسیەکانیان گرتو لە تیرۆرو خافلکوژکردندا پاڵپشتی چالاکیی ئەوانیان کرد.

لە دواییشدا دەسەڵاتداران خۆیان لایەنگریی ئەوانیان کردو دەزگاکانی پۆلیسیان کرد بە ئامرازی پاراستنو دنەدانی دەستدرێژیکەرو راوەدوونانی دەستدرێژی بۆ کراو. دەیان کەڕەت وا ڕووی دەدا دەستدرێژی بۆکراو یا کەسانی دووچاری دەستدرێژیکردنە سەر دەگیرانو، تاوانبارانو دەستدرێژیکەرانیش بەبێ هیچ ڕاوەدوونانێك وازیان لێ دەهێنرا. ئێمە هەڵەیەکی خراپمان کرد بەوەی کەبەس بەراگەیاندن وەڵامی ئەم دەستدرێژیانەمان دەدایەوەو داوامان لەدەسەڵاتدارانی لەگەڵ دەستدرێژیکەراندا دەست تێکەڵ کردوو دەکرد کارێکیان بەرانبەر بکەن، لە کاتێکدا پێمان دەکراو مافی ڕەوای خۆمان بوو بەپێی سەرەتای بەرانبەر کێکردن بەهەمان شێوە داکۆکی لەخۆمان بکەین. هێندە تینو توانو هێزمان هەبوو دەستەبەری دەرسدادانی دەستدرێژیکەرانو ڕێ لێ بەستنیان بکات. ئەوی ڕاستی بێ پەنا بردنە بەر خافلکوژ کردن نە بەڵگەی هێزو نە ڕێو شوێنێکی ڕاست بوو لە ململانێی حیزبی ـ سیاسیدا. دەبوو پەردەی لەسەر لابدەینو نارەزاییی بەرانبەر پێشان بدەین ـ وەك کردمان ـ، بەڵام کە نارەزایی پێشاندان سوودی نەبوایە دەبوو ڕێ لە دەستدرێژیکەر ببەستینو هەر بە هەمان ڕێو شوێن کە ئەو پەنای بۆ دەبرد دەرسی دابدەین.

* * *

بەرەی یەکگرتنی نیشتمانی وەك بەرجەستە کردنێکی ڕاستەقینەی هاوپەیمانەتیی حیزبەکانو هێزە سیاسیە بەرهەڵستەکانی ئیمپریالیزمو ڕژێمی پاشایەتی، لە

پێناوی سەرکەوتنی شۆڕشدا نەخشێکی سیاسیی بنچینەییی لە خەباتدا گێڕا. بەڵام بەرە، ڕاستەوخۆ دوای سەرکەوتنی شۆڕش، بەبێ دەرکردنی هیچ بڕیارێکی لەبەریەکهەڵوەشان بەکردەوە لەبەریەکهەڵوەشا. ئەم دیاردەیە بەپێی جیاوازیی حیزب‌و کەسەکان بەگەلێك شێوەی جیاجیا لێکدرایەوە. هەموو کۆتاو ڕۆتای لەبەر یەکهەڵوەشانی هاوپەیمانەتیەکەیش درا بەسەر کەسانی دیکەو بەتایبەت شیوعیەکاندا کەبەوە تاوانبار کران مافی چالاکیی سیاسی‌و سەندیکایی بۆ خۆیان قۆرخ دەکەن‌و کەسانی دیکەیان لێ بێبەش دەکەن. پێویستە دان بەوەدا بنێین کە شیوعیەکان خولیای قۆرخکردنیان هەبوو، وەك چۆن حیزبەکانی دیکەیش بەبێ ناوبوێر کردن هەیانبوو. بەڵام هۆی ڕاستەقینەی لەبەر یەکهەڵوەشانی هاوپەیمانەتیەکە لە هەل‌و مەرجی بەردەستی ئەو کاتەی عێراقدا لەو ڕاستییەدا خۆی دەنواند کە ئیتر پاش هاتنە دیی ئامانجی سەرەکیی بەرە ـ ڕووخاندی ڕژێمی پاشایەتی ـ و لابرانی دوژمنی هاوبەش خاڵی سەرەکیی پێکهاتن بۆ هاوپەیمانەتی لە ئارادا نەماو، ئەوەیش خاڵەکانی ناکۆکیی ـ کە بەر لە شۆڕش پلە دوو بوون ـ لە پێوەندیی نێوان ئەو حیزبانەدا هێنایە پێشەوە. بەعسیەکان بەدەسەڵات گرتنە دەست کەمتر قایل نەدەبوون، ئەگەرچی حیزبی کەمایەتیەکی بچووك بوون. هێندێك حیزبی بۆرجوازیی لیبراڵی سوور بوون لەسەر بێ هێز کردنی دەسەڵاتی شیوعیەکان‌و لە سەقامگیر کردن‌و باشتر کردنی ڕژێمی تازە زیاتریان نەدەویست. (حشع)یش کە خاوەنی دەسەڵاتێکی میللیی یەکجار پەلهاوێشتوو بوو، لەنێوان ئارەزووی بەشی‌هەرە زۆری ئەندامانی‌و ڕازیکردنی سەرکردایەتیی سۆڤیتیدا ڕێگەکەی لێ تێکچوو. لە ناوەندی ئەم ئاڵۆزیانەدا زۆر زەحمەت بوو گیان بە بەر بەرەی یەکگرتنی نیشتمانیدا بکرێتەوە. لەبەر ئەمە لەم بوارەدا هەوڵەکان بە تەواوی سەریان نەگرت، بە هەوڵەکانی (حشع)یشەوە بۆ دامەزراندنی بەرەیەکی چەپڕەوی ڕادیکاڵ‌و لەڕووی ئامانج‌و پێکهاتی ڕێکخستنەوە جیاواز لە هاوپەیمانەتیی پێشوو.

* * *

پارتی دۆخێکی جیاوازی لەهیی حیزبە سیاسیەکانی دیکە هەبوو. کاتێ خۆی سەرباری داواکاریی (حشع) بۆ قبوولکردنی لە بەرەی یەکگرتنی نیشتمانیدا، وەرنەگیرا چونکە حیزبە بۆرجوازیە عەرەبیەکان هەڵوێستێکی نەتەوەییی شۆڤێنیانەیان بەرانبەری دیاری کردو بە حیزبێکی جیاییخوازیان دانا. شتی وا لە گۆڕێدا بووکە پارتی وحشع هەردوو پێکەوە گرێ بدات، ئەگەر چی ئەوە لای پارتی پشتی بە هیچ هاوسۆزییەك لەگەڵ کۆمۆنیزمدا وەك باوەر یا جوولانەوەی سیاسی نەدەبست. لە لایەکی دیکەوە تاکە ڕێکخستنی ناکۆك لەگەڵ پارتیدا لە مەیدانی چالاکیی نێو جەماوەری کورد دا (حشع) بوو، هیچ یەکێك لە حیزبەکانی دیکە پێی نەدەکرا لە ناوەندی سیاسیی کوردیدا خۆ لەقەرەی ململانێی حیزبیی دژ بە پارتی بدات. لەبەر ئەوەی (حشع) لە نێو جەماوەری کوردیشدا گەلێك لە پارتی زیاتر دەستی دەڕۆیشت، پارتی خۆیی لە دۆخێکی شلۆقو دژواردا دەبینیەوە، چونکە لە نێوان کەوتنە هاوکاری لەگەڵ شیوعیەکاندا لە لایەکەوەو حەزپێکردنی دژایەتیکردنو لادانیان لە گۆڕەپانی سیاسیی کوردیدا لە لایەکی دیکەوە دەهاتو دەچوو. خولیای دوژمنایەتی لە داواکاریی هەڵوەشانەوەی ڕێکخستنی کۆمۆنیستی لە کوردستانی عیراقدا دەکەوتە روو.

لام وابێ ناکۆکیی نێو ریزەکانی پارتی، بە تایبەت دوای شۆڕشی تەمووز، دژواریی زیاتری بۆ پەیدا کردو کاری کردە سەر ڕێڕەوی پێوەندیەکانی لەگەڵ (حشع) دا. ناکۆکیەکانی نێو پارتی خۆی پەردەیان لە رووی گۆڕانی پێکهاتەی مەکتەبی سیاسی هەڵماڵی بەشێوەیەك کە - وەك بۆی دەچم - هیچ یەکێك لە سەرکردەو دامەزرێنە کۆنەکانی لە ریزەکانیدا نەبوون، حەمزە عەبدوللا نەبێ کە بە سکرتێری مایەوەو بە یەکێکی چەپڕەوی نێو سەرکردایەتی دادەنرا. چەند کۆنە شیوعییەکی وەك حەمید عوسمانو نەژاد ئەحمەدو خەسرەو توفیقو سالح حەیدەری کە لەو دواییانەدا هاتبوونە پاڵ پارتی، چوونە نێو پێکهاتەی مەکتەبی سیاسیی تازە.

له هەلو مەرجی هەستانی شۆڕشگێڕانەی جەماوەرو گەشەکردنی دەستڕۆیی (حشع) دا زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی قەناعەتیان بەوە هەبوو کە پێویستە پێوەندییەکی دۆستانەی لەسەر شێوە هاوکارییەك دامەزراو لەگەڵ شیوعیەکاندا هەبێ، له کاتێکدا ئێمەیش بۆئەم چەشنە هاوکارییە ئامادەبووین. بۆ ئەم مەبەستە وەفدی سەرکردایەتیی هەردوو حیزب له نووسینگەی (عامر عبدالله) له شەقامی (النهر) چاویان بەیەکتر کەوت. لەلایەن ئێمەوە (سلام عادل)و جەمال حەیدەری‌و (عامر عبدالله)و من ئامادەبووین، لەوانیش چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی‌و لەوانە نووری شاوەیس‌و جەلال تاڵەبانی. گفتوگۆو بیروڕا گۆڕکێ بە شێوەیەکی ئاسایی‌و دۆستانەو جاروبار بە گلەییی هەردوو لا لە یەکتری دەستی پێکرد. کە جەلال تاڵەبانی کەوتە قسە کردن تووڕە دەرکەوت‌و بەبێ هیچ پاساودانەوەیەکی مەنتیقی توندو تیژ بووو هێرشی کردە سەر (حشع)و بە زایۆنیزمی چواند. ئەمە شتێکی نا خافڵ بوو بۆ ئێمە، چونکە چۆن دەکرا لە چاوپێکەوتنێکدا کە ئامانجی هاوکاریکردنی نێوان هەردوو حیزب بوو بەرانبەر بە ئێمە پەنا ببرێتە بەر ئەم جۆرە ڕێ‌و شوێنە مایەی وەڕزکردنە بەرانبەر بە ئێمە. پێم وایە بۆ ئەندامانی وەفدەکەی پارتیش شتێکی کت‌و پڕ بوو. ئێمە هیچ لێکدانەوەیەکمان بۆ نەدۆزیەوە، جگە لە ئارەزووی جەلال تاڵەبانی بۆ خولقاندنی کەشێکی وا کەلێك نێزیکبوونەوەو هاوکاریی نێوان هەردوو حیزبی تێدا نەکرێن. (سلام عادل)یش پێ بە پێ خۆیی سوورکردەوەو بە لەپی دەست بەسەر ئەومێزەیدا کێشا کە لە دەوری دانیشتبووین‌و بە کەللەییەوە گوتی : "بە ئەدەب بە". ئێمەیش گشتمان لە کۆبوونەوەکە کشاینەوەو وەفدەکەی پارتیمان بە تەنیا بەجێ هێشت.

ڕۆژی دوایی سەرکردایەتیی پارتی لێبوردنێکی دەرهەق بە ڕەفتارەکانی جەلال تاڵەبانیی ئەندامی وەفدەکەی داینێ‌و داوای دەست پێکردنەوەی گفتوگۆی کرد. بە داواکە رازی بووین‌و، چەند ڕێ‌و شوێنێکمان بۆ گفتوگۆ کردن بەشێوازێکی تازە دانا. گفتوگۆی دواتر لە نێوان دوو نوێنەری هەردوو حیزبدا ـ من‌و ئیبراهیم ئەحمەد ـ کرا. لە چەند دانیشتنێکی کەمدا پێکەوە لەسەر ڕەشنووسی پەیماننامەی

هاوکاریی دوو قۆڵیی نێوان هەردوو حیزب ڕێك کەوتین. من لەلای خۆمەوە ڕەشنووسەکەم ئامادە کردو ئیبراهیم ئەحمەدیش چەند دەستکارییەکی کەمی بۆ پێشنیاز کرد، ئەمجا بەڵگەنامەکەمان خستە بەردەم سەرکردایەتیی هەردوو حیزب‌و پێی قایل بوون. لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە من لە کاتی چاوپێکەوتنی دوو قۆڵیمدا لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد دا نەرم‌و نیانی‌و سازانێکی لەوە زیاترم لە لا بەدی کرد کە چاوەڕوانی بووم. پێدەچێ ئەوە بە هۆی بەربڵاویی دەستڕۆیشتنی (حشع)ەوە بووبێ لەو هەل‌و مەرجەدا.

گێروگرفتێکی ڕاستەقینەی کۆن لەئارادا بوو، سەرئێشەی بۆ باشتر بوون‌و پەرەسەندنی پێوەندیی نێوان هەردوو حیزب دروست دەکرد. مەبەستم گێروگرفتی داواکاریی پارتی یا داواکاریی ژمارەیەك سەرکردەی بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستنی کۆمۆنیستی لە کوردستاندا. ئەم داواکارییە هێندەی کۆنیی پارتی خۆی کۆن بوو‌و مایەی وەلانانی بەهاوسەرەتا دیموکراتیەکان‌و بەرجەستە کردنێکی خولیای قۆرخکردنی مافی چالاکیی سیاسی‌و سەپاندنی سیستمی تاکە حیزبی بوو لە کوردستاندا. ئەوە لە کۆمەڵگەیەکی پاشکەوتووی وەکوو کوردەواریدا شتێکی سەیر نەبوو. بەڵام هەل‌و مەرجی پاش سەرکەوتنی شۆڕشی تەمووز لایەنێکی تازەی بەم داواکاریە بەخشی‌و لایەنە خراپەکەیی زیاتر کرد، بەتایبەت کە دەچوە قالبی چەند مشتومڕێکی توندوتیژەوە لەوڵاتێکی پاشکەوتووی لە نەریتی دیموکراتیانە خاڵی کە زەحمەت نییە ئەم چەشنە مشتومڕەی تێدا ببێ بە ململانێی خوێناوی‌و دەمانچەو خەنجەر لەنێوان ئەندامان‌و لایەنگرانی هەردوولادا بەکاربهێنرێن. ئەم گێروگرفتە لەیەکەمین ساڵی شۆڕشی تەممووزدا کەهەستانێکی شۆڕشگێڕانەی بێ ئامان لەگۆڕێدا بوو، شوێنە ون بوو یا کەم بووەوە. بەڵام کەعبدالکریم قاسم ڕێبازی خۆیی ڕوو بە ڕاستەوی گۆڕی، دیسان دەرکەوتەوەو هاتە نێو مشتومڕی ڕۆژنامە نووسیی هەردوو لا. لەم مشتومڕە ڕۆژنامە نووسیانەدا بەشی خۆم بەشداریم کردو، گوتارێکم لەوەڵامی پارتیدا نووسی بەچەند ئەڵقەیەك لە (ئازادی)ی ڕۆژنامەی

کوردیی حیزبدا بڵاوکرایەوەو، هۆی پاساودانەوەی هەبوونی ڕێکخستنی کۆمۆنیستیو پووچەڵیی داوای هەڵوەشانەوەیم ڕوونکردەوە. لە گۆتارەکەدا پرسیم: ئەگەر ئەوانەی ئەمڕۆ مافی هەبوون ـ تەنیا هەبوون وەك ڕێکخستنێکی سیاسی لە کوردستان ـ بە ئێمە ڕەوا نابینن، لە پاشە ڕۆژدا بۆیان لوا بە حوکم بگەن هەڵوێستیان بەرانبەر بە کۆمۆنیزمو شیوعیە کوردەکان چۆن دەبێ؟

* * *

کاتێك پاپۆڕە سۆڤێتیەکە بەرەو عێراق بەرێوە بوو مەلا مستەفای بارزانیو یاوەرانیی بۆ نیشتمان دەگواستەوە، هەڤاڵانی خۆمانمان لە شاری بەسرە ڕاسپارد هاوبەشیی ڕێکخستنی پێشوازییەکی جەماوەریی شایان بۆ ئەو میوانانە بکەن کە دوازدە ساڵی ژیانی دوورە وڵاتییان لە هەندەران بەسەربرد بوو. کە مەلا مستەفا خۆیشی گەیشتە بەغدا، لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی دیکەی (حشع)دا چوومە ئوتێلی سەمیر امیس ـ مەنزلگای کاتیی ئەو ـ بۆ دیدەنیکردنو بەخێرهاتن کردنی. ئەوە یەکەم چاوپێکەوتنی نێوان مەلا مستەفاو منی سیاسییەکی شیوعی بوو.

دوای گەڕانەوەی بارزانی، مەکتەبی سیاسیی‌حیزبمان لەوەزعی شەخسیی ئەو هەڵوێست دیاریکردن بەرانبەری کۆڵیەوەو، سەرجەم هاودەنگ بووین لەسەر ئەوەی کە کاری هەرە باش بۆ هەموانو بۆ خودی (بارزانی)ش ئەوەیە ئەو وەك کابرایەکی ناحیزبیو کەسایەتییەکی سیاسیی سەربەخۆی دوور لە پێوەندی بەهەر حیزبێکەوە بمێنێتەوە. لە چاوپێکەوتنو پڕۆ پاگەندە زارەکیەکانماندا کەوتینە خۆ بەم ئاڕاستەیەدا. تا ئێستایش باوەڕم وایە کە ئەوە کارێکی ڕاست بوو. بەڵام ئەوەی کە ویستمان بۆمان سەرنەچوو، چونکە سەرکردەکانی پارتی هاودەنگمان نەبوون بەڵکوو چالاکییەکی چڕو پڕیان کرد بۆ قەناعەت پێیکردنی مەلا مستەفا کە ببێ بە سەرۆکی حیزبەکەیان. هاندەری سەرەکییان بۆ ئەم هەڵوێستە هەستکردنیان بوو بە بێ هێزیی حیزبەکەیانو ئارەزوو کردنیان بوو بۆ سوود وەرگرتن لەلایەنگریی

جەماوەریی بارزانیو شانو شکۆی گەورەی بۆ بەرژەوەندی کاری حیزبییان. ناکرێت لە ڕووی مافی پەتییەوە ئەوە بە ئاواتێکی ناڕەوا دابنێین، بەڵام لەواقیعدا کورت بینییەکی سیاسیی خستە ڕوو. بگرە دەکرێت بڵێین ئەوە بەلای سەرکردایەتیی پارتییەوە هەڵەی تەمەن بوو. لەبەر ئەوەی بارزانی سەرباری ئەوەی کە تێکۆشێکی نەتەوەیی سیاسیی بوو، لەدەورو بەرێکی خێلەکیی لادێییانەدا ژیا بووو گەورە بوو بوو و بۆی هەڵنەکەوتبوو فێری چەردەیەك لە ژیانی حیزبایەتی - تەنانەت بە چەمکە عێراقیەکەیشی - ببیو باوەڕیشی پێ نەبوو. حیزب بەلای ئەوەوە لە تیرەیەکی خێڵ یا شتێکی لەم بابەتە دەچووو هیچی تر نا.

کۆنە سەرکردە تەقلیدیەکانو لەپێشەوەیاندا ئیبراهیم ئەحمەد هەڵەیەکی تازەی دزێویان کرد کاتێك لە ساڵی ١٩٦٠دا پەنایان بۆ دەستڕۆیشتنو تینو توانی بارزانی برد بۆ ڕزگار بوون لە حەمزە عەبدوڵڵاو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوونو بە چەپڕەو دانرا بوون، بەرێکخستنی چالاکییەکی نیوچە کودەتایی کەلابردنی تاقمێكو گێڕانەوەی تاقمێکی دیکەی بۆ مەکتەبی سیاسی خستە ڕوو. ئەم ڕەفتارەی دەستکردی سەرکردە کۆنەکان مافێکی وای بە بارزانی دا کە ڕاست نەبوو بیبیو، بەوە بنەما دیموکراتیەکان لە ژیانی نێوخۆی حیزبدا لەکەدارو پێشێل کران. دواتر ئەو کەسەی کەبوو بە سکرتێری پارتی وجێی حەمزە عەبدوڵڵای گرتەوە، ئەویش لەڕێی ئەوەدا بوو لەکاتێکی دیکەدا هەمان چارەنووسی بەتووشەوە بێ.

* * *

ئەیلوولی ١٩٥٨ بەشداریی یەکەم کۆبوونەوەی پاش شۆڕشی تەمووزی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بووم. هێندێك کادێری پێشکەوتووی وەك (زکی خیری)و (محمد حسین أبو العیس) بە بڕیارێکی مەکتەبی سیاسی بەشدار کران. ڕاپۆرتێکی نووسراو لەبەردەم کۆبوونەوەکەدا نەبوو. (سلام عادل) ڕاپۆرتێکی زارەکیی خوێندەوە، پێشتر لەسەر هێڵە درشتەکانی پێکهاتبوونو شیکردنەوەیەکی سروشتی

شۆڕشەکەی ـ لە ڕوانگەی خۆمانەوە ـ تێدا بوو بەو پێیە کە شۆڕشێکی بۆرجوازیی دیموکراتییە. جەختی کرد کە ئێمە پشتگیریی شۆڕش‌و دەسەڵاتی تازە دەکەین دژی فێڵ‌و دەهۆڵی ئیمپریالی ـ کۆنەپەرستی. ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە حشع یەکەم حیزب بوو دروشمی کۆماری لەم وڵاتەدا بەرز کردەوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە ئەم دروشمە لەسەردەمی سەرکردایەتیی ئەودا بێ سەرو شوێن بوو. منیش پوختەیەکم لەسەر تەوەری باسەکانی کۆبوونەوەکە تۆمار کرد. پاش ئەوە داڕشتنەوەی ئەو ڕاپۆرتەم خرایە ئەستۆ کە بەناوی کۆبوونەوەکەوە دەرچوو.

دوای شۆڕشی تەمووز دەستمان کرد بەزیاد کردنی ژمارەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی‌و مەکتەبی سیاسیی حیزب تا تێکڕا گەیشتە ٣٣ ئەندام‌و پاڵێوراو. ئەوە لە مێژووی (حشع)دا ـ تا ئەو کاتە ـ ژمارەیەکی پێوانەیی بوو. (زکی خیری)و(محمد حسین أبو العیس)و (عبدالقادر اسماعیل) لەو یەکەمین کەسانە بوون کە هێنرانە نێو کۆمیتەی ناوەندی. (عبدالقادر اسماعیل) پاش دوورخستنەوەیەکی زیاترلە بیست ساڵ لە سووریا گەڕایەوە. هەروەها (زکی خیری)و (محمد حسین أبو العیس) نوێترین کەس بوون خرانە نێو مەکتەبی سیاسیی حیزب. عەزیز محەمەدیش لە کۆبوونەوەی ساڵی ١٩٥٩ی کۆمیتەی ناوەندیدا هێنرایە نێو مەکتەبی سیاسی. لەو کەسانە بووم کە بەدەنگدانی نهێنیی دەنگیان بۆدا.

بەم بۆنەیەوە باسی ئەوە دەکەم کە کەریم ئەحمەد داودی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ئەوپەڕی تووڕە بوو و دەستبەجێ نامەیەکی کورتی خستە بەردەم‌و دەست کێشانەوەی خۆیی لە ئەندامەتیی حیزب تێدا ڕاگەیاند. (سلام عادل) لەو پارچە کاغەزە ئاگاداری کردینەوە کە دەست کێشانەوەیەکی تێدا بوو. هۆیەکەی لای ئێمە ڕوون بوو : نارەزایی بوو دژی ئەوەی کە عەزیز محەمەد لە بریی ئەو هێنراوەتە مەکتەبی سیاسی، خۆیی بە شایستە تردەبینی بۆ ئەندامەتیی مەکتەبی سیاسی‌و ئەوەی لە عەزیز دەگرت کە پێشتر سەرکردەی تاقمی ڕەنجدەران بووە. ئەو مەسەلەیەی

به گوێدا نەدەچوو کە ئەوانی دیکە قەناعەتیان بەوە نییە ئەو بخرێتە نێو مەکتەبی سیاسی. (سلام عادل) لەگەڵیدا نەرمونیان‌و باش بووو، بەدرێژاییی دوو ڕۆژی تەواو هەوڵێکی بێ ئەندازەی دا تا دواجار قەناعەتی پێکرد دەست کێشانەوەکەی ڕابکێشێتەوە. پێم وایە ئەم هەڵوێستەی (سلام عادل) هەڵە بوو، ئەگەر چی بەتەنگەوە هاتنی بەرژەوەندی حیزب بۆ ئەوە هانی دابوو. باشتر وابوو دەست لەکەریم ئەحمەد هەڵبگیرێت‌و تەنگەتاو نەکرێت‌و هەوڵی زۆری نەدرێت بۆ قەناعەت پێکردنی تا واز لە بیروڕاو ئارەزووی دەست کێشانەوە بهێنێ.

(سلام عادل) لە کۆبوونەوەیەکی ساڵی ١٩٥٩ی کۆمیتەی ناوەندیدا مەسەلەی پاڵاوتنی (عزیز الحاج)ی بۆ ئەندامەیتی کۆمیتە خستە ڕوو و، بەوەپاساوی دایەوە کەعەزیز دەستی ڕۆژنامە نووسیی هەیە. من‌و عەزیز محەمەد یەك هەڵوێستمان هەبوو : من پاڵاوتنیم ڕەت کردەوەو کەمێك بەدرێژی باسی ئەوەم کرد کە ئەو لەبەندیخانەی بەعقووبە پشتی تێکردین‌و گەلێك هەڤاڵی دیکەیش بەم ڕاستییە دەزانن. کە لە پێشکەش کردنی ڕوونکردنەوەکانم بوومەوە، عەزیز محەمەد ڕایگەیاندو گوتی :

- (أبو سلام) هەرچییەکی گوت من لایەنگریی دەکەم‌و لەگەڵ ڕایەکەی ئەودام‌و دژی پاڵاوتنی (عزیز الحاج)م.

لەگەڵ ئەوەیشدا (سلام عادل) زۆرایەتیی دو سێیەکی دەنگەکانی بۆ پاڵاوتنی بەدەست هێنا، گەرچی پڕ بە پێستی ئەو پلەیە نەبوو و گرنگترین خەسڵەتی سەرکردەی سیاسیی شۆڕشگێڕی لەوڵاتێکی وەکوو عێراقدا تێدا نەبوو. دیارە ئەگەر (عزیز الحاج) لە دەرەوەی ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا بهێڵرایەتەوە، بەشێوەیەکی باشترو زیاتر سوودی بەحیزب دەگەیاند.

* * *

چەند ڕۆژێك دوای لە بەندیخانە دەرچوونم، سەر لەنوێ لە پشت دەستاژۆ (سوکان)ی ئۆتومبێل دانیشتمەوە. ماوەیەك بوو بەبێ ئەوەی مۆڵەتی لێخوڕینم

هەبێ، ئوتومبیلێکی گریسلەری ئەمەریکاییی گێڕ ئۆتۆماتیکم لێ دەخوڕی. ماوەیەکی کەمیش ئوتومبیلێکی ئۆستنی ئینگلیزیم لێ دەخوڕی، کاتی خۆی لە حەببانیە لە ئەفسەرێکی ئینگلیز کڕدرا بوو. دەستاژۆکەی وەك لە بەریتانیا نەریتی لەلای ڕاست بوو. ئەو وەختەی داوای وەرگرتنی مۆڵەتی لێخوڕینم کرد، لە لێخوڕیندا باشتر بوو بووم و لەوە دڵنیا بووم کە من بەبێ هیچ دەست گرتنێك دەردەچم. بە پێچەوانەی (جورج تللو)ی هاوڕێمەوە کە ئەویش داوای مۆڵەتی کردبوو، بەنامەیەکی (طه الشیخلي)ی بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغدا بۆ ئەفسەرێکی پۆلیسی هاتوچوو پشت ئەستوور بوو، نەك بەشارەزاییی خۆی لە لێخوڕیندا. باش لەبیرمە ئەو ئەفسەرەی کە (جورج تلوو)ی تاقی دەکردەوە لێی پرسی:

- بۆچی مەکینەی ئوتومبیل لە ڕادەی ئاسایی پتر گەرم دەبێ؟

جورج بەزەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە:

- (طه الشیخلي) سڵاوت لێ دەکات.

ئەفسەرەکە بە بزەوە هەڵیدایێ:

- ئای کە وەڵامێکی میکانیکیی نایابە!

ئیتر پلەی دەرچوونی بۆ جورج تۆمار کرد، چونکە لەبەرپرسێکی باڵا ترەوە ڕاسپێردرا بوو.

* * *

لەسەرو بەندی ئەو هەڵچوونە شۆڕشگێڕانەیدا (نووری شاوەیس)ی یەکێك لە سەرکردەکانی پارتیم ناسی و پێوەندیی دۆستانەی نێوانمان توندوتۆڵ بوو. کابرایەکی باش و قابیل و لەنێو دەورو پشتەکەیدا لەپیاوە پاکە کەم ژمارەکان بوو. لەپیاوێك دەچوو ناوازەی نێو ئەندامانی خیزانەکەی بێ کەسەرپاکیان یا شیوعی یان لایەنگری ئێمە بوون. لە چاوپێکەوتنێکدا باسی ئەوەی لەلا کردمەوە کە حەز دەکات پێوەندی بە (حشع)ەوە بکات. لێم پرسی : ئەی لەگەڵ پارتیدا چۆن دەبێ؟ وەڵامی

دامەوە کە ئێمە چیی لێ داوا بکەین ئەو وا دەکات : واتە لە پارتیدا بمێنێتەوە یا لێی بێتە دەر. مۆڵەتم دایێ تا مەسەلەکە بەرچاوی (سلام عادل) بخەم. لە کۆڕێکی بچووکی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیدا کە (سلام عادل)و (زکی خیری)و (محمد حسين أبو العيس)ی تێدا بوون مشتومڕمان لەسەر کێشەکە کردو پێکهاتین بۆ ئەندامەتیی (حشع)ی بپالێوین‌و بەسەڵتی پێوەندیمان پێوە بکات‌و هەروا بهێڵینەوەو نهێنیی ئەو پێوەندییەیش بپارێزین. مەکتەبی سیاسیی حیزب ڕەزامەندیی خۆیی لەسەر ئەم بڕیارە پێشان دا. دوای عێراق بەجێ هێشتنم پایزی ۱۹٦۰، لە هەواڵ‌و پێوەندیی ڕاستەقینەی بەحیزبەوە دابڕام‌و هیچم لێ نەدەزانی. شوباتی ۱۹۷۹ نەبێ کە لەشاری بەرلینی خۆرەلات پێی گەیشتم. ئەوە دوایین چاوپێکەوتنم بوو لەگەڵیدا. گوتی :

- من تا ئێستایش هەر ئەوەم کە لەسەردەمی (عبدالكريم قاسم)دا بووم - (مەبەستی پێوەندیی خۆی بوو بەحیزبەوە).

دوابەدوای چاوپێکەوتنم لەگەڵ (نووری شاوەیس)دا، کە چاوم بەعەزیزمحەمەد کەوت ئەم هەواڵەم پێ گەیاند.

ئەمە داوایەکی هاوچەشنی (عبدالوهاب محمود)ی سەرۆکی پێشووی سەندیکای پارێزەرانم بیردەخاتەوە بۆ قبوولکردنی لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا تا وەك بالوێزێکی عێراق - کە عبدالكريم قاسم دایناببوو - بە ئەندامەتیی حیزبەوە بچێتە مۆسکۆ، کاتی خۆی هاتنە ڕیزی (عبدالوهاب محمود)یشمان پەسند کردو پێوەندییەکی سەڵتەزەلامیی تایبەتی بۆ ڕێکخرا.

بەم بۆنەیەوە پێم خۆشە بە چەند وشەیەك باسی پێوەندیی (عبدالكريم قاسم) بە (حشع)ەوە بکەم. گەلێك قاو داخران‌و بڵاوکرانەوە لەو بارەوە کە ئەو شیوعی‌و ئەندامی حیزب بووە بەناوی خواستراوی (مطر)ەوەو، زۆر لە سەرۆکانی دەوڵەت‌و بەرپرسانی حکوومەتی‌و هیی دیکە ئەم قاوەیان جوویەوە. ئەوە قاوێك بوو فرێ

بەسەر ڕاستییەوە نەبوو. ئەو ئەفسەرێکی نیشتمانیی سەربەخۆ بوو و پێشەوایەتیی باڵی سەرەکیی جووڵانەوەی ئەفسەرانی ئازادیخوای بێلایەنی لە سوپای عێراقدا کرد. (سلام عادل) بۆی باس کردم کە (عبدالکریم قاسم) لە ڕێی (رشید مطلك)ی هاوڕێی پیاو چاکی خۆیەوەو جاروباریش لە ڕێی مولازم (حامد مقصود)ی ئەفسەری شیوعییەوە پێوەندیی بە (حشع)ەوە هەبوو.

بە باوەڕی من، (ماجد محمد أمین)ی دادخوای گشتی لەدادگای گەل کە(فاضل المهداوي) سەرۆکایەتیی دەکرد، لانی کەم بۆ ماوەیەکی دیاریکراو پێوەندیی بە(حشع)ەوە هەبوو. بەڵام (فاضل المهداوي) ڕۆژێك لە ڕۆژان نەهاتە نێو (حشع)، وەك (وصفي طاهر) کە خزمێکی (زکي خیری)و دۆستێکی شیوعیەکان بوو.

هێندی پێوەندیی بەدانیشتنەکانی دادگای گەلو شێوازی(فاضل المهداوي)یەوە هەبێ لەدادگاییکردندا ـ ئەمەیان بەزۆری بەشێوەیەکی نابابەتی لەسەری نووسراوە ـ ئێمەی بەرپرسانی (حشع) یا لایەنگر بووین بەبێ هیچ خۆلێ پاراستن (تحفظ)ێك یان لایەنگری خۆلێ پارێزو لەهەمان کاتدا ڕەخنە گربووین. خۆم ئەم ڕایەی دواییانم هەبوو. ئاشکرا کاری لە دانیشتنەکانی دادگاییکردنداو بلاۆکردنەوەی ڕووداوەکانی وەکوو خۆیان بۆ ڕای گشتی ڕاستەوخۆ لە ڕێی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە دیاردەیەکی هەناوی دیموکراسی بوو، چونکە خەڵکانی لایەنگری دەسەلاتداران و خەنیمەکانیان وەك یەك دەیانتوانی ڕاستەوخۆ ئاگاداری وردو درشتی دادگاییکردنەکە بن. پیاوی بە داد کاتێك دەکەوێتە بەراوردی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانەو کردەوەکانی ئەم ساڵانەی دواییی حوکمدارە بەعسیەکان کە بریتی بوون لە فڕاندنو گرتنی ملهوڕانەو ئەشکەنجەی دڕندانەو کوشتنی سەدانو هەزاران بە ئەشکەنجەدانو چەندین ڕێوشوێنی هەرچیو پەرچیانە تەنانەت بە بێ دانەوەی لاشەی کوژراوەکان بە کەسو کاریانو بەبێ دەرکردنی یەك وشە لە بارەیانەوە، دەزانێ دانیشتنەکانی دادگاییکردن تا چ ئەندازەیەك ئاشکرا بوون. لە چالاکیەکانی ئەنفالی دژ بە

کوردستاندا ساڵی ١٩٨٨ ژمارەی ئەوانە بە چەشنێکی بێ سەرەو بەرە بەبێ هیچ دادگاییکردنێك کوژران لە سەد هەزاری تێپەڕاندو زۆربەیان ژنو منداڵ بوون.
بەرپرسانو ئەندامانی حیزبی بەعس کە ساڵی ١٩٦٠ بە تۆمەتی پیلانگێڕان یا بە هۆی هاوبەشیکردنیانەوە لە هەوڵی خافلکوژ کردنی (عبدالکریم قاسم)دا دەستگیر کران، بە بەرچاوی هەموانەوەو لە دادگاکەی (فاضل المهداوي)دا و لە سایەی حکوومەتی (عبدالکریم)دا بە ئاشکرا دادگایی کران. پارێزەریان هەبوو داکۆکییان لێ دەکردنو، وەك خەڵك دەیانزانی بۆچی ئەمیان ریسوا دەکرێتو ئەویان بێ تاوان دەردەچێ، لە کاتێکدا (عبدالکریم قاسم)ی سەرۆکی دەوڵەتو (فاضل المهداوی)ی سەرۆکی دادگاکەیو (ماجد الامین)ی دادخوای گشتی بەبێ هیچ لێکۆڵینەوە یا دادگاییکردنێكو بەشێوەیەکی هەرچیو پەرچیانە کوژران.
ئەگەر لە عیراقی ئەو رۆژانەدا راوەرگرتنێکی ئازاد بکرابایە، چوار لەسەر پێنجی عیراقیەکان پشتگیریی دادگاییکردنەکانی (فاضل المهداوی)یان دەکرد. بۆیە ئەوە بە راستی دادگای گەل بوو، بەڵام ئەگەر پێوانە ژیاریەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو لەبەر چاو بگرین، ئەوا (فاضل المهداوی) جاروبار لە دادگایکردندا پەنای دەبردەبەر چەند رێو شوێنێکی ناپەسەند، وەك هەڵدانی لەسەر قسەی تاوانبارانو شتی وا.
تاوانبارانی دانیشتنێکی دادگا کە لە بەرپرسانی حیزبی بەعس بوون، زانیاریو قسەکانیان پێچەوانەی راستیە مێژووییەکان بوونو مەبەستیان لەوە رەتکردنەوەی ئەو تاوانانە بوو کە درابوونە پاڵیان. (عزیز الشیخ) لەماڵەوە دانیشتبوو و تەماشای تەلەفزیۆنی کرد بوو، کە ئەوەی بیستبوو بە تووڕەییەوە هەستا بوو و بیستۆکی تەلەفۆنی هەڵگرتبوو تەلەفۆنی بۆ دادگای گەل کرد بووو قسەی ئەوانی بە درۆخستبووەوەو ئامادەیی خۆیی پێشان دابوو شایەتی لەبەر دەم دادگادا بدات.
بەخێر هاتنیان کردبووو داوایان لێ کردبوو دەمو دەست ئامادە ببێ. شایەتیەکەیمان بە تەلەفزیۆن بیست. بەلای هەموومانەوە شتێکی کتو پڕ بوو. ئەوە بێزاریو

نارەزاییی لە نێوماندا هورووژاند، چونکە پیشەی ئێمە نەبوو بەهیچ شێوەیەك خراپی دەرهەق بە رابردووی ئەوانە بکەین، لە کاتێکدا پێوەندییەکی بەرەیی‌یان لەگەڵماندا هەبوو. ئێمە بە جۆرێکی جیاواز لە ئێستای بەعسیەکان دەمانڕوانییە رابردوویان، وەك چۆن پێداگربووین لەسەر پەردە هەڵنەماڵین لە رووی هیچ نهێنییەکی هاوپەیمانەتیەکانی پێشوو بەشێوەیەك کە خراپەکاریی بۆ هاوپەیمانەکانمان تێدا بوو بێ. (سلام عادل) لەو کەسانە بوو کە لە (عزیز الشیخ) نارەزاو بەقین بوو و، راوێژی پێ کردین چی بکەین. رێك کەوتین لە رۆژنامەکەماندا (یەکگرتنی گەل ـ اتحاد الشعب) سەر کۆنەیەکی ئاکاری (عزیز الشیخ)و داوای لێبوردنێك لەو رووداوە بڵاو بکەینەوە. لایەنەکانی دیکەی (بەرەی یەکگرتنی نیشتمانی) ش نارەزایی‌یان بەرانبەر دەربڕیو هێندێکیان داوای سزای توندتریان لێ کردین. بەڵام (کامل الجادرچی) گوتی : ئەوەی کە لە رۆژنامەکەتاندا بڵاوکرایەوە مەبەستەکە بەدەستەوە دەدات.

* * *

پاش شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ بۆ یەکەم جار چاوم بە (کامل الجادرچی) کەوت. بۆ ناسین و رێز لێنان سەرم لە ماڵە نیوچە ئەریستۆکراتیەکەی دا لە گەڕەکی (الکسرە)ی بەغدا. بۆم دەرکەوت برادەرایەتیی خۆش و بەدەست و دڵەو بایەخ بە کتێبخانە گەورەکەی دەدات و سوورە لەسەر دەوڵەمەندکردنی. کە هاتینە سەر باسی بارودۆخی سیاسی و ئەوە کە لە گۆڕانکاریەکانی دواییدا چیمان پێ باشترە، (کامل الچادرچی) لەسەر سیاسەتی ئێمە هەڵێدایی و چیرۆك ـ یا نوکتە ـ یێکی بڵاوی نێو بەغدائییەکانی بۆ گێڕاینەوە: (یا چەقۆ یان کێری مەلا). (نصیر)ی کوڕی، لاوێکی ئەندامی (حشع) بوو. کاتێك هات قاوەمان بخاتە بەردەم، (کامل الچادرچی) بە گاڵتەو راستییەوە گوتی:

ـ تکام وایە ئامۆژگاریی (نصیر)ی کوڕم بکەن تا بەشێوەیەکی دۆستانە لەگەڵ باوکیدا بجووڵێتەوەو بە بۆرجوازییەکی دوژمنی دانەنێ.

هەر لەم رووەوە، دیاردەیەکی تێبینیکراو و گشتی لە عیراقی سالانی چل و پەنجادا ئەوە بوو زۆربەی کوڕانی پیاوە نیشتمانپەروەرەکانی دژ بە ئیمپریالیزم و جار نا جاریش کوڕانی کەسایەتیە نا نیشتمانپەروەرەکان لە باوکانیان جوێ دەبوونەوە و رێی چەپڕەوییان دەگرت و دەچوونە ریزی حیزبی شیوعییەوە.

هاتنە ریزی (حشع)ی کوڕانی چینی ئەریستۆکراتی و پیاوانی چینی حوکمدار و هێندێك گەورە دەرەبەگی کورد و عەرەب بە پێچەوانەی خواست و ئارەزووی باوکانیانەوە، شتێکی دەگمەن نەبوو. من ئەو دیاردەیە بە دوو شت لێك دەدەمەوە: تەشەنە کردنی تیۆرو چەپاندن و بێبەشکردنی گەل لە ئەنجامدانی مافە دیموکراتیەکانی لەلایەکەوە، راستیی سیاسەت و پەلهاوێشتنی لایەنگریی گەل لە حشع لەلایەکی دیکەوە.

* * *

بەر لە شۆڕشی تەمووز دوژمنایەتیکردنی ئیمپریالیزم و رژێمی پاشایەتی (عبدالكريم قاسم) و (عبدالسلام عارف)ی جووتە ئەفسەری نیشتمانپەروەری لە چوارچێوەی جوولانەوەی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا کۆکردەوە، لە کاتی جێبەجێکردنی چالاکیە عەسکەریە بە جەرگانەکەی کودەتایشدا (عبدالسلام) لە بەردەستی (عبدالكريم)دا کاری کرد. دوای سەرکەوتن (عبدالسلام) پلەی بەرپرسی دووەمی دەوڵەتی گرت و، لە رووی سیاسییەوە لە چاو (عبدالكريم)ی هاوڕێیدا راستڕەو بوو. بەلام پاش نەمانی رژێمی پاشایەتی لەبەر هەم ناکۆکیی فیکری ـ سیاسی لە نێوانیانداو هەم بەیەکدادانیان لەسەر کورسیی پێشەوایەتی، هێندەی نەخایاند دەسەلات وەرگرتن پێوەندیی دۆستانەی دوایی پێ هێناو ململانێیەکی توندو تیژ لە نێوانیاندا جێی گرتەوە. لە جەنگەی ئەم ململانێیەدا دەبوو هەریەکەیان بەشوێن یەکێك لەناوەندو هێزە سیاسیە جەماوەریەکاندا بگەرێ تا پالی پێوە بدات و ئەویش پشتگیریی بکات. (عبدالسلام عارف) بە حوکمی خولیا نەتەوەییە راسترەوەکەی و لە

گەڕانیدا بەشوێن پاڵپشتێکدا رووی کردە ناوەندە نەتەوەییە راستڕەوەکان بە تایبەت بەعس. لە کاتێکدا (عبدالکریم قاسم) رووی کردە هێزە دیموکراتییە چەپڕەوەکانو بە تایبەت (حشع) کە بە بەربلاوی دەستی لە نێو گەلدا دەڕۆی، ئەویش دامەزراندنی جۆرەپێوەندییەکی - نەنووسراوی - دۆستانەو هاوپەیمانانەی نێوان هەردوولا - عبدالکریم قاسمو شیوعیەکان - بوو. عبدالکریم بە تایبەت لە قۆناخی پەیمان بەستنیدا لەگەڵ (حشع)دا گرنگترین دەسکەوتەکانیی بۆ لە رووی سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە سەقامگیرکردنی سەربەخۆیی نیشتمانی بەدی هێنا، چونکە لە پەیمانی بەغداو تەوقی ئیستەرلینی دەرچووو یاسای چاککردنی کشتوکاڵی داناو بەوە لایەنگریی جەماوەریی رژێمەکەیی یەکجار زیاد کرد. دوابەدوای سەرنەکەوتنی (عبدالسلام عارف) لە هەوڵەکانیدا بۆ رێکخستنی کودەتایەکی عەسکەریی تازە کە گەیشتنە کورسیی باڵاتری حوکمی بۆ دەستەبەر بکات، پێوەندیی نێوانیان تێکچوو کۆتایی پێ هات. کە عبدالکریم دەستی لە سەرکەوتن گیر بوو زیاتر لە خۆی گۆڕاو خولیای دیکتاتۆریی عەسکەری - تاکڕەویی تاوی سەند. ئەوەندەی پێ نەچوو پشتی کردە هاوپەیمانە شیوعیەکانیو دوژمنایەتیی خەنیمە نەتەوەییەکانی کەمکردەوە.

* * *

(جمال عبدالناصر) بە توندی دژی بەستنی پەیمانی بەغداو چوونە پاڵ ئەو پەیمانەی رژێمی پاشایەتیی عیراق راوەستا. لە قۆناخێکی دیاریکراودا پێشەوایەتیی خەباتی نەتەوەییی ئازادیخوازانەی نەتەوەی عەرەبی کرد دژی ئیمپریالیزمو هاوپەیمانەکانی لە ناوچەکەدا. بۆیە سروشتیو گرنگیش بوو بە گەرمیو توند پێشوازی لە شۆڕشی ١٤ی تەمووز بکات هەر لە یەکەمین سەعاتەکانیەوە. بەڵام پێشهاتەکانی دوایی روونیان کردەوە کە ئەم پێشوازیکردنەی لە ئارەزووی ئەو بەدەر نەبوو بۆ ئەوەی دەست بەجێو بەبێ هیچ لەبەرچاوگرتنێکی بنچینەکانی دیموکراسی

عیراقی نوێی تازەکی ئازادکراو بداتە پاڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو (کە ئەوسا لە میسرو سووریا پێکهاتبوو). لە عیراق خۆیشیدا حیزبی بەعس بۆ گەیشتن بە حوکم نەك دروشمی یەکێتیی ، دەمو دەست یا یەکسەر چوونە نێو ئەو یەکێتییەی بەرزکردەوە (کەچی لە قۆناخەکانی حوکمداربوونیدا هەموو یەکێتیەکی دەمو دەستی رەتکردەوە). ئێمە دژی یەکێتی رانەوەستاین، بەلاّم دروشمێکی باشترو پتر مەنتیقیو بە دەنگەوە هاتووی داواکاریەکانی هەلو مەرجەکەمان دارشت ـ دروشمی یەکگرتنی فیدراڵی. داوایشمان کرد یەکگرتنەکە لەسەر بناخەیەکی دیموکراتی دابمەزرێت، بە رەچاوکردنی تایبەتمەندە مێژووییە ناوچەییەکانی هەر ولاّتێك. ئەم هەڵوێستەمان پشتگیریی بەشی هەرە زۆری گەلی عیراقو رژێمی (عبدالکریم قاسم)یشی بە نسیب بوو. دەکرێت جەخت بکەین کە کاتێك (جمال عبدالناصر)کەوتە دژایەتیکردنی رژێمی عبدالکریمو (حشع)و پشتگیریی بەعسیەکانو (عبدالسلام عارف)و گرەوی لەسەر ئەوە کرد داوایان لێ بکات دەست بەجێ بێنە نێو یەکێتیەکەوە، هەڵەیەکی مێژوویی کرد. تەنانەت ئەگەر بۆیشی بلوایەعیراق بخاتە نێو کۆماری عەرەبیی یەکگرتووەوە، ئەوا سەرەنجام ئاکامەکەی هەمان رووداوی ساڵی ١٩٦٠ی سووریا دەبوو.

* * *

یانەی کوردانی فەیلی لە بەغدا ئاهەنگێکی گێڕا لەسەر شەرەفی هەم مەلا مستەفای بارزانی دوابەدوای هاتنەوەی لە دوورە ولاّتو هەم ئێمەی تاقمێك لەو شیوعیانەی کە پاش شۆڕش لە بەندیخانە دەرچووین. (فاضل المهداوي) و (ماجد الامین) و (وصفي طاهر) لە نێو بانگکراوەکاندا بوون. چەند سروودو گۆرانییەکی نیشتمانی لە ئاهەنگەکەدا پێشکەش کرانو، چەند هوڕا کێشانێکی هەمە چەشنەی دژی کۆلۆنیالیزمو کۆنەپەرستییان تێهەڵکێش بوو. کە جەماوەر بە شێوەیەکی پڕ خۆش هوڕای بۆ ژیانی بارزانی کێشا، بارزانی هەستاو ئامادەبوانی بێ دەنگ کردو

ـ بە نەریتە ساکارە جووتیار ئاساکەی ـ داوای لێکردن هوڕا بۆ ژیانی پێشەوا عبدالکریم قاسم بکێشن نەك ئەو کە ـ بە قسەی خۆی ـ شەرەفمەنددەبێ هەر ئەوەندە ببێتە قەیتانی پێلاوەکانی پێشەوا عبدالکریم.

لەم ئاهەنگەدا شتێکی کتەو پڕی بچووکم بە ڕیشەوە بوو، لە ناکاودا کابرایەك هاتە لامو بە گەرمی تەوقەی لەگەڵدا کردمو لێی پرسیم :

ـ مامۆستا دەمناسی؟

ـ نەخێر نەمناسیوی. جەنابت کێی؟

ـ مـن (پاشا)ی هاونیشتمانم، خاوەنی ئەو خانووەی کە ئەیلوولی ١٩٤٩ مانگێکی رەبەق بەندکراو ئەشکەنجەدرا لەبەر ئەوەی ئێوە لە هۆدەیەکی خانوەکەدا بوون لە (باب الشیخ). بیرتە؟ خانوەکەتان چۆڵ کرد ئەمجا بەسەریاندا داو گرتمیان.

ـ بەڵێ باش لە بیرمەو شادمانم کە لێرە دەتبینم دوای رووخانی ئەو رژێمەی کە ئێمەی راوەدوونا و تۆیشی بەندکردو ئەشکەنجەی دای.

* * *

لە شوباتی ١٩٥٩دا بۆ یەکەم جار بووم بە هەڵگری پاسپۆرتێکی یاسایی عیراقیو بۆ بەجێهێنانی داوەتی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی لە نێو وەفدێکدا سەفەرم کرد بۆ مۆسکۆ تا وەك میوان لە کۆنگرەی بیستو یەکەمیدا هاوبەشی بکەین. وەفدەکە (سلام عادل)ی سکرتێری حیزب سەرۆکایەتیی دەکرد. لە فڕۆکەیەکی (کەی ئێلْ ئێم)دا بەغدامان بەجێ هێشتو لە یەکێك لە بالآترین ئوتێلەکانی (ئەمستەردام)لەسەر حسێبی ئەو کۆمپانیایە کە هەڵیگرتین ماینەوەو، چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو فڕۆکە سۆڤێتیەمان دەکرد کە بۆ مۆسکۆ هەڵیدەگرتین. ویستمان کەڵك لەوە وەربگرین کەلە (هۆڵەندە)ین، بۆ یەکتر ناسین دیدەنیی بارەگای حیزبیشیوعیی هۆڵەندەمان کرد. سواری پاسێك بووینو ناونیشانی حیزبی شیوعیمان لە بلیتبڕ (جابی)ەکە پرسی. کە زانیی ئێمە بێگانەین، مشووری

خواردین. ناوی ئەو وڵاتەی لیٚ پرسین کە لێیەوە هاتووین. بیٚ هوودە هەوڵمان دا تێی بگەیەنین عیراق لە کوێیە، هەرگیز ناوی عیراقی نەبیستبوو، ئەگەر چی شۆڕش هەواڵەکانی عیراقی لەسەر ئاستی جیهان خستبوە پێشەوە. ئەم بلیتبڕە هۆڵەندییە بە رادەیەك لە سیاسەت، هەتا لە بیستنی هەواڵی رادیۆو تەلەفزیۆن دوور بوو، ناوی عیراق‌و شۆڕشی ١٤ی تەمووزی نەبیستبوو. کە (عبدالرحیم شریف) پێی گوت ئێمە لە بەغدای شاری هەزارو یەك شەوەوە هاتووین، کابرا وەڵامی دایەوە :

- بەغدای هەزارو یەك شەوە باش دەزانم‌و زۆر جار چیرۆکەکانیم خوێندووەتەوە. ئێستاکە هەموو شتێك روون‌و ئاشکرایە.

لە فڕۆکە خانەی مۆسکۆ ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی چاوەڕێی دەکردین. بۆ ئەو ڤێلایە گوێزراینەوە کەماڵی ستالین بوو تا رۆژی کۆچی دواییکردنی. بینایەکی ساکار بوو، ناوماڵێکی ئاسایی تێدا بوو. حەوزێکی مەلەی سادەو هاوینەی سەر بەرەڵا لەبەر دەم بیناکەدا بوو، قووڵیەکەی وا دیاریکرابوو کە لەگەڵ بالای کورتی (ستالین)دا بگونجێت. هێندێك لەو دارە مزرەمەنیانە لە قوژبنی باخەکەی دەرەوەی بیناکەدا بوون کە دەیانگوت ستالین کاتی خۆی پەرۆشی خزمەتکردن‌و شەونخوونی پێوە کێشانیان بووە. دارستانێك دەوری بیناکەی دابوو یەکێك بوو لە دارستانەکانی دەوروبەری مۆسکۆ. بینایەك لەولا بیناکەی دیکەوە هەر لە نێو دارستانەکەدا بوو، جاران بارەگای پەل (فصیل)ی پارێزگاریکردن بوو و دوایی کرا بوو بە نەخۆشخانەیەکی سەر بە کۆمیتەی ناوەندی.

بایەخێکی تایبەتی درا بەوەفدەکەمان، چونکە وەفدی یەکێك بوو لە حیزبە شیوعیە گەورەکانی وڵاتانی جیهانی سەرمایەداری. سۆڤێتەکان بۆ رێزنان لە نەخشی (حشع)و پایە دیارەکەی پێیان راگەیاندین وەفدی ئێمە یەکەم وەفدی نێو میوانەکان دەبیٚ گوتاری خۆی بخوێنێتەوە. ئەوەمان بە جۆرە ئیمتیازێکی گەورە دانا

به حیزبمان بەخشرا بێ. بەڵام کتو پڕ دۆخەکە گۆڕا چونکە وادەی خوێندنەوەی گوتارە ئامادەکراوەکەمان هات، کەچی وەفدێکی دیکە بانگ کرا گوتارەکەی بخوێنێتەوەو فەرامۆش کراین بەبێ ئەوەی هۆیەکەی بزانین. ڕۆژی دوایی هۆیەکەیمان زانی! گوتارەکەمان هیچ بە شانو باڵ هەڵدانێکی (عبدالکریم قاسم)ی تێدا نەبوە، بەرپرسانی بەشی نێو دەوڵەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی سۆڤێتیش بەمە ڕازی نەبوون. تکامان لێ کرا ئەم پێدا هەڵدانەی ناوکێش بکەین. ئەوە چی دەگەیەنێ؟ مانای وایە ئێمە ئازادنین گوتار بە ناوی وەفدەکەمانەوەو لەسەر هەلو مەرجی ئەو وڵاتە کە لێیەوە هاتووین بخوێنینەوە. بەڵکە دەبێ گوتارەکەمان لەگەڵ ڕای سەرکردایەتیی سۆڤێتیدا لەسەر خودی عبدالکریم هاوجووت بێ. بەواتایەکی دیکە، پێوەندیی نێوان ئێمەو سەرکردایەتیی سۆڤێتی لەسەر بنچینەی هاوسانیی ڕاستەقینە هەڵنەچندراوە، بەڵکوو پێوەندییەکە لە نێوان سەرکردەو سەرکردایەتیکراودا.

هەمووماں یان زۆربەمان ناڕەزاییمان لەم کردەوەیە دەربڕی. بەڵام پێمان بە جەرگی خۆماندا ناو ملمان بۆ کەچ کردو ڕستەی "کوڕی بەخشندەی گەل" (ابن الشعب البار)مان وەك پێدا هەڵدانێك بە خودی (عبدالکریم)دانا و ئاخنی گوتارەکە کرد. دوای ئەوەو دوو ڕۆژ پاش ئەو وادە دیاریکراوە ڕێیان پێدایـن گوتارەکە بخوێنینەوە. دیارە ئەم ڕستەیە بیۆکەیەك بوو خرایە نێو هێڵی سیاسیمانو، لە درێژاییی قۆناخی دوایی لە ڕووی ڕێبازی سیاسیمانەوە بەرانبەر بە دەسەڵاتداران زۆر لەسەرمان کەوت. بەواتایەکی تر، ئەوە دەربڕینی گەوهەری ئەو ڕێبازە بوو کە دواتریە پەرەسەندنی نا سەرمایەداری ناودێر کرا.

لە کاتی مانەوەماندا لە مۆسکۆ چاومان بە گەلێك سەرکردەی حیزبە شیوعیەکان کەوت، لەوانە ئایدت (یا عائید ـ وەك خۆی ئاماژەی کرد)ی سکرتێری حیزبی شیوعیی ئەندەنووسیا کە ئەوسا سەرکردایەتیی یەکێك لە گەورەترین حیزبە شیوعیەکانی جیهانی سەرمایەداریی دەکرد. ئایدت گوێی لە قسەکانمان گرت

لەسەر شۆڕشی ١٤ی تەمووزو دەستڕۆیی بێ ئەندازەی حیزبمان و تین و توانی زۆرو زەبەندی خەباتگێڕانەی، بۆیە هەڵیدایێ و گوتی :

- لە ئەندەنووسیا بە دۆخێکی ئاوادا تێپەڕ بووین و پێمان وابوو هەموو کاروبارەکان لە دەستی خۆماندان. پاشان دەرکەوت ئێمە خەیاڵ پلاو بووین.

شتی جێی داخ ئەوەیە، ئایدت تەنانەت دوای ئەو قسە ئاماژە بۆ کراوەیشی لەگەڵماندا و تا حیزبی شیوعیی ئەندەنووسیا تێکشکاو لە ١٩٦٥دا خۆیی کوشت، هەر لە خەو و خەیاڵدا دەژیا.

ئەندامانی وەفدەکە پاش کۆنگرەی سۆڤیێتی گەڕانەوە بۆ عیراق و من لە مۆسکۆ مامەوە بۆ چارەسەر کردنی کۆنەدیزانتریەکەم کە دە ساڵ بوو تووشی بوو بووم. یەک مانگ لە نەخۆشخانەیەکدا گلدرامەوەو نەخۆشیەکەم بە تەواوی چارەسەر کرا، ئەنجا برامە نەخۆشخانەیەکی دیکە، لەوێ لە یەک ڕۆژدا نەشتەرکارییان بۆ لووتی من و (علی الوتار) و (عبدالامیر عباس) کردو چەند ڕۆژێک تێیدا ماینەوە. (ناتاشا)ی پەرستاری شۆخە کچی ڕووسیایی بەرادەیەک خزمەتی کردین وامان بە خەیاڵدا هات ڕایانسپاردبێ. بەڵام سەرنجمان دا لەگەڵ هەموو نەخۆشەکاندا ئەمە کاری بوو و، هەموو نەخۆشێک وەکو کچە هاوڕێیەکی تایبەتی خۆی تێی دەڕوانی. بیست ساڵ لەوە بەدوا ئەم پەرستارەم بینی یەکێک بوو لە مامۆستاکانی زانکۆی مۆسکۆ.

لە نەخۆشخانە بووم کە بیستم (عبد الوهاب الشواف)ی فەرماندەری مەرقیعی مووسڵ هەوڵی داوە کودەتایەکی عەسکەری ڕێک بخات. ئەم هەواڵە مایەی ئەوپەڕی نیگەرانی بوو و وای لێکردم لەگەڵ ڕادیۆ چکۆلەکەمدا شەوخوونی بکێشم. بە درێژاییی شەو تا بەیانی ڕادیۆکەم لەلا بوو. هەتاوکەوتنان (گارشین)ی یاوەری پیاو چاکی ڕووسی هاتە لام پیرۆزبایی سەرنەگرتنی هەوڵی کودەتاکەم لێ بکات. پاش گەڕانەوەم بۆ بەغدا لە دوا دواییەکانی نیسانی ١٩٥٩دا، ئەنجا بۆم هەڵکەوت ورد و

درشتی رووداوەکەی مووسلّ بزانم. زانیم هەوڵەکە لەلایەن (عبدالوهاب الشواف)و چەند دەستو پێوەندێکیو هێندێك کەسی کۆنەپەرستی سەر بەشێخانی خێڵەکانو بنەماڵە ئەریستۆکراتیەکانی مووسڵەوە رێك خرا. (جمال عبدالناصر) هاوبەشێکی کارای نەخشەکێشانو چالاکیەکە بووو لە حیسابەکانیدا هەڵەی کرد. ژمارەیقوربانیان لە شیوعیەکانو لایەنگرانی دیکەی رژێم نێزیکەی سەد کەس بوو، بەرانبەر بە ٤٠ کەس لە قوربانیانی لایەکەی دیکە. خولیای تۆڵە سەندنەوە بەسەر ئاکاری بەرپرسە ناوچەییەکانی حیزبی شیوعیدا زاڵ بوو، بۆیە لەوەختێکدا کە هەوڵەکە سەرکوت کرا بوو حەڤدە کەسیان ـ ئەوانە لە چل کوژراوەکەن ـ لە دیارترین خەنیمە سیاسیە لایەنگرەکانی هەوڵی کودەتاکە کوشتبوو.

(حمزە سلمان)ی پارێزەری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبمان لە سەروبەندی رووداوەکاندا وەك سەرپەرشتیارێکی حیزبی لە بەغداوە بۆ مووسڵ نێردرا بوو. کاتێك پێی گەیشتم (محمد حسین العیس)و (زکی خیری)و(جورج تللو) لەوێ بوون کاتێك لەسەر کوشتنی ئەو حەڤدە کەسەی دوای خەفە کرانیڕاخیبوونەکە گلەییم لێ کرد. دەستی بۆ گیرفانی چاکەتەکەی بردو نامەیەکی دەرکردو دایمیو گوتی:

ـ چاوەڕوانی ئەم گلەییەم لە تۆو لە هەڤاڵانی دیکە دەکرد، بۆیە ئەم نامەیەم پاراست تا داکۆکیی پێ لە خۆم بکەم. ئێستا تکا دەکەم بیخوێنیتەوەو بمدەیتەوە.

نامەکەم خوێندەوە. بە دەستخەتی جەمال حەیدەریو بە ئیمزای مەکتەبی سیاسییەوە نێردرا بوو. ئەو رێنوێنیانەی کە تێیدا نووسرا بوون، سەرپەرگر بوون چونکە فەرمانیان دابوو سوود لەو هەلوێستە وەربگیرێ بۆ پاکتاو کردنی سەرانی دوژمن. جا نەمزانی ئاخۆ جەمال حەیدەری بە رێککەوتن لەگەڵ (سلام عادل) یا کەسێکی دیکەیشدا ئەم نامەیەی نووسیبوو یان نا. سەرەڕای ئەم سەرپەرگریەو سەرەڕای پێویستی سەر کۆنەکردنی کردەوەی هەڤاڵانی ئەوێمان، دادپەروەری لەوەدایە پێشەکی رەفتارو تاوانەکانی سەرانی ئەو یاخیبوونە عەسکەریە سەر کۆنە

بکرێن کە لە یەکەم رۆژی یاخیبووندا شەش ئەوەندەی ئەم ژمارەیەیان کوشتو لەوانە (کامل القازانچی)ی پارێزەری دیموکراتیی هەڵکەوتوو.

*　　*　　*

کە لە مۆسکۆوە گەڕامەوە بۆ بەغدا بە (لوبنان) دا ڕەت بووم‌و سێ رۆژم تێدا بەسەر برد. ئەو ماوەیە پێتەختی جوانی وڵاتەکەو شارەکانی (الجزین)و (دیر القمر)و چەند ناوچەیەکی دیکەم بینی. هێندێك دانیشتووی چاخانەیەك لە (الجزین) داوایان لێکردم‌و ڕێیان بدەم تەماشای ئەو چەند رۆژنامە رۆژانەیە بکەن کە لە بەیرووت کڕیبوومن. لێم پرسین: بۆ خوێندنەوە چ رۆژنامەیەکیان بەلاوە باشە، وەڵامیان دایەوە:

- یا (النداء) کە رۆژنامەی حیزبی شیوعیی‌لوبنانە، یان (الدستور) کە رۆژنامەیەکی مەسیحی ڕاستڕەوی‌کەم‌و زۆر سەرپەڕگرە.

کە لە بیروت سەرم لە نووسینگەی رۆژنامەی (النداء)دا بە (احمد غریبە)ی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی لوبنان گەیشتم‌و بە سیفەتە حیزبییەکەمەوە خۆمم پێ ناساند. بە پێچەوانەی داب‌و نەریتی ئێمەوە لە بەغدا، داوەتی نەك هەر پارچەیەك بگرە جگەرەیەکی پاکەتەکەیشی نەکردم کاتێك دەریهێنا تا جگەرە بکێشێ‌و جگەرەیەك بداتە (مصطفی العریس)ی برادەری.

*　　*　　*

پاش شۆڕشی تەمووز بۆ یەکەم جار بە (ڕەزا رادمەنیش)ی سکرتێری‌حیزبی توودەی ئێران گەیشتم کە لە ئەورووپاوە بەغدا هاتبووە بۆ نێزیکبوونەوە لە ئێران‌و چەند پێوەندیکردنێك بە پاشماوەی هەڤاڵانیەوە لەوێ. چەند رۆژێك لە ماڵمان مایەوەو بە مرۆڤێکی سادەو چاك‌و قابیل هاتە بەرچاوم، هیچ رۆژێك نەکەوتمە باس‌و خواس لەسەر چالاکیی حیزبی‌و بەرهەمی کاری خۆی‌و دۆخی داماویی حیزبەکەی. دوایی زانیم بە یارمەتیی (صالح دگلە) لە بەسرە پێوەندیی بە (عەباس)ناوێکەوە کرد بوو کە خۆیی بە کادیرێکی حیزبەکەی دانابوو. پاشتر دەرکەوت ئەم

(عەباس)ە هەر نۆكەرێكی ساواك (ئاسایشی گشتی)ی ئێران بووو، بەر لەوەی لەوەختێكی درەنگتردا لە لایەن تاقمی (فیداییی خەڵق)ەوە بكوژرێت، توانیی پاشماوەی ڕێكخستنەكانی توودە لە ئێران پاكتاو بكات.

* * *

لە گەرمەی هەستانی شۆڕشگێڕانەی تاوسەندووی جەماوەردا كە بەدوای سەركوتكردنی یاخیبوونەكەی (عبدالوهاب الشواف)دا هات، خۆپێشاندانی یەكی ئایاری ١٩٥٩مان لە بەغدا ڕێكخست. ڕێكخستنی شارە نێزیكەكانی وەك (نەجەف و كەربەلاو حللەو فەلووجەو دیالە.. تد)مان ڕاسپارد كرێكاران و لاوان بۆ بەشداری تێدا كردنی بنێرن. دروشمەكانیمان بۆ دیاری كردو بڕیارمان دا ببێتە فیستیڤاڵێكی كرێكاریی میللیی و دەستڕۆییی حیزبەو خواستی گەل ڕەنگ پێ بداتەوە. هەروەها بڕیارمان دا سەركردایەتیی (حشع) خۆیشی بەناوی (كەژاوەی ڕۆژنامەی یەكگرتنی گەل ـ اتحاد الشعب)ەوە هاوبەشیی خۆپێشاندانەكە بكات. كە خۆپێشاندانەكە سەرلەبەیانیی یەكی ئایار دەستی پێكرد، ئێمە وەك یەكەم كەژاوە هاتینە دەرێ،كەژاوەكە شەقامی (الرشید)ی لە (الباب الشرقي)یەوە بڕی و لە (باب المعظم) كۆتاییی پێ هات. كە لە (باب المعظم) نێزێك بووینەوە ڕووداوێكی سەیر بەسەر كەژاوەكەماندا هات : سەربازێك بە بەرگی ڕەسمییەوە لە ناوەڕاستی شەقامە گشتیەكەو بەردەم كەژاوەكەماندا ڕاوەستاو بە جۆشێكی زۆرەوە هوڕای كێشا:

ـ بژی كۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی عێراق بە ڕێبەریی (عبدالكریم قاسم)ی تاكە پێشەوامان.

پێدەچێ چاوەڕوانی بەدەنگەوە هاتنێكی پڕ خرۆشی وەك ئەوەكەی خۆیی كردبێ. بەڵام ئێمە قڕو قەپمان لێكرد، بۆیە ئەویش واق وڕماو شەقامەكەی بەجێ هێشت.

خۆپێشاندانەكە لە بەیانییەوە تا نیوەی شەو درێژەی كێشاو گەورەترین فیستیڤاڵی كرێكاری ـ میلیی لە مێژووی عێراقدا خستە ڕووو هێندێك خافلگیریی سیاسیی پێ بوو، بەتایبەت بەرزكردنەوەی دروشمی هاوبەشی (حشع) لە

حوكمدا. پتر لە نیو ملیۆنو تەنانەت نێزیکەی ملیۆنێك کرێکارو لاوو کەسانی دیکە لە شەقامی (الرشید) هوڕایان کێشاو داوایان لە عبدالکریم کرد شیوعیەکان بەشداری دەسەلات بکات. ئەمە لەکاتێکدا ئێمە لە مەکتەبی سیاسی سەرجەم دروشمەکانی خۆپێشاندانمان دەست نیشان کردو ئەم دروشمەمان تێ نەخست کە خەلك دەست پێشخەریی بۆ کردو ئامانجی ئەوەبوو هەم پالپشتی شیوعیەکان بکاتو هەم عبدالکریم نەورووژێنێ :

" بژی عەبدولکەریمەکەی پێشەوا، بوونی حیزبی شیوعی لە حوکمدا داوایەکی مەزنە ".

سلام عادل لە کەژاوەی " اتحاد الشعب"دا بەشداریی نەکرد. دوای بلاوە لێکردنی کەژاوەکە ئێمەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بە شەقامی (الرشید)دا دابەش بووین تا لەچەند بالکونێکەوە بڕوانینە خۆپێشاندانەکەو چاودێریی ڕادەی ڕێکخستنی بکەین. (محمد حسین ابو العیس) یەکەم کەس بوو سەرنجی پەیدابوونی ئەم دروشمە بڕیار لێ نەدراوەی دا. بۆیە چووە لای (سلام عادل) کە لەشوێنێکی نێزێك لە خۆی بوو. پرسیی ئاخۆ دەبێ ڕێ بەتەنینەوەی دروشمێکی پێشتر بڕیار لەسەر نەدراو بدەین، واتە دروشمی هاوبەشیی (حشع) لەحوکمدا؟ سلام عادل وەلامی دایەوە :

- بێلە بە دلی خۆیان هوڕا بکێشن، پێویست بەدەست تێوەردانو گۆڕانکاری ناکات.

ڕۆژی دوایی بۆ لێکۆلینەوەو هەلسەنگاندنی ئەنجامەکانی خۆپێشاندانەکە کۆبووینەوە. پاش لێدوانێکی تێرو تەسەل لە مەکتەبی سیاسی بڕیارمان دا دروشمی هاوبەشی لە حوکمدا بەدەستەوە بگرین بەو پێیە کە خواستی کرێکارانو جەماوەری دەردەبڕێ. جا بەڕاستیش وەها بوو. بڕیاریشمان دا هەلمەتێکی ڕاگەیاندن - ڕۆشنبیر کردن لەنێو ڕێکخستنەکانمانو نێو جەماوەردا بکەین بۆ پشتگیریی ئەم داوایە. کۆبوونەوەکە بلاوکردنەوەی چەند گوتارێکی بۆ هەمان ئامانج لە ڕۆژنامەی (اتحا

الشعب)دا پێ سپاردم‌و، کردم. هەڵمەتەکەمان لە نێو جۆش‌و خرۆشی ئەندامان‌و لایەنگرانی حیزبدا بەردەوام بوو، کاتێك یادداشتێکمان لەسەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی سۆڤیێتییەوە پێ گەیشت، ڕەخنەی لێ دەگرتین لەسەر داوای هاوبەشی لە حوکمداو هەڵوێستەکەمانی بەسەر پەڕگریەکی چەپڕەوی لە قەڵەم دەداو جەختی دەکرد کە پێویستە پاڵپشتی دەسەڵاتی عبدالکریم بکرێت دژی ئەوفیلێ‌و دەهۆ ئیمپریالیانەی‌کەدووچاری دەبن‌و مەبەستیان ڕووخاندنیەتی.

بەر لە گەیشتنی ئەم یادداشتە لە سەرکردایەتیی سۆڤیێتییەوە زۆربەمان لە سەرکردایەتیی (حشع) سەرمان لە دەسەڵات وەرگرتن دەخورا. وا دەمانڕوانیە دروشمی هاوبەشیی حوکم کردن کە هەنگاوێکە ڕوو بەدەسەڵات وەرگرتن. ئەم ئاواتەمان ڕەوا بوو، چونکە (حشع) بەهێز ترین حیزبی سیاسیی وڵات‌و حیزبی زۆربەی ڕاستەقینەی گەل بوو. بۆیە مافی خۆی بوو بە پێی هەموو داب‌و نەریت‌و پێوانەیەکی دیموکراتیانە ببێ بەحیزبی حوکم بەدەست لەوڵاتدا. بەڵام یادداشتی (یانامەی) سەرکردایەتیی سۆڤیێتی تەنیاخۆتێهەڵقورتاندنی خەڵکانێکی خۆلێگۆڕاو بوو کە لە هەل‌و مەرجی ڕاستەقینەی عێراق بێ ئاگا بوون‌و لە مۆسکۆوە، لە دووریی هەزاران کیلۆ مەترەوە لە بەغدا، لە پشت مێزەکانیانەوە دادەنیشتن‌و خراپەیان دەرهەق بە پێوەندیی برایەتیی ئینتەرناسیۆنالانەی نێوان شیوعیەکانی وڵاتە جیاجیاکان دەکردو سیاسەتێکی چەوتی لەگەڵ واقیعی عێراقدا نەگونجاویان بەسەرماندا دەسەپاند، لەباتیی ئەوەی هەوڵ بدەن لە ڕێگەی ئێمەی خەڵکانی خەباتگێڕو شارەزای هەل‌و مەرجی ئەم وڵاتەوە لە بارودۆخی وڵاتەکەمان حاڵی بن. ئێمەیش لەلای خۆمانەوە دەست بەستەی ئەو ڕێ‌و ڕەسم‌و قەبڵاندنانە بووین کە ئەوسا لە پێڕەوی پێوەندیەکانی نێو جووڵانەوەی کۆمۆنیستیدا زاڵ بوون. دەروێشی سەرکردایەتیی سۆڤیێتی بووین‌و باوەڕمان وابوو کە لە ئێمەی شیوعیە عێراقیەکان پتر لە دۆخی وڵاتەکەمان تێ دەگات. ملمان بۆ فەرمانەکە درێژ کردو وازمان لە

دروشمی هاوبەشیی حوکمکردن هێناو، دواتریش بەدرێژاییی سەردەمی عبدالكريم وازمان لە ئامانجی بەدەسەلات گەیشتن هێنا. پێم وایە ئێمە ئەگەر زیاتر بە ئەزموون‌و پێگەیشتوو بووینایە، داواکەی سۆڤێتیەکانمان ڕەت دەکردەوە. بەلاّم لەبەدیهێنانی ئەو ئامانجە ڕەوایەدا کە هەموو حیزبێکی سیاسی لە پێناویدا پێکدێت، واتە ئامانجی بە دەسەلاّت گەیشتن بۆ بەدیهێنانی ئەو بەرنامە سیاسی - ئابووریەی کە باوەڕی پێیەتی‌و لەسەری دامەزراوە، هەلی مێژوویی تەمەنمان لە دەست دا.

لەو کاتەوە کە لە نیوەی ۱۹۵۹دا دەستمان لە هەولّی بە دەسەلاّت گەیشتن هەلّگرت، هێلّی سیاسیی گشتیمان بەرانبەر بە ڕژێمی عبدالكريم‌و بەرانبەر بە کێشەی دەسەلاّت بە گشتی‌لەسەر ڕێبازێکی ڕاستڕەوی کلکایەتی جێگیر بوو. بەلاّم چالاکی‌و نەخشەکانی حیزب بە گشتی‌و چالاکیی هێندێك لە ڕێکخراوەکانی بە تایبەتی لەسەر پەڕگریی چەپڕەوانەو کەلکەلّەی منداڵانە خالّی نەبوون. هەلّچوونی شۆڕشگێڕانەی تەشەنە کردووو فراوانیی چالاکیی جەماوەری‌و فراوانیی ڕێکخستنە حیزبی‌و سەندیکاییەکانمان لەولاّتێکی خۆرهەلاّتیی پاشکەوتوو و دووچاری چەپاندن‌و تیرۆردا بە درێژاییی دەیان سالّی ڕابردوو لەوە فراوانتر بوون کە حیزب بتوانیّ لە خۆیدا جێیان بکاتەوە. کادیرە سەرکردەکان، بە تایبەت ئەوانەی باشوورو ناوەڕاستی عیراق، خەلّکانێکی ئەوپەڕی سەرپەڕگری وەك (حسن الرگاع) لە (المسيب)و (حميد بخش) لە (بەسرە)یان لە نێودا بوو.

- ١٠ -

# گۆڕانی ڕێبازی "عبدالكريم قاسم"و نشوستیی شۆڕشی ١٤/ی تەمووز

لام وابێ خۆپێشاندانی یەکی ئایاری ١٩٥٩ (عبدالكريم قاسم)ی تۆقاند، چونکە ئەوەی بۆ خستە ڕوو کە (حشع) هەر هێزێکی سیاسیی پاڵپشتکەری ئەو نییە دژی خەنیمەکانی لەوێنەی (عبدالسلام عارف)و بەعسیەکان، بەڵکوو مەترسییە بۆ سەر خۆیشی لەو ڕووەوە کە دەستڕۆیەو بیر لەوە دەکاتەوە ببێ بە هاوبەشی حوکمو لەوانەیە دوایی لەشکرکێشی بکاتە سەر ڕژێم. گۆڕانی ڕێبازی سیاسیی عبدالكريم ئا لێرەوە دەستی پێکردو هاوکاتی هێرشێکی چالاکی ڕاگەیاندن بوو بە شێوانو درۆ هەڵبەستن لە دژی شیوعیەکان. وەك لە زۆربەی کاتدا بووە بە نەریتێکی باو، هێرشەکە لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە (هیچ نەبێ بە ڕواڵەت) ئاراستەی چەند کەسێکی دەست نیشانکراو کرا - دژی (سلام عادل)ی سکرتێری حیزبو جەمال حەیدەریو (عامر عبدالله)ی جووتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی - بۆ ئەوەی وا پێشان بدرێت کە ئەمە مەسەلەی ڕەفتاری چەند کەسێکی دیاریکراوە نەك مەسەلەی دژایەتیی سەرجەم جووڵانەوەی کۆمۆنیستی. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بەسەر ئەو کەسانەوە گیرسابنەوە، چونکە ئەوانە لە بواری پێوەندیی حیزبدا بە ناوەندەکانی دیکەوە دیاربوون.

شایانی باسە مەلا مستەفا بارزانی گورجو گۆڵانە بەشداریی ئەم هێرشەی کرد. بەڵام بە زۆربەی دەنووکی لەسەر خودی جەمال حەیدەری بوو. جا نازانم ئاخۆ هۆیەکەی ئەوە بوو کە جەمال تاکە کەسێکی کوردی نێو ئەوانە بوو کە تووشی هێرشەکە بوون یان نا.

مەترسیو وەهمـەکانی عبدالکریم پاش واز هێنانمـان لـە دروشمی هاوبەشیی حوکـم، بنچینەیـەکی واقیعییـان نـەبوو، لەبـەر ئـەوەی ئێمـە بووین بـە پشتگیری حوکمەکەیو هەر لەسەر ئەو سیاسـەتە ماینـەوە کـە لـە یەکـەمین قۆنـاخی شۆڕشدا نەخشەمان بۆ کێشا. مەبەستم سیاسەتی هاوکاری لەگـەڵدا کردنـیو داکۆکیکردنـە لە ڕژێمەکـەی دژی هـەر هەوڵێك بۆ ڕووخاندنی. لە کـاتێکدا ئـەو سیاسـەتەکەیی لە بنەڕەتەوە گۆڕی ! لە ڕێبازی هاوکاری لەگەڵدا کردنمانەوە بۆ ڕێبـازی بـە جۆرەهـا ڕێگە دژایەتیکردنمان. ولاتەکە خەڵکانێکی زۆرو بگرە چەندین چینی کۆمەلایـەتیو ڕێکخـراوی سیاسـیی لـە دوژمنـانی کۆمۆنـیزم تێدا بـوون. بـەر لـەوەی ڕژێمـی عبدالکریم بە دەزگا سەرکوتکەرەکانی خۆیەوە بداتە پاڵیان، بەرانبـەر بـە ئێمـە بێ هێز بوون. بەڵام گۆڕانی ڕێبـازی عبدالکریـم هاوسـەنگیی هێزەکـانی سەر شـانۆی سیاسـیی ولاتـی گـۆڕیو زەمینەیـەکی لـەباری بـۆ بووژانـەوەی چـالاکیی دژ بـە کۆمۆنـیزمو دیموکراسـیو ـ بـە مانایـەکی دیـاریکراو ـ دژ بـە عبدالکریـم خۆیشـی خۆش کرد. ئاسایی بوو نـاوەندە ئیمپریـالیو کۆنـە پەرستە عـەرەبیو بیانیـەکانیش پەلە بکەنو هەوڵ بدەن سوود لەو دۆخە تازە بابەتە وەربگرن بۆ بـەرژەوەندی خۆیـانو بۆ گێڕانەوەی ئەو ئیمتیازانەی کە دوا بـە دوای سـەرکەوتنی شۆڕشـی ١٤ی تـەمووز لەم ولاتەدا دۆڕاندیان.

* * *

ساڵی ١٩٥٩ کاتێك (محمدحسين أبوالعيس) لە سەردانەکەی چین گەڕایـەوە کـە پـتر لـە مـانگێکی خایـاندو هێندێك دەنگوباسـی لەسـەر ناکۆکیـەکانی نێـوان سەرکردایەتیی هەردوو حیزبی شیوعیی چینیو سۆڤێتی بۆ هێنـاین، تـا ئـەو کاتـە هیچ شتێك لەبارەی ئـەم ناکۆکیانـەوە ئاشکرا نـەکرابوو. ئـەو قسـەیەی کـردەوە کـە چینیەکان بەشێوەیەکی ڕەسمی بە گوێیاندا دابوو:

ـ سەرکردایەتیی چینی سێ ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بە هۆی لادانی فیکرییانەوە لە پایەی حیزبییان لابردووە، لەوانە چوتێو پنك تی هوا کە ساڵی ١٩٥٣ ڕێبەریی چالاکیی عەسکەریی وەدەرنانی هێزەکانی ئەمەریکای کرد لە کۆریای باکوور.

نە (محمد حسين أبوالعيس) زانییو نە ئێمەیش ئەم لادانە فیکرییە چییە. بەڵام وەك دوایی ڕوون بووەوە، مەسەلەکە پێوەندیی بە هەڵوێست دیاریکردن هەبووبەرانبەر بە ناکۆکیەکانی چین لەگەڵ سەرکردایەتیی سۆڤێتیدا. ئەم ناکۆکیانە بە شێوەیەکی دیارتر لەو گوتارانەدا دەرکەوتن کە سەرکردایەتیی چینی بە ناونیشانی (بژی لینینیزم)ەوە وەك بەرپەرچدانەوەیەکی بیرو چەمکەکانی سەرکردایەتیی سۆڤێتی لەسەردەمی (خرۆشیۆف)دا لە ڕۆژنامەی (جین مین جیباو)دا بڵاوی‌کردنەوە. لە بەغدا ئەم گوتارانەمان بە عەرەبی لە باڵوێزخانەی چینی دەست کەوت.

(سلام عادل) هیچی لەسەر نە مەبەستی بڵاوکردنەوەو نە ناکۆکیی روو لە زیادی نێوان هەردوو سەرکردایەتیی چینیو سۆڤێتی نەدەزانی، کە ئەم گوتارانەی خوێندەوە دڵبەستەیان بوو و بۆی دەرکەوت لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆیو بۆچوونەکانی (حشع)دا بە گشتی گونجاون. بۆیە دەست پێشخەریی کرد داوا لە دەستەی نووسەرانی (اتحاد الشعب)ی ڕۆژنامەی حیزب بکات بۆ بڵاوکردنەوەیان. ئەوە بوو بە ڕاستی بڵاوکرانەوە. ئەوە مانای وابوو ڕێبازی فیکریی (سلام عادل)و بەشی هەرە زۆری سەرکردەکانی (حشع) لەو ڕێبازەی سەرکردایەتیی چینییەوە نێزیکتر بوو. بەڵام دڵسۆزی بۆ سۆڤێت لە سەراوردی هەموو شتێکەوە بوو. شیوعیە عیراقیەکان وەك زۆربەی شیوعیەکانی جیهان لە دەورانێکی مێژوویی دەست نیشان کراودا وەها پەروەردە بوون. هەر کە ناکۆکیەکان خرانە ڕوو، (سلام عادل) ئاشکرا ڕایگەیاند بەبێ مەرج لایەنگریی سۆڤێت دەکات دژی سەرکردایەتیی چینی. هەرکەسێك یا

حیزبێك داوای دیاریکردنی هەڵوێستێکی سەربەخۆی بێلایەن‌و وابەستە نەبووی بە هیچ لایەکەوە بکردبایە، بە لادەرو دژ بە کۆمۆنیزم دادەنرا. ئەوە چەشنێك لەوشکە باوەڕی بوو و پاچێك بوو لەو پاچانەی رماندن کە هەردوو سەرکردایەتیی سۆڤێتی‌و چینی پێکەوە بەکاریان هێنا بۆ لەکەدار کردنی شان‌و شکۆو هەیبەتی جوولانەوەی کۆمۆنیستیی جیهانی‌و دوو بەرەکی نانەوە لە ریزەکانیدا لە دەیان ولات‌و حیزبدا. لە کاتێکدا (ماوتیستۆن)ی رێبەری شۆڕشگێڕی مەزن‌و بیرکەرەوەی گەورەی چینی خەریك بوو، پاش دەسەلات گرتنە دەست، گومڕا دەبوو دەگۆڕاو بەرەو بستەڵەکی بیروڕاو سەرلێشێوان‌و شپرێوی دەچوو، (خرۆشیۆف)یش پێ بە پێ چەند هەڵەیەکی گەورەی کرد. ئەگەر چی پەیی بەوێرانکاریی دەرەنجامی رەفتاری بیرۆکراتیی ستالینانە بردبوو و چەند بیرو چەمکێکی تازەی هێنایە گۆڕێ‌و چەند هەنگاوێکی دیاریکراوی بۆ چارەسەری دۆخەکە نا ؛ بەلام نەك هەر ئاگای لە قوولی‌و رەهەندی گیروگرفتەکان نەبوو، بگرە ئاسانیش نەبوو ئاگای لێیان بێ‌و لە چارەسەرکردندا پێڕەویی چەند رێ‌و شوێنێکی راست‌و دروستی نەکرد، ئەوەیش هەلی بۆ لایەنگرانی رێبازی ستالینیی تاکە دەستڕۆی نێو حیزبی سۆڤێتی رەخساند بە ئاسانی بیخەن‌و (بریجنێف)ی هاوڕێی‌جێی بگرێتەوەکە هەموو شتێکی خراپی لە (ستالین)ەوە بە میراتی بۆ مابوەوەو ئەو شتانەیشی بە درێژاییی سالانی حوکمی لە سەرکردایەتیی حیزب‌و دەولەتدا زیاتر خراپ‌و وێران کرد.

* * *

سالی ١٩٦٠ لەوەختێکدا هێرشی پروپاگەندە لە دژی (حشع)گەرم بوو، مەلا مستەفای بارزانی فەرمانی دا حەمزە عەبدوللاو ئەندامانی دیکەی مەکتەبی سیاسی پارتی کە لەگەلیدا بوون بە شێوەیەکی بیرۆکراتیی کودەتاکەرانە دوور بخرێنەوە. بەوە لەو پێڕەوی ناوخۆیەی تێپەڕاند کە ئەنجامدانی مافێکی لەم چەشنەی دەدایە کۆنگرەو کۆمیتەی ناوەندی. مەکتەبی سیاسییەکی تازەی بە سەرۆکایەتیی

ئیبراهیم ئەحمەد دامەزراند. دیارە ئەم کردەوەیە کەشێکی گونجاوی بۆ تاوسەندنی ململانێی نێوان شیوعیەکانو پارتیەکان هێنایە بوون لە کوردەواریەکی پاشکەوتوودا کە نەخوێندەواریو دابو نەریتی خێڵەکیی تێدا باڵا دەست بوونو زۆربەی کات تفەنگو خەنجەری تێدادەبوونە ناوبژیکەری نێوان خەڵکانی بە بیر ناکۆكو لە رووی سیاسییەوە ململانێ کردوو.

لەو رۆژانەدا بە خاوخێزانەوە سەرم لە دێی "تەکیە"ی زێدی لە دایکبوونم دا. عادەتی لە سەربانێك لەگەڵ جووتیارەکاندا دانیشتبووین کە (حەمە جەمە)ی جووتیاری هەژار، تفەنگ بە شان، بە هەناسە بڕکێوە هاتە لامان، دیار بوو وەزعەکەی نائاسایی بوو. جووتیارێك لێی پرسی :

ـ حەمە چیت لێ قەوماوە؟

ـ بەڵێ، لە دێی "مەسۆیی" (دێیەکە نێزیکەی دە کیلۆمەترێك دوورە) لەگەڵ چەند کەسێکدا شەرم کردو دوای ئەوەی دەست درێژییان کردە سەرمو منیش بەش بەخۆم تەقەم لێکردن، ناچار بووم لەوێ هەڵبێم.

ـ شەڕەکە لەبەر چی بوو؟

ـ ئەوان پارتین جنێویان بە کۆمۆنیزم دا. منیش نەمتوانی لە بەرانبەریاندا بێ دەنگ بم.

ـ مانای وایە تۆش پێ بە پێ جنێوت بەپارتی داوە.

ـ بێ گومان. پێش ئەوەی دەستم بگاتە تفەنگەکەمو رەتیان بدەمەوە، پەلاماریان دامو لێیان دام. پاش ئەوە خۆمم ناچار بینی دێیەکە بەجێ بهێڵمو بێمە ئێرە.

ئەوەیان شێوە ململانێیەکی فیکری ـ سیاسیی ئەوسا بوو، بەتایبەت لە گوندە کوردنشینەکاندا دەکرا. بۆ نەگبەتی ئاستی بەرپرسە ناوچەییەکانی هەردوو حیزب لە ناوچە دێهاتیەکاندا نزم بوو، بە رادەیەك لە بریی رکە بەرایەتیی حیزبیی دیموکراتیو ئاشتییانە خۆیانیان دەخستە داوی ئەم ململانێ تراژیدیە چەوتە.

دوابەدوای گەڕانەوەم لە تەکیەوە بۆ سلێمانی، لەسەر ڕێ بووم بۆ بەغدا، بە ڕەسمی ئاگادار کرامەوە بچمە لای بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگا. دیار بوو ئەوە هەر گەڕپێکردن و تیزۆر بوو. داواکەم فەرامۆش کرد و گەڕامەوە بۆ بەغدا. لە کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسیدا بڕیاردرا من و عەزیز محەمەد، بۆ لوتف نواندن بەرانبەر مەلا مستەفای بارزانی، دیدەنیی بکەین لە ماڵەکەی و تێ بکۆشین هاوبەشیی هێرشی ناو زڕاندنی شیوعیەکان و قووڵکردنەوەی پەڕاگەندەیی نێو ڕیزی نیشتمانیی بەش بەشکراو نەکات. ئەگەر بیرم بە هەڵەیدا نەبردم، (عەزیز شەریف)یشمان لە تەکدا بوو. بەشێوە زمانێکی دۆستانە قسەمان بۆ بارزانی کرد و تکامان لێ کرد دەستڕۆیی خۆی بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی دوو بەرەکی و بڵاوکردنەوەی تەبایی لە نێو هاونیشتمانانیدا بخاتە کار. بەڵام ئێمە نەك هەر ئەو شتەمان بۆ بەدی نەهات کە بۆی چووبووین، بەڵکوو دەیشبوو تا بەدڵ گەلێك جنێو و پیاوخراپکردنی شیوعیە عیراقیەکان بە گشتی و هێندێك کەسیان بە تایبەتی ببیستین و قووت بدەین. ماڵەکەم بەجێ هێشت و لەم سەردانە پەژێوان بوومەوە.

کە شێخ ئەحمەدی بارزانی گەیشتە بەغدا، سەرمان لەویش دا لە ماڵی مەلا مستەفای برای. شێخ لە نێو بارزانیەکان و لەلایەن مەلا مستەفا خۆیشیەوە وەك سەرۆکی خێڵ دانی پێدانرابوو. کابرایەکی دەستەی وەك جووتیاری بارزانی سادە و پیاو چاك و کەمدوو بوو. هیچ مرخێکی لەوە خۆش نەکردبوو ببێ بە پێشەوایەکی سیاسیی نەتەوەیی لە دەرەوەی چوارچێوەی خێڵەکەیدا. هەروەها کەس نەبوو لە ڕێبەرایەتیی خێڵەکەیدا لە ڕوویدا بوەستێتەوە. شێخ بەخێر هاتنی کردین، ئێمەیش لەلای ئەو داد و بێدادمان لە دەست مەلا مستەفای برای کرد بەهۆی هاوبەشیی چالاکانەیەوە لە هێرشی پروپاگەندەی دژ بە (حشع)دا. لە پێشەوەی هۆدەکەو پەنا شێخی بەساڵدا چوو دانیشتبووین. کە مەلا مستەفا هاتە ژوورەوە بۆ ڕێزلێنانی هەستاینە سەر پێ و ڕاوەستاین و شوێنی دانیشتنمان لەپەنا برا گەورەکەیەوە بۆ چۆڵ

کرد. بەلاّم مەلا بەبێ جوولّە لە خوارووی هۆدەکە دەستەو نەزەر بە راوەستاوی مایەوە. بە پێی دابی خێلّەکیی لای بارزانیەکان چاوەڕوانی فەرمانی شێخ ئەحمەدی دەکرد. دانەنیشت تا شێخ رێی پێ دا :

- مستۆ روونە !

شێخ لەوەلاّمی ئەو سکالاّیەدا کە لە دژی مەلا مستەفا پێمانگوت بە شێوە زمانە لادێییانە سادەکەی خۆی گوتی :

- کە پیاوەکانمان چوونە رووسیا لە جلەکانی بەریان بەدەر هیچی دیکەیان نەبوو. کە لەوێ هاتنەوە سەعاتیان لە دەستدا بوو و چەندین جانتای پڕ لە شتی بەنرخیان پێ بوو.. بۆیە دەبێ بە ئەمەك بین بۆ رووسیاو کۆمۆنیزم‌و بەردەوام شوکرانە بژێریان بین. ئەویشی بۆ زیادکرد :

- کە زیان بە ئێمە گەیشت، شیوعیەکانیش زەرەرمەند بوون.

قسەکانیی بە رەخنە گرتن لە مەلا مستەفا دوایی پێ هێنا. مەلا پێی نەدەکرا پەلّپ لە قسەکانی برا گەورەکەی بگرێ یا مشتومڕیان لەسەر بکات. کە شێخ گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی، مەلا هیچ لە ئاکاری نەگۆڕا.

* * *

(عبدالكريم قاسم) ساڵی ١٩٦٠ یاسایەکی لە بارەی پێکهێنانی حیزبی یاسایی‌یەوە دەرکرد. هەر تاقمێك بیویستبایە مۆڵەتی یاسایی وەربگرێ، دەبوو داوایەك پێشکەش بکات ٥٠ ئیمزای خەلّکانێکی پێوە بێ کە مەرجی یاسایی‌یان تێدا هەبێ. چەند داوایەك پێشکەش کران، لەوانە داواکەی ئێمە کە (زكي خيري) ئیمزای سەر پوولەکەیی کردبوو، لە کاتێکدا ناوی (سلام عادل) ناوبوێر کرابوو لەبەر ئەوەی نەوەکا دەسەلاّتداران بە بەهانەی تێدا نەبوونی‌مەرجی یاسایی‌یەوە پەلّپی لێ بگرن. داوایەکی دیکەی دەستکردیش لە پاڵ داواکەی ئێمەدا بە ناوی (حشع)ەوە هەبوو، (داودالصائغ)ی نۆکەری رژێم پێشکەشی کرد بوو کە کابرایەکی نیوچە

نەخوێندەواری هیچ‌و پووچی (جبار حمزة) نـاو ڕێنوێنیی دەکـرد. ئـەم کابرایـە بـۆی هەڵکەوتبوو ببێ بە ناسیارێکی عبدالکریم‌و بە یەکێك لـەو کەسـانە کـە ڕاسـتەوخۆ پێیەوە بەسترا بـوون (دەنـگ هـەبوو سـەرۆکێکی ڕاسـتەقینەی ئیستیخبارات بـێ). ئاشکرا بووئامـانجی ئـەم داوا دەسـتکردە دۆزینـەوەی بەهانەیـەکی ڕواڵـەتی بـوو بـۆ ڕەتکردنـەوەی داواکـەمان بـە بیـانووی ناجـایزیی هـەبوونی دوو حـیزب بـەم نـاوەوە. قایمکاریمان کردو شتێکی وامـان سـازکرد کـە سیفەتی یاسـاییی لـە داواکـەی داود دادەماڵێ. من خۆم ڕاسپێردرام سەرپەرشتیی ئەم کارە بکەم‌و، (عیسـی العزاوي)ی ئەندازیاری شیوعیم کردە یـاریدەدەری خۆم‌و پێوەندیشـم بـە (بشـری برتـو)ی کچـە شیوعیی گورج‌و گۆڵی ئەو کاتەوە کرد. کەڵکێکی زۆرمان لە (عدنان)وەرگرت کـە لە ڕێکخستنەکەی داود دا بووو بە نهێنی پێوەندیی پێمانەوە هەبوو.

دەسکەوتی چالاکیمان ئـەوە بـوو وای لێ هـات بەشـی هـەرە زۆری ئەوانـەی کـە ئیمزایان لەسەر داواکەی داود کرد بوو لە هەڤاڵە نێردراوەکانی ئێمـە بـوون، لەوانـە (لیلی الرومي)ی‌قوتابیی شیوعیی زانکۆو تاکـە ئـافرەتی نێـو ئـەو کۆمەڵـە. داود دەبەنگ‌و دابڕاو بووو، لەوە کەوتبوو ژمارەی یاساییی داواکـراو کۆبکاتـەوە. کـاتێك ئەو وادەیە نێزیك بووەوە کە دەبوو دەسەڵاتداران بە ئا یان نا وەڵامی داواکە بدەنەوە، دەست کێشانەوەیەکی بە کۆمەڵمان ڕێکخسـت کـە پـتر لـە ٨ ــ ١٠ی ئیمزاکـەرانی داوای دامـەزراندنەکەی گرتەوە. یەك کـەسمان لـە هـەڤاڵانمان بـۆ زانیـاری کۆکردنـەوە هێشتەوە. بەوە بناخـەی یاسـاییی داوای حیزبـە دەسـتکردەکەمان هەڵتـەکاند. بـەڵام دەسـەڵاتداران بەهێنانـە ڕیزی کەسـانی تـازە لـەبری کشـاوەکان، هـەلی دووبـارە پێکهێنانـەوەی دەستەی دامـەزرێنیان بۆ داود ڕەخساند. بۆ کەڕەتی دووەم پۆستەیەکی تازەمان لە هەڤالانمان بۆ ئـەم دەبەنگـە نـاردو خسـتنیە نێو دەسـتە دامـەزرێنەکـەی خۆی. ئەم کەڕەتەیش لە کاتێکی گونجاودا دەست کێشانەوەیەکی نیوچە بـە کۆمـەڵی تازەمان لە نێو ئیمزاکەرانی داواکەدا ڕێکخسـت‌و سـەر لـە نـوێ بناخـەی یاسـاییی داواکەمان هەڵتەکاندەوە.

وێڕای هەموو ئەوانە، دەسەڵاتداران وەڵامە نووسراوێکیان ئاراستە کردین کە تێیدا هاتبوو ـ گوایە ـ ناکرێت دوو حیزب بە هەمان ناوەوە مۆڵەتیان پێ بدرێت، بۆیە داواکەمان ڕەت دەکەنەوە. مانای وابوو ئەوان داواکەی داودیان بۆ ڕەتکردنەوەی داوای ئێمە دروست کردبوو. حیزبە شیوعیە کارتۆنیەکە سەرباری ئەوەی کە بناخەیەکی یاسایی نەبوو، مۆڵەتی پێ درا. ئەم کێشەیە جەختی لەسەر ئەوە کرد کە یاسای حیزبەکان لە گاڵتە جاڕییەکی دیموکراتی‌زیاتر نەبوو. لەم بارەیەشدا هەر نەرم‌و نیان ماینەوەو بڕیارمان دا بیانوەکانی عبدالکریم بۆ ڕەتکردنەوەی داواکەمان هەڵبتەکێنین. کۆبوونەوەیەکی ناوەختمان بۆ کۆمیتەی ناوەندیی حیزبمان کردو تێکڕا ڕێککەوتین ناوی حیزبمان لە (حشع)ەوە بۆ حیزبی‌یەکگرتنی گەل (حزب اتحاد الشعب) بگۆڕین‌و لەسەرئەم بنچینەیە داواکە پێشکەش بکەینەوە.

بڕیاری ناوی حیزب گۆڕینمان بڕیارێك بووگشت هەڤاڵان‌و دۆستانمان تێی‌دەگەیشتن‌و لەگەڵ پێداویستەکانی بارودۆخە تازەکەیشدا هاوجووت بوو. بەڵام سەرکردایەتیی سۆڤیێتی تێی نەدەگەیشت‌و بە پێویستی دەبینی‌خۆتێهەڵبقورتێنێ‌و دەستبەجێ پەڵپ لەو کارەمان بگرێ وەك بڵێی هەڵەیەکی مەبدەئیی گەورەمان کردووە. من‌و (زكي خيري) لەسەر داوای (زایتسیف)ی باڵوێزی سۆڤیێتی چووینە دەزگای بازرگانیی سۆڤیێتی لە (الكرادة الشرقية)ی بەغدا. کابرا ویستی چاوی پێمان بکەوێ تا نامەیەکمان بۆ بخوێنێتەوە کە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی سۆڤیێتی ئاراستەی لیژنەی ناوەندیی حیزبمانی کردبووو بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدرابوو. پوختەی نامەکە ڕەخنەی توندگرتن بوو لە کردەوەی ناوی حیزب گۆڕینمان (دیارە بەبێ ڕاوێژکردن بە سۆڤیێت). لەوەیش سەیرتر، ئەوان ئامۆژگارییان کردین لەگەڵ (داود الصائغ)دا لێکحاڵی ببین‌و ناوی بخەینە نێو دەستە دامەزرێنەرەکەمان بۆ ئەوەی مۆڵەتی یاسایی وەربگرین. باڵوێز بە پەرۆشەوە پشتگیریی نامەکەی دەکرد. لەسەر ناوەڕۆکی نامەکە دووایـن‌و مشتومڕمان لەگەڵ

باڵوێز خۆیشیدا کرد. داکۆکیمان لە بڕیاری کۆمیتەی ناوەندیمان کردبەو پێیە کە لەو هەلو مەرجە بەردەستەی عیراقدا هەڵوێستێکی راستە. بە (زایتسیف)مان راگەیاند رەشە خەڵکەکەی دوروپشتمان لە کارەکەمان حاڵی بوون‌و پێیان باش نەبوو تا رژێمی عبدالکریم تەنگەتاو بکەین‌و بۆهەموانی بسەلمێنین راست ناکات لاف‌و گەزافی ئازادیی کاری حیزبی لێ دەدات. هەروەها هێنانی کەسێکی وەك (داود الصائغ)مان بۆ نێو ئەو دەستە دامەزرێنە کە خستمانە بەردەم دەسەلآتداران‌و رای گشتی پێکەوە بە توندی رەتکردەوە. ئاکامەکەی رەتکردنەوەی داواکەمان بوو بە دارشتنە تازەکەیشیەوە. ئەوەیان بڕیاری خودی عبدالکریم بوو. بینایەکی تەرخان کرد ببێتە بارەگای حیزبە ساختەکەی داودو (جبار حمزة)یش سەرپەرشتیی بکات.

بەم بۆنەیەوە رووداوێکی سەیر دەگێڕمەوە کە ماوەیەکی کەم پاش مۆڵەت پێدانی حیزبە کارتۆنیەکە بەسەر پێشەواکانیدا هات. باڵوێزخانەی سوودان لە بەغدا بانگی کردبوون بۆ ئاهەنگێك کە بە بۆنەی جێژنی سەربەخۆییی سوودانەوە گێڕابووی. "پێشەواکان" لەوێ زێدەخۆرییان لە مەی خواردنەوەدا کردبووو سەرخۆش بوو بوون‌و لە نێو خۆیانداهەراو زەنایەکیان لەسەر چۆنیەتیی دابەشکردنی دوو هەزار دینار نابووەوە کە(داود الصائغ) لە (جبار حمزة)ی‌وەرگرتبوو بۆ راییکردنی کاروبارە بە ناو حیزبییەکانیان. فەرمانبەرانی باڵوێزخانە ناچار بووبوون لەو ئاهەنگە دیپلۆماتیە دەریان بکەن. رۆیشتبوون‌و کێشەکەی خۆیانیان لەگەڵ خۆدا بردبووە بارەگاکەیان کە کابرایەکی ئاسایشی گشتی تاکە پاسەوانی بوو بوو. کێشەکە لە نێوان داود لە لایەك‌و (جميل محمد علي)ی هاوڕێی‌و یەکێکی دیکەدا (ناوەکەیم بیرنایێ)لە لایەکی دیکەوە گەرم بوو بوو. (عدنان)ی لاویان لەگەڵدا بوو بوو کە بە نهێنی هاوکاریی دەکردین، ئاگری کێشەکەی خۆش کردبوو تا سەرباری قیژاندن‌و جنێو بە یەکتر دان، کار لە نێوانیاندا گەیشتبوە رادەی شەق‌و دەست وەشاندن. جووتە هاوڕێکەی داود داوای بەشی خۆیانیان لەو پارەیە کردبووو داودیش

داواکەی ڕەت کردبوونەوە ولافی ئەوەی لێدابووکە گوایە عبدالکریم ئەوی بە دەست پاك داناوە تا پارەکە خەرج بکات. دوا جار پاسەوانی بیناکە پەنای بردبووە بەر کارەبا کوژاندنەوەو داخستنی دەرگاکان لە پێشەوا بەشەڕ هاتوەکان‌و هەڕەشەی بانگ کردنی (جبارحمزە)ی لێ کردبوون. نیو سەعات کەمتر لەوەبەدوا ئەوان هەر لە تاریکییدا ڕاگیرابوون، کاتێك (جبار حمزة) گەیشتبووە جێ‌و گلەییی لە سەرکردەکان کردبووو هەموو پارەکەی لە داود سەندبووەوەو هەریەکەیانی بۆ ماڵی خۆی ناردبووەوەو بەوە کێشەکەی چارەسەر کردبوو. جا کە داود پارەکەی دابوو بە جبار پێی گوتبوو :

ـ فەرموو بیگرە! من بەسنگ فراوانییەوە پارەکە دەدەمە نوێنەری پێشەوا.

* * *

کاتێك بەعسیەکان هەوڵی خافلکوژکردنی (عبدالکریم قاسم)یان داو بریندار کرا، (حشع)پێوەندییەکی قەیراناویی لەگەڵ ئەودا هەبوو. من‌و (زكي خيري) لەو نەخۆشخانەیەدا کە تێیدا چارەسەردەکرا، سەرمان لێدا. بە ئەندازەیەك گەرمییەوە پێشوازیی لێ کردین‌و، ئێمەیش بە ناوی(حشع)ەوە پیرۆزباییی سەلامەتی‌و لە مردن ڕزگاربوونمان لێ‌کردو نارەزاییمان دژی دەستدرێژیکردنە سەری پێشان دا. لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕاکشابووو جلە خوێناویەکانیی لە تەنیشتیەوە بوون. بۆ لوتف نواندن پێم گوت :

ـ هەوڵی خافلکوژکردنت تۆڵە سەندنەوە بوو لە تۆ، چونکە تۆ سەرکردەی شۆڕشی ١٤ی تەمووز بووی.

ـ ئەگەر من نەبووبام‌و ئەم شۆڕشەم نەکردبایە، گەلی عیراق پێنجسەد ساڵی دیکەیش لەبەر ڕەحمەتی کۆلۆنیالیزم‌و ڕژێمی پاشایەتیی نۆکەردا دەمایەوە. (ئەوەی بە شانازی‌و بە سادەلەوحیی جووتیارێکی بوغراوە گوت).

ـ پێمان نەدەکرا پێی بڵێین "نەخێر سەرداری پێشەوا"! هەر ئەوەندەم پێ بەس بوو بەوردی بڕوانمە دەم‌و چاوی. پارچەیەك بوو لە غەرایی‌و پشت بە خۆبەستن.

وادەیڕوانیە خۆی وەك بلێی (المهدي)ی چاوەڕوانکراوە. پێم وابێ هیچ دەرسێکی لە هەوڵی خافلکوژکردنی بە ئەنجام نەهێنا. هێندێکمان بەبێ هوودە چاوەڕوانی دەکرد دووبارە چاو بە هەلوێستیدا بەرانبەر بە(حشع) بخشێنێتەوە. دەرکەوت دەستدرێژیکردنە سەری بووە هۆی زیاتر لادانی بەرەو لای ڕاست. هەروەها پێم وایە ئەگەر هەوڵەکە بەخافلکوژکردنی کۆتاییی بهاتبایە، دۆخەکە ڕووی لەباشتر دەکرد.

* * *

پێوەندیی نێوان ئێمەو عبدالکریم بەرەو شپڕێوی‌و ئالۆزیی زیاتر دەچوو. گەرچی ئێمە هەر لەسەر سیاسەتی داکۆکیکردن لە ڕژێمەکەی دژی هەر هەوڵێکی ڕووخاندنی ماینەوە. هێندێك لەبەر پرسانی حیزبمان خەونیان بەوەوە دەبینی ئەم دژواریانە تێ بپەڕێندرێن‌و پێوەندیەکە بۆ سەردەمی زێڕینی جارانی بگێڕدرێتەوە کە تەبایی‌و هاوکاریی تێدا بوو. عەزیز محەمەدی ئەندامی مەکتەبی سیاسی لە ١٩٦٠دا، وەك ڕێگەیەك بۆ چاککردنی پێوەندیەکە ـ بەپێی بۆچوونی خۆی ـ پێشنیازی کرد ڕێکخستنە حیزبیەکانمان لە نێو سوپادا هەڵبوەشێندرێنەوە بۆ ژیاندنەوەی دڵنیایی‌و بڕوا پەیداکردنەوەی عبدالکریم بە ئێمە لەسەر بنچینەی قەناعەت پێ کردنی کە (حشع) بە تەمای کودەتا گێڕان نییەلە دژی حوکمەکەی.

شایانی گوتنە حیزب بەتایبەت لەیەکەمین ساڵی شۆڕشی تەمووزدا زۆر دەستی لەنێو سوپادا دەڕۆی‌و ڕێکخستنەکانی فراوان‌و بەهێز بوون‌و هەزاران ئەفسەرو دەرجەدار(ضباط الصف)و سەربازیان لە نێودا بوو. ئەفسەرە شیوعیەکان ژمارەیەك پلەی گرنگیان لەهێزە چەکدارەکاندا گرتبوو، وەك (جلال الاوقاتي)ی سەرکردەی هێزی ئاسمانی‌و (داود الجنابي)ی سەرکردەی تیپی دووەم و (طه الشيخ احمد)ی بەڕێوەبەری جموجوڵی عسکەری‌و چەند سەرکردەیەکی زرێپۆشەکان لە وێنەی (سلمان الحصان)و (خزعل السعدي)و چەند ئەفسەرێکی دەستڕۆیشتووی وەك (هاشم عبدالجبار) لە هێزی پیادەداو هیی دیکە. جموجوڵی (سلام عادل)ی سکرتێری حیزب لە نێو ئەفسەرانداو جاروبار وێنە گرتنی لەگەڵیاندا لە

چاوپێکەوتنەکاندا مایەی نیگەرانی بوون بۆ عبدالکریم قاسم. ئەو کەسانەیش دەگمەن نەبوون کە هەواڵی ئەم جموجووڵو وێنانەیان بە عبدالکریم دەگەیاند بۆ پتر ترساندنی لە چالاکیی کۆمۆنیستیی گەشە کردوو لە سوپادا.

هیی وامان لەنێودا بوو لەباتیی بیربکاتەوە سوود لەم تینو توانە وەربگرین بۆ بەدەسەڵات گەیشتن، بۆ قایلکردنی عبدالکریم بیری لە نەهێشتنو لابردنیان دەکردەوە. وەختێك عەزیز محەمەد پێشنیازی کرد ڕێکخستنەکانمان لە سوپادا هەڵبوەشێنینەوە، دەیزانی کەسانێکی دیکەیش لەنێو مەکتەبی سیاسیدا هەمن لایەنگری ڕایەکەی دەکەن. چەندین مشتومڕی درێژ لەسەر ئەم مەسەلەیە کرانو چەند ڕۆژێکیان پێ چوو، بەبێ ئەوەی بگەین بەئەنجامو بڕیارێکی یەکلاییکەرەوە (حاسم) بدەین، چونکە هێندێك هەبوون ڕارا بوونو پێیان باشتر بوو بیری لێ بکەینەوە. سەرجەم پێکهاتین ڕاوێژ بەسەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی بکەین بەو پێیە کە لەم بارەوە خاوەنی ئەزموونێکی فراوانترە. (جورج تللو)ی نوێنەری حیزب بۆ پێوەندیکردن بە باڵوێزخانەکانەوە، ڕاسپێردرا مەسەلەکە بخاتە بەرچاوی نوێنەری حیزبیی باڵوێزخانەی سۆڤێتی لەبەغدا. ئەمە لەکاتێکدا خۆیشمان لەنێو خۆماندا درێژەمان بە لێکۆڵینەوەی کێشەکەدا. بەر لەوەی هیچ وەڵامێکمان لە سۆڤێتەوە پێ بگات، لەبەغدا بەزۆریەی دەنگ بڕیارێکمان دا: ڕەتکردنەوەی پێشنیازەکەی عەزیز محەمەد. منو(سلام عادل)و(محمدحسین أبوالعیس)و (زکي خیري) دژی پێشنیازەکە دەنگمان داو، عەزیز محەمەدو (جورج تللو)و(هادي هاشم)یش دەنگیان بۆ پشتگیریی پێشنیازەکەدا. دوان لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، لەبەر ئەوەی لەدەرەوەی وڵات بوون، هاوبەشیی ئەم لێدوانەیان نەکردو ئەوانیش جەمال حەیدەریو (عامر عبدالله) بوون. باوەڕم وایە ئەگەر لەنێویشماندا بوونایە ئەنجامەکەی هەرئەوە دەبوو، چونکە جەمال حەیدەری دژی پێشنیازەکە دەنگی دەداو (عامر عبدالله)یش لایەنی پێشنیازەکەی دەگرت.

دوایی وەڵامی سەرکردایەتیی سۆڤێتیمان وەرگرت، لەگەڵ ڕای زۆربەدا هاوجووت بوو کە پێویستی دەکرد درێژە بە چالاکیی حیزبی بدرێت‌و شەونخوونی بەسەر ڕێکخستنەکانی سوپاوە بکێشرێت. بەڵام پاش ئەوەی زۆر بەدەنگی دژی هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستنەکانی سوپادا، گیروگرفتێکی دیکەی شێلگیر دەرکەوت. ئاشکرابوو کە (جورج تللو)و(هادي هاشم)ی سەرپەرشتیاری ئەوسای ڕێکخستنە عەسکەریەکانمان بە کردەوە ئەو ڕایەیان بەجێ هێنا کە داوای هەڵوەشاندنەوەی دەکردو کادێری حیزبیی دەست بەکاری نێو لیژنەی سەرکردایەتیی بەرپرس‌و لیژنەکانی خواروەتریان لێ ئاگادار کردەوە. دەبوو هەڤاڵانمان لەوەبەدوا تەقەلایەکی چڕو پڕ بدەن بۆ نەهێشتنی شوێنەواری ئەم کارەو دیسان بنیاتنانەوەی دەستە حزبیی ـ عەسکەریەکانمان لە سوپادا.

مەسەلەکە هەر چۆنێك بێ، پێشنیازەکە شێوەیەك بوو لە کلکایەتی‌و لەگەڵ سیاسەتی ڕازیکردنی (عبدالكريم قاسم)دا ـ بەهەر نرخێك بووە ـ هاو ئاهەنگ بوو. ئەوە بە ڕوونی دەریخست کە حیزب تەوژمێکی ڕاستڕەوی کلکایەتیکەری تێدایە. بەڵام بە تەنیا عەقڵیەتی ڕاستڕەوی تا ئەو کاتە لەنێو سەرکردایەتی‌و کادێرانی (حشع)دا زاڵ نەبوو. پێڕەو کەرانی هێڵی سیاسیی ڕاستڕەوی " کلکایەتی" دەرەنجامی کاریگەریی سەرکردایەتیی سۆڤێتی بوو نەك قەناعەتی خودی شیوعیە عێراقیەکان خۆیان.

* * *

(محمد حسين أبو العيس) لەوانی دیکە پتر لەئاقارەکانی پەرەسەندنی دۆخەکەی دەپرسی‌و دووپاتی دەکردەوە. ئەوی ڕاستی بێ ئێمە دوای ئەوەی چارەنووسی خۆمانمان بەهیی (عبدالكريم)ەوە گرێ دا، نەخشەی هیچ ئاسۆیەکی پاشە ڕۆژ ـ ستراتیجی ـ مان بۆ خۆمان نەکێشا. بەڵام هەوڵی خافلکوژکردنی عبدالكريم بەتوندی ئەم پرسیارەی خوارەوەی خستە بەردەمان : ئەگەر عبدالكريم خافلکوژ کرا

یا کودەتایەکی عسکەری قەوما، چی بکەین ئێمە بەبێ ئەوەی گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لەسیاسەتماندا بکەین؟ لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە ناومان نا پلانی کاتی ناوەخت (خطة الطوارىء). واتە قایمکاریکردن بۆ ئەو حاڵەتە ناوەختانەی کە ڕەنگە ڕوو بدەن. ساڵی ١٩٦٠ سەرپەرشتیی پلانەکە، یا بەشێکی گەورەی پلانەکەیان، لەڕووی سازکردنی ڕێکخستنە حیزبی ـ مەدەنیەکانمانەوە خستە ئەستۆم. لەکاتێکدا ئەرکی ئامادەکردنو جێبەجێکردن، هێندەی پێوەندیی بەدەوری عەسکەریە شیوعیەکانی سوپاوە هەبوو، خرایە سەرشانی لیژنەی حیزبیی بەرپرس لەنێو هێزە چەکدارەکاندا. گەلێك کۆبوونەوە لەگەڵ کادیرانی حیزبیدا کران وباسی ئەو پارچە چەکە سووکەڵانە (دەمانچە، غەدداره..تد)مان کرد کە هەم لەلای هەڤاڵانمان بوونو هەم دەکرا بیانکڕین. چەند تاقمێکی چکۆلەی دەستوەشاندنمان پێکهێناو بەرپرسمان بۆ دانانو نەخشەیەکمان بۆ جموجووڵ لەکاتی پێویستدا داڕشت هەموو ئەوانە تەنیا وەکوو تەگبیرێکی قایمکارانە کران تا لەکاتی خافلکوژکردن یا ڕووخانی (عبدالکریم قاسم)دا جێبەجێ بکرێن. لایەنی هەرە گرنگی پلانەکە جموجووڵی هەڤاڵە عەسکەریەکانمان بوو لە سوپادا.

بەر لەوەی هەلو مەرجێك بێتە پێش ئەم پلانەی تێدا تاقی بکەینەوە، عێراقم بەجێ هێشت. بەڵام ئەم پلانە ـ بە بۆچوونی من ـ پلانێکی سەرنەگرتوو بوو، چونکە پێبەندی هێڵێکی ستراتیجیی لە بنەڕەتەوە چەوتو سەرنەگرتوو بوو. بەم پێیە وا دانرابوو کە عبدالکریم هەر لێی دەدرێتو بەدەستی کەسانێکی دیکە دەڕووخێت، ئەوسا ئێمەش ڕادەپەڕینو دۆخەکە بۆ بەرژەوەندی حیزبو گەل یەکلایی دەکەینەوە. کارایی ئەم پلانە بەتێپەڕینی کات کەم دەبووەوەو بەرە بەرە لەنێو دەچوو، لەبەر ئەوەی گلۆڵەی سیاسەتی عبدالکریم بەردەوام ڕووی لە لێژی دەکردو جەماوەری گەلیش بەردەوام لێی دەتەکێنەوە. کە کودەتای ساڵی ١٩٦٣ کرا، ئیتر ساتی یەکلاییکردنەوە بۆ بەجێهێنانی پلانەکە هاتە پێشو، ساخ بووەوە کە وەختەکە بەسەر

چووەو رژێم پشگیریی خۆیی لە دەست داوەو نەك هەر جەماوەر بگرە عەسکەریە شیوعیەکانیش لەسەر جۆش‌و خرۆشی جارانیان نەماون داکۆکیی لیّ بکەن‌و بەرەنگاری نەیارەکانی ببنەوە. ئەوە شتێکی سروشتی‌و ئەنجامێکی مەنتیقی بوو بۆ هەمان سیاسەت کە عبدالکریم لە سالآنی حوکمیدا لەسەری رۆیشت، چونکە لەبەر شەڕی دوژمنکارانەی دژی کوردستان پشتگیریی گەلی کوردی لە دەست داو، بەهۆی خۆدزینەوەو پاشەکشە کردنیەوە لە جێبەجێکردنی یاسای چاککردنی کشتوکاڵدا لایەنگریی زۆری جووتیارە عیراقیەکانی‌لە دەست داو، لەبەر ساختەکاریی لە مافی کرێکاراندا بۆرێکخستنی سەندیکایی‌و لایەنگریی چەوسێنەرانیان پشتگیریی کرێکارانی لەدەست دا. هەروەها لەبەر دژایەتیکردنی دیموکراسی‌و پەنا بردنیە بەر ری‌و شوێنە دیکتاتۆریەکانی حوکم پشگیریی کۆمەڵێکی زۆری لە قوتابیان‌و لاوان‌و رۆشنبیران‌و خەڵکانی دیکە لەدەست دا.

* * *

ساڵی ١٩٦٠ کۆبوونەوەیەکی پڕ کێشمە کێش بۆ کۆمیتەی ناوەندی بەسترا، چوار رۆژی خایاند بە شەوەکانیەوە. لەو ماوەیەدا ئەو خانوەمان بەجێ نەهێشت لە گەڕەکی (السعدون) کە تێیدا کۆبووینەوە. کەشی کۆبوونەوەکە گرژو دژوار بوو، چونکە کەشی سیاسیی گشتیی وڵات ڕووی لە ئاڵۆزی بوو و حیزب لە سیاسەتێکی چەوتی داسەپاو گلابوو و ململانێی نێو بەرپرسان‌و کادێرانی حیزب تاوی سەندبوو.

پێشهاتەکان دەریانخست ئەو ئەزموونە زۆرو زەبەندەی کە لەخەباتی دژی ئیمپریالیزم‌و دژی ڕژێمی عێراقیی لایەنگری کۆلۆنیالیزمدا بەدرێژاییی چارەکە سەدەیەك لە تێکۆشان لەلای (حشع) کەڵەکە بوو بوو، لەو هەل‌و مەرجە تازەیەدا زۆر سوودی پێ نەگەیاندین ؛ کاتێك گۆڕانێکی سیاسی ڕیشەیی بەسەر بارودۆخی وڵاتدا هات‌و تەمووزی ١٩٥٨ ڕژێمێکی تازە لە ڕووی پێکهاتن‌و ناوەڕۆکی چینایەتی ـ کۆمەڵایەتییەوە جێی ڕژێمە کۆنە هەرەسهێناوەکەی گرتەوە.

سەرکردایەتیی سۆڤیێتی نەخشێکی یەکلاییکەرەوەی لە سەر لێشێواندنو ـ لە ڕووی گەوهەرەوە ـ کردنمان بە کلکی ڕژێمی (عبدالکریم)دا هەبوو. وەك چۆن لە زۆربەی کاتدا چاوەڕوان دەکرێت، ئاوا پاشاگەردانیی سیاسی لە ڕێڕەوی حیزبدا کە هاوکاتی زیادبوونی تیژڕو سەرکوتکردن بوو دژی شیوعیەکانو ڕێکخراوەکانو جوولانەوەی جەماوەری، کێشایەوە ـ هەر دەیشبوو بکێشێتەوە ـ بۆ پەیدا بوونو نەشونماکردنی چەشنە گرژیو قەیرانێك لە پێوەندیەکانی ناوخۆی (حشع)داو بەتایبەت لە نێو سەرکردایەتیەکەیدا. ئەوەیش لە ڕەوتی مشتومڕو کاروبارەکانی ئەو کۆبوونەوە تەواوەدا کەوتە ڕوو کە کۆمیتەی ناوەندی کردی.

بەر لەم کۆبوونەوەیە هەستمان بەو دژواریە گەورانە دەکرد کە ڕووبەڕووی کاروانی خەباتی حیزب دەبوونەوە. بۆ دەرچوون لەتەنگەتاویە ڕاستەقینەکە، بە شوێن دەرویەکدا دەگەڕاین. هۆی ڕاستەقینەی تەنگەتاویەکەمان نەدەزانی. دەرکمان بەوە نەدەکرد کە ڕێبازە سیاسیە چەوتەکەمان ئەم تەگەتاویەی بۆ پەیدا کردین. ئەو ڕێبازەیش سۆڤیت، بە مانایەکی دیاریکراو، بەسەریدا سەپاندین. بۆ هۆی گەلێك هەڵەی دیکەی سیاسیو ڕێکخراوەیی دەگەڕاین کە لەوانە بوو کرابن. هێندێك لە نێوماندا باوەڕیان وابوو هۆیەکە دەدرێتە پاڵ چەند هەڵوێستێکی سەرپەرگریی چەپڕەوانەی خۆمان یا هیی هێندێك ڕێکخراوو بەرپرسمان. بۆ نموونە، هێندێك گوتیان چاوپێکەوتنی ئاشکراو نیوچە ئاشکرای (سلام عادل) لەگەڵ ئەفسەرانداو جاروبار لە نێو سەربازگە عسکریەکاندا، هۆی سەرەکیی ترساندنی عبدالکریمو هەڵپێچانی بوو بۆ گۆڕینی ڕێبازی خۆیو، دواتر گۆڕانی ئەو ڕێبازەو ئالۆز بوونی پێوەندیەکان لەگەڵ (عبدالکریم)دا دەکەونە ئەستۆی (سلام عادل). هیچ یەکێکمان پەیی بەوە نەبرد کە گۆڕانی ڕێبازی عبدالکریمو دواتر گرژبوونی پێوەندیی نێوان جووتە هێزی سەرەکیی سەر شانۆی سیاسی ـ عبدالکریمو حشع ـ زیاتر دیاردەیەکی سروشتیی چاوەڕوانکراو بوو و ڕێگەی ڕاستیش بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە

لەوەدا بوو دیسـان سیاسـەتمان لەسـەر بنچینـەی ڕووکردنـە دەسـەڵات وەرگرتـن وەك مـافێکی ڕەوای شیوعیەکان دابڕێژینەوە. باوەڕم وایە گرتنە بەری ئەم جۆرە سیاسـەتە دەبوە هۆی توندو تۆڵکردنی تەبایی لە نێو سـەرکردایەتیی (حشع)داو لادانیشـمان لەو گێروگرفتانەی کە تووشمان بوون.

ئێمەی زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسـی ـ مـنو محمد حسـین أبـو العیسو زکي خیريو عـامر عـبداللەو جـورج تللـوو چـەند کەسـێکی دیکەیشـمان بـە کـەمی باوەڕمان وابوو کـە (سـلام عـادل) بـۆ سـەرکردایەتی لێوەشـاوە نییـەو مـایـەی ئـەو گێروگرفتانەیە کە دووچاری حیزب دەبن. سەیرمان کرد چارەسەر ئەوەیە بیگۆڕین بـە کەسێکی دیکە. بەڵام ـ پێدەچێ عامر عبدالله نەبێ ـ هەموومان ئـەم بیرۆکەیـەمان بۆ دەرەوەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پێ خۆش نەبووە، تەنانـەت مەسـەلەکەمان لای ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیش نەدرکاند. وامان دەبینی تاکڕەویو بیرۆکراسـیی (سـلام عـادل) هـۆی هەڵـەو گێروگرفتـەکانن. ئێسـتاکە حـەز دەکـەم بڵێـم : ئـەم گێروگرفتە ئەگـەر لەگەڵ ئەو ڕێبـازەدا تێکـی بخـەین کـە گرتمانـە بـەر، لـەو هـەلو مەرجەدا هەر پـەیدا دەبـوو، جـا سـکرتێرەکە لـەجیاتیی (سـلام عـادل)هەرکەسـێك بووایە. گوناحەکە گوناحی ئەو نەبوو، گـەرچی شەقڵی تاکڕەویو بیرۆکراتیی هـەبوو. ئەو لەو کەسە سەرەکیانەی دیکەیش زیاتر کە نەخشەی سیاسەتی حیزبیان دەکێشـا، بەرپرسی نەدەکەوتە ئەستۆ.

کۆمیتەی ناوەندی ئەو دوایـەی دوورخسـتنەوەی (سـلام عـادل)ی پـێ شـتێکی کتو پـڕ بـوو کـە لـە کۆبوونەوەکەدا بـەرچاومان خسـت. کۆبوونەوەکـە پـاش چـەند مشتومڕێکی درێژو گەرمو گـوڕ چارەسـەرێکی مامنـاوەندیی دۆزییـەوە : مـانـەوەی (سلام عادل) بەسکرتێری وەك جارانو پێکهێنانی دەسـتەیەکی سـکرتاریەت کـە ـ سەرەڕای سلام عادل ـ بەهادین نووریو (هادی هاشم)یشیان بخرێتە پاڵ. ئـەم کـارە ململانێیی ناوخۆی سەرکردایەتیی دوایی پێ نەهێنا. (سلام عادل)یـش لـەو کەسـانە خۆش نەبوو کە داوایان کردبوو لەو پلەو پایەیە دوور بخرێتەوە.

ئێستا پێویستە لەسەرم دانی پێدا بنێم کە من یەکێك بووم لە کەسە سەرەکیەکانی بڕیاردەری سیاسەتی حیزب‌و دواتر یەکێك بووم لەبەرپرسە سەرەکیەکانی ئەو سیاسەتە چەوتە کە (حشع) لە نێوان ۱۹۵۹ ـ ۱۹٦۰ دا گرتیە بەر. وەك ئەندامانی دیکەی سەرکردایەتیی دەرکم بەوە نەدەکرد کە هۆی سەرەکیی نەبوونی تەبایی‌و تاوسەندنی ململانێ لە نێو سەرکردایەتیدا دەگەڕێتەوە بۆ لە دەستدانی سەربەخۆییی فیکریمان ووازهێنانمان لە مافی خاوەن بڕیاربوونمان بۆ نەخشە کێشانی سیاسەتی عیراقیی تایبەت بە خۆمان. بە قەناعەت‌و بەبێ هۆشیارییەکی دروست قایل بووین بەرانبەر رژێمی (عبدالکریم) بە رێگایەکی سیاسیدا بڕۆین کە بە دڵی خۆمان نەبوو، بەڵکوو بە دڵی کسانێکی دیکە بوو. ئاکامەکەیشی ئەوە بوو، پەنجەی تاوانمان بۆ یەکتری راکێشاو کەوتینە داوی چەندین ململانێی فیکریی واوە کە زیانی قورسیان بە حیزبمان‌و بەسەر لەبەری جوولانەوەی نیشتمانیی دیموکراتی لە عیراقدا گەیاند. نامەوێ خوێنەوار لەو قسانەی پێشووم تێ بگات کە لە سەروبەندی ئەو ململانێیانەدا هێندێکمان هیچ هەڵەو مەرامێکی شەخسیی بەرژەوەند پەرستانەی نەبوە. بەڵکوو خەڵکانێکمان لە نێودا بوو کوڕی رۆژو خاوەنی رابردووی خەباتێکی بێ داروبار بوون‌و لەوەش زێتر پێوەندییەکی گیانیی بێ هێزیان بەکێشەی کۆمۆنیزم‌و گەلەوە هەبوو. هەروەها خەڵکانێکمان لە نێودا بوو پڕ بە پێستی ئەو پایە حیزبییانە نەبوون کەگرتبوویانن.

هێندەی مەسەلە کە پەیوەستە بە (سلام عادل)ەوە کە ساڵی ۱۹۵۵پلەی بەرپرسی یەکەمی حیزبی وەرگرت، ئەو خەباتگێڕێکی شیوعیی‌دڵسۆزو ئازاو لەکاری حیزبیدا شێلگیر بوو. یەکێك بوو لە کەسە سەرەکیەکانی دەستەی سەرکردایەتی. (حشع) هەتا سەرگرتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز، گەلێك سەرکەوتنی گەورەی بە سەرکردایەتیی ئەو بەدەست هێنا. سەرکردەیەکی میللی‌و کوڕی خێزانێکی میلليی سادە بوو. بەڵام لە رووی رۆشنبیری‌و ئەزموون‌و لێهاتووییەوە ـ

که فەهدلە سالانی سەرکردایەتی کردنیدا وابوو ـ سەرکردەیەکی جیاکراوەی نێو هەڤالانی سەرکردایەتی نەبوو. مێژوویەکی خەباتکارانەی دیاری نەبوو، بەڵکە یەکێکی نێو ژمارەیەك کەسی خاوەن ئاستو لێهاتوویی لە یەکترەوە نیزیك بوو. چەند خاڵێکی بێ هێزیی خۆیشی هەبوو وەك خولیای تاکرەویو خۆسەپاندنو پێرەویی بیرۆکراتیانە (ئەمە لەو ماوەیەدا دیاردەیەکی گشتی بوو لە نێو سەرکردایەتیە کۆمۆنیستیەکاندا)و حەز بە توندو تیژی کردن تا ڕادەی پێ لێ هەڵبڕین بەرانبەر هەر هەڤاڵێك زاتی بکردایە رەخنەی لێ بگرێ یا بەرهەڵستیی سیاسەتو هێندێك لە رەفتارەکانی بکات. دەستێکی کەمی لە نووسینی سیاسیدا هەبووو ئەوەیش لە لێوەشاوەییی سەرکردایەتی کردنیدا رەنگی دەدایەوە. ئەگەر ئەمرۆ لێم بپرسن کێ لەو ماوەیەدا بۆ پلەی بەرپرسی یەکەم باش بوو، لەوەلامدا بەبێ دوو دڵی دەڵێم : (محمد حسين أبو العيس) باشترینو شایانترین کەس بوو.

* * *

پاش کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیو پاش چوار رۆژ لێدوانی شێلگیرانەو جاروبار گرژ بە مێشکێکی شەکەتەوە هاتمەوە بۆ ماڵ لە (عرصات بحوشی). بڕیارمدا مۆڵەتێکی کورت بە عەقڵم بدەم، لانی کەم بۆ ئەو شەوە، بیر لە کێشە سیاسیو حیزبیەکان نەکەمەوە. (سعيد موسى)م نارد نەختێك خواردنەوەم بۆ بکڕێ، تا بخۆمەوەو بە کاریگەریی کهوول سڕ ببمو بنووم. کە دنیا تاریك داهاتو بەر لەوەی هیچ بخۆمەوە زەنگی ماڵەوە لێیداو (زكي خيري) خۆیی بە ژووردا کرد. پێش ئەوەی لە پەنامەوە دابنیشێ، رایگەیاندو گوتی :

ـ من مێشکم زۆرماندووەو بڕیارم داوە لە کەشی وتووێژی سیاسی دوور بکەومەوەو بخۆمەوەو بحەسێمەوە.. لەبەر ئەوە هاتمە ئێرە.

بەخێرهاتنم کردو پێم گوت منیش بڕیاری هەمان شتم داوە. دوای چەند دەقەیەك سەر لە نوێ زەنگەکە لێی دایەوەو (محمد حسين أبو العيس) هاتە ژوورەوەو

هەمان قسەی (زكي خيري)ی كـردەوە. دوابـەدوای سـێیەم لێدانـی زەنگەكـە،(جـورج تللو) وەژوورکەوت و هەمان شتی گوتەوە. (أم سلام) خوانـی بـۆ سـازکردین و بوتلـه ویسکیەکە لەگەڵ بوتڵە بیرەکاندا دانراو لیٚ نیشتین لە خواردنەوەو نوکتـەی ئاسـایی بۆ یەکتر. هەموویشمان سوور بوویـن لەسـەر ئەوە کـە توخنـی مشـتومڕی سیاسـی نەکەوین. بەر لەوەی خواردنەوەکە بگاتە نیوەی، مشتومڕی سیاسی دەسـتی پێکـردو هاتینەوە سەر باس و خواسەکانی کۆبوونەوەکە. دوای نیوە شەو ئەو کاتـەی کـە بوتڵـه ویسکیەکەو هەر ٢٤ بوتڵە بیرەکان تەواو چۆڕە بڕکرابوون، موناقەشەی ئێمە هێشـتا هەر ئاگری لیٚ دەبوەوە. ئەو نوکتە بلاوەی نێو عیراقیەکانم لـە مۆسـکۆ بیرکەوتـەوە : بۆچـی ژووری بەشـی نـاوخۆ لـە زانکـۆی مۆسـکۆ سـەعات دووی پـاش نیـوە شـەو روونـاکە؟ وەلاّم : ئەوە چەند قوتابیەکی عـیراقیی تێـدان مشـتومڕ لەسـەر سیاسـەت دەکەن، یا چەند ڤیتنامییەك فێری زمانی رووسی دەبن، یان چەند کووبابیەك سەما دەکەن.

* * *

پایزی ١٩٦٠ تووشی نەخۆشیەکی لەپڕبووم : هەردوو قـاچم لـەکاتی ڕۆیشـتندا ئازاریان هەبوو و سەرچاوەکەی بڕبڕەکانی پشتم بوو. تا ئێستا باوەڕم وایە دەرەنجامی زێدە بـەکارهێنانی ( ئـەنتی بـایۆتیك)بـوو. بـەپێی ڕاسـپێریی (اسمـاعیل جاسـم)ی پزیشکی نەشتەرکار تا لە دومەڵێك ڕزگارم بیٚ و پێویسـت نـەکات نەشـتەرکاریەکی سادەی بۆ بکرێت.

لە کاتێکدا (حشع) بانگ کرابوو بۆ هاوبەشـیکردن لـە کۆبوونـەوەی جیـهانیی حیزبە شیوعیەکان و کرێکاریەکانداو بڕیار وابـوو تشـرینی دووەمـی ١٩٦٠لـە مۆسـکۆ سـاز بکرێـت، مـن کرامـە سـەرۆکی وەفدەکـە تـا لـەم کۆبوونەوەیـەدا بەشـدار ببـم و لەهەمـان کاتدا چاری نەخۆشیەکە بکەم. ئەوسا خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو کە هێندێـك کەس ئامانجیان لەم ناردنەی من بۆ مۆسکۆ بەدیهێنانی شێوە دوورخستنەوەیەکە بـۆ ئەوەی لەبەشداریی کاری سەرکردایەتی دوور بکەومەوە.

کۆبوونەوە جیهانیەکە لە هۆڵێکی (کرملین) کرا لە گەمەی ناکۆکیە توندوتیژە زانراوەکانی نێوان حیزبە شیوعیەکانو بەتایبەت هەردوو حیزبی سۆڤێتیو چینیدا. هۆڵەکە ژمارەیەکی لەدیارترین کەسانی جووڵانەوەی کۆمۆنیستی جیهانیی تێدا بوو کە زۆربەیانم بۆ یەکەم جار بینی، وەك مۆریس تۆریزو پالمیرۆتۆگلیاتیو خرۆشیۆفو لیۆشاوشیو هۆشی مینەو هیی دیکە. بەشی هەرە زۆری حیزبە شیوعیەکان لەگەڵ حیزبی سۆڤێتیدا بوون. لەکاتێکدا حیزبی شیوعی ئەلبانیا دایە پاڵ حیزبی چینیو هیی کۆریایش نە لەگەڵ ئەمیاندا بوو نە ئەویان. هەرچی (حشع)یش بوو بە تەواویو بەبێ مەرج لایەنگریی لە سۆڤێت دەکرد دژی چینیەکان، ئەوەیش گرێو گۆڵی ئەرکەکەمی وەك سەرۆکی وەفدی حیزب زیاد کرد.

گوتاری سەرکردایەتیی سۆڤێتی خرۆشیۆف خوێندیەوە، درێژو تا ڕادەیەك لەسەرخۆ بوو پشتگیریی زۆر لەنێردراوانی حیزبە شیوعیەکانی بەنسیب بوو. کەسانێکی لە پاشا پاشایی تری وەك (خالد بکداش)و (محمد حرمل) لەنێو خوتبە خوێنە لایەنگرەکانی سۆڤێتدا بوون. بە پێچەوانەیشەوە، گوتاری وەفدی چینی کە لینپیاو خوێندیەوە، توندو تیژو پڕ لە هاشەو هووشە بوو گەلێك تاوانبار کردنو هورووژاندنی بێ پەردەی دژی سەرکردایەتیی سۆڤێتی تێدا بوو داکۆکیەکی بێ پەردەیش بوو لە ڕێبازی تەقلیدیی ستالینیانە کە خرۆشیۆف لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی سۆڤێتیەوە لە ١٩٥٦دا دژی ڕاوەستا. گوتارەکەی (ئەنوەر خوجە)ی ئەلبانیایی ڕەقترو زیاتر مایەی هورووژاندن بوو. وەفدی ئیتالیایش هەڵوێستێکی سەربەخۆی دیاری هەبوو، چونکە لایەنگریی هیچ لایەکی نەکرد لەدژی ئەوی دیکە.

گوتاری وەفدەکەمان خۆم نووسیمو لە کۆنگرەدا خوێندمەوە، پێم وابێ تا ڕادەیەك هێمن بوو تا ئەندازەیەکی دیاریکراویش سەربەخۆیی تێدا ڕەنگ دەدایەوە. لەبەر ئەم هۆیە ئەندامانی وەفدەکەمان بەبێ هیچ پەرۆشییەكو بگرە بەنابەدڵی قبووڵیان کردو (جەمال حەیدەری)ش ڕەتی کردەوە. بەهۆی نەخۆشییەوە ئامادەی کۆبوونەوەی لیژنەیەك نەبووم پێکهێندرا بوو ئەو بەڵگەنامەیە بنووسێ کە

وا دانرابـوو بـەناوی کۆبوونەکـەوە دەربچێ، بۆیـە جـەمال حـەیدەری لـە گوتـارێکی لاوەکیدا کە بەناوی وەفدەکەمانەوە خوێندبوویەوە، لەپاڵ لایەنگریی بەبێ مەرجی لـە سەرکردایەتیی بەخوا بووی سۆڤیێتی، هێرشێکی تونـدو تیـژی کردبـووە سـەر چینو سەرپاکیڕەخنە گران لە سۆڤیێت. ڕۆژی دوایـی ئـەم گوتـارەم خوێنـدەوەو ڕەخنـم لێ گرت، کەچی جەمال بەئامادەبوونی ئەندامانـی دیکـەی وەفدەکە وەڵامـی دامـەوەو گوتی :

- ئێمە سەیرمان کرد تۆ بەرانبەر بە چینیەکان نەرم وەستایتو بەڕاستی هەوڵت نەدا ڕێبازی حیزبمان دەربڕی، بۆیە دوێنێ سوودمان لە هەلی نـەهاتنت وەرگـرت تـا شتێك بەناوی وەفدەکەمانەوە بڵێین کە هەم تێڕوانینی حیزب دەردەبڕێو هـەم دەبـێ هەموان لەم کۆبوونەوەیەدا بیبیستن.

ڕۆژانە بە بەردەوامی چاومان بە سۆڤیێتیەکان دەکەوت. بەڵام تەنیا بۆ جارێکیش چاومان بەوەفدی چینی یـا هـەر وەفدێکـی لـەو چەشـنە نەکـەوت. لـەلای هـەڤاڵانی وەفدەکەمان درکاندم کە من حەز دەکەم لەگەڵ چینیەکاندا بەیەك بگەین بـۆ وتووێـژ لەسەر تێڕوانینەکانیان کە لەڕاستیدا لایەنگریان نەبووم. بەیەکگەیشتنەکە نەکرا.

* * *

کاتێك بەڵگەنامـەی کۆتایی خرایە بەرچاوی ئامادەبوانی کۆبوونەوەکە، من هیچ هەڵوێستێکم لەهیی وەفدی کۆریای باکوور خراپتر نەبینی کە بەڕاشکاویو بـەتوندی بەرهەڵستیی هەر ڕەخنە یا ڕیسوا کردنێکی دیاردەی تاك پەرستیی کـرد بـەبیانووی ئەوەی کە ـ گوایە ـ ئەوە خراپەکاریی تێدایـە بـۆ سـەرکردایەتیی حـیزبی کۆریـاییو کۆریـای بـاکووریش هـەلو مـەرجی تایبـەتی خۆیـی هەیە. ئـەم هـەلو مەرجە لـە ئارەزووی (کیم ئیل سۆنگ) بەدەرنەبوو بۆ مانەوەی وەك خوایـەکی بـێ گونـاح لـەو وڵاتـەداو بـۆ ئـەوەی کـەس بـەخۆدا ڕانەپـەرموێ ڕەخنـەی لێ بگـرێ. خـۆلێ پاراسـتن (تحفظ)ەکـەی وەفـدی کۆریـایی نـەبێ، سـەرجەم وەفدەکـان ئیمزایـان لەسـەر ئـەو بەڵگەنامەیەی کۆتایی کرد کە لە کۆبوونەوەکەوە دەرچوو.

کۆبوونەوەکە دوایی پێ هاتبوو و هەموو وەفدەکان لە ئاهەنگێکی پێشوازیا کۆببوونەوە کە سەرکردایەتیی سۆڤێتی لەسەر شەرەفی میوانەکان لە کرملین گێڕای. خرۆشیۆف‌و مۆریس تۆریزو پالمیرۆتۆگلیاتی لە دژی (میگۆیان)ی ئەرمەنیی دانیشتووی تەنیشتیان یەك کەوتن. بۆیە کەوتنە گێڕانەوەی ئەو نوکتەو قسەو قسەلۆکانەی کە دەدرێنە پاڵ ئەرمەن‌و رادیۆی یەریڤان. (میگۆیان)یش گوتی:

- دەمەوێ نیکیتا خرۆشۆف وەڵامم بداتەوە: ئایا کۆنیاکی فەڕەنسەیی لە کۆنیاکی ئەرمەنیی سۆڤێتی باشترە وەك هەڤاڵ مۆریس لافی ئەوە لێ دەدات؟

- مۆریس هەڵیدایێ: کەواتە میگۆیان توانیی ناکۆکی لەنێوانماندا بنێتەوە.

چەند گۆرانی‌و دیمەنێکی هونەری لە ئاهەنگەکەدا پێشکەش کران. سەمایەکی کۆنی ڕووسیایی یان دڵبەندی کردم کەشەش کوڕو پێنج کچ بەشدارییان تێدا کرد. کوڕێکیان تەماحی ئەوەی هەبوو لەیەك کاتدا هاوڕێیەتی لەگەڵ چەند کچێکدا بکات. ئەمیانی بەجێ دەهێشت‌و پێوەندیی بەویانەوە دەکردو، دووەمیانی بەجێ دەهێشت‌و دەچوە پاڵ سێیەمیان. دواجار پێنج کوڕەکەی دیکە لەگەڵ پێنج کچەکەدا پێکهاتن‌و، ئەویش بەتاقی تەنیا بەبێ دۆست مایەوە.

* * *

دوای کۆتایی هاتنی کۆبوونەوە کە لە نەخۆشخانەی کۆمیتەی ناوەندی لە مۆسکۆ کەوتم‌و ئەندامانی وەفدەکەیش بۆ بەغدا گەڕانەوە. دوایی زانیم ئەوان لە ڕاپۆرتەکەیاندا بۆ مەکتەبی سیاسی باسی ئەوەیان کردبوو کە من سەرپێچیی سیاسەت‌و ڕێنوێنیەکانی حیزبم کردووە، چونکە لەکاتی کۆبوونەوەکەدا وەکوو پێویست لایەنگریی سۆڤێتم نەکردبوو. ئەم هەڵە هەڵبەستراوە زۆر لەسەرم کەوت، لەبەرئەوەی وەختێکی دیکە لەدژم قوت کرایەوەو بەیەکێك لەو هۆیە سەرەکیانە دانرا کە سزای لێ‌خستنمی لە سەرکردایەتی‌و ڕاگرتنی ئەندامەتیمی لە حیزبدا پێ پاساو دەدرایەوە.

پاش له نەخۆشخانە دەرچوونم داوای بلیتی سەفەرم لە (ڤالیووشـن)ی ئـەندامی لیژنەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی سەر بە کۆمیتـەی نـاوەندی حـیزبی شـیوعی سـۆڤێتی کرد تا بۆ بەغدا بگەڕێمەوە. ڕۆژی دوایی هاتە لام بۆ ئوتێل‌و گوتی :

ـ کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شـیوعیی سـۆڤێتی برووسـکەیەکی لـە مەکتـەبی سیاسیی حیزبتان وەرگرتووە تێیدا هاتووە کە سـەرکردایەتیتان بڕیـاری داوە تـۆ لـە مۆسکۆ بمێنیتەوەو پێوەندی بە قوتابخانەی حیزبیی باڵاوە بکەی.

حەزم نەدەکرد بمێنمەوەو داوای خوێندنی حیزبیم نەکردبوو. چـەند جـارێك داوای گەڕانـەوەم کـردەوە بـۆ بـەغدا، لـەوە زیـاتر کـە جـەختیان لەسـەر ڕەتکردنـەوەی‌و پێویستیی مانەوەم بۆ خوێندن دەکـرد، هیچـی دیکـەم پـێ نەدەگەیشـت. بیرم لـەوە نەدەکردەوە لە ڕووی بڕیارەکەدا بوەستمەوەو قسەی مەکتەبی سیاسی ژێر پـێ بنێـم‌و بگەڕێمەوە. بەڵام باش قەناعەتم بەوە کرد کەلـەمۆسکۆ مـانەوەم هـەر شـێوە سزاو دوور خستنەوەیەکە لە عێراق‌و لە بەشداریی چـالاکیی سەرکردایەتیی حـیزبدا. مـن ئەو ئەندامـەی سەرکردایەتی نەبووم کە زیاتر پێویستم بەخوێندنی کێشە تیۆریەکانی فەلسەفەو ئابووریی سیاسی‌و بنیاتنانی حیزب‌و هیی لەم بابەتە بێ. بـەڵام مـن ئـەو ئەندامەی سەرکردایەتی بووم کە لای سکرتێر ڕەزام گران بوو. لەبـەر ئـەوە نـاڕەزاییم دەربڕیبایە یان نا، بمویستبایە یان نەمویستبایە دەبوو بخوێنم. ئەمە قەناعـەتی پـێ کردم بەوە کە هەریەکێك ئیش لەگەڵ (سلام عـادل)دا بکات دەبێ پێ بەپێی بڕوات‌و ڕەخنەی شێلگیرانەی لێ نەگرێ. چاوپێکەوتنە دوو قوڵیەکـەی دوا بـەدوای کۆبوونـەوە پـڕ کێشـمە کێشـەکەی کۆمیتـەی نـاوەندیم لـە ١٩٦٠دا بیرکەوتـەوە کەبەوپـەڕی هێمنیەوە لەسەر پەرەسەندنی وەزعی حیزب‌و هێندێك ڕەفتـاری سـەلام خـۆی قسـەم لەتەکدا کردو ئامۆژگاریم کرد لە پلەی سکرتێری لابچێ‌و بەئـەندامێکی مەکتـەبی سیاسی بمێنێتەوە. کەچی لەوەڵامدا گوتی :

ـ دوو پشك کە دەبینێ ئاگر لە هەموو لایەکەوە دەوری داوە، دەسـت پێشـخەری دەکات بەخۆیەوە بدات‌و خۆ بکوژێ.

لەو چاوپێکەوتنە هاتمە دەرو قەناعەتم بەوە هەبوو کە (سلام عادل) هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە دەست لە پلەی سکرتێری حیزب هەڵبگرێ، ئەوەتا منیش بە ڕێگەیەکی بیرۆکراتیانە ناچار دەکرێم بەکردەوە دەست لە پلەو پایەم لە مەکتەبی سیاسیو لە سکرتاریەتی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبگرم تا لەنێوچە تاراوگەیەکدا دوور لە عێراق بمێنمەوە.

ئەوەندەی نەبرد هەریەکە لە (عامر عبداللـه)ی ئەندامی مەکتەبی سیاسیو (ثابت حبیب العاني)ی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی لەم تاراوگە نیوچە ڕەسمییەدا گەیشتنە لامان. دەمزانی (عامر)یش بوغزێندراوە، چونکە لەو کەسانە بوو کە داوایان کرد (سلام عادل) لە پلەی سکرتێری دوور بخرێتەوە. بەڵام دوایی زانیم (ثابت) لەوەش زێتر جامی غەزەبی بەسەردا قلّپ کراوەتەوە.

* * *

نێوان ئەیلوولی ١٩٦١ ـ ئەیلوولی ١٩٦٣ لە قوتابخانەی حیزبیی باڵای مۆسکۆ لە نێو تاقمەکەی خوێندنماندا مامەوە کەسەرباری دوورخراوە ئاماژە بۆکراوەکان لە (هادی هاشم)و (سلام الناصری)و(جەمال حەیدەری )و(نزیهـە الدلیمی)و(عادل حبە)و (مهدی عبدالکریم)و (ثمینة ناجي ـ ژنی سەلام عادل)و هەروەها ـ لەکاتێکی درەنگتردا ـ (آرا خچدور) و (حسین سلطان) پێکهاتبوو. بەرنامەی خوێندنمان، وێڕای زمانی ڕووسی، بابەتەکانی فەلسەفەو ئابووریی سیاسیو کێشەکانی بنیاتنانی حیزبو مێژووی حیزبی شیوعیی سۆڤێتیو جووڵانەوەی کرێکاریو ئازادیخوازی جیهانیو یاسای نێو دەوڵەتیو جوگرافیای ئابووریی جیهانی دەگرتەوە. شێلگیرانە خوێندمو قەت ڕووی نەدەدا لە هیچ تاقیکردنەوەیەکدا لە (٥)ـ کەبەرزترین پلە بووـ کەمتر وەریگرم.

(هادي هاشم)، سەرەڕای ئەوەی کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیو سکرتاریەت بوو، لە خوێندندا لە هەموان بێ تواناتر بوو. فێر بوو بوو لە گەلێك حاڵەتدا خۆیی

لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە دەدزیەوە، چونکە دەسەڵاتی بەسەر وەڵامدانەوەدا نەدەشکاو نەیدەویست ڕووبەڕووی دەرنەچوون و کەوتن ببێتەوە. سەرباری درێژیی مانەوەی، شتێکی ڕاست لە زمانی ڕووسی فێر نەبوو لە ناوە پێویستەکانی خۆی زیاتر بۆ دروستکردنی ئەو شتانەی کە سەودا سەریان بوو لە ترشیات و چێشتی ئالۆزی وەك یاپراخ و کوببە بە جۆرە جیاجیاکانیەوەو شتی وا. جێی ئەو هەموو گەنجینەو دووکانانەی پێ دەزانی کە ئەو کەرەستانەیان تێدا دەفرۆشران. دەبێ دانی پێدا بنێم کە کابرایەکی قابیل و لەگەڵ هاوڕێیانی تیپی خوێندندا برادەرایەتیی خۆش بوو پێوەندییەکی باشی پێیانەوە هەبوو مشووری دەخواردن. بەڵام لەو مەسەلە بنچینەییەدا کە لەپێناویدا نێردرابووین ـ مەسەلەی خوێندن ـ گوێی بەخۆی و بەکەسانی دیکە نەدەدا. لەوە دەچێ خەریك بوو بێ ڕوو لە شپرێوی بکات، وەك هێندێك کەس ئەمە پێشەیانە. هادی هیچ شەقڵێکی سەرکردەی سیاسیی شك نەدەبرد.

لام وابێ (هادی هاشم) و (حسین سلطان) و (ثابت العاني) نەبێ، هەموان فێری چەردەیەك لە زمانی ڕووسی بوون. ئەمەی دواییان خۆیی بە فێربوونی زمانەوە ماندوو دەکرد، بەڵام سوودی نەبوو.

بەیانیەکیان (نزیهە الدلیمی) سەعاتەکەی دەستیی ون کرد، بەبێ هوودە هەموو شوێنێکی بۆ گەڕا. پاشنیوەڕۆ کە چاوم پێ کەوت لێم پرسی :

ـ سەعاتەکەتت دۆزییەوە؟

ـ نەخێر نەمدۆزییەوە.

ـ پاش ئەوەی سەعاتێکی ڕاستەقینەم لەدەستیدا بینی، پێم گوت : مادامێکی تۆ سەعاتێکی زیادەت هەیە. بەڵاکە گەورە نییە.

ـ نەخێر هیچ سەعاتێکی دیکەم نییە.. هەر ئەو سەعاتە بوو.

ـ ئەی ئەو سەعاتەی دەستت هیی کێیە؟

ڕوانییە دەستی‌و لەیەکێك دەچوو کت‌و پڕ شتێکی عەنتیکەی لێ پەیدا بووبێ. بەپێ سەیر بوون‌و واق وڕمانەوە قیژاندی:

- ئەمە ئەو سەعاتەمە کە لام وابوو ون بووەو لەبەیانییەوە تا ئێستا بەدوایدا دەگەڕام!

(عامر عبدالله)لەگەڵ (ثابت العاني)دا ڕێککەوتبوو خواردنیان بە خەرجی‌و دروستکردنەوە یەك بخەن‌و کۆمۆنەیەکی دوو قۆڵی بۆ خۆیان دابمەزرێنن. هێندەی پێ‌نەچوو ڕێککەوتنەکەیان هەرەسی هێنا. کە هۆکەیم لە (ثابت العاني) پرسی، وەڵامی دایەوە:

- دەبوو پارەی گیرفانم خەرج بکەم‌و بە دەستی خۆم خواردن‌و چایەکە ساز بکەم‌و، (عامر)یش هەر ئەوەی لەسەر بوو ئامادەی نان‌و چا خواردن بێ. لەبەر ئەوە کۆمۆنەکە هەرەسی هێنا.

ڕۆژێکیان (عادل حبە) چوو بووە چێشتخانەی قوتابخانەو یەکێکی دەست نەکەوتبوو قسەکانیی بۆ بکات بە ڕووسی. بە پەنجە ئاماژەی بۆ لیستەی خواردن کردبووو سێ جۆرە خواردنی دەست نیشان کردبووو پارەکەی دابوون. کاتێك وەریگرتبوون، بۆی دەرکەوتبوو هەر سێ جۆر سووپی دیاری کردبوو.

ئەو کاتەی لەوێ نیشتەجێی بینای بەشی ناوخۆی قوتابخانەی حیزبی بووین، گەشتێکی قوتابخانەیان بۆ شاری (کییێف) بۆ ڕێکخستین. دەبوو هەموو ڕۆژێك خواردنی ڕۆژی دوایی دەست نیشان بکەین. نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی خواردنە سەرەکیەکەیان بۆ (سلام الناصري)نەهێنا. کە داوای کرد، وەڵامیان دایەوە هیچی ناونووس نەکردووە. ئەویش سوور بوو لەسەر ئەوەی کە نووسیویەو داوای لیستەکەی کرد. کە هێنایان ئاماژەی بۆ وشەی "بەڕێوەبەر"ی پەراوێزی لیستەکە کرد. پاش یەك دەقە بەڕێوەبەر لە بەردەمیدا قوت بووەوە. پاشتر ڕوون بووەوە کە (سلام الناصري) ئاماژەی بۆ وشەی بەڕێوەبەری لیستەکە کردووە، چونکە وای زانیوە خواردنێکە لە خواردنە عیراقیەکان دەچێ.

مۆسکۆم خۆش ویست، دوای ئەوەی تێیدا ژیام و تێکەڵی خەڵکەکەی بووم و فێری زمان و داب و نەریتیان بووم. بۆم دەرکەوت شاری سەلامەتی و دڵنیایی و دڵپاکی و ڕووخۆشی و شانۆی گەورە و باخچەی جوانە. نەمدی و نەمبیست هیچ شتێك زەوقی یەکێکی تاقمەکەی خوێندنمان لێ تێك بدات، ئەگەر چی ئێمە پاش نیوەشەو بە دارستان و شەقامە چۆڵەکاندا دەڕۆیشتین. جاروبار بە شەو لە باخە گشتیەکاندا دەماینەوە و بە هەموو جێیەکدا دەگەڕاین. تەنیا یەك ڕووداو قەوما : شیوعییەکی سوودانیی قوتابیی قوتابخانەکە( پێم وابێ ناوی معاویە و ئەوسا لە ئەندامانی سەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی سوودانی بوو) درەنگانێکی دوای نیوەشەو گەڕابووەوە، سەرخۆش بووبوو ئامێرێکی ئاسایی تۆمارکردنی پێ بوو. شوفێری تەکسیەکە دایبەزاندبوو تۆمارکەر (المسجل)ەکەی لێ دزیبوو. ئێمە زۆر نیگەران نەبووین، چونکە ئەم لاوە سوودانیەمان لە نێودا بەد ڕەوشت و ئێسك قورس بوو.

بۆم دەرکەوت گەلی ڕووسی سادە و دڵپاك و بە ئاکار و پەروەردە باشە. ئەگەر ڕێ بەخۆم بدەم بەراوردی ئەو گەلانە بکەم کە بۆم هەڵکەوتووە لەگەڵیاندا بژیم و ناسیاری لەگەڵ داب و نەریت و سایکۆلۆجییاندا پەیدا بکەم، ئەوا بەبێ چەندو چوون دەیبڕمەوە کە گەلی ڕووس بێ هەواترین و سەرنج ڕاکێشترین گەلە دیبێتم. من ئێستاکە لە دوادواییەکانی ۱۹۹۱دا ئەمە دەنووسم و زۆر لەو شتانە بەباشی دەزانم کە لە مۆسکۆ ڕوویان داو گۆڕان. بەڵام ئەوەی دەینووسم قەناعەتی تەواوەتیمە لەسەر ڕووسیای نێوان ۱۹٦۱ ـ ۱۹٦۳.

ئۆدێسا نەبێ کەنارەکانی (دەریای ڕەش)م سەرتاسەر بینی. وەك میوانێك لەئوتێلەکانی کۆمیتەی ناوەندی و وەك گەشتیارێکی ئاسایی نارەسمی ژیام. چەند جارێك سەرم لەنەخۆشخانە داو، یەکەمین جار ساڵی ۱۹۵۹ دوای چەند ڕۆژێکی کەم لێی هەڵاتم، چونکە زمانی ڕووسیم نەدەزانی. دوایی قەناعەتم بەوە کرد کە تەنانەت پشوو بەسەر بردن و حەوانەوەش پێویستییان بە چەشنە ئەزموون و لێهاتوویی یەك

هەیە. دوایین گەشتم بۆ حەوانەوەو پشوودان لەسەر دەریای رەش و ـ کەمتر ـ لەسەر دەریای بالتیك لە ساڵی ١٩٧٤دا بوو کە لە بەغداوە بە هاوڕێیەتیی (عایدة یاسین)ی هاوسەرم سەفەرم کرد.

* * *

زستانی ١٩٦٢ (سلام عادل) وەك سەرۆکی وەفدی (حشع) بۆ کۆنگرەی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی گەیشتە لامان. دوای کۆنگرەکە بڕووسکەیەکی مەکتەبی سیاسیی بۆ هات بۆ ئەوەی بچێتە قوتابخانەی حیزبی لە مۆسکۆ. واتە چیی لەگەڵدا کردم ئەوەیان لەگەڵدا کرد. بە واتایەکی کرد، کەوتە هەمان بیرەوە کە خەڵکانی دیکە بە دەستی ئەو تێی کەوتن. لام وابێ (زکي خیري)توانیبووی وەك رێگەیەك بۆ دوورخستنەوەی لە سەرکردایەتی، قەناعەت بە ئەندامانی دیکەی مەکتەبی سیاسی بکات (سلام عادل) بۆ خوێندن بنێرنە یەکێتیی سۆڤێت. لە شوقەیەکی دەرەوەی بینای قوتابخانەکەدا لەگەڵ ژن و کچە منداڵەکەیدا ژیانی بردە سەر. جا نازانم داخۆ کەڵکی لە خوێندنی حیزبی وەرگرت یان نا. بەڵام هەموان دەیانزانی ئارەزووی مانەوە ناکات و بە شوێن هەر دەرفەتێکدا دەگەڕێت خوێندنەکەی بپچڕێنێ و بگەڕێتەوە بۆ عیراق.

بڕیارم دا درۆیەکی نیسانی ١٩٦٢ لەگەڵ هەڤاڵانی تاقمی خوێندنداو لەوانە (سلام عادل) بکەم. تەلەفۆنم بۆ یەکێکیان کردو گوتم گوایە کودەتایەکی عەسکەری لە بەغدا کراوەو (عبدالکریم قاسم) بە دەستی کودەتاکەران کوژراوە. هەر بە رێکەوت هەڤاڵێکی سووریایی هەمان درۆی رێکخستبوو و تەلەفۆنی بۆ هێندێك عیراقی کردبوو. کە سەرچاوەی هەواڵەکە زۆر بوو، باوەڕیان کرد. (سلام عادل) تەلەفۆنی بۆ کردم ـ منیش چاوەڕوانی ئەمەم دەکرد ـ و داوای روونکردنەوەی رووداوەکەی کرد. وەڵامم دایەوەو جەختم لەسەر هەمان هەواڵ کرد. هەڤاڵانی تاقمەکەمان بۆ ماوەی نێزیکەی دوو سەعاتێك کەوتنە شیکردنەوەو قسە

تێداکردنی، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێکیان پەی بەوە ببات کە ئەوە ڕۆژی یەکی نیسانە.
دوا جار پێم گوتن :
ـ سەرچاوەی هەواڵەکە پەیامنێری ڕادیۆی ئەرمینیایە بە بۆنەی یەکی نیسانەوە گوتوویە. (لە مۆسکۆ کرابوو بە عادەت هەموو درۆو نوکتەیەك دەدرایە پاڵ ڕادیۆی یەریڤان).
کە (سلام عادل) لە مۆسکۆ بوو، شەڕی ناوخۆ لە کوردستانی عیراق گەرم بوو. سەلام لە هەڵوێستی کەمتەرخەمانەی سەرکردایەتیی حیزب بەرانبەریە گێروگرفتی کوردی نیگەران بوو. جەختی دەکرد کە نابێ بە تەنیا بەرهەڵستیی خەباتی چەکداری نەتەوە پەرستە کوردەکان دژ بە ڕژێمی عبد الکریم بکرێت، بەڵکو پێویستە بایەخ بەم مەسەلەیە بدرێتو دروشمی ئۆتۆنۆمی بەدەستەوە بگیرێت. من لەو ماوەیەدا دوور خرابوومەوەو بەکردەوە ئەندامەتیم ڕاگیرابوو بە بەڵگەوە نەمدەزانی هەڵوێستی ئەم کەسە یا ئەو ئەندامەی سەرکردایەتی بەرانبەر دەست پێکردنو پەرەسەندنی خەباتی چەکداری لە کوردستاندا چۆنە. تەنیا چاوم بە بڵاوکراوە حیزبییە گشتیەکان دەکەوت. دەیشمزانی (حشع) داوا لە پارتی دەکات چەك دابنێتو بە دووی چارەسەری ئاشتیانەی گیروگرفتەکەدا بگەڕێت. بەڵام ئەوەی کە (سلام عادل)گوتی، وەك پێشتر گوتم، نیشانەی هەبوونی ناکۆکیی تێڕوانین بوو لە نێو سەرکردایەتیدا. لەو باوەڕەدام (زکي خيري) بوو داوای چەك دانانی دەکرد بە بێ بەدەستەوە گرتنی داواکاریی ئۆتۆنۆمی، چونکە پاش دوورخستنەوەی شەخسی (سلام عادل) بۆ مۆسکۆ ئەو ئیشو کارەکانیی هەڵدەسووڕاند. هەڵوێستی (سلام عادل) دروستترو لە ڕاستییەوە نێزیکتر بوو.
ئێوارەیەکیان یەکێکیان تەلەفۆنی بۆ کردمو گوتی :
ـ سبەی (سلام عادل) دەچێتەوە بۆ نیشتمان، جا بەم بۆنەیەوە بانگ کراوی ئێوارە لەگەڵماندا بێی بۆ ماڵیان تا ماڵئاواییی لێ بکەینو شێوی لەگەڵدا بکەینو

بخۆینەوە. بە پەرۆش نەبووم بۆ بەشداری لە ئاهەنگەکەدا. بەلاّم بە لایەقم نەدەزانی رەتی بکەمەوە، بەتایبەت دەگەڕایەوە بۆ عیراق. بۆیە چووم‌و بەشداریم کرد. بەهۆی باری دژواری دەروونمەوە هێندەم خواردەوە تا گەیشتە ئەوەی پێویست بکات بە یارمەتیی یەکێکیان بگەڕێمەوە بۆ ژوورەکەم لە قوتابخانە. تاکە کەرەتی ژیانم بوو لە خواردنەوەدا زێدەخۆری بکەم تا بیٚ هۆش بووم. هەرگیز ئەوە دووبارە نەبوەوە.

هەمان ساڵی ١٩٦٢ (سلام عادل) گەڕایەوە بۆ عیراق. دوای ماوەیەك دەرکەوت کێشەی سەرەکی جێی ئەوپەڕی بایەخی ئەو هەم کێشەی پتەوکردنی دەسەلاٚتی سەرکردەییی خۆی بوو لەحیزبداو، هەم دوورخستنەوەی ئەو کەسانەی کە پێشتر هەڕەشەیان لەو دەسەلاٚتە کرد بوو. بەم پێیە ئەو مەسەلەیە ورووژێندرا کە بە کێشەی فراکسیۆنی چوار قۆڵی ناسرا. واتە ئەو دەستە بەندی (تکتل)یەی کە درایە پاڵ چوار ئەندامی مەکتەبی سیاسی. مەسەلەکە خرایە بەردەم کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیو بڕیارێکیان لە کۆبوونەوەکە دەرهێنا کە دەڵێت :

دەستە بەندییەك کراوەو کۆمیتەی ناوەندی ریسوای دەکات چونکە بەرجەستەکردنی رێبازێکی راستڕەوی کلکایەتیی پاکتاوکەر (تصفوي)ە. لێدوانو لێپێچانەوەکان لە نێو کۆبوونەوەکەدا کرابوون بە ئامادەبوونی : لە لایەکەوە منو عامر کە بە دوو سەر گەورەی فراکسیۆنە چوارقۆڵیەکە لە قەڵەم درابووینو، لە لایەکی دیکەوە (ثابت العاني) کە تاکە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیبوو پێوەندیی بە فراکسیۆنەکەوە هەبیٚ (لە رێی پێوەندییەوە بە عامر عبداللە). تەنانەت داوایشیان لیٚ نەکردین نامە لە بارەی مەسەلەکەوە پێشکەش بکەین، بەر لەوەی کۆبوونەوەکە ئەم بڕیارانەی خوارەوە لەسەر سزادان بدات :

١ـ لابردنی هەریەکە لە بەهادینو عامر لە گشت پلەیەکی حیزبییانو راگرتنی (تجمید) ئەندامەتییان لە حیزبداو چاوەڕێکردن بۆ زانینی جۆری ئەو هەڵوێستەی کە بەرانبەر بە بڕیاری سزادانەکە دیاریی دەکەن، تا دوایی بڕیار بدرێت وەك دوو

ئەندام لە حیزبدا بمێننەوە یان نا. لابردنی (ثابت العاني)ش لە گشت پلەیەکی حیزبیی.

٢ـ لابردنی هەریەکە لە (زكي خيري)و (محمد حسين أبو العيس) لە مەکتەبی سیاسیو کۆمیتەی ناوەندیو کردنیان بە ئەندامی لیژنەی ناوچە (منطقة).

ئەم هەموو شتانە کران بەبێ ئەوەی هیچیان لە بارەوە ببیستم، وەك بڵێیی کێشەکە پێوەندیی بە منەوە نەبوو بێ. تا رۆژێکیان لە قوتابخانەی حیزبی بووم، لەناکاو بانگیان کردمە ژوورێك تا چاوم بە بەڵگەنامەکانی کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بکەوێ. (سلام الناصري)ی بەرپرسی حیزبیی تاقمەکەمانو (آرا خچدور)و (حسين سلطان)ی جووتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی لەوێ بوون. سێ نامەی (زكي خيري) لە نێو بەڵگەنامەکاندا بوون. لە یەکێکیاندا دانی پێدا نابوو کە دەستەبەندی هەبوەو ئەم بەشداریی تێدا کردووە. لە دووەم نامەیدا کە بە داوای (سلام عادل) نووسیبووی، زیاتر دانی بە هەبوونی دەستەبەندەکەیدا نابوو. لە سێیەم نامەیشیدا لەوە زیاتریش دانی پێدا نابووو هەوڵی دابوو ئەو کەسە رازی بکات کە هەموو شتێکی لە دەستدا بوو. هەرسێ نامەکەی (زكي خيري) بە توندی رقیان هەستاندمو پاڵیان پێوە نام چاو بە هەڵوێستمدا بگێڕمەوە بەرانبەر بە کەسایەتیی (زکی)، چونکە چەشنە داماویو گوێ لەمستییەکی پێشان دابوو. پێم وابێ ئامانجی لە هەڵوێستی پشت کردنە ئێمە، دەربازکردنی خۆی بوو لە سزادان یا بۆ وەرگرتنی سزایەکی سووکتر بوو. نامەکەی (محمد حسين أبو العيس)یش کرابوو بە پاشکۆی بەڵگەنامەکان، کە خوێندمەوە بۆم دەرکەوت ئەم کابرایە سەرەتا نکوولیی لە هەر دەستەبەندییەك کردووە. بەڵام دواجار ئەوەندە تەنگیان پێ هەڵچنیوە ناچار دانی پێداناوە. ئەم لە نامەکەیدا دەڵێت : داوام لە هەڤاڵی سکرتێر کرد بۆم روون بکاتەوە چۆن دەبێ ئەو رووداوە بە دەستەبەندی ناو بنێین. لە کاتێکدا فراکسیۆنەکە نەهیچ کارنامەیەکی هەبوەو نە کۆبوونەوەی رێکوپێك و نە هیچ

شتێکی لەم بابەتە.. سکرتێر بۆی روون کردمەوە ـ قسەکە هیی (محمد حسین أبو العیس)ە ـ مەرج نییە لە دەستەبەندیدا هیچ بەرنامەو کۆبوونەوەیەك هەبێ. (محمد حسین)هەر ئەم روونکردنەوەیەی پێ بەس بووەو قایل بووە بەوە کە دەستەبەندی هەبوە.

دوایی لە (آرا خچدور)و (حسین سلطان)م بیست (عامر)یش لەو نامەیەدا کە پێشکەشی کردبوو وەك (زکي خیري)دانی بە هەبوونی دەستەبەندیدا نابوو و ئەم وەڵامەی بۆ عیراق ناردبووەوە. نازانم (ثابت العاني) لە نامەکەیدا چیی نووسیبوو. بەڵام باش دەزانم بەشداریی (ثابت) لەو دەستەبەندیە هەڵبەستراوەدا لە گۆڕینەوەی باس‌و خواس‌و "زۆر بلێیەتیی هەڤالانە"ی نێوان خۆی‌و عامری تێ‌نەپەڕاندووە، تەنانەت ئێمە هیچمان لە بارەی مەسەلەکەوە لێ نەبیستبوون.

چیرۆکی دەستەبەندیەکە لە بنەڕەتدادروستکراو هەڵبەسترا تا بکرێتە بەهانەی دوورخستنەوەی ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە دەیانتوانی لە نێو کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسی‌و کۆمیتەی ناوەندیدا قسە بکەن بە رەخنە گرتن روو بە رووی خودی سکرتێر. سەربەخۆیی لە بیروڕاداو نەترسان لە بەرچاوخستنی هەر رایەکی جێی قەناعەتی خاوەنەکەی، لەو شتانە بوون کە بە دڵی (سلام عادل) نەبوون. هەرچی‌تاوانی راستڕەوی‌و کلکایەتی کردن‌و پاکتاو کردنیش بوو کە دایان بە ملی فراکسیۆنە هەڵبەستراوەکەدا، لەسەر بنچینەیەکی مەنتیقی هەڵنەچندرا بوو، چونکە:

١ـ هێڵی سیاسیی راستڕەویی پێڕەو کراو بەرانبەر بە رژێمی عبدالکریم بە تەنیا هێڵی ئەندامانی فراکسیۆنە هەڵبەستراوەکە نەبوو. بەڵکە هێڵی حیزب یا سەر لەبەری سەرکردایەتی بوو بە (سلام عادل)و لایەنگرانیشیەوە. سۆڤێت ـ وەك پێشان گوتم ـ نەخشێکی سەرەکیی لەسەپاندنی‌ئەم هێڵەبەسەر(حشع)دابینی.

٢ـ ئەو کارانەی کە دژی‌کەسانی بەدەستەبەندی تاوانبار کراو کران هاوکاتی هیچ دەستکاریکردنێکی ئەو هێڵە نەبوون، نە دروشمی رووخاندنی رژێم بەرزکرایەوەو

نەچاو بە هەڵوێستی حیزبدا بەرانبەربە توێژە بەرهەڵستەکانی عبدالکریم خشێندرایەوەو نە هیچ پلانێکیش بۆ گەیاندنی حیزب بە دەسەڵات دارێژرا.. تد.

٣ـ ئەو کەسانەی کە لە کێشەیەکی گرنگی وەك چالاکیی حیزبی کردن یا نەکردنی نێو سوپادا بە پاکتاوکەرو راستڕەو ناوبرابوون ـ بەهادین‌و زکي خیري‌و محمد حسین أبو العیس ـ ئەوان خۆیان ساڵی ١٩٦٠ پشگیریی (سلام عادل)یان کرد دژی هەڵوەشاندنەوەی رێکخستنی حیزبی لە سوپادا. لە کاتێکدا پاش هورووژاندنی کێشەی دەستەبەندیی راستڕەویی پاکتاوکەر هەر ئەوانەی لەگەڵدا مانەوە کە داوای هەڵوەشاندنەوەیان دەکردو، ئەوانیش (هادی هاشم)و عەزیز محەمەدو (جورج تللو)بوون.

حەز دەکەم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە ئەوانەی لایەنی (سلام عادل)یان گرت دژی ئەو فراکسیۆنە راستڕەوە پاکتاوکەرە هەڵبەستراوە، هەر خۆیان نەخشەی سیاسەتە راستڕەویە کلکایەتیکەرەکانیان لە ١٩٦٤داو بە تایبەت ساڵانی هاوپەیمانەتیی کلکایەتی لەگەڵ رژێمی بەعسدا (١٩٧٢ ـ ١٩٧٩) بۆ حیزب دانا.

# ـ كودەتای شوباتی ١٩٦٣ ـ

لە ساڵی دووەمی خوێندندا بووم کە ئاژانسەکانی دەنگوباس هەواڵی کودەتای هەشتی شوباتی ١٩٦٣ یان هێنا. ئەم کودەتایە دەرەنجامی هەوڵو تەقەلای هاوبەشی نێوان ناوەندە خۆراواییەکانو حوکمدارانی قاهیرەو چەند لایەنێکی دیکەی ڕاستڕەو بوو، سەرباری حیزبی بەعسی عێراقیو توێژێك لە عەسکەریە کۆنە پەرستو ڕاستڕەوکانی سوپا. ئێمەی عێراقی لە قوتابخانەی حیزبیی مۆسکۆدا کەوتینە دۆخێکی دەروونیی یەکجار دژوارەوە، بەبێ ئەوەی بتوانین لە بەدوودا چوونی لە دوورەوەی دەنگوباس زیاتر هیچی تر بکەین. هەڵوێستی سەرکردایەتیی سۆڤێتیمان بەڕێبەریی خرۆشیوف بەدڵ بوو کە بەتوندی کودەتاکەی ڕیسوا کردو پەردەی لە ڕووی تاوانەکانی هەڵماڵی. تاوانەکانی لە هەموو ئەو تاوانانەیان تێپەڕاندبوو کە خاکی عێراق تا ئەو کاتە بەخۆوەی دیبوون. هێرشی ڕاگەیاندنی سۆڤێتی بەشێکی بنچینەییی هێرشێکی جیهانی بوو، ڕیزی کودەتاکەرانی شێواندو دژایەتیەکانیانی زیاد کردو تەمەنی حوکمی بەعسیی کورت کردەوە.

ماوەیەکی کەم پاش کودەتاکەو وەك بەشێك لە پاڵپشتکردنمان بەڕاگەیاندن دژی کودەتاکەران، ڕادیۆی دەنگی گەلی عێراق هاتە ڕوو کە لە بولگاریاوە بەرنامەکانیی بڵاو دەکردەوە. سەرەتا دەست پێشخەریەکە لە توودەییە ئێرانیەکانەوە بوو کە لەوێ ڕادیۆی نهێنیی (پەیکی ئیران) یان بەڕێوە دەبرد، بەتایبەت لە (حەسەنی قزلجی)ی توودەییی کوردەوە کە بڕێك زمانی عەرەبیی دەزانی. ئیتر پێش ئەوەی شیوعیە عێراقیەکان جێی خۆیان لە ڕادیۆکەدا بگرن، ئەو بەعەرەبیە شەقو شڕەکەی دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی دەنگوباسو باوەگۆ (تعليقات). حەسەن کاتی خوێندنی زانستی ئاینی لە مزگەوت فێری عەرەبی بوو بوو. لەدەست ڕژێمی شا هەڵاتبوو بەدرێژاییی نێزیکەی بیست ساڵ کە لەعێراق بەسەری بردو ماوەیەك لە

بەغدا بووو، لەنێوان وەرزێریی دێهاتو کرێکاریی بینای شاراندا دەهاتو دەچوو، توانیبووی عەرەبیەکەی پەرە پێ بدات. نموونەی خەباتکاری شۆڕشگێڕی خۆڕاگربوو کە کۆڵی پێ نەدەدرا. دواجار لە ڕێی پێوەندیی بەحیزبی توودەوە گەیشتە بولگاریا تا لەوێ لەبەشی کوردیی (پەیکی ئیران) ئیش بکات.

سۆڤیێتیەکان دوای کودەتای شوبات یارمەتیی (سلام الناصری) - یا أنور مصطفی - ی ئەندامی پالێوراو بۆ مەکتەبی سیاسیو بەرپرسی حیزبیی تاقمەکەی خوێندنمانیان دا بۆ ئەوەی دەربکەوێ. بۆیە گەلێك لێدوانو بەیاننامەیان بۆ بڵاوکردەوەو هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخساند نامەو یادداشت بۆ حیزبە شیوعیو ناوەندە دەرەکیەکان بنێرێ. (سلام الناصری) خۆیشی بۆ ڕاپەراندنی ئەم ئەرکە بە پەرۆش بوو، ئەگەر چی ئەو لێوەشاوەییە داواکراوەی شك نەدەبرد، چونکە پێی نەدەکرا گوتارێك یا ڕاگەیاندنێکی سیاسیی ماقووڵ بنووسێ.

ماوەیەك لەکودەتا بە دوا (مهدی عبدالکریم)ی قوتابیی تاقمی خوێندنمان لە مۆسکۆوە برایە بولگاریا بۆ ئەوەی لە ڕادیۆی دەنگی گەلی عیراق ئیش بکات. مەسەلەی چوونە ئەوێیان نەخستە بەردەمی منو عامرعبداللە، ئەگەرچی ئێمە لەهەموان پتر دەسەلاتمان بەسەر نووسینو کاری ڕۆژنامە نووسیدا دەشکا. (أنور مصطفی) هێشتا کە لێمان بەقین بوو، چونکە بەدەستە بەندی تاوانبار کرابووینو ناومان لە لیستە ڕەشەکەدا بوو. لەکاتێکدا من پێشدەستیم کردبوو چەند باوەگۆڕو گوتارێك بۆ ڕادیۆ بنووسم، لەوانە گوتارێکی تەرخانکراو بۆ ستایشکردنی (سلام عادل) دوای ئەوەی کە بەئەشکەنجەدان شەهید بوو.

پاش کودەتا نامەیەکم دا بە (سلام الناصري)و ئامادەییی خۆمم تێدا پێشاندا بۆ ئەوەی بەنهێنی بگەڕێمەوە بۆ عێراقو بەشداریی دووبارە بنیاتنانەوەی حیزب بکەم. وا وەلام درامەوە کە دەبێ سالی خوێندن تەواو بکەم، ئەمجا خۆ بۆ گەڕانەوە ئامادە بکەم. سالی دووەمم تەواو کردو لەگەل تاقمێکی عێراقیو سووریاییو

لوبنانی‌و ئوردنی‌و کووبایی‌و ئیتالیاییدا بەشداریی گەشتی هاوینەی (بەپراتیک ناوبراوی) قوتابیانم کرد بۆ جیۆرجیای سۆڤیێتی لە قەفقاس. لە (تبلیس)ی پێتەخت سەرمان لە کارگەیەکی بەرهەمهێنانی خواردنەوەدا. کە هاتینە دەر، هێندێکمان عارەق وا کاری تێکردبوو لارە لاری دەکرد. ئێوارە بیستم لاوێکی کووبایی‌و ژنە مامۆستایەکی ڕووسیی تاقمەکەمان لەدەوروبەری شار پیاسەیان کردووە، لێیان دراوەو ڕووت کراونەوە. مرۆڤ بە ئاسانی دەیتوانی تێبینیی ئەو بیرو خولیا نەتەوەییە بکات کە تاڕادەیەك بە بەربلاوی لەنێو جیۆرجیەکاندا هەبوو. کۆلخۆزیە جیۆرجیە موسڵمانەکان لە کۆماری ئەبخازیای خاوەن ئۆتۆنۆمی ـ بەشێکە لە جیورجیا ـ بەسەردانەکەمان دڵشاد بوون. ناوەکانیان بەگشتی عەرەبی بوون وەك محەمەدو عومەرو عەلی‌و حەسەن تد. لەناوچەیەکی دێنشینیش دیدەنیی کارگەیەکی شەرابمان کرد. کارگەکە توونێلێکی دەستکردی ژێر چیاکەی بەدوادا دەهات کە درێژیی ١٣کیلۆمەتر بوو و هەشتا ملیۆن لیتر شەرابی دەگرت. خۆشیمان لە داوەتی ژێر کۆمەڵە دارێکی بەرزو سەر کانیەکی دڵگیری بناری چیایەکی قەفقاس وەرگرت. جووتیارێکی جیۆرجی دوای سەرخۆشبوون دەستی بە هوڕاکێشان کرد بۆ ژیانی ستالین کە دە ساڵ بەر لەوە کۆچی دواییی کردبووو، نیگەرانیی خۆیی بەرانبەر بە کارەکانی خرۆشیوف دژی (ستالین)ی کوڕە شیوعیەکەی جیۆرجیا پیشان دا کە سی ساڵ حوکمی یەکێتیی سۆڤیێتی کرد. داب‌ونەریتی جیۆرجی لە ئاهەنگی خواردنەوەو شەونشینیدا وەها بوو، کابرایەکی بە (تەمەدان) بانگکراو لە بەراییی داوەتەکەوە دادەنیشت‌و ئەوانی دیکە بەدرێژاییی کاتی داوەتەکە ملیان بۆ فەرمانەکانی درێژ دەکرد.

سەرەتاکانی تەممووزی ١٩٦٣ بوو کاتێك سەرلەبەیانیی ڕۆژێکیان هەستاین، گوێم لێ بوو (مهدي عبدالكريم ) دەیگوت:

ـ ئەمڕۆ شتێکی گرنگ لە عێراق ڕووی داوە.

ـ لێم پرسی : (أبوكسری) ئەی ئەوەت چۆن زانی؟ خەونت بینیوە؟

ـ بەڵێ خەونم دیوە، خۆتان دەیبینن..

هیی وامان لەنێودا بوو گاڵتەی بەخەونەکەی و بەهەموو خەونێك دەهات. ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە ڕادێوی بەغداوە بەیاننامەیەکی ڕەسمیمان لەسەر ئەو هەوڵی کودەتا عەسکەریە کۆمۆنیستیە بیست کە بە جووڵانەوەی (حسن سریع)ی جێگری عەریف ناسراوەو لەسەربازگەی (الرشید)کراو خەریك بوو سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدەست بێنێ. کە بە(مەهدی)م گوت تۆ بە خۆڕایی خەونت نەبینیو بەئارەزوو قسەت نەکرد، چیرۆکێکی دیکەی بۆ گێڕامەوەو باوەڕم پێ کرد، بەبێ ئەوەی باوەڕم بە بەندو باوو غەیبزانی هەبوو بێ. مەهدی گوتی :

ـ لە خانەی باڵای مامۆستایان (کۆلێجی پەروەردە) قوتابی بووم و خایەو مایەم بریتی بوو لەنیو دینار تا لە ماوەی پازدە ڕۆژی کۆتاییی مانگدا لە پێتەخت پێی بژیم. پارەکەم لە گەڕانێکی شەقامی (الرشید)دا لێ بزر بوو. خەمگین و لێو بەبار لە ژوورەکەی بەشی ناوخۆ دانیشتم و هەردوو چاوم نووقاندو بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ بۆ تەگبیری حاڵی خۆم چی بکەم. کت و پڕ پارەکەم بینی لە پەنا بەرمیلێکی خۆڵی کۆڵانێکی (رأس القرية)دا کەوتبوو. پێڵاوەکەمم لەپێ کردو بەشی ناوخۆم ڕوو بە هەمان کۆڵان کە نێزیکەی بیست دەقەیەك دوور بوو بەجێ هێشت. پارەکەم بەو شێوەیە بینی کە پێشتر هاتە بەرچاوم و وەك منداڵێك ئەو یاریەیان بۆ کرببێ کە ئەم بەدڵێتی، ئاوا بە شادمانییەوە بە پارەکەوە گەڕامەوە.

* * *

ئەیلوولی ١٩٦٣ لەگەڵ (عادل حبة) دا مۆسکۆم بەجێ هێشت تا لە چیکۆسلۆڤاکیا جێگیر ببین و خۆ ئامادە بکەین بە شێوەیەکی نهێنی بگەڕێینەوە بۆ عێراق. ئەوە بوو خوێندنی حیزبیمان بەر لە سێیەم و دوایین ساڵی واز لێ هێنا. لە چیکۆسلۆڤاکیا لە ڤێلایەکی لادێییانەی ناوەڕاستی دارستانێکی هەشتا کیلۆمەتر

له (پراگ)ەوە دوور جـێ نشـین بووین. (فـرج محمـود)یش گەیشـتە لامـان. (حسـین سلطان) بەرپرسە عیراقیەکەمان بوو. لە میواندارییی دەزگایەکی تایبـەتی ئاسایشـدا بووین، راسپێردرابوو یارمەتیی ئەو شیوعیە عیراقیانە بدات کـە ئارەزوویـان دەکـرد بە نهێنی بگەڕێنەوە بـۆ وڵاتەکـەیان بـۆ درێـژەدان بـە خـەباتی شۆڕشـگێڕانە. گـەرم کردنەوەی ڤێلاکەمـان لەسەر خەڵووزی بەرد بەند بوو. دارستانەکەی دوورپشـتمان پـڕ لە جۆرە کارگێکی باش بوو. سەربازێکی وەزیفـە (مکلـف)یـان وەك چێشـتپەزێکی چیکی بۆ ناردین. ماوەی مانەوەی لە لامـان زۆر شـت لـە (فـرج محمـود)ەوە لەسـەر هونەری چێشت لێنانی خۆرەڵاتیانە فێر بوو. بەوە دڵخۆش بووو گوتـی: دوای تـەواو کردنـی خزمـەتی عەسـکەری دەبم بـە چێشـتپەزێکی پلـەی یەکـەم. کابرایـەکی چیکیشیان بۆ ناردین تا دەرسمان لە بارەی کاری نهێنییەوە پێ بڵێت. بۆم دەرکـەوت پێویستیەکی راستەقینەی بەوە هەیە گوێ لـە چەند دەرسـێکی ئێمـە بگـرێ لەسـەر کاری نهێنی.

ماوەی مانـەوەمان لـە چیکۆسـلۆڤاکیا چـەندجارێك بـە (میـلان)ی پیـاوی ئاسایش‌و بەرپرسی کێشەکانی رەوانەکردنـەوەی ئێمـەی عـیراقی گەیشتم. وام هاتـە بـەرچاو کابرایـەکی مـاقووڵۆ لـە ئیشـی خۆیـدا شـێلگیرو پـاك بـێ. رۆژێکیـان رەخنەیەکی توندو تیژی لە سەرکردەکانیحیزبی توودە گـرت‌و بـە گوێمیـدادا لەبـەر ئەوەی سوور بوون لەسـەر مانـەوە لـە هـەندەران دوور لـە گۆڕەپـانی خـەباتی گـەرم‌و گوڕی وڵاتەکەیان. جارێکیشیان رەخنەی لە (سلام الناصري) گرت لەسەر  راڕایـی‌و ترسانی لە گەڕانەوەو لە بارەیەوە گوتی :

- یەکجار زەحمەتە بیهێنمە بەرچاوم کە (سلام الناصري) بوێرێت بگەڕێتـەوە بـۆ عیراق. پیاوی تەنگانە نییە.

* * *

پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ عیراق، چەند مانگێکم لە پراگ بەسەر برد. ماوەیەك لە ئوتێلێك مامەوە. دەبوو لە مانگێکدابە (١٥٠٠)کرۆن بژیم. لە دەست کورتیەکی راستەقینەدا بووم تا گواستمەوە بۆ گۆڤاری (مسەلەی ئاشتیو سۆشیالیزم)و، لەوێ وەك یەکێك لە کارگەرانی بە مووچەیەکی (٣٥٠٠) کرۆنی ئیشم کرد.

پراگ، وەك زۆر لە ئەورووپاییەکان ناوی دەنێن، "مۆزەخانەی ئەورووپا"یە. شارێکە بە گردۆڵەکانیو شوێنەوارە مێژووییە دڵگیرەکانیو کچۆڵە جوانکیلەکانیو بەو رووبارەکەیشیەوە جوانە. بەڵام تەق تەقی بەردەوامی ترام (شەمەندەفەری کارەبایی) بەسەر شەقامە خشتڕێژ کراوەکانیەوەو ئەو دوو کەڵەی کە لە کارگەکانەوە بەرز دەبێتەوەو ئەو ئاوو هەوا شێدارە پیس دەکات، ئەوانە لە جوانیو دڵگیریی شارەکە کەم دەکەنەوە. ئەگەر پیاڵەیەك بیرەی (پیلزن)ی پلە یەك بخۆیتەوە، خێرا قەناعەت بەوە دێنی کە شا بیرەی جیهانە. ئەگەر گەرۆکێکی بێگانەیش بیو جێیەکت لە ئوتێلەکان گەرەك بێ، دەبێ بەرتیل بە بەڕێوەبەر یا کەسێکی ئەوێ بدەی. ئەگەر هەوڵ بدەی بە زمانی رووسی قسە لەگەڵ چیکەکاندا بکەی، زۆربەی ئەوانە کە ئەندازەیەك لە زمانی رووسی دەزانن بە گەرمی بە پیرتەوە نایێن. ئەگەر چی هەموان سلاڤین، کەچی رقیان لە رووسە.

لە پراگ تێکەڵی کۆمەڵگەی بچووکی عیراقی بووم کە بەشی هەرە زۆریان لە شیوعیە عیراقیەکان بوون. (عزیز الحاج)و (نوری عبدالرزاق)و (ماجد عبدالرضا)و (مهدي الحافظ)و (موسى أسد)و (بهنام بطرس)و قادر دیلانو کەسانێکی دیکەیان لە نێودا بوو. بۆ یەکەم جار لە ئوتێلێکی پراگ چاوم بە (عبدالفتاح ابراهیم)ی کەسایەتیی دیموکراتیی عیراقی کەوت کە وەك گەشتیارێك هاتبوو. چاوم بە (مهدي الجواهري)ی کەڵە شاعیریش کەوتو ئێوارەیەکیان داوەتم کرد بۆ شوقەکەم. کە شەراب کەمێك سەریی قورس کرد، هەستا لە هۆڵەکەدا کەوتە

پیاسەو بە نەشئەوە پێدەکەنیو جار لە دوای جار ئەو نوکتە بەغداییە بڵاوەی دەگوتەوە کە من بۆم گێڕایەوەو پوختەکەی ئەمەیە : کابرایەکی ئەفەندیی نێو ئەو بەغداییانەی کە ساڵی ١٩٢٦ دژی پەیمانی عیراقی ـ بەریتانیایی خۆپیشاندانیان کرد، بانگ کرا چاوی بە مەلیك فەیسەڵ بکەوێ بۆ ئەوەی داواکاریەکانی خۆپیشاندانەکە بەرچاو بخات. بە مەلیکی گوت :

ـ جەنابی خاوەن شکۆ زیندانی بکەو لە قەنارەی بدە !

ـ مەلیك پرسیی : دەتانەوێ کێ زیندانی بکرێتو بکوژرێت؟

ـ (منصور أبو العرگ).

ـ ئەی بۆچی دەتانەوێ زیندان بکرێتو بکوژرێت؟

ـ چونکە فێڵ لە عارەقەکەدا دەکات، ئاوی زیادی تێ دەکاتو ئەمجا بە گرانیش دەیفرۆشێ.

(موسی أسد) لە نێو عێراقیەکاندا وا ناسرابوو کابرایەکی لا پرەسەنی (فضولي) پلە یەکەو بە هەموو کەینو بەینێکی نێوانیان دەزانێ. ڕۆژێکیان لەگەڵ (نوری عبدالرزاق)و ماجدو مهدیو چەند کەسێکی دیکەداچووینە سەیران بۆ دەرەوەی پراگ. بڕیارمان دا (موسی أسد) بەسەیرانەکەمان نەزانێو بەشداریمان نەکات. لە دووریی سی کیلو مەتر لە پراگەوە، لە ئوتێلێکی گەشتو گوزار دانیشتین بیرە بخوێنەوە، یەکێکیان گوتی : موسی شوێنەکەمان نادۆزێتەوەو ناگاتە لامان. چەند دەقەیەك بەسەر ئەوەدا ڕانەبورد، دەرگاکان کرانەوەو (موسی أسد) هەڵێکوتایە سەرمان !

(عزیزالحاج) لە دەستەی نووسینی گۆڤاری " مسەلەی ئاشتیو سۆشیالیزم"دا نوێنەری (حشع)بووو بەرزترین مووچەی لە نێو شیوعیە عێراقیەکانی چیکۆسلۆڤاکیادا وەردەگرت. وا ناسرا بوو لە نێویاندا کە لە گشتیان دەست قووچاوترە. چەند جارێك لە ئوتێل سەری لێ دام. کەرەتێکیان لە درێژەی باسو

خواسی نێوانماندا پێم گوت گیروگرفتێکی فیکری هەیە ساڵانێکی دوورو درێژە مایەی وتووێژ لەسەر کردنە. من بەلای خۆمەوە چارەسەریم کردووە. ئەویش ئەوەیە کە ئایا کورد نەتەوەیەك پێکدەهێنێ یان نا؟ ڕوونم کردەوە کە گەلی کورد نەتەوەیەك پێکدەهێنێ، بەڵام هێشتاکە بنەماکانی خۆیی بەبێ زیادو کەم تەواو نەکردووە. بەڵکوو هێندێکیانی هەن، بەتایبەت ئەوەیان کەبەستە بەهەستی نەتەوەییی هاوبەشەوەو، هێندەکەی دیکەیشی خەریکە دروست دەبن. پاش چەند ڕۆژێکی کەم گوتارێك بە قەڵەمی (عزيز الحاج)و بەناونیشانی (ئایا گەلی کورد نەتەوەیەك پێکدەهێنێ؟) وە لە گۆڤاری سبەی (الغد)دا بڵاوکرایەوە. عەزیز بە تاکە وشەیەکیش ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردبوو کە ئەو ئەم بیرۆکەیەی لە یەکێکی دیکە بیستووەو لە گۆتارێکدا دایڕشتووە.

* * *

حوزەیرانی ١٩٦٤ لە پراگەوە چوومە مۆسکۆ، تا بۆ یەکەم جار پاش ڕاگرتنی ئەندامەتیم لە ١٩٦٢دا بەشداریی کۆبوونەوەیەکی حیزبیی کادێران بکەم. ئەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندی کە لە هەندەران بوونو چەند کادێرێکی وەك (نوري عبدالرزاق)و ماجدو مەهدیو (ثمينة ناجي)و منو (عامر عبدالله) ئامادەی بووین. کۆبوونەوەکە (سلام الناصري) سەرکردایەتیی کردو ئەوەی لێ دەویست ڕێبازێکی کلکایەتیی ڕاستڕەوی دەست نیشانکراو بگرێتە بەر. سەلام خۆی بەردەوام بە میزاج ڕاستڕەو بوو. هەروەها سۆڤێتیەکان ـ بە تایبەت بەشی نێو دەوڵەتیی کۆمیتەی ناوەندی ـ پیرۆزباییی ئەم چەشنە ڕێبازەیان لێ دەکرد.

ئێمە بەڕێوە بووین بۆ مۆسکۆو فڕۆکەخانەی مۆسکۆمان بەجێ هێشتبوو کە یاوەرە سۆڤێتیەکەمان پێی گوتین : خرۆشیۆف بە چالاکییەکی پیلانگێڕانە یا نیوچە پیلانگێڕانە کە بریجنیف سەرکردایەتیی کرد، لابراو دوای ئەو پێشەوایەتیی گرتە دەستو لە ساڵانی حوکمیدا ڕێبازی ستالینیی بەدزێوترین شێوە هێنایەوە مەیدان.

دێمەوە سەر کۆبوونەوەکەمان. لێدوانێکی گەرمی فراوان کراو هێندێکیان بەرهەڵستیی ئەو بیروڕایانەیان کرد کە (سلام الناصری) بەرچاوی خستن. بەڵام زۆربە ـ منیش لە نێویاندا بووم ـ بڕیاری لەسەردا. کاکڵەی ئەم بیروڕایانە ئەوە بوو کە دەکرێت رژێمی وردە بۆرجوازیی ـ لە چەشنی رژێمی جمال عبدالناصرو هیی لەم بابەتە ـ بە کاریگەریی سیستمی سۆشیالیستیی جیهانی ببێ بە رژێمێکی سۆشیالیستی. لەو خەیاڵەدا بووین کە رژێمی (عبدالسلام عارف)یش لەو رژێمانەیە. ئەوانە هەر ئەو بیروڕایانە بوون کە پاشتر بە ڕێبازی پەرەسەندنی ناسەرمایەداری ناوبران. ئەم کۆبوونەوەیە هەنگاوێك بوو لە هەنگاوە ڕێخۆشکەرەکان بۆ سەرخستنی کۆبوونەوەی چاوەڕوانکراوی کۆمیتەی ناوەندی.

* * *

دوو مانگ پاش کۆبوونەوەی کادێران لە مۆسکۆ، کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە پراگ کرا. کاتی دانیشتنەکانی کۆبوونەوەکە بە منو (عامر عبدالله)و (ثابت العاني)یان راگەیاند ئامادە ببین، چونکە ئەو سزایانەی کە لە کۆبوونەوەی ١٩٦٢دا دایانین هەڵوەشێندرانەوەو دواتر پلەی ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیان پێمان بەخشییەوە. ئەوانەی کە بڕیاری سزادانیان لە ساڵی ١٩٦٢دا ئیمزا کرد بوو، ئابی ١٩٦٤ قەناعەتیان پەیدا کرد کە لە بنەڕەتدا هیچ دەستەبەندییەك لە گۆڕێدا نەبووو سزاکان زۆردارانەو ناهەقی بوون.

بەڵام کۆبوونەوەی ئاب سەبارەت بە من یەك سزای بە سووککردنەوە لەسەرم هێشتەوە، ئەویش سزای ئاگادارکردنەوەم (انذار)بوو کە سەروبەندی کۆبوونەوەی جیهانیی حیزبە شیوعیەکان ساڵی ١٩٦٠ ئاراستەم کرا، چونکە هەڵوێستەکەمیان بە دڵ نەبوو. پێشتر باسی ئەمەم کردووە.

مەسەلەی سەرەکیی نێو کارنامەی بەردەم کۆبوونەوەکە ئەو راپۆرتە سیاسیە بوو کە رووکاری ئیشی داهاتووی دیاری کرد. کۆمیتەی ناوەندی ـ بە منیشەوە ـ

هەڵەیەکی گەورەی کرد، لەبەر ئەوەی بڕیاری لەسەر هێڵێکی سیاسیی کلکایەتی‌دا کە لەسەر ئەو ئومێدە بنیات نرابوو گوایە رژێمی دیکتاتۆریی عەسکەریی (عبدالسلام عارف) پەرە بستێنێ‌و ببێتە رژێمێکی پێشکەوتخوازی روو لە سۆشیالیزمی وەك رژێمی (جمال عبد الناصر) لە میسر. لە کاتێکدا عبد السلام لە کودەتا فاشیە خوێناویەکەی هەشتی شوباتدا هاوبەشی بەعسیەکان بوو و لە ماوەی ساڵێکی دوای کودەتای تشریندا بەسەر هاوبەشەکانیدا چل شیوعیی لە سێدارە دا. کۆبوونەوەکە بە زۆریەی (١٢)دەنگ لە کۆی (١٤) بڕیاری لەسەر ئەم هێڵە سیاسیە راستڕەوە کلکایەتیەدا . بە تەنیا (عزیز الحاج)ی ئەندامی پاڵێوراو بۆ کۆمیتەی ناوەندی دەنگی لە دژی داو، (آرا خچدور) لە نێوان لایەنگرو بەرهەڵستدا بە بێ دەنگدان مایەوە.

پاش هێرشی پۆلیسیی رژێمی فاشی کە کێشایەوە بۆ فڕاندن‌و پاکتاوکردنی نۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بە (سلام عادل)ی سکرتێری حیزب‌و چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی‌و سکرتاریەتەوەو رووخانی ژمارەیەکی دیکەو لەوانە (هادي هاشم الأعظمي)ی ئەندامی مەکتەبی سیاسی‌و سکرتاریەت کە (سلام عادل)و هەر کەسێکی دیکەی ناسیبوو بە دەستییەوە دابوون، ئیتر دۆخی سەرکردایەتی - رێکخراوەییی حیزب رووی لە خراپی کرد. دەبوو بە هەڵبژاردنی سکرتێرو مەکتەبی سیاسی دۆخی سروشتیی رێکخستن بگێڕدرێتەوە بۆ حیزب. کێ بە سکرتێر هەڵبژێردرا؟ تەنیا دوو کەس هەبوون چاویان تێ بڕدرابوو . عەزیز محەمەد کە پێش شۆڕشی چەواشەی شوبات ئەندامی مەکتەبی سیاسی‌و سکرتێری رێکخراوی هەرێمی کوردستان بوو و، (سلام الناصري) کە ئەندامێکی پاڵێوراو بوو بۆمەکتەبی سیاسی‌و لە هەندەران دادەنیشت‌و لە نێو تاقمەکەی خوێندندا بوو. ئەمەی دواییان سەرباری ئەوە کە لە رووی سەر لەبەری وەزعیەوە کەسێکی گونجاو نەبوو، خۆیی نەپالاوت‌و داوای لێبووردنی کرد. هەر عەزیز محەمەد لەو بارودۆخە

بەردەستەدا وەك کەسێکی پەسەند کراو مایەوە. مەکتەبی سیاسیش هەڵبژێردرا. من‌و عامر، وێڕای (باقر ابراهیم)و عومەری مامە شێخەو عەزیز محەمەدو (سلام الناصري)، هەڵبژێردراین.

(زکي خيري) بۆ مەکتەبی سیاسی هەڵنەبژێردرا، چونکە لەنامەکانیدا دانی بەو دەستەبەندیە هەڵبەستراوەدا نابوو و ئەو مەسەلەیەی قووڵ کردبووەوەو، ئەوەیش شوێنەوارێکی خراپی لەلای هەموان بەجێ هێشتبوو. بە قسەی عەزیز محەمەد دەبوو زەکی، بەر لە گێڕانەوەی بۆ مەکتەبی سیاسی، بە قۆناخێکی گواستنەوەدا ڕەت ببێ. بەڵام زەکی خۆی لەو جۆرە نەبوو کە لەم هەڵوێستەی کەسانی دیکە بەرانبەری خۆش ببێ، چونکە مەسەلەی پێشەوایەتی بەلای ئەوەوە شتێکی پلە یەك بوو و هەموو مەسەلەکانی دیکەیش پلە دوو بوون. لەبەر ئەمە کاتێك پاش کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەکە (کە ئامادەی نەبوو) گەیشتە پراگ، هێرشی کردە سەر ئاکامەکانی کۆبوونەوەکەو، بە هاوکاریی توندو تۆڵی (عزيز الحاج) دژی هێڵی ئاب وەستا.

یەکێك لە بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە ئەوە بوو : ئەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندی‌و ئەو هەموو کادێرانەی کە بەر لەو کاتە لە دەرەوەی نیشتمان بوون، لە هەندەرانەوە بگەڕێنەوە بۆ عیراق‌و، ئەوانەیش کەپێش کودەتای شوبات لە ناوەوەی عێراق بوون بچنە دەرەوە. ئەوە بڕیارێکی بەجێ‌و بەردەوامبوونی ئەو داب‌و نەریتە خەباتکارانە بوو کە لە کۆنەوە لە(حشع)دا بنج بەست بوو بوو. عەزیز محەمەدو (باقر ابراهیم)و کەریم ئەحمەد بۆ خوێندنی حیزبی نێردرانە مۆسکۆو، (زکي خيري)ش لە گۆڤاری "مەسەلەی ئاشتی‌و سۆشیالیزم"دا بەنوێنەری ئێمە هێڵرایەوە. لەکاتێکدا ئێمەیش بەرودوا دەستمان بە گەڕانەوە کرد بۆ عێراق. (عزيز الحاج) نەبێ کەبەهۆی ترسنۆکییەوە تا سەرەتاکانی ١٩٦٧ دواکەوت‌و نەگەڕایەوە.

* * *

که حوکمم لیٚ کرا بۆ خوێندنی حیزبی له مۆسکۆ بمێنمەوه، ژنەکەمو هەرسێ منداڵە چکۆلەکەم لە بەغدا مانەوه. ئەوه زۆرداریيەکی ئاشکرا بوو بەتايبەت بەرانبەر بەوان. له ١٩٦٣دا سەرپاکيان گيران. پاش چەند مانگێك پيرەژنەکەی دايكم توانيبووی بگاتە بەغداو منداڵەكان لەبەندیخانە وەربگرێتەوەو بيانبات بۆ سلێمانی.

حكوومەتی (عبدالسلام عارف)١٩٦٤بڕیاری دا ڕەگەزنامە لەژنەکەمو (عمومة مصري) بستێنێتەوەو بە بەهانەی ئەوە کەهەردوکیان جوولەکەن دووریان بخاتەوە بۆ دەرەوەی عێراق. له پراگ بە (أم سلام) گەیشتمو بۆ چەند مانگێکی کەم پێکەوە ژیانێکی خێزانیی سروشتیو هێمنمان گوزەراند. لە شوقەیەکدا دانیشتبووین کەلەگۆڤاری "مەسەلەی ئاشتیو سۆشیالیزم "ەوە دەستم کەوت، چونکە کارگەرێکی دەستەی نووسینی بووم.

دەورانی ئیش کردنم لە گۆڤارەکەدا گوتارێکم بەپێی ڕاسپێریی مەکتەبی سیاسیو بەناوی (منير احمد)ەوە تێدا بلاّو کردەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو هێڵە سیاسیە تەرخان کرابوو کە کۆبوونەوەی ئاب بڕیاری لیٚ دا. گوتارەکە وەك هێڵە سیاسیە پێڕەو کراوەکە لەسەرەتاکانیدا چەوتو خراپ بوو. بەلاّم ئەو نووسەرە ڕووسیيەی کەوەریدەگێڕاو دایدەڕشتەوە، خراپتری کردو هێندێك شتی وای تێکرد کە من نەمنووسیبووو دوای بلاّوکردنەوەی نەبێ لە گۆڤارەکەدا پێم نەزانی.

ئەو ڕۆژانە کە پاش کۆبوونەوەکە لە پراگ بەسەرم بردن، دەبوو هۆشێکی زۆرمان بەچالاکیی (عزيزالحاج)ەوە بێ کە ـ سەبارەت بە هێڵی ئاب ـ قسەی هەقی کردو مەبەستی پێ ناهەقی بوو. وەك دەرکەوت هەریەکە لە (زكي خيري)و(آرا خچدور)و(نوري عبدالرزاق)و (ماجد عبدالرضا)و(مهدي الحافظ) هاوکارییان دەکرد. نامیلکەیەکی بچووك بە ئیمزای " کۆمەڵێك شیوعی"یەوە لە پراگ بەشرایەوە بۆ ڕەخنەگرتن لەسیاسەتی (حشع)و هێرشکردنە سەر هێڵی ئاب تەرخان کرابوو. (عزيز الحاج) نکوولیی لەوە کرد پێوەندیی پێوە هەبێ: بەلاّم

(هشام البعاج) کسالّی ١٩٥٧ بۆ یەکەم جار لەبەندیخانەی تاکە کەسیی بەعقووبە ناسیم، لە چاوپێکەوتنێکی دوو قولّیماندا لای خۆم دانی بەوەدا نا کە فیتی بلاّوکراوەکە لەژێر سەری عەزیزدایە.

دوایی کە گەڕابوومەوە بۆ عیراق (عزیزالحاج)و (زکي خیري) بە جووتە نامیلکەیەکیان دەرکرد بۆ هەڵسەنگاندنی سیاسەتی حیزب لە نێوان ١٩٥٨ـ١٩٦٤دا تەرخان کرابوو. لەولاّتانی ئەورووپایی‌و هەرکوێیەك پێیان کرابێ بلاّویان کردەوە.